وتاری هەینی

# ئاسوودەیی ئیسلام

بەرگی دووەم

فاتح مەلا ڕەسوڵ شارستێنی

١٤٣٤ك - ٢٠١٣ ز

ناوی کتێب: ئاسوودەیی ئیسلام
نووسەر: فاتح مەلا ڕەسوڵ شارستێنی
بابەت: ئاینیی، وتاری هەینی
بەرگ: دووەم
ساڵی چاپ: ١٤٣٤ك، ٢٠١٣ز
تیراژ: ٥٠٠ دانە
چاپ: یەکەم
دیزاین: گۆڤاری بڕیار
چاپخانە: پیرەمێرد

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی(١٥٥١)ی ساڵی (٢٠١٣)ی پێدراوە

پێشکەشە بە:

* دایكو باوكی خۆشەویستم.

* هەموو ئەو كەسانەی كە لەخزمەتیاندا خوێندوومە.

* رۆحی مامۆستا عەبدولكەریمی مودەریس، ئەو كەسەی بۆ یەكەمجار لەكوردستاندا؛ وتاری رۆژی هەینی بەزمانی شیرینی كوردی بۆ گەلی كورد خوێندەوە.

* بەهاوسەری بەرێزو هاورێبازم.

* نوری چاوانم محەمەدو ئیبراهیمو ئاسوودەو ئەڤین.

بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس و ستایش بۆخوای تاكو تەنیاو بێ شەریك، درودو سلاوی خوا لەسەر پێشەواو سەروەرمان نوری چاومان شەفیعی مەحشەرمان محمد المصطفى (ﷺ) بێت.

رەزاو رەحمەتی خوا لەسەر یاران و شوێنكەوتووانی تاقیامەت.

بەڕێزان: ئەوەی لەدووتویی ئەم كتێبەدا دەیخوێنیتەوە: بەرگی دووەمی ئاسودەیی ئیسلامە كە وتاری رۆژانی هەینییەو خوێندومەتەوەو بە (سی دی) بلاوكراونەتەوە، پاشان بەشێوەی نووسینی كتێب داڕێژراوەتەوە، منیش خستنمە بەردەستی خۆشەویستان و بەڕێزان لەوتاربێژان و بانگخوازان، بەئومێدی ئەوەی لەدوعای خێر بێبەشمان نەكەن، ئەوەی ڕاست و ڕەوان بوو، ئەوە فەزڵی خوایە بەسەرمانەوەو ئەوەش كە هەڵەو كەموكوڕی بوو، لەلایەن بەندەوەیەو داوای لێبوردن لەو خوایە دەكەم كە تەنیا هەرئەوە تووشی هەڵە نابێت و لەهەڵەی بەندەكانی دەبووری..

خوای گەورە پشتو پەنای هەموو لایەك بێت.

مەلا فاتح

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجْمَعين.

**ئیماندارانی بەڕێز: ووتاری ئەم هەفتەیەشمان لەم ڕۆژە پیرۆزەدا، دەتوانین بڵێین کەهەر تەواوکەری زنجیرە باسی (تێگەیشتن و فەهمی ڕاست ودروستە لەئیسلام)ە، چونکە لەم بابەتەشدا هەندێکی زۆر لەموسڵمانان بێئاگان.**

**بۆ نموونە: زۆرێك لەموسڵمانان وادەزانن کەبابەتی شەرعی، یان کەدەڵێین: فلاّن مەسەلە شەرعیە. یان ئەو بابەتە دینیە، یەکسەر بیرو هزرمان دەچێتە سەرئەوەی کەباس باسی عیبادەتەکانە. وەکو دەست نوێژو خۆشۆردن و تەیەموم و نوێژ وڕۆژوو ...هتد.**

**زۆر بەکەمی بیرو هۆشمان بۆلای باسی فەزا وئاسمان وئەستێرەکان دەچێت. وە ئەمە بەبابەتێکی دینی سەیر ناکەین و دەڵێین: ئەمە باسی سەر مینبەرو قسەو باسی مامۆستای ئاینی و پێش نوێژو ووتار خوێن نیە!!**

**یاخود: کەلە کۆڕو دانیشتنێکدا باسی ئەوە دەکرێ، کەئەمریکیەکان، یان ڕوسی و یابانیەکان چونەتە سەر مانگ، یان واکەشفی ئەستێرەکانی تر دەکەن، یان زانستی ئەتۆم دەخوێنن. یان فلاّن دۆزینەوەیان لەسەر ڕۆژو مانگ دۆزیوەتەوە، یەکسەر موسڵمانی بێ ئاگا خۆی بەکەم وشەرمەزار دەزانێ وخۆی بچوك دەکاتەوەو خۆی بەخۆی دەڵێ: باشە بۆچی ئێمەی موسڵمان ئەمانە نازانین و ئەو کافروگاورو جولەکانە ئەمانە دەدۆزنەوە؟! وەکەسانی دژ بەئیسلام و موسڵمانانیش کەدەزانن ئێمە لەقورئان ودینەکەمان ناحاڵین. فرسەتمان لێ دێنن و بەدواکەوتومان دەزانن و دەڵێن: ئەم موسڵمانانە گێژو وێژن، هەرخەریکی ڕۆژوو نوێژن!**

**بەلاّم، بالەم ووتارەدا، بچینە خزمەت قورئان وتێ ی بگەین وبزانین ئیسلام بەرامبەر بەزانستی فەزاو بەرامبەر چونە بۆشایی ئاسمان و بەرامبەر قسەکردن لەمانگ و ڕۆژو ئەستێرەکان چی فەرمووە؟! پێش هەموو شتێ، ئەگەر تەنها سەیری پێڕستی سوڕەتەکانی قورئان بکەین و سەیری ناوی سوڕەتەکان بکەین. بۆمان دەردەکەوێ کەئەوەندە سوڕەتەی بەناوی ئاسمان و ئەوەی لەئاسماندا هەیە، زۆر زۆرە، بۆ نموونە:**

١. سورة الشَّمْس.

٢. سورة القَمَرْ.





٣. سورة البُرُوج.
٤. سورة الطَّارِق.
٥. سورة الانْفِطار.
٦. سورة التكوير.
٧. سورة الانْشِقاق.
٨. سورة النَّجم.
٩. سورة الدُّخان.
١٠. سورة الزَّلْزَلَة.

**وە ئەو سورەتانەش کەباسی کاتەکان دەکەن و سەرنجی مرۆڤی بۆلا ڕادەکێشن کەبیری لێ بکاتەوەو سودمەند بێ لێ ی، ئەمانەن:**

١. سورة الضُّحَى.
٢. سورة اللَّيْل.
٣. سورة الفَجر.
٤. سورة القَدْر.

**وە زانایان دەفەرمون: زیاتر لە (١٠٠٠) ئایەتی قورئان باسی گەون و ئاسمان دەکات.**

**لەو (١٠٠٠) ئایەتە (٤٦١) ئایەتی قورئان باسی زەوی وخرِی زەوی وجۆری خاکەکەی وتوێکڵی زەوی وناوەوەی زەوی دەکات. وەهەروەها ئەو ئایەتانەی (ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ) باسی زانستی (جیولۆجی) دەکەن زیاترن لە (١١٠) ئایەت.**

**ئەمجا کەخوای گەورە ئەمەی لەقورئاندا بۆ باس کردوین. تەنها بۆ ئەوە نی یە کەبزانین ئەمە هەیە وبیخوێنینەوە یان بیکەین بەنووشتە، بەڵکو بەئاشکرا دەفەرموێ: ئەم زانستی (جیولۆجی یە)، دەبێ موسڵمانان کارامەبن تێیدا وژیانی خۆیانی پێ خۆش بکەن ولەئەنجامی لێکۆڵینەوەدا زیاتر گەورەیی خوایان بۆ دەربکەوێت. بەو مانایەی زانستی (جیولۆجی) عیبادەتە وئەگەر موسڵمانان هەندێکیان ئەم کارە نەکەن، هەمویان گوناهبار دەبن. چونکە (١٠٠٠) ئایەتی قورئانیان ئیهمال کردوە. لەکاتێکا هەرگەل و نەتەوەیەك، یەك ئایەتی**

قورئان پشت گوێ بخەن، ئەوا ماڵوێران دەبن.

بۆ نموونە: چۆن خوای گەورە داوامان لێ دەکات کەنوێژ بکەین. ئاواش فەرمانمان پێ دەکات کەلەزەوی وئاسمان وورد بینەوە وسەرنجی بدەین وتێیدا بگەڕێین، هەرئەوەندە جیاوازی لەنێوان ئەم دوو فەرمانەی خوای گەورەدا هەیە کە: نوێژەکە لەسەر هەمووومان فەرزە، چونکە ئاسانە. وە هیچ کەس لێ ی بێ ئیحتیاج نیەو خۆراکی ڕۆحە وکۆڵەکەی دینە. بەڵام زانستی جیۆلۆجی هەموو کەس فێری نابێت. ئەگەر کۆمەڵێك پێ ی هەڵسان لەموسڵمانان و بۆ ئەوانەی تریان باس کردو لەمەیدانی کردەوەدا بەکاریان خست و بەرهەم دار بوو. ئەوا گوناهـ لەسەر هەموو خەڵکەکە لادەچێ.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ثُمَّ اللَّهُ يُنشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ العنكبوت، ٢٠.

واتە: ئەی محمدﷺ بڵێ: بڕۆن بگەڕێن بەزەوی داو سەرنج بدەن کەچۆن دروستکراوەکانی لەسەرەتاوە بەدی هێناوە، لەپاشان هەرخوای گەوە بەدی هێنانی دوا ڕۆژیش بەدی دێنێ، بەڕاستی خودا بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا.

جا ئیمانداری بەڕێز: ئایا جێ بەجێ کردنی ئەم ئایەتە کەفەرمودەی خوایەو فەرمانی (سیروا)ی تێدایە بەبێ کۆلێجی تایبەت و زانکۆی پێشکەوتوو دەکرێ؟! بێگومان نەخێر، چونکە خوای گەورە بە ئاشکرا پێمان دەفەرموێ: لەموختەبەرو تاقیگەدا، شیکاری بەردەکانی ناو ناخی زەوی بکەن و بزانن چەند هەزار ساڵە دروست کراوە.. دەی کە ئێمەی موسڵمان نایکەین ئەوە قورئانەکەمان جێ بەجێ نەکردوە وسزاکەشی ئەو دواکەوتنەمانە لەبواری پێشکەوتنی ئەمڕۆی جیهاندا..

یان قورئان باسی ئاسمان دەکات و دەفەرموێ:

﴿ أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ﴾ ق، ٦.

واتە: دەی ئایا سەرنجی ئەو ئاسمانەیان نەداوە کە لەسەریانەوەیە، چۆن دروستمان کردوەو ڕازاندومانەتەوە. وە هیچ درزو کەلێنێکی تێدا نی یە.

دەی واجبە لەسەر موسڵمانان بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم فەرمانە خوایی یە کەئامێری (تیلیسکۆب)ی زۆر پێشکەوتویان هەبێت. تاسەیری ئاسمانی پێ بکەن.

یاخود دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي السَّمَاءِ بُرُوجًا وَزَيَّنَّاهَا لِلنَّاظِرِينَ ﴾





الحجر: ١٦ .

واتە: سوێند بەخوا بێ گومان ئێمە دروستمان کردوە چەند بورجێك لەئاسماندا وئەو ئاسمانەمان ڕازاندۆتەوە بۆ سەرمنج دەران.

کەواتە: پێویستە کەموسڵمانان جێگاو زانکۆی تایبەتیان هەبێت کەلێکۆڵینەوەی تێدا بکرێ لەسەر ڕۆژو مانگ و ئەستێرەکانی ئاسمان.

کەچی بەداخەوە بەهۆی دورکەوتنەوەمان لەقورئان هێشتا وادەزانین کەئەوە ئیشی کافرانەو موسڵمان نابێ دەست لەکاری خوا بداو دەم لەشتی ئاواوە بدات!!..

وە بەدوژمنانی ئیسلامیش دەڵێین و با ئەمە وەلامێکیش بێت بەدەست موسڵمانانی دڵسۆزو گەنجانی خەمخۆرەوە، کەکاتێ دور لەدینان پێیان دەڵێن: خەڵکی چونە سەرمانگ کەچی تازە ئێوە هەرخەریکی نوێژ ورۆژوون! یان خەریکی مزگەوت دروستکردنن!..

پێیان دەڵێین: خۆ وەکو ئێمە نەچوینەتە سەرمانگ، جەنابیشت کەدورو دژی بەدین هەرنەچوی! ئەی کەبەبێ دینیە خۆتۆ لەدین بێ بەری ئەی بۆ نەچوی؟!!.

وە هەروەکو لەسەرەتاوە باسمان کرد (١٤) سورەتی قورئان بەناوی تەواوی سورەتەکان باسی زانستی فەزاو زەوی وکاتەکان دەکات. وە زیاتر لە (١٠٠٠) ئایەتی باسی عیلمی فەزاو جیۆلۆجی دەکات. بەلام هەر لەقورئاندا، حەج بەو گەورەییە کەڕوکنی پێنجەمی ئیسلامە، تەنها یەك سورەتی بەناوەوە هاتوە کەبریتی یە لەسورەتی (الحَج) وەچەند ئایەتێکی کەم باسی دەکەن.

یان جومعە، ئەم مەراسیمە گەورە عەظیمە. کە غەیری ئیسلام کەس توانای ئەوەی نیە کەئاوا خەڵکی کۆبکاتەوە، تەنها یەك سورەتی بەناوەوە هاتوە. وەیەك ئایەتی قورئان باسی دەکات. وە ڕۆژوی ڕەمەزان، سورەتی قورئانی بەناوەوە نیەو چەند ئایەتێکی کەم باسی فەرزبون و چۆنیەتیەکەی دەکات، وە نوێژ کەکۆڵەکەی دینەکەمانە، سورەتی بەناوەوە نی یە ونزیکەی (٨٠) ئایەت باسی دەکات.

کەواتە: ئێمەی موسڵمان ئیسلامەکەمان دینەو دونیایە. مزگەوت و زانکۆیە.

عیبادەت و تەکنەلۆژیاو فەزایە. دەست نوێژو جیۆلۆجی یە بۆیە سوپاسی خوای گەورە دەکەین و دەڵێین: الحَمْدُ لِلّهِ الَّذي هَدانا لِلايمانِ والاسلام.

ئیمانداران، هەندێ جار ئەو پرسیارە دەکرێت ئایا مرۆڤ بۆی هەیە بچێتە بۆشایی ئاسمان و بچێتە سەرمانگ وئەستێرەکانی تر؟!.

قورئانی پیرۆز دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَظَلُّواْ فِيهِ يَعْرُجُونَ ﴿١٤﴾ لَقَالُوٓاْ إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَٰرُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ ﴿١٥﴾ ﴾ الحجر: ١٤-١٥.

واتە: ئەو بێ باوەڕانە، ئەگەر دەروازەیەکمان لەئاسمانەوە بۆ بکردنایەتەوە، تاپیایدا سەربکەون وتێپەڕببن ونهێنی دروستکراوانی ئێمە ببینن، هەرباوەڕناهێنن. ئەوە دەیانگوت: بێگومان چاوبەستمان لێ کراوە. یاخود ئێمە کەسانێکی جادوو لێکراوین!!

بەڕێزان: لەم ئایەتە قورئانیەدا سێ ئاماژە هەیە:

١- ئاسمان بۆشاییەکی بەتاڵ نیە، بەڵکو پڕە لەغاز، وەکو گازی هایدرۆجین وهیلیۆم وکەمێك لەئۆکسجین ونایترۆجین ونیۆن و هەڵمی ئاو. لەگەڵ بونی چەند تیشکێك وەکو تیشکی ژێرسور وتیشکی سینی وتیشکی گاما (غاما).

وە هەروەها چەند دەروازەیەکی دیاریکراو هەن لەبۆشایی ئاسماندا لەحاڵەتی دەرچون لەبەرگە هەوای زەوی و ئەگەر لەغەیری ئەو شوێنانەوە کەشتی ئاسمانی بڕواتە دەرەوە، ئەوا لەبۆشایی ئاسماندا گڕ دەگرێت و دەسوتێ. وە تەواو بەپێچەوانەشەوە کاتێ کەشتیە ئاسمانیەکان، لەبۆشایی ئاسمانەوە بەرەو زەوی دەگەڕێنەوە پێویستە ڕەچاوی ئەوە بکەن کەڕێك لەو دەروازانەوە بگەڕێنەوە کەلەناو چینی دەرەوەی بەرگە هەوادا هەن. ئەگینا ئەگەر لەو ڕێگا دیاریکراوانەوە نەگەڕێنەوە سەرزەوی، یان توشی سوتان دەبن، یاخود لەبۆشایی دەرەوەدا دەمێننەوەو تا لەناوچون هەردەبێ بۆخۆیان بسوڕێنەوە!.

٢- ووشەی (يَعْرُجُون) دوو مانا هەڵدەگرێ. بەمانای هەڵکشان بەرەو ژور (الصُعُود) یان مەیلان بوون، لاربونەوە دەگرێتەوە. کەئەمەش مەرجە بۆ کەشتی ئاسمانی لەکاتی چونە دەرەوەی لەبەرگە هەوای زەوی دا.

٣- دوای دەرچون لەبەرگە هەوای زەوی، تاریکاییەکی ڕەشی واهەموو






جێگایەك دەگرێتەوە، هەروەكو مرۆڤ چاوی توند بەسترابێتەوە وهیچ نەبینێ. رێك وەكو قورئان دەفەرموێ: (سُكِّرَتْ أَبْصارُنا)..

كەواتە: چونە ناو بۆشایی ئاسمان وناو فەزا، نەك هەرگوناهـ نیە. بەڵكو جێ بەجێ كردنی ئەم ئایەتە قورئانیەیە.

ئیمانداران: یەكێكی تر لەو پرسیارانەی كەقورئان وەڵامی دەداتەوە، ئەوەیە كەلەزۆر كۆنەوە مرۆڤ پرسیویەتی: ئایا لەغەیری هەسارەی زەوی دا، هیچ زیندەوەرێك بونی هەیە؟! لە وەڵامدا ئێمەی موسڵمان دەڵێین:

بەڵێ، زیندەوەری تر هەیە. بەڵام مرۆڤ تەنها لەسەر زەوی هەیە، كەواتە: ئەوەی كەدەوترێ زانایان وتویانە: زیندەوەر لەسەر مەریخ هەیە، یان دەگونجێ ژیان لەسەر فلاَن هەسارە هەبێ، ئەوە پێشتر قورئان باسی كردوە. ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦ خَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٍۚ وَهُوَ عَلَىٰ جَمْعِهِمْ إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٌ ﴾ الشورى: ٢٩

واتە: لەنیشانەو بەڵگەكانی گەورەیی و دەسەڵاتی خوا، دروستكردنی ئاسمانەكان و زەوی و ئەو زیندەوەرانەیە، كەتیایاندا بلاَوی كردۆتەوە. هەرئەو زاتەش كاتێك بیەوێت تواناو دەسەڵاتی بەسەر كۆكردنەوەمیاندا هەیە...

لێرەدا سەرنجی ووشەی (فیهما) بدەن، كەمانای ئەرز وئاسمان دەگرێتەوە. رەنگە یەكێ بڵێ، (دابَّة) كەلەئایەتەكەدا هاتوە مەبەست پێ ی فریشتەكانە كە لەئاسماندان و مرۆڤیش لەسەر زەوی دایە. بەڵام نەخێر. (دابَّة) مەلائیكەت ناگرێتەوە. چونكە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ مِن دَآبَّةٍ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴾ النحل:٤٩

واتە: هەرچی لەئاسمانەكان و هەرچی لەزەوی دا هەیە، سوژدە دەبەن بۆ خوای بەدیهێنەریان. هەروەها هەموو زیندەوەران. فریشتەكانیش بەتایبەت سوژدە دەبەن بۆ خواو، خۆبەگەورە نازانن لەهیچ فەرمانێكی خوا لانادەن.. لێرەدا ئایەتەكە (دابة) زیندەوەرانی، لەگەڵ (الملائِكة) فریشتەكان. لەیەكتری جیاكردونەتەوە.

كەواتە: بەڵێ لەئاسماندا، لەهەسارەكاندا زیندەوەر هەیەو ژیان هەیە، بەڵام مرۆڤ نیەو وەكو ژیانی سەرزەوی نیە وئێمەش بەمە ئیمانمان زیاد دەبێ و بەڵگەیەكی ترمان بەرچاو دەكەوێ لەسەر گەورەیی و دەسەڵاتی بێ سنوری





خوای گەورە.

ئیمانداران: یەکێکی تر لەوشتانەی کەقورئان باسی کردوە بریتی یە لەجێگیربونی مەسافەی نێوان زەوی و ڕۆژو مانگ و زەوی یە. خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ بِحُسۡبَانٖ ﴾ الرحمن:٥.

واتە: خۆرو مانگیشی بەحیسابێکی وورد دروست کردون و دایناون لەخولگەکانیاندا لەسوڕانەوەدان. خۆر یەك ملیۆن و سێ سەد هەزار جار گەورەترە لەزەوی و(١٥٠) ملیۆن کیلۆمەتر لەزەوی یەوە دوورە. ڕوناکی خۆر بەماوەی (٨) دەقیقە دەگاتە سەرزەوی. جا ئەگەر ئەو دوری یەی نێوان زەوی وخۆر زۆرتربێ، ئەوا زەوی دەیبەستێ ودەبێتە سەهۆڵ. وە ئەگەر کەمتریش بێ ئەوا زەوی لەگەرمان دەسوتێ! وە دوری نێوان زەوی ومانگ (٣٠٠,٠٠٠) سێ سەد هەزار کلم.

خۆ ئەگەر ئەم دوری یە کەمتر بوایە. ئەوا دەبوە هۆی ئەوەی کەئاوی دەریاو زەریاکان بەرز ببوایەتەوەو وشکانی سەر زەوی دابپۆشیایەو ژیان لەسەر زەوی نەدەما.

خۆ ئەگەر دووری نێوان مانگ و زەوی کەمتر بوایە لەوەی کەئێستا پەروەردگار بۆی داناوە. ئەوا هەڵکشان و داکشان بۆ ئاوەکانی سەرزەوی ڕوی نەدەدا ومانگ بەرەو ئەستێرەیەکی تر کێش دەکراو ئەو کاتە زەوی بەدەوری خۆیدا بەخێراییەکی وادەسوڕایەوە. کەلەماوەی (٤) خولەکدا جارێك بەدەوری خۆیدا دەخولایەوەو بەم پێ یە ڕۆژ تەنها دوو سەعات و شەویش دوو سەعات دەبوو لەجیاتی بیست وچوار سەعات. کەئەمەش دەبوە هۆی ئەوەی ژیان لەسەر زەوی زۆر ناڕەحەت بێ ومرۆڤ نەلەڕۆژدا فریای هیچ کارو کەسابەتێك بکەوێ، نەلەشەویشدا تێرخەو ببێت..

وە هەڵکشان وداکشانی ئاوی زەریا ودەریاکان کە لەڕۆژێکدا دووجار ڕوودەدات لەسەر دەستی زانا (نیوتن) ئاشکرا کرا کە ووتی: هۆکارەکەی پەیوەندی بەهێزی بە کێش کردنی مانگەوە هەیە. وەك قورئانی پیرۆز ئامازەی پێ کردبوو. پێش دۆزینەوەکەی زانا(نیوتن).

وەجێ ی ئامازە پێ کردنە ئەوەش بڵێین کە: زانستی نوێ دەری خستوە کە



مانگ کاریگەری بەهێزی هەیە لەسەر مرۆڤ و زیندەوەرانی تریش. لەوکاتەدا کەدەبێتە مانگی چواردە.

بۆ نموونە: ڕێژەی خۆکوشتن لەوکاتەدا کەمانگ لەچواردەیدایە زۆرترە. چونکە ئالۆزی مێشك زیاد دەکات ونەخۆشی دەرونی بەرز دەبێتەوە. هەروەها مانگ کاتێ گەیشتە شەوی چواردەی کاریگەری لەسەر گژوگیاو درەختەکان دەبێت وزۆر بەخێرایی گەشە دەکەن و گەورە دەبن. وە ماسی یەکانیش کاتێ مانگ گەیشتە شەوی چواردەی لەقولایی دەریاکانەوە بەرەو چینی سەرەوەی ئاوەکان دێنە سەرەوە!.

کە ئەمەش ڕەنگە یەکێ بێ لەحیکمەتەکانی بەڕۆژوبونی پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕۆژانی (١٣و ١٤و ١٥)ی مانگی دا. وە سوننەتیشە بۆ ئوممەتەکەی کەتێ ی دا بەڕۆژوبن. چونکە بەهۆی ئەو ڕۆژوو گرتنەوە مرۆڤ لە هەڵچونی دەرونی و شڵەژانی ڕۆح و عەقڵ دەپارێزێ، کە لەوکاتانەدا وەکو باسمان کرد زیاد دەکەن.

کەواتە: سوپاس بۆ خواو درودو سلاو بۆ پێغەمبەری نازدار، کەئێمەی موسڵمان عیبادەتەکانیشمان، ڕۆژوە سوننەتەکانیشمان. هەمووی لەسەر بنەمای زانستی یەو جێگای شانازیە.

ئیمانداران: یەکێکی تر لە إعجازی زانستی قورئان بریتی یە لەباس کردنی هێزی کێش کردن لەگەردوندا.خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ﴾ الرعد: ٢



واتە: خوای گەورە ئەو زاتەیە، کەبەچاوی خۆتان دەبینن چۆن ئاسمانەکانی بەبێ کۆڵەکەو ستون بەرز کردۆتەوە وڕایگرتووە.

نایەتێکی تر دەفەرموێ: ﴿ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ﴾ لقمان: ١٠.

وە فەرمویەتی: ﴿ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْحُبُكِ ﴾

واتە: سوێند بەئاسمانی خاوەن ڕێگە ورێك وپێك و ڕازاوە.

وە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَا ﴾ فاطر: ٤١.

واتە: بەڕاستی هەرخوایە کەئاسمانەکان وزەوی ڕادەگرێت و نایەڵێت لەناو بچێت و لەیەك بترازێت.

ئیماندارانی بەڕێز: لەم چەند ئایەتەی کەباسمان کردن، خوای گەورە سەرنجمان ڕادەکێشێت بۆ ئەوەی کەئەوەی کەئاسمانەکانی ڕاگرتومو هەیەو

چاوی ئێمە نایبنێ، بریتی یە لەهێزی کێش کردن. کە ئەم هێزە هەموو کەونی ڕێك خستوە. کە لەگەردیلەیەکەوە دەست پێدەکات، تادەگاتە مەجەڕەیەك و گەلە ئەستێرەیەك.

بۆ نموونە: ئەگەر سەرنجی ڕۆژ بدەین، دەبینین گەزەوی بەرەولای کێش کراوە بەهێزێکی دیاری کراوی پێویست. بەشێوەیەك گەزەوی لەبازنەیەکی داخراودا دەسوڕێتەوە بەدەوری خۆردا. بەڵام لەقولایی گەردوندا بزر نابێت. کەهەموی تاریکایی یە. وە بەلاچونی، یان ترازانی زەوی لەو خولگە تایبەتیەی خۆی، ژیان بەتەواوی کۆتایی پێ دێت.

چونکە گەزەوی لەو خولگەی ئێستای دەرچوو. ئەوکاتە پلەی گەرمی لەسەر زەوی دەگاتە (٢٧٠) پلە لەژێر سفرەوە. کەپلەی سفری ڕووتە. کەگەردیلەش تواناى جولانەوەی نامێنێ!

بۆیە خوای گەورە کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُمۡسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ أَن تَزُولَاۚ ﴾

یەکسەر ئایەتەکەی بەوە تەواو کرد کە فەرموی: ﴿ وَلَئِن زَالَتَآ إِنۡ أَمۡسَكَهُمَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ﴾ فاطر: ٤١.

واتە: سوێند بەخوا ئەگەر ئاسمانەکان و زەوی لەیەك بترازێن. ئەوە هیچ کەسێك نیە بتوانێت دوای ئەو زاتە فریایان بکەوێت. بەڕاستی هەر ئەو هەمیشەو بەردەوام نەرمونیان و لێخۆشبووە.

جا بۆ ئەوەی نرخ و بایەخی هێزی کێشندەی خۆر بۆ زەوی بزانین، باوادابنێین کەئەم هێزی کێش کردنە بەهەر هۆیەکەوە بێت نامێنێ. جا بۆ ئەوەی کەوا زەوی هەربەخۆرەوە بمێنێتەوەو لەوبازنە داخراوەدا هەربەدەوریا بخولێتەوەو لەخولگەی خۆی نەترازێ و ژیانی مرۆڤ و هەموو زیندەوەران بەیەك چرکە کۆتایی پێ نەیەت.

پێویستە هەرچی سەروەت و سامانی سەرزەوی هەیە، هەموو کارگەکان بخرێنەکار وهەرچی دەوڵەمەندو هەژارە چی پارەیان هەیە بیبەخشن و هەرچی مەعدەن و کانزای ژێر زەوی هەیە دەری بهێنن، بۆ ئەوەی کۆڵەکەی پێ دروستبکەین و زەوی و خۆری بەیەکەوە پێ ببەستینەوە!. جاکاتێ زاناکان دەگەڕێن بەشوێن بەهێزترین مەعدەن وکانزادا کەتوانای خۆڕاگرتنی ئەو قورسی یە وئەو ڕێگا دورەی هەبێ، هەمویان یەك دەنگ دەبن لەسەرئەوەی کە (فولاذ) بەکاربهێنن. کە (فولاذ) کەبەهێزترین کانزاکانە. وە لەهەمویان زیاتر





تواناى خۆڕاگرتنى هەيە لەژێر فشارى قورسى دا. ئەگەر تاڵەداوێكى فولاذى كەتيرەكەى يەك ميليمەتر بێت بەڕێكى دابنرێ، تواناى ئەوەى هەيە (١٠٠) كيلۆ قورسايى ڕابگرێ ونەچەمێتەوە!

جا بۆ ئەوەى زەوى لەخۆر نەترازێ. ئێمە لەم مەعدەنە بەهێزە. گرانبەهايە، دەگمەنە، كەفولاذيە پێويستمان بە (مليۆن، مليۆن) كۆڵەكەى فولاذى هەيە. كەدرێژى هەريەكەيان (١٥٦) سەدو پەنجاوشەش مليۆن كيلۆمەتر بێت. كەلەوكاتەدا پێويستە تيرەى هەريەك لەوكۆڵەكانە (٥) مەتر بێت!.. كە هەريەك لەو كۆڵەكانە تواناى ڕاگرتنى دوو مليۆن تەن قورسى هەيە! دەى هێزى كێشندەى خۆر بۆ زەوى چەندە؟!

بريتى يە لە: دوو مليۆن تەن كەڕەتى مليۆن، مليۆن بكرێ!! خۆ وا دابنێ مرۆڤ توانى ئەمەش بكات. بەڵام دەزانى ئەوكات چى ڕودەدات؟! وەختێ كارەكەمان تەواو دەبێ و دەڵێين: ئۆخەى ئەوە زەويمان بەستەوە بەخۆرەوەو ئيتر زەوى لانادات و ژيانمان پارێزراوە. بەڵام بەداخەوە هەركەسەيرى ئەملاولاى خۆمان دەكەين هەموو هيواو ئاواتەكانمان دەبنە سەراب ودەبينين كەسەرزەوى وەكو باغاتێكى لێ هاتوە لەكۆڵەكەى فولاذى ونێوانى هەركۆڵەكەو كۆڵەكەيەكى تر جێگاى كۆڵەكەيەكى ترى تيرە پێنج مەترى لێ نابێتەوە! وسەيردەكەين بەهۆى ئەم هەموو كۆڵەكەيەوە، خۆتيشكى خۆر لەزەوى نادات! وەهيچ جۆرە جموجۆڵ وكشت وكاڵ و بازاڕ وكارگە وخانوو ماڵێك جێگاى نەماوە. هيچ ڕێگايەك نەماوە هاتوچۆى پێدا بكرێ!!

(سُبْحانَ الله) قورئان چەند جوان فەرموى: ئەگەر ئەو هێزى كێشندەى خۆر بۆ زەوييە لابچێ و لەيەك بترازێن، غەيرى خوا هيچ هێزو دەسەڵاتێك نيە. بتوانێ ئەمە وەكو خۆى لێ بكاتەوە! كە بەڕاستى ئەم ئايەتە قورئانيەش يەكێكى ترە لەهەزاران ئايەتى إعجازى زانستى كەبەڵگەيە لەسەرئەوەى كە ئەم قورئانە كەلامى ئەو خوايەيە كەئەرزو ئاسمانەكان وخۆرو مانگ و خولگەكان وهێزى كێشندەى دروست كردوەو ئەم قورئانە هيچ پەيوەنديەكى بەدانراوى محمدەوەﷺ نيە.

ئەينا پێغەمبەرى نەخوێندەوار بە (١٤٠٠) ساڵ زياتر لەمەوبەر چوزانێ باس لەم حەقيقەتە زانستيانە بكات. كە ئەمڕۆ لەسەدەى بيست و يەكدا زانست

باسی دەکات.

بەڕێزان: یەکێکی تر لەئایەتە ئیعجازیەکانی قورئان کەباسی زەوی دەکات ئەم ئایەتەیە کەدەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴾ النازعات: ٣٠.

واتە: دواتر زەویشی بەشێوەیەکی هێلکەیی بەدیهێناوە!.. (سُبْحانَ الله) قورئان باسی خڕی زەوی دەکات. بەڵام دەفەرموێ وەکو خڕی تۆپ نیە. بەڵکو وەکو هێلکە وایە. کە ئەمڕۆ زانست سەلماندی کە بەڵێ زەوی خڕیەتیەکەی هێلکەیی یە، نەك تۆپی. ئەمەش بەهۆی ئەوەی کەتیرەی زەوی لەلای هێڵی ناوەڕاستی زەویدا (خَطُّ الاستِواء)دا، بەئەندازەی (٤٢) چل ودوو کیلۆمەتر گەورەترە لەتیرەکەی لەجەمسەرەکانیەوە!

جا بەهۆی ئەم جۆرە خڕیتیەی زەوی یەوە کەلەشێوەی هێلکەدایە، لەهەر جێگایەکی ئەم سەرزەوی یە بیت بەتەخت دێتە بەرچاوت.

تەنانەت لەشوێنێکەوە دەست بەڕۆیشتنی سەرزەوی بکەو هەموو سەرزەوی بگەڕێ و وەرەوە هەمان شوێن. هەموو سەر زەویت بەتەخت دێتە بەرچاو. قورئان دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡأَرۡضَ مَدَدۡنَٰهَا ﴾ الحجر: ١٩.

واتە: زەویشمان ڕاخستوە. (سُبْحانَ الله) وەکو ڕاخەر بەسەریا دەڕۆیت ولەهیچ جێگایەکەوە ناکەوێتە ناو بۆشایی ئاسمانەوە. خۆ ئەگەر زەوی چوارگۆشە، یان سێگۆشە، یان شەش پاڵو بوایە، یان خڕ بوایە وەکو خڕی تۆپ، ئەوا مرۆڤ لەکاتی گەڕان بەسەر زەوی دا دەگەیشتە جێگایەك کە لەبەردەمیا بۆشایی فەزاری دەبینی و دەکەوێتە ناو بۆشایی یەوە.



ئیمانداران: زەوی بەردەوام نیوەی شەوەو نیوەکەی تری ڕۆژە. ئەمەش هەر بەهۆی خڕیەتی شێوە هێلکەیی زەوی یەوەیە.

قورئان باسی ئەوەکات کە زەوی نیوەی شەوەو نیوەکەی تری لەهەمان کاتدا ڕۆژە. وەکو دەفەرموێ: ﴿ يُكَوِّرُ ٱلَّيۡلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيۡلِ ﴾ الزمر: ٥.

واتە: خوای گەورە کەئاسمانەکان وزەوی لەسەر بنچینەی حەق وڕاستی دروست کردوە، بەشێوەی کەوانەیی، شەو بەسەر ڕۆژدا دەهێنێت. بەهەمان شێوەی کەوانەیی ڕۆژیش بەسەر شەودا دەهێنێت. کە ئەمە خۆی بەڵگەیەکی قورئانیە لەسەر شێوازی خڕی زەوی.

وە ئەم ئایەتە ئاماژە بەوە دەکات کەزەوی بەردەوام لەسوڕانەوەدایە. چونکە: (التَّكوير مَعْناهُ اللَّفُ وَالدَّوْران حَولَ الشَّيِ) ..



باشە ئەگەر ئەم قورئانە کەلامی خوای گەورە نەبێ، ئەو پەروەردگارەی کە ڕۆژو زەوی و مانگ وهەموو گەردونی دیار ونادیاری دروست کردوە. کەهەرئەویشە قورئانی ناردۆتە خوارەوە بۆسەر سەرداری پێغەمبەران (وخَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاس). ئایا چۆن پێغەمبەری خواﷺ زانی کە زەوی هێلکەیی یە و زانی نیوەی زەوی ڕۆژە ونیوەکەی تری شەوە؟!

ئایا بەچ ئامێرێك لەبۆشایی ئاسمانەوە سەیری کرد؟! کەهیچ کەس لەو سەردەمەدا ئەوەی نەزانیوە، تەنانەت کەگالیلۆ ووتی: زەوی دەسوڕێتەوە سوتاندیان، لە ئەوروپادا!! ئەمەیان پێ قبوڵ نەکرا!..

بەڵام قورئان فەرموی: ﴿ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ ۚ وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ ﴾ فاطر: ١٣.

واتە: هەرخوایە کەشەو تێهەڵکێشی ڕۆژ دەکات. ڕۆژیش تێهەڵکێشی شەو دەکات. خۆرو مانگی ڕامهێناوە، هەریەکەیان تاکاتێکی دیاری کراو لەسوڕانەوەدایە.

ئا ئەو خوایە پەروەردگارتانە خاوەنی هەموو موڵك و بەدیهاتوەکانە. بەڵام ئەوانەی جگەلەو هاناو هاواری بۆ دەبەن ولێ ی دەپاڕێنەوە تەنانەت خاوەنی توێکڵە تەنکەکەی دەوری ناوکی خورمایش نین.

بەڕێزان: سەرنجی ووشەی (يُولِجُ) بدەن. کەمانای ئەوە دەگەیەنێ کەشەو یان ڕۆژ. ووردە وردە بەرەو کورت بونەوە یان درێژبونەوە دەچێت. تالە ٢١ی کانونی یەکەم دا درێژترین شەوی ساڵەو لە ٢٢ی حوزەیراندا درێژترین ڕۆژی ساڵە، جا ئەگەر زەوی نەجولایە، ئەوا بەردەوام نیوەی دنیا هەرشەو دەبوو. وە بە بەردەوامی نیوەکەی تریشی هەرڕۆژ دەبوو!! کەئەوکات ژیان لەسەر هیچیان وەکو پێویستە نەدەبوو. وەتام وچێژ لەژیان نەدەبینرا. وەشەو و ڕۆژیش یەکسان دەبن لە ٢٣ی مارت و لە ٢٣ی ئەیلول دا.

خوای گەورە بەئاگامان دێنێتەوەو دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَآءٍ ۖ أَفَلَا تَسْمَعُونَ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ ۖ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴾ القصص: ٧١-٧٢.

واتە: ئەی محمدﷺ بڵێ: خەڵکینە هەواڵم بدەنێ ئەگەر خوای گەورە شەوگار بکات بەهەمیشەیی تاڕۆژی قیامەت (هەرڕۆژ نەبێتەوە) چ خوایەکی

**تر هەیە جگە لە (اللّه) بتوانێت ڕووناکیتان بۆ فەراهەم بهێنێت. ئایا ئێوە ئەم ڕاستیانە نابیسن؟!**

**هەروەها پێیان بڵێ: هەواڵم بدەنێ ئەگەر خوا ڕۆژگاری کردە هەمیشەیی لەسەرتان.**

**تا ڕۆژی قیامەت خایاندی، کام خواْ هەیە جگە لە (اللّه). کە شەوگارتان بۆپێش بهێنێت تا ئارامی تێدا بگرن، ئایا ئێوە سەرنجی ئەم دیاردانە نادەن و نایانبینن؟!.**

**لێرەدا ئەگەر یەکێ بپرسێ: ئەی بۆچی هەست بەجوڵەی زەوی ناکەین؟**

**قورئان وەلام دەداتەوەو دەفەرموێ:** ﴿ وَتَرَى ٱلْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِ ۚ صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ ۚ إِنَّهُۥ خَبِيرٌۢ بِمَا تَفْعَلُونَ ﴾ النمل: ٨٨.

**واتە: تۆ کێوەکان دەبینیت، وادەزانیت کەوەستاون وبێ جووڵەن، لەکاتێکدا کەئەوانیش وەکو هەور لەجوڵەدان – چونکە زەوی بەخێرایی هەزار کیلۆمەتر لەسەعاتێکدا بەدەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە، وە هەروەها لەسەرەتای بەرپابونی قیامەتدا کێوەکان وەکو خوری شیکراوە دەبرێن بەئاسماندا وچاڵ و چۆڵی زەویان پێ پڕدەکرێتەوە، ئەمەیە دەستکردی ئەو خوایەی کەهەموو شتێکی بەو پەڕی ڕێکوپێکی دروست کردوە. بەڕاستی ئەو زاتە زۆر ئاگایە. بەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.ئەگەر یەکێ بڵێ، ئەم ئایەتە مەبەستی پێ ی قیامەتە.**

**ئەوا دەڵێین: نەخێر، چونکە: (تَحْسَبُها) بۆ قیامەت نیە. چونکە لەقیامەت دا مەجالی شك وگومان نیە وخوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿ فَبَصَرُكَ ٱلْيَوْمَ حَدِيدٌ ﴾ ق: ٢٢.

**بەمانای ئەوەی کەلەڕۆژی قیامەتدا چاو هەموو شتێك وەکو خۆی دەبینێت. چونکە لەو ڕۆژەدا چاو زۆر تیژە. هەروەها لە قیامەتدا شاخ نامێنێ. وەکو دەفەرموێ:** ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ﴾ طه: ١٠٥

**واتە: ئەی محمدﷺ پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی کێوەکان، کەلەکاتی بەرپابونی قیامەتدا چیان بەسەر دێت؟ تۆ پێیان بڵێ: پەروەردگارم هەڵی دەتەکێنێت و وردو خاشی دەکات.**

**بەلام بۆچی ئێمە هەستی پێ ناکەین کەزەوی ئاوا بەردەوام لەسوڕانەوەدایە؟! لەبەرئەوەی هەرچی شتێك لەسەر ڕووی زەوی هەیە لەگەڵ سوڕانەوەی زەوی دا، دەسوڕێتەوە. هەواو ئاو و خانوەکان و مرۆڤەکان و شاخەکان. هەموویان لەجوڵەدان لەگەڵ جوڵەی زەوی دا. ئەمە لەکاتێکدا خێرایی خولانەوەی زەوی**





بەدەوری خۆیدا لەناوچەی هێڵی ناوەڕاستی زەویدا (خَط الاستواء) دەگاتە (١٦٠٠)کلم لەکاتژمێرێکدا. وە دەگاتە (١٠٦٠٠)کلم/ لەکاتژمێرێکدا لەدەرەنجامی خولانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا.

بەڵام ئێمە وادەبینین کەزەوی جێگیرەو ناجوڵێت، چونکە خۆشمان لەگەڵیا دەجوڵێین، هەروەکو ئەوکەسەی لەناو ئوتومبێلدا دانیشتوەو ئوتومبێلەکە لەڕۆشتنایە. ئەگەر سەیری دەرەوە بکات وائەبینێ کە زەوی یەکە دەڕوات و ئەم کەلەئوتومبێلەکەدایە ناجوڵێ. کە بەپێچەوانەشەوەیە.

- ئیعجازێکی تری زانستی قورئان ئەوەیە کەباسی ئەوەمان بۆ دەکات کەمانگ بۆخۆی هەروەکو زەوی تاریکەو ڕوناکی لەڕۆژەوە وەردەگرێ ودەیداتەوە بەزەوی، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ تَبَارَكَ ٱلَّذِى جَعَلَ فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجًا وَقَمَرًا مُّنِيرًا ﴾ الفرقان: ٦١.

واتە: زۆر گەورەو مەزنە ئەو زاتەی لەئاسماندا چەندەها خولگەی گەورەی بۆ هەسارەو ئەستێرەکان بەدی هێناوە، هەروەها چرایەکی پرشنگدار کە خۆرەو مانگێکی ڕووناکیشی بۆ زەوی دابین کردوە.

هەروەها خوای گەورە لەقورئاندا فەرمویەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلشَّمْسَ ضِيَآءً وَٱلْقَمَرَ نُورًا ﴾ یونس: ٥.

واتە: خوا ئەو زاتەیە کەخۆری کردوە بەسەرچاوەی تیشك وڕووناکیەکی پرشنگدار، مانگیشی کردوە بەسەرچاوەی ڕووناکی.

جا لێرەدا بەوردی سەرنجی قورئان بدەن کەچۆن کاتێ باسی خۆر دەکات. بەچرا وەصفی دەکات، وە ئاشکرایە چراش دووشتی هەیە. هەم گەرمی و هەم ڕووناکی. کە ئەم دوو صیفەتەش هەردوکیان لەخۆردا بونیان هەیە. کەگەرمی وڕووناکی یە. کەڕووناکی وگەرمی بەزەوی دەبەخشێ. ئەمە لەکاتێکا کەخوای گەورە وەصفی مانگ دەکات بە (مُنیراً) چونکە مانگ وەکو ئاوێنە وایە، تەنها ڕووناکی خۆر پێچەوانە دەکاتەوە بۆ زەوی، بەبێ ئەوەی گەرمی بداتەوە.

واتە مانگ ساردەو گەرمی تێدانیە وەکو خۆر. وەهەروەها تاریکیشە وڕووناکیەکەی لەخۆرەوە وەردەگرێت. کەئەمەی قورئان باسی دەکات، بەبێ کەم و زیاد ئەوەیە کەزانایانی فەلەك باسی دەکەن.

لێرەدا پێویستە تێ بینی ئەوەبکەین کەسوپاس بۆ خوای گەورەو کاربەجێ،

کەمانگی وادروست کردوە کەتەنها ڕووناکی دەداتەوە وبۆخۆی گەرمی و ڕووناکی نیە. چونکە ئەگەر مانگیش وەکو خۆر گەرمی وڕووناکی ببوایە. ئەوا شەویش وەکو ڕۆژ گەرم دەبوو، وەشەویش وەکو ڕۆژ ڕووناك دەبوو.

لەکاتی مانگە شەودا ئەو ڕووناکی یە نەرمە جوانەی ئێستا هەیەتی، کە لەخۆرەوە عەکسی دەکاتەوە، نەیدەماو ڕووناکی مانگە شەو وەکو نیوەڕۆی ڕۆژ ڕووناك دەبوو. ئەوکاتە ئیسراحەت و پشوو لەژیاندا، بەتایبەت لەشەودا، کەکاتی ئاسودەبون وحەوانەوە وپشوودانە، نەدەما.. هەزاران هەزار سوپاس بۆ خوای گەورە.

ئیمانداران: یەکێ لەوشتانەی کەبەچاوی خۆمان دەیبینین، بریتی یە لەڕۆژگیران و مانگ گیران. کە لەڕووی زانستی یەوە ڕۆژگیران ئەوکاتە ڕودەدات کەمانگ دەکەوێتە نێوان زەوی وخۆرەوە.

ڕەنگە یەکێ بپرسێ و بڵێ: باشە چۆن مانگ بەری ڕووناکی خۆرمان لێ دەگرێ. لەکاتێکا کەمانگ نزیکەی (٤٠٠) جار لەخۆر بچوکترە؟!

لەوەڵامدا دەڵێن: خۆر لەزەوی دورترە، وەکو لەدوری نێوان مانگ وزەوی. دوری نێوان خۆرو زەوی (٤٠٠) جار زیاترە لەدوری نێوان مانگ و زەوی.

ئائەمە وای کردوە کەخۆرو مانگ لەکاتی خۆرگیرانی تەواودا لەئەندازەوحەجم دا وەکویەك بنوێنن! وە لەوکاتەدا مانگ بەتەواوی دەبێتە بەربەستی نێوان تیشکی خۆر وزەوی. جا پێویستە لەکاتی خۆرگیران دا، سەرنجدانمان لەدیمەنی خۆر لەکاتی گیرانیدا وامان لێ نەکات کەتەماشای بکەین وتوشی ئەو هەموو زەرەر وترسناکیە ببینەوە کە بەوهۆیەوە بەرچاومان دەکەوێت. چونکە تەماشاکردنی خۆر لەکاتی خۆرگیراندا. زەرەرێکی یەکجار زۆر بەچاوی مرۆڤ دەگەیەنێت. بەبێ ئەوەی لەوکاتەدا ڕاستەوخۆ مرۆڤ هەستی پێ بکات، بەڵکو دواتر لێ ی دەردەکەوێت. وەمناڵ دەبێ زیاتر بپارێزرێ، چونکە چاوی ناسکترە.

هەرلەبەر ئەمەشە کەپێغەمبەری خواﷺ نوێژی ڕۆژگیرانی بۆ کردوین بەسوننەت. کەسوننەتە لەنوێژی ڕۆژگیراندا قورئانی زۆری تێدا بخوێندرێ وەزۆر لەسوجدەدا بمێنینەوە. بۆئەوەی تائەم نوێژە، بەو شێوە درێژە دەکەین، خۆر گیرانەکەش تەواو ببێ و لەزەرەرو زیانی تەماشاکردنی خۆر بەدوربین.

چۆنیەتی نوێژی ڕۆژگیران: دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشە بۆمان دەگێڕێتەوە ودەفەرموێ: ئەو ڕۆژەی کەخۆرگیرا. پێغەمبەری خواﷺ هەستا







**نوێژی ڕۆژگیرانی کرد. دوای نوێژ دابەستن وخوێندنی سورەتی فاتحە. قورئانێکی زۆری خوێند. لەفەرمودەی إبنُ عباس دا هاتوە کەنزیکەی سورەتی (البَقرة) قورئانی تێدا خوێند. پاشان چوە ڕکوع وزۆر زۆر لەڕکوعدا مایەوە. پاشان سەری بەرزکردەوەو فەرموی: سَمِعَ اللهُ لِمن حَمِدَهُ. پاشان هەربەپێوە وەستاو (نەچوە سوژدە) بەڵکو دەستی کردەوە بەقورئان خوێندن و قورئانێکی زۆری خوێند. بەڵام هەندێ کەمتر پاشان چووەوە ڕکوع بلام کەمتر لەڕکوعی پێشوو. پاشان کە لەڕکوع هەڵسایەوە، ئەمجارەیان چوە سوژدەوەو زۆر سوجدەیەکی درێژی برد. پاشان لەڕکاتی دوەمیشدا بەهەمان شێوەی کرد. پاشان سەلامی دایەوە. ئەم فەرمودەیە، رَواهُ البُخاری (١٠٤٧) ومُسْلِم (٩٠١). کەواتە نوێژی ڕۆژگیران. لەدووڕکاتدا، چوار ڕکوعی تێدایە.**

**کەجیاوازە لەهەموو نوێژەکانی تر. لێرەدا ئەو پرسیارەش دەکرێ کە: ئایا بۆچی نوێژ دەکەین بۆ ئەم دیاردەیەو نوێژەکەشی بەشێوەیەکە کە لەهەموو نوێژێکی تر جیاوازە؟!**

**لەوەڵامدا دەڵێین: واللهُ أعْلم:**

**١- تاوەکو موسڵمان بیسەلمێنێ کەوا شایەتی دەدەم کەئەم ڕۆژو مانگ و ووناکییە هی خوایەو ڕۆژو مانگ بۆخۆیان مەخلوقی خودان وخزمەتکاری مرۆڤن و نابێ مرۆڤ لێیان بپاڕێتەوەو سوژدەیان بۆ ببات.**

**بەڵکو دەبێ سوژدە تەنها بۆ خالیقی کەون و ڕۆژو مانگ ببرێ، کەئەمەش بەرزی و گەورەیی مرۆڤی تێدایە. خوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِ ٱلَّيْلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ لَا تَسْجُدُوا۟ لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴾ فصلت: ٣٧.

**٢- بۆیە ئەونوێژە وادرێژە تاوەکو لەوماوەیەدا، هەرخەریکی نوێژکردن بین وئەم نوێژە زیاتر لەسەعاتێك دەخایەنێ. وە تائەوکاتەش ڕۆژگیرانەکە نامێنێ وچاوی نوێژ خوێنەکە لەمەترسی تەماشاکردنی ڕۆژ بەگیراوی دەپارێزرێ.**

**(سُبْحانَ الله). ئەم دینەی ئێمە. ئەم ئیسلامە ئازیزەمان هەموی زانستە. عیبادەتەکەشی لەسەر بنەمای زانستی بنیات نراوە وڕۆژ بەڕۆژ زانست گەورەیی ئەم ئیسلامە دەردەخات وەگەورەیی ئەم ئیسلامە لەوەدایە کەهەرگیز لەسەر خورافیات و عاطیفەیی، بێ بنەمای زانستی دانەمەزراوە. چونکە شتی خەرافی و عاطفی ودور لەڕاستی چەسپاوی زانستی دوای چەند ساڵ وسەدەیەك پوچەڵ دەبێتەوە.**

پێشەوایانی فەرمودە. بوخاری ومسلم، دەگێڕنەوە کەکاتێ ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەری خواﷺ لەسەرەمەرگدا بوو. ئیبراهیمی لەئامێز گرت وبۆنی پێوەکردو بەخۆیەوە گوشی و ماچی کرد (فَأَخَذَ رَسُولُ اللهِﷺ إبْراهيم، فَقَبَّلَهُ، وشَمَّهُ). ئەوەبوو لەباوەشی پێغەمبەری خوادا. ئیبراهیمی منالْ کەتازە کەوتبوە گرِوگالْ. وەفاتی کرد،(فجعلت عَينا رَسُولِ اللهِﷺ تَذْرِفانِ) کەوەفاتی کرد. پێغەمبەری خواﷺ هەردوو چاوی پڕبوو لەفرمێسك و فرمێسك بەچاوی پیرۆزی دا هاتە خوارەوە. عبدالرحمن ی کوڕی عەوف فەرموی: (وأَنْتَ يارَسُولَ اللهِ؟!) ئەوە چی یە تۆش دەگری ئەی پێغەمبەری خواﷺ ؟! پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: (يا بْن عَوْف إنَّها رَحْمَةٌ) ئەی کوڕی عەوف. ئەم گریان و فرمێسك باراندنە. ئەوە ڕەحم وسۆزو بەزەیی یە.

پاشان فەرموی: (إنَّ العَيْنَ تَدْمَعُ والقَلْبَ يَحْزُنُ، ولانَقُولُ إلا مايُرْضِي رَبَّنا. وإنا بِفِراقِكَ ياإبراهيمُ لَمَحْزُونُونَ).

واتە: بەڕاستی لەکاتی ئاوادا، لەوکاتەدا کە کۆرپەی چاوگەش، ئومێدی دایەو بابە چاوە جوانەکانی بۆ دواجار لەیەك دەنێ ودوا هەناسە دەدات و ئەو منالە کەهەردەم لەزەردەخەنەو جموجۆلْ دابوو. ئێستا بێ گیان بوە.

مرۆڤ لەم کاتەدا خۆی بۆ ناگیرێ و چاوی فرمێسك دەڕێژێ ودلْی مەحزون دەبێ و بەلاّم شتێ نالْێین ئەوەنەبێ کە پەروەردگارمان پێ ی ڕازی یە. بەڕاستی ئەی ئیبراهیم ئێمە بەجیابونەوەی تۆ لێمان مەحزون ودلْ بەخەمین..

بەلْێ، تەواوی شاری مەدینە، بەغەم وپەژارەی پێغەمبەری خوا دلْبەخەم بوون و خەفەتبار بوون. قەدەری خوای گەورە لەوکاتەدا خۆریش گیرا. دنیا تاریك بوو. صەحابەکان وایان زانی کە ئەو خۆرگیرانەش لەبەرخاتری مردنی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەرﷺ ڕووی داوە. ڕۆژیش بەشداری لەماتەمینی مالْ و دلْی پێغەمبەرداﷺ دەکات.

جا ئەگەر حەزرەتی محمد المصطفیﷺ پێغەمبەری خوا نەبوایە. باشترین هەل و دەرفەتی ڕەخساو بوو. بۆئەوەی کەبیقۆزێتەوە بۆ ئەوەی پلە وپایەی خۆی بەهێز بکات و بلْێ، ڕاستە من ئەوەندە گەورەم. ئەوەتا خۆریش لەئاسمانەوە بەشداری پرسەم دەکات.

بەلاّم نەخێر، ئەو پاشایەکی دونیایی دونیا خۆر نی یە. ئەوە پێغەمبەری خوایەﷺ. ئەو ئەمینداری وەحی ئاسمانە. بۆیە ڕەتی ئەوەی کردەوە کەڕاستیە





زانستییەکان تێکەڵ بەهەست وسۆزی موسڵمانان بکات. بۆیە یەکسەر چوە سەرمینبەرو ووتاری داو فەرموی: (إِنَّ الشَّمْسَ وَالقَمَرَ آيَتانِ مِن آياتِ اللهِ عَزَّوَجَل، لا يَخْسِفانِ لِمَوتِ أَحَدٍ وَلا لِحَياتِهِ، فَإِذا رَأَيْتُم ذلِكَ فَادعُوا اللهَ وَكَبِّرُوا وَصَلُّوا وَتَصَدَّقُوا). رَواهُ البُخاري (١٠٤٤) وَمُسْلِم (٩٠١).

واتە: بەڕاستی ڕۆژ وومانگ، دوو نیشانەو بەڵگەن لەنیشانەو بەڵگەکانی خوای گەورە (عَزَّوجَل) لەبەرمردنی هیچ کەس و لەدایك بوونی هیچ کەس ناگیرێن و تاریك نابن. هەرکاتێ ئێوە ئەوەتان بینی، کەخۆرگیرا، یان مانگ گیرا. لەخوا بپاڕێنەوەو یادی خوابکەن و نوێژ بکەن وخێر وخێرات بکەن.

بەم شێوەیە ئەو صادقی ئەمینە، ئالەوکاتەدا ئەو ڕاستی یە زانستی یەی پێ ڕاگەیاندین، کە مانگ گیران و ڕۆژگیران پەیوەندی بەمردن و لەدایك بونی کەسەوە نی یە. هەزاران صەلات و سەلامی خوای لەسەربێ. اللّهُمَّ صَلِّ عَلى سَيِّدِنا محمد وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلِّمْ..


سەرچاوەکان

١- قورئانی پیرۆز.

٢- پوختەی تەفسیری قورئان ، محمد مەلا صاڵح بامۆکی.

٣- تەفسیری ئاسان ، بورهان محمد أمین.

٤- مَوسُوعَة الاعجاز العِلمي ، يوسف الحاج أَحْمَد ص٣٢١.

٥- مَوسُوعَة الاعجاز القُرآني ، د.نادِيَة طَيَّارَة ج٢ ، ص٢٩، ص١١٧، ص٩٤، ص٣٩، ص١٣٧، ص١٤٢، ص١٢٨.

٦- صَحيح فِقهِ السُّنَة ، أبومالِك كَمال بن السَّيد سالم ، ج١ ، ص٤٣٥.

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجْمَعين.

ئيمانداران: پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ دەفەرموێت: (من جاءَ إلى مَسْجِدي هذا، لَمْ يَأْتِهِ إلا لِخَيْرٍ يَتعَلَّمهُ أوْ يُعَلِّمَهُ، فَهُوَ بِمنزلَةِ المُجاهِدِ في سَبيلِ اللهِ، وَمن جاءَ لِغَيرِ ذلِكَ فَهُوَ بِمَنزلَةِ الرَّجُلِ يَنظُرُ إلى مَتاعِ غَيرِهِ) حَديثٌ صَحيح - رَواهُ ابنُ حِبّان وَصَحَّحَهُ الالباني (٦٠٦٠) في صَحيحِ الجامِعِ.

واتە: هەرکەسێك بێت بۆ ئەم مزگەوتەی من (مزگەوتی مەدینە) ، تەنها بۆ فێربونی خێرو چاکە هاتبێ کەفێری ببێ، یان فێری کەسانی تری بکات. ئەوە ئەوکەسە لەپلەی ئەوکەسەدایە کەلەپێناوی خوای گەورەدا جیهادو تێکۆشان دەکات. وەهەرکەسێك بۆ غەیری فێربون وفێرکردنی زانست وخێر بێتە مزگەوتی من. ئەوە پلەی وەکو ئەوکەسە وایە کەتەماشای کەلوپەلی کەسانی تردەکات.. دیارە تەماشاکردنی کەلوپەلی خەڵکیش هیچ سودێك بەو ناگەیەنێت جگە لەکات بەفیرۆچون وچاو ودڵ ماندو بوون نەبێت.

خۆشەویستان: مزگەوتی پێغەمبەری خواﷺ ئەو مزگەوتە پیرۆزمیە کەلەدوای مزگەوتی حەرامِ لەمەککە، گەورەترین مزگەوتی سەررِوی جیهانە. یەك نوێژ لەمزگەوتی پێغەمبەردا -خوای گەورە بەنسیبمانی بکات- خێر وپاداشتی هەزار نوێژی هەیە کەلەغەیری ئەو مزگەوتەدا بکرێت. جا مزگەوتی پێغەمبەری خواشﷺ وەکو مزگەوتی کەعبە، پێشەواو پێشەنگی مزگەوتەکانی تری سەرزەوین. جابەم پێ یە چۆن هاتوچۆکردنی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەیە دەبێتە مایەی خێرو بەرەکەت بۆکەسی هاتوچۆکار. کەبەنیەتی فێربونی زانستی شەرعی یان فێرکردنی خەڵکی بێ. بەهەمان شێوە بۆ مزگەوتەکانی تریش لەسەر زەوی دا، هەروایە وئێمەی موسڵمان کەسوپاس بۆخوا هاتوچۆی مزگەوت دەکەین. دەبێ بەئاگابین، هاتنمان تەنهاو تەنها بۆ عیبادەت و فێربونی زانستی شەرعی و ووشەی جوان و خێربێت.

ئەینا تەنها ماندوبونمان بۆ دەمێنێتەوە. بۆیە هەرکەلەماڵەوە هاتینە دەرەوەو بەرەو مزگەوت هەنگاومان نا، بائاگاداری نیەتمان بین و لەمزگەوتیشدا ئاگاداری کردەوەو رِەفتارمان بین و بەقسە وباسی دونیاو کاروباری لابەلای دور لەدینەوە خۆمان خەریك نەکەین.

بەڵێ جومعە وجەماعەت ومزگەوت ونوێژ بۆ بەختەوەری مرۆڤە لەدونیاو لەقیامەتدا بەڵام بەمەرجێك بەوشێوەیە عیبادەتی خوا بکەین. کەخوای

پەروەردگارو پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی بۆیان باس کردوین. بۆئەم مەبەستەش پێویستە ئاگامان لەم (٥) پێنج بنەمایە بێت.

١- بەردەوام بوون لەسەر ئەو عیبادەت وخواناسیەی ئەنجامی دەدەین. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (أَحَبُّ الاعمالِ إلى اللهِ تَعالى أَدْومُها وإنْ قَلَّ) رَواهُ مُسْلِم.

واتە: خۆشەویسترین کردەوەکان لەلای خوای گەورە، ئەومیانە کەبەردەوام بێت هەرچەندە کەمیش بێت.

بۆ نموونە: ئەگەر تۆ شەوی دوو ڕکات شەونوێژ بکەیت. بەڵام هەموو شەوێك بیکەیت، ئەوە باشترەو لای خوای گەورە خۆشەویسترە، لەوەی کەماوەی حەفتەیەك شەوی (٢٠) ڕکات شەونوێژ بکەیت. بەڵام دوای ئەوە ساردبیبتەوەو هەر واز لەشەونوێژ بهێنیت.. زۆرکەس هەیە، ماوەیەك زۆر گەرمە لەسەر عیبادەت و هاتوچۆی مزگەوت. تەنانەت گلەیی لەوکەسانە دەکات کەکەمتر هاتوچۆی مزگەوت دەکەن، بەڵام دوای ئەو ماوە گەرم و گوڕیە ساردبونەوە ڕوی تێ دەکات. کەبەردەوامە لەسەری، ئەگەر کەمیش بێت.

٢- خۆپاراستن و پەناگرتن بەخوای گەورە بۆ پاراستن لەوەسوەسە ودڵەڕاوکێ و دڵ بەگومانی. وەکو وەسوەسەی ناونوێژ. یەکێ لەصەحابەکانی پێغەمبەر ﷺ ناوی (عثمانی کوڕی ئەبی العاص) بوو. عەرزی پێغەمبەری خوای کرد:

(يارَسُولَ اللهِ، إنَّ الشَّيْطانَ حالَ بَيني وبَيْنَ قِراءتِي يَلبِسُها (يخلِطُها عَلَيَّ). فَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ذاكَ شَيْطانٌ يُقالُ لَهُ (خِنزَب) فَإذا أَحْسَسْتَهُ فَتَعَوذْ باللهِ منهُ، واتْفَل عَن يَسارِكَ ثَلاثاً. قالَ عُثمان: فَفَعَلْتُ ذلِكَ، فَأَذْهَبَهُ اللهُ عَزَّوَجَلْ عَنّي) رَواهُ مُسْلِمْ (٢٢٠٣).

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، بەڕاستی شەیطان لەناو من ونوێژەکەمدا پەردە دادەنێ و مەشغوڵم دەکات، وەلەکاتی قورئان خوێندنەکەمدا، لێم تێك دەدات. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئەوە شەیطانێکە پی دەوترێ (خینزەب)، جاهەرکاتێ هەستت پێ کرد. یەکسەر پەنابگرە بەخوای گەورە کەبت پارێزێ لەوەسوەسەی ئەو شەیطانە. وە بەلای چەپتدا سێ تف بکە.

عوثمان دەڵێ: ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێ ی ووتم جێ بەجێم کرد. خوای گەورە ئەو وەسوەسەی لەسەر لابردم.

لەشەرحی عەقیدەی طحاوی دا دەفەرموێ: (ودينُ اللهِ في الارضِ والسَّماءِ واحِدٌ،



وهُو دينُ الاسلام. وهُو بَينَ الغُلُوِّ والتَّقصيرِ).

واته: ئاینی خوا لەزەوی و ئاسماندا هەریەك ئاینە. کەئاینی ئیسلامە، ئیسلامیش ئەو دینەیە. کە لەنێوان توندڕەوی و ڕۆچون و زیادەڕەوی وکەم وکورتی وگوێ پێ نەداندایە.

زانای گەورەی ئیسلام (إبنُ عَقيل) دەفەرموێ: جارێك پیاوێك هات بۆلام و پێ ی ووتم: (أَنْغَمِسُ فِي الماءِ مِراراً كَثيرَةً وأَشُكُ: هَلْ صَحَّ لِي الغُسْلُ أَمْ لا؟! فَما تَري فِي ذَلِكَ؟!).

واته: ئەو پیاوە پرسیاری لێ کردم و ووتی: من چەند جارێك لەسەریەك خۆم نقومی ئاو دەکەم کەچی دوای ئەو هەموو جارە کە خۆم لەئاوەکەدا نقوم دەکەم، هێشتا هەر لەگوماندام و دڵم ئاسودە نابێت کەئایا بەتەواوی لاشەم تەڕبووە یان نا؟!

ئایا جەنابت لەوبارەیەوە چی دەفەرموی؟! إبْنُ عَقيل دەفەرموێ: منیش پێم ووت: (إِذْهَب، فَقَد سَقَطَتْ عَنكَ الصَّلاةُ). وتم: هەستە بڕۆ، تۆ نوێژت لەسەر لاچووەو پێویست ناکات نوێژ بکەی!. کابرا بەسەرسوڕمانەوە ووتی: چۆن؟! ووتم: بەبەڵگەی ئەو فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کەفەرمویەتی: (رُفِعَ القَلَمُ عَنْ ثَلاثَةٍ، المَجْنُونُ حَتَّى يَفيقَ، والنَّائِمُ حَتَّى يَستَيقِظَ، والصبِيُّ حَتَّى يَبْلُغَ) واته: قەڵەم هەڵگیراوە لەسەر سێ کەس وعیبادەتیان لەسەر واجب نیە وبەنەکردنی تاوانبار نابن. ئەوانیش: شێت هەتاوەکو شیفای بۆدێ و بەئاگادێتەوەو عەقڵ وهۆشی بەکاردەکەوێتەوە. نوستوش هەتا بەخەبەر دێت. منالیش هەتا بالغ دەبێت. دەی تۆ لەشێتەکانی چونکە ئەوەی بچێتە ئاوەوەو خۆی تێدا نقوم بکا هێشتا پێ ی وابێ تەڕنەبووە ئایا شێتە یان نا؟! بێگومان نوێژیش لەسەر شێت واجب نەماوە!.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (صِنْفانِ مِن أُمّتي لاتَنالُهُما شَفاعَتي، سُلْطانٌ ظَلُومٌ غَشُوم، وغالٍ فِي الّدينِ. يَشْهَدُ عَلَيْهِم ويَتَبَرّأُ منهُم) - السُّنَةِ لابنِ أَبِي عاصِم، وقالَ الالْباني: صَحيحٌ.

واته: دوو دەستە وتاقم هەن لەئومەتم. کەشەفاعەتی من نایانگرێتەوە: کاربەدەستی زاڵمی غەشکار لەمیللەتەکەی. هەم زوڵمیان لێ دەکا وهەم دەیانچەوسێنێتەوە، هەم غەشیان لێ دەکات وسەروەت وسامانی ئەو میللەتە بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی بەکاردەهێنێت. هەروەها ئەوکەسەش کەزیادەڕەوی دەکات لەدین داو ئەوەی خوای گەورە فەرزی نەکردوە، ئەم لەسەرخۆی پێویست

دەكات و سەرەنجام بۆشی ناكرێت.

ئیماندارانی بەڕێز: ئەوكەسانەی كەتوشی وەسوەسە بون، باگوێ لەپێغەمبەری دڵسۆزمان ﷺ بگرن كە فەرمویەتی: (إِنَّ اللهَ تَجاوَزَ لأمَّتي عَما وسْوَسَت، أو حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسها مالَم تعْمَل بِهِ أَوْ تَكَلَّم). رَواهُ البُخاريُّ.

واتە: خوای گەورە سەرفینەزەری كردوە بۆ ئوممەتەكەم لەوشتانەدا كەوەسوەسەیان بۆ دروست بوە تێیدا.

بۆ نموونە: دەست نوێژی شۆردوە زۆر بەجوانی، كەچی كەلەدەست نوێژەكە تەواو دەبێ و خەریكە نوێژ دادەبەستێ، دڵی دەكەوێتە گومانەوە، كە ئایا تۆ بڵێ ی ئانیشكم، پاژنەی پێم. فلان شوێنم شۆردوە یان نا!! ئەمە بۆی مەگەڕێوە وئەگەر تەڕیش نەبوبێ خوای گەورە چاوپۆشیت لێ دەكات، ئەوەی پێ خۆشترە لەوەی كەبگەڕێتەوە جارێكی تر بیشۆریتەوە وخۆت توشی وەسوەسە بكەی. وەخوای گەورە چاوپۆشی كردوە لەهەموو ئەو خەتەرەو خەیاڵاتانەی كەبەدڵی مرۆڤدا دێن، مادام هەرلەناخی دڵیەو نەیكردوە، بەكردەوەیان بەقسە دەری نەبڕیوە.

بۆ نموونە: كەسێك لەخەیاڵیا كەسێك دەكوژێ، ماڵی دەدزێ. ئەمە هیچ گوناهێكی لەسەرنیە. هەتا نەیكات بەكردەوە. هەرچەندە پێویستە مرۆڤ خۆشی لەخەیالاتی خراپ بپارێزێ. هەروەها كەسێك لەدڵی خۆیا وائەزانێ ژنەكەی خۆی تەڵاق داوە. ئەوە ئەم كەسە چونكە بەقسە دەری نەبڕیوە. هیچ كاریگەری بۆسەر تەڵاقەكەی نابێت و تەڵاقی پێ ی ناكەوێ. هەزاران سوپاس بۆ لوتف وكەرەمی خوای گەورە.

هەروەها ئەگەر كەسێك لەمزگەوتا بوو، دەست نوێژی هەبوو، كەچی كەوتە گومانەوەو وای زانی دەست نوێژی شكاوە بەوەی كەبایەكی لێ بۆتەوە. بەڵام گوێی لەهیچ دەنگێك نەبوە. ئەوە ئەو پرسیارە صەحابەكان لەپێغەمبەری خوایان پرسی ﷺ : (الرَّجُلُ يَجِدُ فِي الصَّلاةِ شَيئاً أَيَقْطَعُ الصَّلاةَ؟!)

واتە: كەسێك لەناونوێژدا هەست بەشتێك دەكات كەبایەكی لێ بۆتەوە. ئایا نوێژەكەی ببڕێ وبڕوات دەست نوێژەكەی تازەبكاتەوە؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: فَلا يَنْصَرِفُ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتاً أَوْ يَجِدَ ريحاً). رَواهُ الهَيْثَمي.

واتە: نەخێر. بانوێژەكەی نەبڕێت ولەڕیز نەچێتە دەرەوە، هەتاوەكو گوێ





ی لەدەنگێك نەبێت یان بۆنێكی نەكردبێت.

٣- إحْذَرْ من تَحَوُّلِ العِبادَةِ إلى عادَةٍ: ئاگاداربە كەعیبادەتت لێ نەبێ بەعادەت. وریابە نوێژەكەت نەبێ بەعادەت. هاتنت بۆ جومعە نەبێ بەعادەت، وەكو نان خواردنی لێ نەیەت. بەداخەوە هی واهەیە بۆنان خواردنێك هەوڵی ئەوە دەدات و چاو ورد دەكاتەوە كەمەتعەمێكی باشی دەست بكەوێت. كەچی بەداخەوە بۆ جومعەو ووتاری بەهێز وبەپێز ئەوەندە هەوڵ نادات. جالەبەرئەوە پێویستە موسڵمان ئاگاداربێت كەئەمری خوا بێ مشت ومڕ جێ بەجێ دەكرێ و وەدڵنیاش بێ كەئەو عیبادەتە بۆ سوودی لاشەتە.

زانای ناودار (د.محمد راتب النابلسی) لەكتێبەكەی خۆی دا (أیاتُ الله في الانْسان لا٣٧٠) دەفەرموێ: ئافرەتێكی موسڵمانی خەڵكی دیمەشقی سوریا. توشی سەرئێشەیەكی زۆر توند بوو كەپێ ی دەوترێ (داءُ الشَقیقَة) لەسوریا چارەسەری نەبوو، بەمەبەستی چارەسەر ڕووی لەیەكێ لەوڵاتانی خۆرئاوا كرد. ئەو دكتۆرەی كەئەم ئافرەتە بۆ چارەسەر چوەلای كەسێك بوو. زۆر دوور لەدین، هیچ بڕوای بەخوای پەروەردگار نەبوو (پەنا بەخوا) بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە. ئەوەیە كاتێ كەئەو پزیشكە ناموسڵمانە. لەوئافرەتە موسڵمانە دەپرسێت: لەچ وڵاتێكەوە هاتوی؟ ئافرەتە موسڵمانەكە دەڵێ: لەسوریاوە. دكتۆرەكە دەڵێ: نوێژ دەكەیت؟! ژنەكە دەڵێ: نەخێر نوێژ ناكەم! دكتۆرەكە دەڵێ: بڕۆ نوێژەكانت بەرێكوپێكی بكە. ئەو سەرئێشە توندەت نامێنێ!!

ئەو ئافرەتە موسڵمانە سەری سوڕدەمێنێ لەقسەی ئەو دكتۆرەو خەریك دەبێ هاوار بكات و بڵێ: باشە من بەهەزاران لیرەم سەرف كردوەو سواری فڕۆكە بوم و لەئاسیاوە هاتۆتە ئەوروپا. كەچی دەرمانەكەی ئەوەبێ كەدكتۆر پێ ی بڵێ: نوێژەكەت بكە. بەڵام كاتێ كە لێی دەپرسێ: باشە جەنابی دكتۆر شەقیقە چ پەیوەندیەكی بەنوێژكردنی موسڵمانانەوە هەیە؟! دكتۆر دەڵێ: یەكێ لەهۆیەكانی توش بون بەشەقیقە ئەوەیە كەدەماری شاخوێنبەر، كەخوێن دەبات بۆ دەماغ لاواز دەبێت.

جا مرۆڤ كاتێ سەری دەخاتە سەرزەوی ونێوچەوانی لەگەڵ پەنجەكانی قاچی یەكسان دەبێت. وەكو سوجدەی نوێژ، ئەو دەمارە خوێنبەرە فراوان دەبێت وخوێن بەپڕتەو بەرەو دەماغ دەڕوات ومرۆڤ لەسەر ئێشەی توند

(شەفیقە) دەپارێزێ.

بەڵێ ئیماندارانی بەڕێز. سوجدە، ڕکوع، دەست نوێژ، هەمویان لەبنەڕەتدا عیبادەتن و مایەی نزیك بونەوەی مرۆڤن لەپەروەردگاری. وە پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ خوای گەورەدا دروست دەکەن. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر زانایانی پسپۆڕ دیراسەی بکەن، بەتایبەت زانایان و پسپۆڕانی بواری لاشەی مرۆڤ، لەبوارەکانی ڕیخۆڵەو هەناودا، وەلەبوارەکانی کۆئەندامی سوڕانی خوێن ودەماردا. بەڕاستی شتی زۆر سەرسوڕهێنەریان دەست دەکەوێت وکاریگەری ئەم عیبادەتەیان لەسەر لابردنی نەخۆشی بۆ ئاشکرا تر دەبێت.

٤- ئەی ئیمانداری بەڕێز، بۆئەوەی کەتام و چێژ لەعیبادەت وەربگری. ئەوا بەقسەی شەرع عیبادەت بکە نەك بەهەواو ئارەزوی خۆت.

بۆ نموونە: ئەگەر دەچویت بۆ مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت، لەوکاتەدا قامەت دەکرا. تۆ بەهێواشی برۆو هەنگاو بنێ، نەك بۆئەوەی فریا بکەوی، بەپەلە پەلەو ڕاکردن بڕۆی وخۆت توشی ئازارێك بکەی.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (إذا سَمِعْتُمُ الاقامَةَ فَامْشُوا إلى الصَّلاةِ، وعَلَيْكُمْ بالسَّكينَةِ والوقارِ ولا تُسْرِعُوا، فَما أدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا، ومافاتَكُمْ فَأَتِمُّوا) رَواهُ البُخاري.

واتە: ئەگەر گوێتان لەقامەتی نوێژ بوو. ئەوە بڕۆن بەرەو نوێژەکە، بەڵام ئاگاداربن کەبەهێمنی و سەنگینیەوە بڕۆن و پەلە پەل مەکەن و ڕامەکەن!، جا ئەوەی کەفریاکەوتن ئەوە بیکەن لەگەڵ پێش نوێژەکەدا ونەوەش کەفریانەکەوتن، دوای سەلام دانەوەی ئیمام هەستنەوە بۆخۆتان تەواوی بکەن.

یەکێ دەپرسێ و دەڵێ: باشە بۆیە من بەپەلە دەڕۆم بەرەو نوێژی جەماعەت، بۆئەوەی کەفریای هەموو نوێژەکە بکەوم وخێری تەواوم بەنسیب بێت؟!

بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إذا كانَ يَعْمُدُ عَلى الصَّلاةِ، فَهُو في الصَّلاةِ).

دەفەرموێ: پەلەمەکەو بەهێواشی و سەنگینی برۆ. چونکە هەریەکێ لەئێوە، کاتێ کەبەنیەتی نوێژی جەماعەت لەماڵ دێتەدەرەوە. ئەوە وەکو لەناو نوێژدابێ وایەو هیچ لەخێرو پاداشتی نوێژە جەماعەتەکەی کەم نابێتەوە، بەمەرجێ بەئەنقەست خۆی دوانەخستبێ!.

بەڕێزان: یەکێکی تر لەوشتانەی کەهەندێك لەموسڵمانانی ئەهلی مزگەوت، ئەنجامی دەدەن و پێچەوانەی شەرعە ئەوەیە کە: کاتێ کەسێك دێتە مزگەوتەوە،





لەوکاتەدا وا قامەت دەکرێ. کەچی ئەم بەپەلە دەست دەکات بەنوێژی سوننەت و بەحیسابی خۆی فریای نوێژە فەرزەکەش دەکەوێت. بەڵام بێئاگا لەوەی کەپێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (إذا أُقيمَتِ الصَّلاةُ، فَلا صَلاةَ إلا المَكْتُوبَة) رَواهُ مُسْلِم. واتە: هەرکاتێ قامەت کرا بۆ نوێژ. ئەوا هیچ نوێژێك ناکرێت. تەنها نوێژی فەرز نەبێت.

ئیمانداران: یەکێکی تر لەوشتانەی کەپێویستە موسڵمان لێ ی بەئاگابێت، بەتایبەت بۆ کەسانی گوندنشین وبەتایبەتتر ئەوکەسانەی کەکشتوکاڵ دەکەن یان ئاژەڵ داری دەکەن زیاتر. ئەویش ئەومیە کاتێ کەلەدەرەوەی ماڵن و لەدەشت و بناری شاخ دان. زۆر ئاگاداری نوێژەکەیان بن و هەوڵبدەن هەر لەودەشتە لەناو کشتوکاڵەکەیان. یان لەلای ئاژەڵەکەیان لەدەشت وکێو نوێژەکەیان بکەن و هەڵی نەگرن بۆئەوەی بگەنە ماڵەوەو ئەمجا لەماڵەوە نوێژەکەیان بکەن. چونکە بەحیسابی خۆیان لەماڵەوە پاکوخاوێنترە، یان جل و بەرگیان خاوێنترە ودەست نوێژیان پوخت ترە. لەبەرئەوەی کەپێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (الصَّلاةُ في جَماعَةٍ تَعْدِلُ خَمْساً وعِشرينَ صَلاةً، فَإذا صَلاها في فَلاةٍ، فَأَتَمَّ رُكوُعَها وسُجُودَها، بَلَغَتْ خَمْسينَ صَلاةً) رَواهُ أَبُو داود وصَحَّحَهُ الالْباني.

واتە: نوێژی بەکۆمەڵ بەرامبەرە بەبیست و پێنج نوێژ، جا ئەگەر کەسێك (بەهۆی کاروکەسابەتەوە) نەیتوانی لەئاوەدانی نوێژەکەی بەجەماعەت بکات — ولەدەشت وبیابان و بناری شاخەکاندا نوێژەکەی کرد. وەنوێژێکی زۆر تێرو تەواوی کردو ڕکوع و سوجدەی بەتەواوی بردو پەلەی تێدا نەکرد. ئەوە پاداشتی ئەونوێژەی ئەوکەسە لەودەشتەدا. دەگاتە پەنجا نوێژ!! هەزاران هەزار سوپاس بۆ لوتف و مەرحەمەتی خوای گەورە.

نوێژی کەسێك کەشوانی ئاژەڵە: پێغەمبەری خوا ﷺ موژدەیەکی گەلێك گەورە و دڵخۆشکەر دەداتە ئەوکەسانەی کەپیشەی پێغەمبەرانیان هەیە. کەشوانی مەڕو ماڵاتەو دەفەرموێ: (يُعْجِبُ رَبّكَ مِن راعي غَنَمٍ في رَأسِ شَظِيَّةٍ، يُؤَذِّنُ بالصَّلاة ويُصَلِّي، فَيَقُول الله عَزَّوَجَلَ: أُنظُرُوا إلى عَبْدي هذا، يُؤَذِّنُ ويُقيمُ الصَّلاة، يَخافُ مِنِّي قَدْ غَفَرْتُ لِعَبْدي وأَدْخَلْتُهُ الجَنَّةَ). رَواهُ أَبُو داود..

واتە: خوای گەورە موعجەبەو خۆشحاڵە بەکەسێك کەشوانی مەڕوماڵاتە، لەسەر گردو تەپۆڵکەو لوتکەی شاخێکەو خەریکی لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانیەتی

كاتى بانگ دێ و وەختى نوێژە. هەڵدەستێ بانگ دەدات ودەنگى زولاڵى (اللهُ أكبر) بەسەر چيا وكۆساران ودەشت ودەردا پەخشى دەكاتەوە. وەنوێژێكى زۆر رێكوپێك دەكات، خواى گەورە دەفەرموێ: بڕوانن (ديارە بەفريشتەكان دەفەرموێ) بڕوانن بۆ ئائەم عەبدەم، كەچۆن بانگى داو نوێژێكى چەند پوخت وجوانى ئەنجامدا. لەترسى من، خۆكەس چاوى لێ ى نيە، تەنها لەبەرجێ بەجێ كردنى ئەمرو فەرمانى من ئەوبانگ ونوێژەى ئەنجامدا. ئەوامنيش بڕيارمدا كەلەو بەندەيەم خۆش ببم و بيخەمە بەهەشتەوە!.

موژدەيەكى ترى پێغەمبەرى خوا ﷺ كەدەفەرموێ: (إذا كانَ الرَّجُلُ بِأَرْضٍ قِيٍّ، فَحانَتِ الصَّلاةُ، فَلْيَتَوَضَأ، فَإنْ لَمْ يَجِدْ ماءً فَلْيَتَيَمِمْ، فَإنْ أَقامَ صَلّى مَعَهُ مَلَكاهُ، وإنْ أَذَّنَ وأَقامَ، صَلَّى خَلْفَهُ من جُنُودِ الله مالايُري طَرَفاهُ). رَواهُ عبدالرَّزاق وصَحَّحَهُ الالْبانيُّ في صَحيح الترغيب: ٢٤٩.

واتە: ئەگەر كەسێك لەدەشتاييەكدا بوو، وەختى نوێژ هات، هەستا دەست نوێژى شت. ئەگەر ئاوى دەست نەكەوت تەيەمومى كرد. ئەوا ئەگەر قامەتى كردو نوێژى كرد. هەردوو فريشتەكەى سەرشانى كەبەردەوام لەگەڵيدان نوێژى لەگەڵ دەكەن، وە ئەگەر بانگى داوقامەتى كرد ونوێژەكەى كرد. ئەوا لەدوايەوە ئەوەندە لەسەربازەكانى خوا، لەدوايەوە نوێژ دەكەن كەئەمسەراو سەرى ديار نى يە!..

بەڵێ ئيمانداران، ئەم دينى ئيسلامە. هەموى ڕەحمەتە وهيچ كەس لەو ڕەحمەتە بێ بەش نابێ. مەگەر كەسێك خۆى زەحمەتى بوێ، بەهۆى كەللەشەقى و دڵڕەقيەوە. يان بەهۆى تێنەگەيشتن لەو ڕەحمەتە وەكو ئەوەى كەشەريعەتى ئيسلامى باسى كردوە. ئەوەتا چەندين كەس لەپيشەوەرانى كشتوكاڵى و ئاژەڵدارى و ڕەوەندوكۆچكەرەكان. لەم هەموو ئەجرو پاداشتە گەورە كەباسمان كرد بێبەش بون، چونكە وەكو خۆى لەدين حاڵى نەبوون.

بەڕێزان: يەكێكى تر لەوڕەحمەت و بەرەكەتانەى ئيسلام ئەوەيە كەپێغەمبەرى خوا ﷺ لەم فەرمودەيەدا باسى دەكات بۆمان و دەفەرموێ: (من تَوضَّأَ فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ، ثُمَّ راحَ فَوَجَدَ النّاسَ قَدْصَلُّوا، أَعْطاهُ اللهُ عَزَّوَجَلَّ مِثْلَ أَجْرِ من صَلاها وحَضَرَها لايَنْقُصُ ذلك من أَجْرِهِمْ شَيْئاً). رَواهُ أَبُوداود.

واتە: هەركەسێك دەست نوێژێكى پوخت بگرێ و بەجوانترين شێوەى شەرعى







دەست نوێژ بشوات. پاشان بەرەو مزگەوت بەڕێ بکەوێ بەنیەتی بەجێهێنانی نوێژی جەماعەت کەچی کەدەگاتە مزگەوت. تەماشا دەکات واخەڵکی لەنوێژی جەماعەت بونەوە، ئەوە خوای گەورە پاداشتی کەسێك کەئامادەی ئەو نوێژی جەماعەتە بوە. بۆ ئەمیش دەنوسێ کەبەنیەتی جەماعەت هاتوە بۆ مزگەوت وفریانەکەوتوە. بەبێ ئەوەی خوای گەورە هیچ لەپاداشتی ئەو کەسانەش کەم بکاتەوە کەبەشداری ئەونوێژەی جەماعەتەیان کردوە! ئەمەش هەموی ڕەحمی خوای گەورەیە لەگەڵ ئەم ئوممەتی محمدەﷺ.

ئیمانداران: یەکێکی تر لەبەرەکەتەکانی ئاینی ئیسلام کەبەداخەوە زۆرماڵ لێ ی بێ بەش بوە، بریتی یە لەچونی ئافرەت بۆ مزگەوت وبەشداری کردن لەنوێژی جەماعەتداو لەجومعەدا. پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوو لەپیاوان دەکات و دەفەرموێ: (لاتَمْنَعُوا إِماءَ اللهِ مَساجِدَ اللهِ، وليخرجْنَ تفلات) حَدْيثٌ حَسَنٌ، رَواهُ أَبُو داود (٥٦٥).

واتە: ئافرەتان قەدەغە مەکەن لەهاتوچۆکردنی مزگەوتەکانی ماڵی خوا، بەڵام با ئافرەتان بەشێوەیەك لەماڵ چوبنەدەرەوە کەعەتریان بەخۆیان نەکردبێ وبۆنیان نەڕوات ونەبنە جێگای سەرنجی خەڵکی.

لەهەردوو صەحیحی بوخاری (٩٠٠) ومُسْلِم (٤٤٢) دا. فەرمودەکە ئاوا هاتووە: (لاتَمْنَعُوا إِماءَ اللهِ مَساجِدَ اللهِ).

لەفەرمودەیەکی تردا، بەم شێوەیە هاتوە: (لاتَمْنَعُوا نِساءَكُمْ المَساجِدَ) رَواهُ البُخاري ومُسْلِم. واتە: ئافرەتەکانتان (ژن وکچ وخوشك ودایکتان) قەدەغە مەکەن لەچون بۆ مزگەوت. ئیمامی نەوەوی لەشەرحی صەحیحی مسلم دا (ج٤ ص١٦١) دەفەرموێ: نابێت ئافرەتان قەدەغە بکرێن لەهاتوچۆکردنی مزگەوت. بەڵام بەومەرجانەی کەزانایان باسیان کردوە و لەفەرمودەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ وەریان گرتووە. کەئەمانەن:

نابێ بۆنی خۆشی وای پێوەبێ سەرنجی دەوروبەرو ئەوکەسانە ڕابکێشێ کەبەلایاندا تێدەپەڕێ، وەجل وبەرگێکی ڕازاوەی وا لەبەرنەکات کەوەکو بۆشایی بچێت وابێت. وەخەڵخاڵی لەقاچدا نەبێت کەبەرێگادا ڕۆیشت دەنگی بێت (ئەمڕۆ ئەوجۆرە پێلاوانەی ژنانیش دەگرێتەوە کەلەکاتی ڕۆیشتندا تەقە تەق دەکات وسەرنجی دەوروبەر ڕادەکێشێ). وە هەروەها نابێ ئافرەت لەکاتی چونی بۆ مزگەوت دا. جلوبەرگێکی وا لەبەربکات کەبەهۆیەوە فەخرو شانازی بەسەر

خەڵکا بکات بەتایبەت ئافرەتانی هاوڕێ ی، وەپاشانیش مەرجە کەتێکەڵاوی پیاوان نەبێت..

زانای گەورەی سەردەمیش (إبْنُ عُثَيمين) لە (الشَّرح الممتع) ج٤ ص٢٥٤، دا دەفەرموێ: (يَحْرُمُ عَلى الوليِّ أنْ يَمْنَع المَرْأة إذا أرادَتْ الذَّهاب إلى المَسْجِدْ لِتُصَلِّي مَعَ المُسْلِمينَ) واتە: حەرامە سەرپەرشتیاری ئافرەت، کەقەدەغەی ژن بکات لەچونە مزگەوت، کاتێ ئەوئافرەتە ئەیویست بڕوات بۆ مزگەوت. بۆئەوەی لەگەڵ موسڵمانانندا نوێژ بکات.

خۆ ئەگەر ئافرەت نەیتوانی بڕوات بۆ مزگەوت بۆ نوێژە جەماعەتەکانی، بەهۆی دوری ماڵیانەوە لەمزگەوت یان سەرماو گەرمای زۆرەوە یان کاروباری ماڵ وبەخێوکردنی منداڵەوە. ئەو ئافرەتانە دەتوانن بۆخۆیان نوێژەکەیان بەجەماعەت لەماڵەوە بکەن. ماڵی واهەیە چەند ئافرەتێکی تێدایە. لەدایك وکچ وباوك. ئەوە کامیان زیاتر شارەزایی هەبوو لەجوان خوێندنەوەی قورئانداو شارەزا بوو لەئیمامەت ونوێژ. با ئەوەیان پێش نوێژیان بۆ بکات. (لِماثَبَتَ أنَّ عائِشَةَ (رضي اللهُ عَنْها) أمَتْ النِّساءَ وقامَتْ وسَطهُنَّ في صَلاةٍ مَكْتُوبَةٍ، وكذلك ثَبَتَ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رضي اللهُ عَنْها). صَحيحٌ لِغَيْرِهِ، رَواهُ ابنُ حَزْم في المحلى ج٤ ص٣٠٩.

واتە: هەردوو دایکی ئیمانداران، خاتوو عائیشە ونوموسەلمە، پێشنوێژیان بۆ ئافرەتان دەکردو لەناوەڕاستیاندا دەوەستان لەنوێژە فەرزەکاندا..

زانای بەناوبانگیش — إبنُ القَيِّم الجوزيَّة لە (إعلام المُوَقِّعين) ج٢ ص٣٧٦ دا، بەلایەوە سوننەتە کەئافرەتان بۆخۆیان نوێژەکانیان بەجەماعەت بکەن.



دەی بالەئێستاوە، ئافرەتانی موسڵمان نوێژەکانیان لەمزگەوتا بەجەماعەت بکەن، لەشوێنی دیاری کراو بۆیان، خۆئەگەر نەیانتوانی بێنە مزگەوت بالەماڵەکانیاندا بۆخۆیان جەماعەت بکەن وماڵەکانیان بکەنە مزگەوت (إن شاءالله).

وەپێویستە ئاماژە بەوەش بکەین کە: لەنوێژی مەغریب وعیشاو بەیانی دا، ئەو ئافرەتەی کەپێش نوێژی بۆ ئافرەتان دەکات لەماڵەوە. بۆی دروستە کەدوو ڕکاتەکە بەدەنگی بەرز فاتحە و قورئانی تێدا بخوێنێ. بەمەرجێ پیاوی نامەحرەم گوێ ی لەدەنگی نەبێ، بەلام ئەو پیاوانەی کەمەحرەمی خۆنی، وەکو باوك وبراوخاڵ ومام و کوڕو مێرد. ئەوە ئەگەر لەماڵەوەش بن وگوێشیان لەدەنگی بێ، هیچ قەیدی نیە... چونکە چەسپاوە، کە: (أنَّ عائِشَةَ - (رَضي اللهُ



عَنها) أَمَّتْ نِساءاً في الفَرِيضَةِ في المَغْرِبِ، وقامَتْ وسَطَهُنَّ، وجهرت بالْقِراءَةِ) - المُحَلّى - إبنُ حَزم - ج٤ ، ص٣٠٩. واته: خاتوو عائیشه ئیمامەتی بۆ ئافرەتان دەکرد لەنوێژی فەرزی مەغریب داو لەناوەڕاستیانەوە دەوەستاو بەدەنگی بەرز فاتحەو قورئانی دەخوێند.

بەڵێ بەومەرجەی پیاوی نامەحرەم لەو.ماڵەدا گوێ ی لەدەنگی نەبێ، بەڵام بۆ پیاوی مەحرەم دروستە دەنگی بیبستن، ئەمەش فەرمودەی (إبْنُ قُدامة) یە لە - المُغْني ج٢ ص٢٠٢ دا.

٥- خاڵی پێنجەم کەپێویستە ئێمەی موسڵمان ئاگاداری بین، بۆئەوەی تام وچێژی عیبادەت بکەین ئەوەیە کە، طَلَبُ القُبُولِ مِنَ اللهِ تَعالى، وعَدَمِ الاغْتِرارِ بِالْعَمَلِ:

داوای ئەوە لەخوای گەورە بکەین کەئەو کردەوەی کردومانە. ئەو گفتارەی وتومانە، لێمان قبوڵ بکات بەگەورەیی خۆی وکەم وکوڕیەکانمان بۆ پڕبکاتەوە. وەلەخۆبایی نەبین بەوەی هەندێ عیبادەت وکردەوەی باشمان کردوە. چونکە شیعاری پێغەمبەران وخواناسان، لەدوای تەواوبونی کارەکانیان ئەوە بوە، کەخوایە لێمان قبوڵ بکەی. ئەوەتا حەزرەتی إبراهیم و حەزرەتی ئیسماعیلی کوڕی کاتێ کەماڵی بەیتیان تەواو کرد وبینای کەعبەیان کرد، ڕویان لەخوای گەورە کردو ووتیان: ﴿ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾ البقره: ١٢٧

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (لَنْ يَنجِيَ أَحَداً منكُمْ عَمَلَهُ، قالَ رَجُلٌ: ولا إيَّاكَ يارسول اللهِ قالَ: ولا إيَايَ إلا أنْ يَتَغَمَدَنِيَ اللهُ بِرَحْمَتِهِ، ولكِنْ سَدِّدُوا) رَواهُ مُسْلِم (٧١/٢٨١٦) وبِنَحْوِهِ عِنْدَ البُخاري (٦٤٦٤).

واتە: هیچ کەس لەئێوە بەهۆی کردەوە چاکەکان وعیبادەتەکانی خۆیەوە ڕزگاری نابێت — ڕزگاری نابێت لەدۆزەخ وناچێتە بەهەشتەوە. پیاوێك ووتی: تەنانەت تۆش ئەی پێغەمبەری خوا؟! فەرموی: تەنانەت منیش، مەگەر خوای گەورە لەناو ڕەحمەتی خۆیدا نقومم بکات.

بەڵێ ئیمانداران: هەرگیز نابێ بەکردەوەکانی خۆمان لە خۆمان بایی بین، چونکە هەرکەسێ وای زانی زۆر کەسێکی باشەو شانازی و فەخری بەکردەوەکانی خۆیەوە کرد. ئەوە بەڕاستی دەبێ لەخۆی بترسێ کە ڕۆژێك توشی گومڕابون و تیاچون ببێ، پەنا بەخوا.

سەرنجی ئەم بەسەرهاتە بدەن، کەمرۆڤ دەهەژێنێ و زانای گەورەو مێژوو

نوس و موفەسیری قورئان – إبنُ کثیر، له (البِدایَة والنِّهایَة) ج١١، ص٧١ دا باسی کردوه. لەرِوداوەکانی سالّی (٢٧٨)ی کۆچی. کەلەو سالّەدا (إبنُ عبدالرَّحیم) مردوه، که ئەمە بەسەرهاتەکەیەتی:

ئیبن جەوزی دەڵێ: ئەم بەدبەختە گومرایە، یەکێك بوو لەموجاهیدان. لەتێکۆشەرانی ئیسلام، زۆربەی غەزاکانی دژی رِۆم بەژداری کردوە وزۆر ئازاو پاڵەوان بوە. لەیەکێك لەغەزاکاندا لەوکاتەدا کەموسڵمانان گەمارۆی شارێکی ولاَتی رِۆمیان دابوو. ئەم پیاوە موجاهیدە چاوی ئەکەوێ بەیەکێ لەئافرەتانی ئەوشارە کەرِۆمی دەبێ. بەچاوپێکەوتنی دڵی دەچێتە سەری وشەیدای دەبێ، لەدەرفەتێکدا بەکەسێکدا پەیامی بۆ دەنێرێ ودڵی خۆی بۆ دەکاتەوە. ئافرەتەکەش دەڵێ: ئەگەر دەیەوێ بەمن بگات وبۆیەك بین، دەبێ ببێ بەگاور!! لەدینی محمد وازبێنی!! وەبێتە ناو ئەم قەلایەی ئێمەوە ودژی موسڵمانان بجەنگێ!! ئەم پیاوە دەڵێ ئامادەم وموسڵمانان بەجێ دێڵێ ودەچێتە ناو قەلای گاورەکانەوە وکافر دەبێت! وەختێ موسڵمانان بۆی دەگەرِێن، دەزانن کافر بوە وبۆتە گاور، زۆر غەمبار دەبن. زۆر خەفەتی لێ دەخۆن. پاش ماوەیەك چاویان پێ ی دەکەوێ وا لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا بەیەکەوە دەگەرِێن. موسڵمانەکان لەم دیوو قەلاکەوە پێ ی دەڵێن:

فلاّن کەس ئایا قورئانەکەت، زانستەکەت، رِۆژوو نوێژەکەت. جیهادو تێکۆشان و پاڵەوانیەتیەکەت چیان لێ هات؟! چۆن دڵت هات بۆ ئافرەتێ ئاوا دەست بەرداریان بی؟! ووتی: بزانن. هەر لەوکاتەوەی وازم لەئیسلامەتی هێناو بوومە گاور، برِوابکەن هەموو قورئانم لەبیرچۆوە. تەنها یەك ئایەتم بیرماوە. کەدەڵێ: ﴿ رُّبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ كَانُوا۟ مُسْلِمِينَ ذَرْهُمْ يَأْكُلُوا۟ وَيَتَمَتَّعُوا۟ وَيُلْهِهِمُ ٱلْأَمَلُ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴾الحجر:٢-٣.

بەڵێ، ئەم پیاوە دوای ئەو هەموو تەمەنە لەجیهادو عیبادەت وخواپەرستی کەچی بەکافری مرد. کەزۆرجار هۆکارەکەی ئەوەیە کە: کاری زۆر کردوە بۆ ئیسلام، بەلاّم لەخوا نەپارِاوەتەوە کەلێ ی قبوڵ بکات. بەڵکو لەخۆبایی بونی پێوە دیاربووە. سەرەنجام ئەوە چارەنوسی دەبێ.

خوای گەورەو میهرەبان لێت دەپارِێینەوە، ئەوەی کردومانە لێمان قبوڵ بکەی و بەسەرماندا نەدەیتەوەو رِاگیراوو دامەزراومان بکەی لەسەر شەقامە رِێگەکەی ئیسلام و لەلارِێبوون و گومرِابون بمانپارێزی. ٱللَّهُمَّ ءَآمِينَ



## سه‌رچاوه‌كان

١- ته‌فسیری ئاسان ، بورهان محمد أمین.
٢- الوَصایا النَبَوِیَّة ، حامد أَحمد الطَّاهِر ، ص٦٦١ ، ص١١١ ، ص١٠٠
٣- مَوْسُوعَة ، نَظْرَةُ النَّعیم ، مجموعَةٌ مِنَ العُلَماء ، ج١١ ص٥١٢٦،
ص٥٧٠٤، ص٥٧٠٧
٤- آیاتُ الله فِي الانْسان ، د.محمد راتب النابُلُسي ، ص٣٧٠.
٥- تَحذیر السَّاجد ، محمود المِصري ، ص٦١١، ص٦٠٩.
٦- فَتاوى النّاس ، أَحكام الصَّلاة ، الجَنائِز ، محمود المصري ، ص٤٤، ص٣٥.

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمِين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبهِ أجْمَعين..

ئیمانداران: ئیسلام ئەو ئاینەیە. کەپەسەند کراوی خوای پەروەردگارە ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُ﴾. ئیسلام دینی دونیاو قیامەتە. پێغەمبەری خوا ﷺ کەخاتەمی پێغەمبەرانە. هیچ لایەنێکی ژیانی فەرامۆش نەکردوە. ئەگەر لەلایەنی خواناسی و بەندایەتی بۆ خواوە کە شەوانی بەشەونوێژوگریان و پاڕانەوە لەخوا بەسەر دەبردو ئەوەندە لەشەونوێژدا بەپێوە دەوەستا (حَتّى تَتورَّمَ قَدَماهُ) تاکو بنەپێکانی هەمووی دەئاوسا! بەڵام ئەمە لەژیانی ئاسایی دای نەبڕی بوو.

بەڵکو هەمیشە بۆن خۆش و پاکوخاوێن بوو. ڕووگەش ودەم بەزەردەخەنەوە بوو. قسەخۆش و ڕووخۆش بوو. بەقسەی جوان و سوعبەتی بەجێ، هاوەڵانی دێنایە پێکەنین وخەمی لەسەر دڵ لادەبردن. زۆر دژی ڕووگرژی ودڵ توندی وبێ تاقەتی بوو. بەردەوام لەخوا دەپاڕایەوە ودەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُبِكَ مِنَ الهَمِّ والحَزَنِ) رَواهُ أبُو داود.

واتە: پەروەردگارا پەنات پێ دەگرم کەبمپارێزی لەغەم وپەژارەو مەحزونی و دڵتەنگی وەصەحابەکانیشی تێگەیاندبوو، کەدینی ئیسلام دینی گۆشەگیری وکزۆڵی و کلۆڵی وسیسی وپیسی نیە. بەڵکو چۆن خوای گەورە مافی بەسەرتەوەیە بەوەی کەبەندایەتی بۆبکەی وعیبادەتی بکەی. حەقێکی گەورەی تریش بەسەرتەوە، لاشەی خۆتە. (إنَّ لِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقاً). بەڕاستی لاشەشت مافی بەسەرتەوە هەیە. بەڵێ، ئیسلام مرۆڤی موسڵمانی بەهێزی خۆش دەوێت. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (المُؤْمِنُ القَوِيُّ خَيْرٌ وأَحَبُّ إلى اللهِ مِنَ المُؤْمِنِ الضَّعيفِ).

واتە: ئیمانداری بەهێزو بەتواناو چاکترو خۆشەویسترە لەلای خوا لەئیمانداری لاواز. وە قورئان ئاماژە بە بەهێزی حەزرەتی موسا دەکات کاتێ بەزللەیەك دەبێتە هۆی مردنی کەسێك. وە قورئان لەباسی (طالوت)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰهُ عَلَيۡكُمۡ وَزَادَهُۥ بَسۡطَةٗ فِي ٱلۡعِلۡمِ وَٱلۡجِسۡمِ﴾ البقرة: ٢٤٧.

باسی بەهێزی وتۆکمەیی وخۆڕاگری لاشەی دەکات و وەکو سیفەتێکی پەسەند و پیرۆز ناوی دەبات. جایەکێ لەوشتانەی کە لاشەی پێ بەهێز دەبێ و لەنەخۆشی و سستی دەیپارێزێ، (وەرزش کردنە). کەوەرزش ووزە بۆ دڵ دەگێڕێتەوە، ئیمامی عەلی فەرمویەتی: (إنَّ القُلوُبَ تَمِلُّ كَما تَمِلُّ الابْدان، فَابْتَغُوا لَها طَرائِفَ الحِكْمَةِ).

واته: بەڕاستی دڵیش ماندوو دەبێ، هەروەکو چۆن لاشە ماندوو دەبێ. جا لەبەرئەوە بەشتی جوان و پڕحیکمەت. پشوی پێ بدەن. کە وەرزش یەکێ لەو شتانەیە کەدڵ پێ ی ئاسوودە دەبێت.

ئیمانداران: هەموو وەرزشەکانی ئەمڕۆ لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا باس کراون و پێغەمبەری خوا ﷺ بەکردەوە ئەنجامی داون. لەو وەرزشانەش:

١- ڕاکردن بەپێ: یەکێ لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ناوی (سەلەمەی کوڕی ئەکوەع) بوو لەڕاکردندا زۆر بێ وێنە بوو. تەنانەت پێشی ئەسپیشی داوەتەوە!!. پێغەمبەری خوا ﷺ ستایشی ئەم وەرزشەوانەی کردو لەناو هاوەڵاندا وەصفی کردو فەرموی: (خَيْرُ فُرْسانِنا أَبُو قَتادَةَ، وخَيْرُ رَجَّالَتِنا سَلَمَةُ). رَواهُ مُسْلِم.

واتە: باشترین ئەسپ سوارمان ئەبو قەتادەیەو چاکترین کەسیشمان کە لەڕاکردنی پێ دا بێ وێنەیە سەلەمەیە).

وە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی زۆر حەزی بەم وەرزشە دەکرد. ئەوەتا، دایکی ئیمانداران. هاوسەری بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ کەخاتوو عائیشەیە، بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: هێشتا قەڵەو نەبو بووم. لەسەفەرێکدا لەخزمەت پێغەمبەردا بوم. پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەم سەرکردەبوە کەبۆ هەموو سەفەرێك (ئەگەر بۆ جەنگ و غەزاش بوبێ) خێزانی لەگەڵ خۆی بردوە، ئەمڕۆ کەدەبینین سەرکردەیەکی نێودەوڵەتی ناودار، لەکاتی سەفەرو گەشتدا خێزانەکەی خۆی لەگەڵە، خەڵکی بەشتێکی پێشکەوتوی دەزانن. بەڵام ئەمە لەڕەوشتە باڵاکانی پێغەمبەری خۆمانە ﷺ..

خاتوو عائیشە دەفەرموێ: لەگەڕانەوەماندا کەهێشتا نەگەیشتبوینە شاری مەدینە، پێغەمبەی خوا ﷺ بەصەحابەکانی فەرموو: (تَقَدَّمُوا) ئێوە بڕۆن و پێشمان بکەون و لێمان دوربکەونەوە. پاشان بانگی کردم وفەرموی: ئەی عائیشە: (تَعالَي أُسابِقْكِ) وەرە باپێشبڕکێ بکەین و بەپێ ڕاکەین، بزانین کێمان پێش دەدەینەوە! ئەفەرموێ، ووتم: زۆرباشە. شوێنێکمان دیاری کرد ودەستمان کرد بەڕاکردن من پێشی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتمە شوێنی دیاری کراوو یاریەکەم بردەوە!

الله، ئەبێ چەند جوان بوبن، لەودیمەنە ناوازەیەدا، ئەو دوو هاوسەرە بەوخۆشەویستیەوە وەرزش ئەنجام دەدەن بەیەکەوە. خۆزگە ئاوا پیاوان و





ژنانی ئوممەتی محمد ﷺ چاویان لەپێغەمبەرەکەیان بکردایە و بەیەکەوە دڵشادو خۆشەویست بونایە.

خاتوو عائیشە دەفەرموێ: دوای چەند ساڵێك کەقەڵەو بوم وکێشم زیادی کرد. قەدەری خوای گەورە لەسەفەرێکی تردا لەخزمەت پێغەمبەری خوادا بوم. ئەمجارەشیان ئیزنی لەهاوەڵانی خواست و فەرموی: ئەی عائیشە، (تَعالي أُسابِقْكِ) وەرە باپێشبڕکێت لەگەڵ بکەم. منیش ئەوڕاکردنەی یەکەمجارم بیرچوبۆوە، ووتم: (أُسابِقُكَ يارَسُولَ اللهِ، وأنا عَلى هذا الحالِ؟) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بەم حاڵەوە کەقەڵەوم پێشبڕکێت لەگەڵ بکەم؟!)

فەرموی: نا، نابێ، دەبێ هەرپێشبڕکێیەکە بکەین، (لَتَفْعَلِنَّ).

خاتوو عائیشە دەفەرموێ: ئەمجارەش شوێنێکمان وەکو خاڵی کۆتایی دیاری کردو دەستمان کرد بەپێشبڕکێ کردن، بەڵام ئەمجارەیان پێغەمبەری خوا ﷺ پێشی دامەوە. جا کەگەیشتە خاڵی بردنەوە ومن هێشتا لەنیوەی ڕێگا بوم و تەنگەنەفەس ببوم. (فَجَعَلَ يَضْحَكُ وقالَ: هذهِ بِتِلْكَ السَّبَقَةِ). پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری کردم وپێکەنی وفەرموی: ئەمە بەڕاکردنەکەی جاری پێشوو. کە تۆ پێش کەوتی و بردتەوە، ئەوە هیچمان لەهیچ!..ئەم فەرموودەیە: (حَديْثٌ صَحيح، أخرجه الحميدي في مُسْنَدِهِ (ق٢/٤٢) وأَبُوداود: (٢٥٧٨)، والنَّسائي، وقالَ الشَّيْخُ الالْباني في (الصَّحيحَة): هذا سَنَدٌ صَحيح عَلى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ، وقَدْ صَحَّحَهُ العِراقيُّ في تَخْريجِ الإحْياءِ (ج٢ ص٤٠).



ئەی ئەوکەسانەی کەئیسلام تۆمەتبار دەکەن بەوەی کەمافی ژنی نەداوەو پیاو سالاری هی ئیسلامە توخوا هیچ سەرکردەیەك هەیە ئاوا لەگەڵ خێزانیدا، وەرزش و پێشبڕکێی کردبێ؟! خۆئەگەر تەلەفزیۆن شتێکی ئاوا نیشان بدات. هەموو موسڵمانان بەلایانەوە شتێکی سەنج ڕاکێشە کەچۆن سەرکردەیەك ئاوا کات بەخێزانی دەبەخشێ و وەرزش دەکات وپێشبڕکێ ی بردنەوەی لەگەڵ ئەنجام دەدات. بەڵام ئەمە پێغەمبەری خۆمانە ﷺ دەبا شانازی بکەین کەئوممەتی ئەو سەردار و سالارمین.

زانای ناودار، ئیمامی شەوکانی، لەکتێبە بەنرخەکەیدا (نيلُ الاوْطار - ج٨،ص١٠٥)دا لەشەرحی ئەم فەرمودەیەدا، فەرمویەتی: (ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر ڕەوابون و دروست بوونی پێشبڕکێ لەسەرپێ – ڕاکردن بەپێ، جائەم یاری و وەرزشە لەنێوان ژن و پیاوی مەحرەمدا ئەنجام دەدرێت. وەکو ژن



ومێردوخوشك و براو... هتد.

وه ئەمه دژایەتی نیه لەگەڵ شەخصیەت وکەسایەتی و ویقارو ڕێزو حورمەت و زانست و تەمەن زۆری.

واتە: بائەوکەسەی کەئەم وەرزشە ئەنجام دەدات، کەسێکی زۆر ناودارو ناسراو بێت، یان زۆر عالم وزانابێ، یاخود چوبێتە تەمەنەوە. هیچ ڕێگرنیە کەبەو هەموو پلە وپایەوە. بەوهەموو عیلمەوە بەوتەمەنە زۆرەوە. وەرزشی ڕاکردن بەپێ ئەنجام بدات. خۆ پێغەمبەری خوا ﷺ مەعلومە کەلەدوای تەمەنی پەنجا ساڵیەوە خاتوو عائیشەی بوە بەهاوسەر، دوای چەند ساڵیش ئەمجا ئەم پێشبڕکێ یەی ئەنجام داوە. کەواتە، تەمەنی زۆربوەو لەگەنجیەتی دەرچووە. کەچی نەیفەرمووە، من و ئەم وەرزشەو ئەو جۆرە پێش بڕکێ یە، بەم تەمەنەوە؟! نەخێر، بەڵکو خۆی داوای کردوە. وەهەروەها جیاوازی نیە، ئەم وەرزشە لەشوێنێکی چۆڵدا بکرێ، یان لەناو خەڵکا ئەنجام بدرێ، واتە: لەبەرچاوی جەماوەریش دەکرێ، بەڵام بەمەرجی پاراستنی بنەما شەرعیەکان. ئەمە جۆری یەکەم لەوەرزش، کەپێشبڕکێ و ڕاکردنە بەپێ. کەئەمڕۆ لەجیهاندا لەئاستی نێودەوڵەتیدا دەکرێت.

٢- المُصارَعَة: زۆرانبازی ویەکتر بەزەوی دادان: زۆرانبازی بەناوبانگی نیوە دورگە (ڕوکانەی کوڕی یەزید) کەکافر بوو. هاتە بەرامبەری پێغەمبەری خواو بەفیزو دەعیەوە بەپێغەمبەری خوای گوت: (يامُحَمَّد، هَلْ لَكَ أَنْ تُصارِعَني؟!) ئایا ئامادەی زۆرانبازیم لەگەڵ بکەی؟! پێغەمبەر ﷺ فەرموی: لەسەرچی ئەنجامی بدەین؟! ئەمەش متمانە بەخۆبون ی پێغەمبەری خوا ﷺ دەردەخات کەدەری خست نەك هەرلێت ناترسم. بەڵکو دڵنیام لەسەرکەوتن (بەپشتیوانی خوا) و چاوەڕێ ی بردنەوەی گرەویشم.

ڕوکانەی پاڵەوان ووتی: لەسەر مەڕێك!. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: منیش ڕازیم. ئیتر باوەشیان بەیەکدا کردو، پێغەمبەری خوا ﷺ پشتی لەزەوی داو خستی! ڕوکانە ووتی: ئەمجارەیان تەواو خۆم ئامادە نەکردبوو. بادووبارەی بکەینەوە لەسەر مەڕێکی تر. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئامادەم.

ئەمجارەش باوەشیان لەیەك دایەوە وپێغەمبەری خوا ﷺ خستی یەوە. ڕوکانە ووتی: سەیرە من هەرگیز پشتم لەزەوی نەدراوە، پاڵەوانی بەناوبانگی هەموو نیوە دورگەم. تکایە ئەی محمد بائەم جارەش دوبارەی بکەینەوە بیکەین





بەسێ جارو ئەوا من دوو مەڕی تۆ قەرزارم. با ئەمجارەش لەسەر مەڕێکی تر بیکەین. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: زۆرباشە ئامادەم. جاری سێ یەمیش پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوکانەی دایەوە بەزەوی دا. ئەمجارەش ڕوکانە ووتی: ئەی محمد سوێندبێ. تائێستا کەس منی نەخستوە. وەواش دەزانم ئەوەی کەمنی بەزەوی دا خست تەنها تۆ نەبوی. وەکو دان پیاهێنان بەوەی کەفریشتە هاوکارت بوە.

ئەمجا ڕوکانە وتی: باشە چی بەماڵ ومناڵ وکەس وکارەکەم بڵێم. بڵێم ئەوسێ مەڕەم چی لێکرد. وا ووتم مەڕێکیان گورگ خواردی. مەڕێکیان بزر بوو. ئەی سێ یەمیان چی لێهات؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ماكُنّا لِنَجْمَعَ عَلَيْكَ أَنْ نُصْرِعِكَ ونغرِمُكَ غَنَمَكَ، خُذْ غَنَمَكَ). ئەی ڕوکانە ئێمە ئەوەندە بێ ویژدان نین کەپشتت لەزەوی بدەین ومەڕەکانیشت لێ وەربگرین و غەرامەت بکەین. برۆ مەڕەکانت بۆ خۆت..

لەسەر ئەم فەرمودەیە، شێخ إبنُ حجر الهيثمي، له (كفُّ الرِّعاع عنْ محرَّماتِ اللهوِ والسماعِ) ص١٢٢، دا دەفەرموێ: دروست نیە لەسەرشت زۆرانبازی بکرێ. چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ مەڕەکانی دایەوە بەڕوکانە ولێ ی وەرنەگرت.

٣- یاری ووەرزشێکی تر بریتی یە لە: نیشانە شکێنی وتیر ئەندازی: عوقبەی کوڕی عامر دەفەرموێ: گوێم لەپێغەمبەری خوابوو ﷺ کەلەسەر مینبەر ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ ﴾ الانفال: ٦٠.

واتە: ئەی کاربەدەستانی دەوڵەتی ئیسلام هەرچی لەتواناتاندایە بۆ بەهێزکردنی سوپای ئیسلام بیخەنە گەڕو ئامادەیی بکەن. هێزی ئاسمانی ودەریایی و ووشکانی و ... هتد.

جا پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەرەکەی خۆیەوە کەئەم ئایەتەی خوێندەوە. فەرمووی: (ألا إنَّ القُوّةَ الرَّمي. ألا إنَّ القُوّةَ الرَّمي) رَواهُ مُسْلِم.

واتە: خەڵکینە، چاك بزانن، ئەو هێزەی کەخوای گەورە لەئایەتەکەدا داوا دەکات لەموسڵمانان کەئامادەی بکەن، تیرهاویشتنە، تیرهاویشتنە. دەسا ئێوەش خۆ ئامادە بکەن.

کەواتە: ئەم تیرهاویشتنە وتیرئەندازی یە، ئەگەرچی وەکو مەشقی بواری سەربازی بەکاردێ. بەڵام وەکو وەرزش دەکرێ ئەنجام بدرێ وموسڵمان، هەم

وەرزش بکاو هەم بۆکاتی ڕوبەڕوبونەوەی کافران و دوژمنانی دین وژینی گەلەکەی سازو ئامادەبێ.

بەڵام نابێ ئەوشتەی کەدەکرێ بەنیشانە ئاژەڵێك یان باڵندەیەك بێ.

وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (لاتَتَّخِذوُا شَيْئاً فيهِ الرُّوحُ غَرَضاً) رَواهُ مُسْلِم (١٩٥٧).

واتە: هەرگیز شتێك مەکەن بەنیشانەو نیشانەی لێ مەگرنەوە بۆ خۆڕاهێنان و مەشق، کەئەوشتە گیان لەبەربێ..

هەندێ کەس هەیە هەربۆخۆشی، بۆ دەرخستنی نیشانە شکێنی خۆی، بەدەمانچە، چۆلەکەیەك. یان کۆترێك دەکاتە نیشانەو دەیکوژێ، بەبێ ئەوەی پێویستی بەگۆشتەکەی ببێ وبەکاری بهێنێ، ئەمە حەرامە.

هەردەربارەی نیشانە شکاندن، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (من عَلِمَ الرَّمْيَ. ثُمَ تَرَكَهُ فَلَيْسَ مِنا أَوْ قَدْ عَصَى) رَواهُ مُسْلِم.

واتە: هەرکەسێ فێری نیشان شکاندن بووبێت و پاشان وازی لێ بێنێت. ئەوە لەئێمە نی یە، یان ئەوە بێگومان سەرپێچی کردووە.

٤- ڕمبازی: هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ حەزرەتی ئەبو هورەیرە بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: (بَيْنَما الحَبَشَة يَلْعَبُونَ عِنْدَ النَبِيِّ ﷺ بِحَرابِهِمْ، دَخَلَ عُمَر، فَأَهْوى إلى الحَصْباءِ فَحَصَبَهُمْ بِها، فَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: دَعْهُمْ ياعُمَر) مُتَّفَق عليه.

واتە: لەکاتێکدا حەبەشیەکان لەخزمەت پێغەمبەردا ﷺ یاریان بەڕمەکانیان دەکرد، حەزرەتی عومەر هاتەژورەوە ویستی لێ یان بدات وقەدەغەیان بکات. بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئەی عومەر وازیان لێ بێنە.

کەواتە: ئەوەی ئەمڕۆ لەجیهاندا دەکرێت لەڕمبازی، لەشەریعەتی ئیسلامدا ڕێگەی پێ دراوە. وەپێویستە ئێمەی موسڵمانیش شوێنی تایبەتمان هەبێت بۆئەم وەرزشە.

٥- الفروسِيّة ( ئەسپ سواری): لەموسنەدی ئیمامی ئەحمەددا هاتوە، کەئیبن عومەر فەرمویەتی: (سَبَقَ النَبِيُّ ﷺ بَيْنَ الخَيْلِ وأَعْطَى السّابِقَ).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ پێشبڕکێ ی لەنێوان ئەسپ سوارەکاندا دەکردو ئەوکەسەی پێشبڕکێ یەکەی ببردایەتەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵاتی دەکرد. بەم پێ یە، پێشبڕکێ ی پایسکیل و ماتۆڕو سیباق دروستە ولایەنی سەرکەوتوو



خەلأت دەكرێ.

٦- وەرزشی شەشەم (السِّباحَة) مەلەوانی یە: حەزرەتی عومەری كوڕی خەطاب بۆئەمیری شامی نوسی: (وَعَلِّمُوا صِبيانَكُمْ الكِتابَةَ والسِّباحَةَ).

واتە: منالّەكانیان فێری نوسین ومەلەوانی بكەن.

ئیمامی سیوطی، كتێبێكی زۆر نایابی نوسی لەباسی گەورەیی مەلەوانی داو ناوی نا: (الباحَة في فَضْلِ السِّباحَة).

ئێستا لەئەوروپاو ئەمریكا. منالّ وەكو وانەیەكی تایبەت لەقوتابخانەدا، پێویستە مەلەكردن فێرببێ و بڕوانامەی مەلەوانی وەربگرێ. كەبەڕاستی ئەمە هی ئیسلامە وبەداخەوە ئەهلی ئیسلام ئێستا لەبیری چۆتەوەو ئەوان فێرمان دەكەن.

٧- بەرزكردنەوەی قورسایی: ئەم وەرزشەش لاشە بەهێز دەكات ودلّ ئاسودە دەكات پێشەوا — إِبْنُ القَيِّم (لەكتێبی) الفروسِيَّة ص٣٧ دا ، باسی ئەوەی هێناوە كە: (لَقَدْ رَأَى النبيُّ ﷺ شَباباً يَرْفَعُونَ حَجَراً لِيَرُوا الاشَدَّ منهُمْ، فَلَمْ يُنْكِرْ عَلَيْهِمْ).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی كەوت بەكۆمەڵە گەنجێك كەوا بەردێكی گەورەیان بەرز دەكردەوە وپێشبڕكێیان دەكرد لەسەرئەوەی كەكامیان زیاتر بەرزی دەكاتەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی نەكردن لەمە ونینكاری نەكرد.

٨- تۆپی پێ و بالەو سەللەوتێنس و وەرزشی كاراتی وكۆنفۆ: ئەمانە كەلەم سەردەمەدا دەكرێت هەمویان لەڕوی شەرعیەوە دروستن. لەكاتێكا مەرجە شەرعیەكان بێنەدی.

كەواتە: واجبی سەرشانی حكومەتە كەیاریگای ڕێكوپێك و تەندروست بۆ تۆپی پێ. بۆ باسكە، تۆپی سەبەتە، بەرزكردنەوەی قورسایی، كاراتی، مەلەوانی، تیراندازی، فڕێ دانی قورسایی، پێشبڕكێ ی ئەسپ سواری و پایسكیل وماتۆڕ سواری و پێشبڕكێ ی ڕاكردن بەپێ. بۆ منالأن وگەنج و لاوانی ولأت بكاتەوە. وەتەنانەت بۆ ئەوكەسانەش كەتوانای لاشەیان بەهێزەو گیانی وەرزشیان هەیە هەرچەندە چوبنە تەمەنیشەوە. كەواتە: هەرحكومەت و دەسەلأتێك لەهەموو شارو شارۆچكەیەك وگوندێكی گەورەدا ئەم شتانە ئەنجام نەدات وئامادە نەكات بۆ گەنج ولاوان ومنالّن. بەحكومەتێكی كەمتەرخەم و تاوانكار دادەنرێ وپێویستە لێپرسینەوە لەگەڵ وەزیری وەرزش بكرێ. نەك وەزارەتی هەر بۆ

پارە خواردن بێ !..

وەهەروەها پێویستە لەسەر حکومەت، ئەو وەرزشەوانانەی کەلەیاریدا سەرکەوتون خەڵاتیان بکات. وە ئەم خەڵاتەیان لەلایەن بودجەی وەزارەتی وەرزشەوە دابین دەکرێت. یاخود یەکێ لەبەشداربوانی خولی یاریەکە دابینی کرد. ئەوە باشە وبەجێ یە. بەڵام ئەگەر چەند تیپێك بەیەکەوە خولێکیان کردەوەو بەیەکەوە، بەپارەی هەمویان خەڵاتیان کڕی. وە لایەنی براوە خەڵاتەکەی دەبرد. ئەوە دروست نیەو جۆرێکە لەقومار.

هەروەها پێویستە ڕوو لەیاریزانان و وەرزش دۆستان بکەین و پەیامی مینبەرو میحرابیان پێ بگەیەنین وپێیان بڵێین: پێویستە ئێوەش پابەندی ئەم خالانەبن:

١- عیبادەت و نوێژەکانتان مەفەوتێنن و ئەتوانن نوێژەکان بەکۆکراوەیی (جمع) بکەن ئەگەر هاتوو یاریەکان دەکەوتنە کاتی نوێژێك و تا یاریەکە تەواو دەبوو، کاتی ئەونوێژە فەرزە بەسەر دەچوو. ئەوە بۆی هەیە جەمعی بکات لەگەڵ نوێژی دوای ئەودا. نیوەڕۆ ببرێتە لای عەسر. یان عەسر بهێنرێتە لای نیوەڕۆ، وەمەغریب و عیشاش بەهەمان شێوە.

٢- ئاگاداری ئەوەبن کەلەکاتی وەرزش کردن دا، با نیەتتان پاك بێ. ئەویاریە وەکو جێ بەجێ کردنی فەرمودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنجام بدەن کەفەرمویەتی: (وإنَّ لِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقًّا). وەکو دەرکردنی حەق ومافی لاشە ئەو وەرزش ویاریە ئەنجام بدەن. وەبەنیەتی ئەوە وەرزش بکەن کەگوێڕایەڵی فەرمایشتی سەروەرو سەردارمان ﷺ کردوە. کەفەرمویەتی: (أَلْهُوا والْعَبُوا فَإنِّي أَكْرَهُ أَنْ أرى فِي دِينِكُمْ غِلْظَةً). رواهُ البَيْهَقي.

واتە: گاڵتە وگەپ بکەن ویاری بکەن، بێگومان پێم ناخۆشە ببینم لەدینەکەتاندا ووشکی و زبری وداخراوی هەبێت..

وە (إن شاء الله) هەوڵبدەن ببن بەنموونەی یاریزانی موسڵمانی ڕەوشت بەرز، (إن شاءالله) ئەو وەرزشەتان بەعیبادەت بۆ دەنوسرێت.

٣- لەکاتی یاری وئەنجام دانی وەرزشدا، دڵی هاوڕێکانت عاجز مەکەو هات و هاوارو فیکە لێدان وقاوو قیژو جوێن دان دورە لەیاریزانی موسڵمانەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (لَيْسَ المُؤْمِنُ بالطَّعانِ ولا اللَّعانِ ولا الفاحِشِ ولا







البّذي).

٤- خوێندن، یان کاروکەسابەتی لەسەر نەفەوتێنی، بەڵکو کاتی بۆ دیاری بکەی.

٥- ئەو جل وبەرگانەی کەخاچ (صەلیب) یان لەسەرە، نابێ وەرزشەوانی موسڵمان لەبەری بکات. وەپێویستە لەجل و بەرگدا ڕەچاوی مەرجە شەرعیەکان بکرێ.

وە پێویستە هەمووولایەك ئەوە بزانین کە: وەرزش بۆ تەبایی وبرایەتیە، وەپێویستە حیزبایەتی تێدانەبێت. بەداخەوە لەعێراقدا وەرزش لەژێر دەسەڵاتی ڕژێمی ڕوخاوی بەعسدا. کەوتبوە ژێر دەسەڵاتی کەسانی ناشایستەوە. عودەی صەدام حسین، بەبێ ئەوەی بزانێ ڤاچ لەتۆپ بدات. کەچی کرابوو بەسەرۆکی لیژنەی ئۆڵۆمپی عێراق. بەداخەوە لەدەسەڵاتی کوردیشیدا. ئەندام مەکتەبی سیاسی دەکرێتە بەرپرسی لیژنەی ئۆڵۆمپی کوردستان. وەبیری تەسکی حیزبایەتی، وەکو هەموو شتێکی ئەم کوردستانە یاریزان و وەرزشەوانانیشی لەت کردوە. وەلەسەر ئاستی جیهانیش وەرزش خەریکە ئامانجە سەرەکیەکەی خۆی کەپارێزگاری لاشەو دورکەوتنەوەیە لەنەخۆشیە جەستەیی ودەرونیەکان وهەروەها دروست کردنی گیانی برایەتی و خۆشەویستی یە، خەریکە ئەم ئامانجە بنەڕەتیەی خۆی لەدەست دەدات.

ئەویش بەهۆی ئەوی کەسیاسەت چۆتە ناو بواری وەرزشیشەوە. ئەوەتا لەئۆڵۆمپیاتی جیهانی دا، سیاسەت لەکۆنەوە دەستی خستۆتە ناوەوە. لەکاتێکا وڵاتانی دونیا، لەهیچ خاڵێکی تەواو هاوبەشدا بەیەك ناگەن وەکو وەرزش. بۆیە هەموو وڵاتانی سەرزەوی بڕیاریاندا کەوەرزش بکەن بە (سومبولی ئاشتی). هەربۆیە وەکو ئاماژەیەك بۆ ئاشتی سەرتاسەری جیهانی، هەرخولێکی ئۆڵۆمپی پێش دەست پێکردنی بەچەند مانگێك، ئەو مەشخەڵە سەرتاسەری جیهانی پێ دەکرێت ولەدوا وێستگەدا دەگاتە ئەوشارەی کەخولەکەی تێدا ئەنجام دەدرێت.

بەڵام هەندێ جاریش، هەڵگیرسانی جەنگ بۆتە ڕێگر لەبەردەم ئەنجامدانی ئۆڵۆمپیاتی جیهانی. وەکو جەنگی جیهانی دووەم. کەنەیهێشت ئەنجام بدرێت. وەهەندێ جار وەرزش لەپەیامەکەی خۆی لایداوە وبۆتە ڕیکلام بۆبیری لار ولەوێر. وەکو لە (١٩٣٤) دا هیتلەر ئۆڵۆمپیاتەکەی ئەڵمانیای کرد بەپڕوپاگەندە کردن بۆ (نازیزم) وە لە (١٩٣٨) دا مۆسۆلۆنی بۆ (فاشیزم) بەکاری هێنا.

وە لەدیارترین تێکەڵاوبونی سیاسەت لەگەڵ وەرزش لە (١٩٧٤) دابوو. کەئۆڵۆمپیادی (موینخی) فەلەستینیەکان یاریزانانی ئیسرائیلیان تیرۆر کرد.

وە لە (١٩٨٠) دا ئەمریکا وبلۆکی خۆرئاوا بەشداری نەکرد لە ئۆڵۆمپیی مۆسکۆدا. وە لەدوای چوار ساڵ لە (١٩٨٤) دا، یەکیەتی سۆڤیەت وهاوپەیمانەکانی لەبلۆکی خۆرهەلات، تۆڵەی خۆیان کردەوەو بەشداری ئۆڵۆمپیادی لۆس ئەنجەلۆسی نەکرد. وەئەمساڵیش کەخولی ئۆڵۆمپیاد لەپەکینی صینە (٤٢) ملیار دۆلاری تێ دەچێت و دەیان وڵات ناڕازین.

کەواتە: ئەمڕۆ وەرزش وەکو سیاسەت بەکاردەهێنرێت و بەداخەوە لەئامانجی بنەڕەتی خۆی دوری دەخاتەوە. بەئومێدی ئەوەین کەمیللەتی کوردیش کەهیچی لەگەڵنی تر کەمترنیە، بەڵکو ئەگەر بواری بۆبرەخسێ باشترین یاریزان و وەرزشوانی هەیەو جوانترین ولەبارترین شوێنە بۆگەلێك جۆری وەرزش وەکو، مەلەوانی، شاخەوانی، ئەسپ سواری و... هتد...

دەی وەرزش دۆستی بەڕێز: شانازی بەئیسلامەکەتەوە بکە. شانازی بەپێغەمبەرەکەتەوە بکە. وەرە دەست بخەرە ناودەستی ئەو ڕابەرو چاوساغە، کەهەموو شتێکی ژیانی فێرکردی. ئەو پێغەمبەرەی کەنەك هەرسەرکردەیەکی ڕوحی، یان سیاسی، یان کۆمەلایەتی، یان سەربازی بێت بەتەنها. بەڵکو سەرکردەو ڕابەرو سەرمەشق و چاوساغ بوو، لەهەموو بوارێکەوە بەوەرزشیشەوە، دەوەرە گەنجی بەڕێز، لەسەر ڕێبازی ئەو پێغەمبەرە ﷺ لامەدە، بەئەخلاقە جوانەکانی خۆت برازێنەوەو یاریگاو تیپەکەتی پێ جوان بکە.

وەرە لەجیاتی موعجەب بونت بەئەم و ئەوەوە، شانازی بەو ئیسلامەوە بکە کەبۆ یەکەمجارو دواجار لەمێژودا نەیهێشت حکومەت و دەسەڵات، یان بیرو بڕواو ئاین، ئەگەر ئیسلامی پڕ ڕەحمەتیش بێت. دەست وەربداتە بواری وەرزشی وکاری وەرزشەوانی، دڵنیام زۆربەتان ئەو ڕوداومتان بیستوە کەکاتێ لەوڵاتی میصر، لەسەردەمی خەلیفەی دووەم، عومەری کوڕی خەتتاب دا. یاری پێشبڕکێ ی ئەسپ سواری وەکو وەرزشی ساڵانە ئەنجام دەدرێت و هەموو کەسێکی لێهاتوو ئارەزومەندی ئەوبوارە بەشداری تێدا دەکات. بەبێ ئەوەی لێ ی بپرسرێ ئایا موسڵمانە یان نا. هەرچەندە هەڵسوڕێنەرو بەڕێوەبەری یاریەکە وهەموو وڵاتەکەش فەرمانڕەوای موسڵمانان بوە. جا لەکاتی پێشبڕکێ ی ئەسپ سواریەکەدا. کوڕی عەمری کوڕی عاص کەوالی و سەرپەرشتیاری



ولاتی میصر بوه، لەگەڵ گەنجێکی میصری بەلام ناموسڵمان، کە قبطی یە. دەکەونە ئەوەی کە پێش هەموو ئەسپ سوارەکان بدەنەوە ، گەنجە قیبطی یەکە لە نزیکی خاڵی کۆتایی نزیك دەبێتەوەو خەریکە پلەی یەکەمی بەدەست دێنێت. کوڕی عەمری کوڕی عاص. دەبێتە دووەم. بەلام پێ ی ناخۆش دەبێ ولەسەر ئەسپەکەیەوە قەمچیەك لەپشتی گەنجە قبطی یەکە دەدات و ئەویش لەتاو ئازاری پشتی سارد دەبێتەوە وبەمشێوەیە یەکەمیەکە لەدەست دەدات و لەبەرچاوی ئەوهەموو خەڵکە سوکایەتی بەکەسایەتی دەکرێ و زۆر دڵگران دەبێ بەم ستەمەی لەلایەن کوڕی بەرپرسی یەکەمی ولاتەوە لێی کراوە. بەلام خۆئەم کەسێکی بێ دەسەلاتەو هاولاتیەکی سادەیە، بۆیە زۆر غەمبار دەبێ بەلام ئەوەی دڵی پێ خۆش دەکات ئەوەیە، کەبیری دەکەوێتەوە ئیسلام ڕەحمەتە نەك هەربۆ موسڵمانان بەڵکو بۆ هەموو مرۆڤایەتی بەگشتی. با ئەو مرۆڤە هەردین وبیر وباوەڕێکی هەبێ، کەدژی ئاینی ئیسلامیش بێ، بەتایبەت ئەم وەرزشی کردوەو پێشبڕکێ ی کردوەو بەهرەو توانای خۆی نواندوە وستەم و ناحەقی لەکەس نەکردوە. لەبەرئەوە بۆ سەندنەوەی مافی خوراوی لەمیصرەوە لەکیشوەری ئەفریقاوە بەبیاباندا بەڕێ دەکەوێ بۆ کیشوەری ئاسیا و دوای دەیان شەو و ڕۆژ ڕێگابڕین. دەگاتە شاری مەدینە. شارەکەی ئەو پێغەمبەرەی کەلەدوا وەصیەتەکانی ژیانی دا فەرموی: توخوا زۆر ئاگاداری ئەو ناموسڵمانانەبن کە لەدەوڵەتی ئیسلامی دا دەژین.

ئەوانە هاولاتی ولاتن وئەگەر هاودینمان نەبن، هاوژینمانن. دەچێتە خزمەت کەسێك کەپەروەردەکراوی دەستی رَحمة للعالمینَ، دەچێتە لای کەسێك سکالای خۆی دەکات کەووتت عومەر. بەبێ ئەوەی مەبەستت بێ، هەست وهۆشت بۆ ووشەی عەدالەت ودادگەری دەچێت. دەچێتە لای عومەری کوڕی خطاب و سکالای مەزڵومیەتی خۆی دەکات. حەزرەتی عومەریش بەڕێزەوە گوێ ی بۆ دەگرێ و سکالاکەی تۆمار دەکات ودەست بەجێ دەنێرێ بەشوێن عەمری کوڕی عاص و کوڕەکەیدا کەبەبێ دواکەوتن بگەنە مەدینە. هەتا ئەوان دەگەن زۆر بەحورمەتەوە جێگای حەوانەوە وخۆراکی باش بۆگەنجە قیبطی یە میصریەکە دیاری دەکەن. کاتێ عەمر وکوڕەکەی دەگەن وناتوانن نکۆڵی بکەن لەوەی کەداوای ئەم گەنجە ڕاست نیە. حەزرەتی عومەر بڕیار دەدات کەبەهەمان وئەو قەمچیەی کەلەپشتی ئەم دراوە، لەپشتی کوڕەکەی عەمری

کوڕی عاص بدرێتەوە. بەدەستی گەنجە زوڵملێکراوەکە خۆی، بۆئەوەی دڵی ئاسودەببێ، بەڵام پێشی دەڵێ: حەزدەکەم پێش ئەوەی لەکوڕەکەی عەمر بدەی وەرە قەمچی لەسەرە ڕوتاوەکەی باوکی بدە. چونکەکوڕەکەی بەپشتی باوکی نازیویەتی و ئەوا لەخۆی بایی بووەو توانیویەتی قەمچی لەپشتی خەڵکی بدات و وەرزش بکاتە جێگای خۆنواندنی کورە ئەمیرایەتی. بەڵام گەنجە قیبطی یە کە ڕازی نەبوو بەوەو ووتی: باوکی لەوێ نەبووەو مافم لەسەر کوڕەکەی هەیە ولەبەرچاوی هەموو خەڵکەکە قەمچیەکەی دایەوە لەپشتی و دڵی ئاسودە بوو.

وەحەزرەتی عومەر پێ ی ووت: هەرکاتێك، ڕۆژێك لەڕۆژان ئازاریان دای، یان لەکاروباری حکومی دا کاریان ڕایی نەکردی، ئاوا پەیوەندی بەخۆمەوە بکەوە وئیتر حەقت نەبێت. وەڕوشی کردە عەمر وکوڕەکەی و، ووتە زێڕینە بێ وێنەکەی فەرموو کەدەڵێ: (مَتَى إِسْتَعْبَدْتُمُ النَاسَ وقَدْ ولَدَتْهُمْ أُمّهاتُهُم أحْراراً).

تاکەی خەڵکی دەکەن بەکۆیلە، لەکاتێکا بەئازادی لەدایك بوون..

بەڵێ ئیماندارانی بەڕێز: وەرزش پێویستە بۆ هەموو کەسێك وهەمومان دەتوانین وەرزش ئەنجام بدەین. لانی کەم هەمومان دەتوانین ڕۆژانە ماوەیەکی باش بەپێ بڕۆین. بەئوتومبێل مەچۆ بۆ بازاڕ. هەم بۆلاشەت بەسودە. هەم قەرەباڵغی لەبازاڕ دوردەخەیتەوە. هەم ژینگە پیس ناکەیت. وە وەرزش گەنجان دەپارێزێ لەزۆر نەخۆشی لاشەیی و دەرونی. هەرکاتێ هەستت بەبێزاری و دڵەڕاوکێ کرد. لەگەڵ یەکێك لەهاوڕێکانت وەرزشبکە. سەیری تەمەن و پلە وپایەت مەکە.

چونکە دڵنیابە زۆربەی سیاسەتمەدار وکاربەدەستە گەورەکانی جیهان وناوەندەکانی بڕیار، بەرنامەی وەرزشیان هەیە. وەلەڕوی ئاینیشەوە هیچ کەس بیانوی ئەوەی نیە. کەبەناوی ئاینەوە، ئاینی ئیسلامەوە ڕێگری بکات لەوەرزش و وەرزش کاران.

بە ئومێدی ئەوەی لەکوردستانی خۆشەویستماندا، بەچاوی ڕێزو حورمەتەوە سەیری وەرزشکار بکرێت وبەشتێکی زیادەو ناباش سەیرنەکرێت وهەموولایەك لەش ساغ و تەندروست بین.







**سەرچاوەکان**


١- تەفسیری ئاسان ، بورهان محمد أمین.

٢- صَحیح قِصَص الرَّسُول ﷺ سَعْد یوسف أبوعَزیز ، ج١، ص٢٣٨.

٣- گۆڤاری هەفتانە ، ژمارە: ١٢ ، لە (١٧) ئابی (٢٠٠٨).

٤- وەرزش بە هەمووان ، عەتا ئەحمەد جاف.

٥- تەفسیری ڕامان ، ئەحمەد کاکە محمود ، ل٣٠٧.




الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبهِ أجْمَعين.

ئیمانداران: وا لەکۆتایی مانگی شەعباندایین و هەمووومان چاوەڕێی خۆشەویستێکین. ناوی ئەو خۆشەویستە ئاشنایەلامان و سالانە سەردانمان دەکات و بەهاتنی چاومان ڕون و دڵمان شادە، بەهاتنی و بەخزمەت گەیشتنی پلەی ئیمانمان بەرز دەبێتەوە. لاپەڕەی کردەوەکانمان لەگوناهو تاوان پاك دەبێتەوە. توێشەبەرەی چاکەمان بەپشتیوانی خوا پڕدەبێ لەچاکە. ئەویش مانگی پیرۆزی ڕەمەزانە. ئەو مانگەی کەخوای گەورە بانگمان دەکات و بانگەوازمان بۆ دەکات کەبەجوانی پێشوازی لێ بکەین.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ ﴾ البقرة: ١٨٣.

ئایا تۆش لەڕیزی ئیمانداراندا خۆت ئامادەکردوە بۆ وەلامدانەوەی بانگەوازی خوا کە لەدرێژەی ئایەتەکەدادەفەرموێ: ﴿ طَعَامُ مِسۡكِينٖۖ فَمَن تَطَوَّعَ ﴾. (إن شاء الله) ئامادەین و زۆریش شادمان و دڵخۆشین، بەویستی خوا بەرئەم موژدەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەوین کەدەفەرموێ: (من فَرَّحَ بِدُخُولِ رَمَضانَ، حَرَّمَ اللهُ جَسَدَهُ عَلى النِيرانِ). هەرکەسێ دڵخۆش و شادمان بێت بەهاتنی مانگی ڕەمەزان، خوای گەورە جەستەی ئەو کەسە لەئاگری دۆزەخ حەرام دەکات.

لەپێشوازی و چاوەڕوانی مانگی ڕەمەزانداین، چاوەڕێیین لەگەڵ بینینی مانگی یەك شەوەدا بەو شێوەیە لەخوا بپاڕێینەوە. کەسەرداری پێغەمبەران، خاتەمی ئەنبیاو مورسەلین، حەزرەتی محمدی ئەمین، پێی لەخوا پاڕایەوە.

کەکاتێ مانگی یەك شەوەی دەبینی دەیفەرموو: (اللّهُمَّ أَهْلّهُ عَلَيْنا بالَامَنِ والإِيمانِ،والسَّلامَةِ والإِسْلامِ، رَبِّي ورَبّكَ اللهُ، هِلالُ رُشْدٍ وخَيْرٍ). حَدْيثٌ حَسَن، رَواهُ أَحْمَد.

واتە: ئەی پەروەردگارا، ئەم مانگە هەڵبێ بەسەرماندا بەئەمن و ئیمانەوە بەئاشتی و سەلامەتی و ئیسلامەتیەوە. ئەی مانگ پەروەردگاری من و تۆش هەر (الله) یە. مانگی بەرەکەت و خێر.

لەم فەرمودەیەوە تێ دەگەین کە:

١- ئیمان لەوشوێنەیە کەئەمینی لێ بێ، جا ماڵ و ناو خێزان ئەمین و بێدەنگ و بێ شەڕو هەراو ئاژاوە بێ. یان گەڕەك و گوند و شار بێ ئاژاوە بێ. یان وڵات بێ ئاژاوە بێ ئەوە ئیمانیش لەوێیەو دینداری ڕاست و دروست لەوێدا

دەکرێ، چونکە ماڵی بەئاژاوە. گەڕەك و گوندو شاری بەئاژاوە. وڵاتی پڕ لەشەڕو دەنگی تەقەو بۆنی باروت و خوێن، کوفری تێدا دەکرێ، بێ ئەمری خوای تێدا دەکرێ، عیبادەتی خوای گەورەی تێدا ناکرێ و هەموو بەخۆیانەوەو بەدژایەتی یەکتریەوە سەرقاڵ دەبن.

٢- ئیسلام کاتێ خەڵکی سودی لێ وەردەگرن و بەجوانی و وەك و خۆی بانگخوازانی دەتوانن بیگەیەنن بەخەڵکی، کەئاشتی بەرقەرار بێ، خەڵکی وەختێ بەباشی ڕوو لەمزگەوت دەکەن و بەدڵی ئارام و هۆشی تەواوە گوێ لەخوتبەو ئامۆژگاری مامۆستای مزگەوت دەگرن، کەئاشتی هەبێ و ترس نەبێ و دڵەڕاوکێ ی تەقینەوەو کوشتن و فڕاندن. لەئارادا نەبێ.

کەواتە دەتوانین بڵێین کە: ئامانجی ئیسلام بەگشتی و مانگی ڕەمەزان بەتایبەتی بریتی یە لەدابین کردنی ئەمن و ئەمان و ئاشتی و هێمنی و سەلامەتی بۆ مرۆڤەکان.

٣- پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوی لەمانگ کرد و فەرموی: (رَبِّي ورَبُّكَ اللهُ). ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێ، چۆن مانگ لەسەر نەخشەی خوای گەورە دەڕوات و لەو ڕۆژووە کەخوای گەورە دروستی کردوەو خولگەی خۆی بۆ داناوە. تۆزقاڵێك لای نەداوە، هەر بۆیە توشی هیچ گرفت و موشکیلەیەك نابێ و نەبووە، مرۆڤیش ئەگەر ئاوا وەکو مانگ، لەسەر نەخشەی خوای خالیقی بڕوات، کەنەخشەکە ئاینی ئیسلامە، مرۆڤیش ئاوا سەلامەت دەبێ کاری لێ تێك ناچێ و توشی دەردی سەری و لاڕێ بوون نابێت.



٤- پێویستە مرۆڤی موسڵمان لەناخی دڵەوە لەخوا بپاڕێتەوەو بڵێ:

(هِلالُ رُشْدٍ وخَيْرٍ) چونکە ئەگەر لەو مانگەدا، خوا نەکردە، ئاژاوەی ناو خێزان، یان شارو وڵات هەبێ، ئەوا بەڕاستی وەکو پێویست تام و چێژ لەڕۆژوو وەرناگرین و هاتوچۆی مزگەوتمان بۆ ناکرێ و عیبادەتی بەکۆمەڵمان بۆ ئەنجام نادرێت، دەی بائێمەش لەمانگی ڕەمەزاندا زۆر دوعای خێر بکەین، بۆ خۆمان، بۆ دایك و باوکمان. بۆ خێزان و منداڵمان. بۆ موسڵمانان بەگشتی. بۆ خراپە کاران کەخوای گەورە لەم مانگەدا هیدایەتیان بدات، دوعابکەین کەڕزق و ڕۆزی ئێمەو هەموو موسڵمانان فراوان بێت، پڕ بەرەکەت بێت. دوربین لەهەژاری و نەداری و غەمگینی و کزۆڵی وکلۆڵی. بۆنەوەی



بەپشتیوانی خوا بەدڵی گەشەوە بەڕوی خۆشەوە. وەکو برا بەیەکەوە. عیبادەتی خوای خۆمان بکەین. چونکە ئامانجی مرۆڤی موسڵمان لەدنیادا: بون و قەوارە و ژینێکی خواویستانەو، ئاوەدانی و سەروەری نیشتمان و خاك. لەبەرزەخ دا:

گۆڕێکی ڕازاوە و ڕووناك.

لەدوا ڕۆژدا:

ڕەزامەندی و لێبوردنی پەروەردگاری تەنیاو تاك.

دەستە بەربونی هەموانیش بەدوو هۆیە:

یەکەم باوەڕ، دووەم: کار و کردەوەی چاك.

ئیمانداران: بەڕاستی دەبێ دڵخۆش بین بەمانگی ڕەمەزان، نەك وابزانین قورسایی سەرشانە، چونکە هەموو شتێکی گەورەو قازانجێکی گەورە، زەحمەت و ماندو بونی زیادیشی دەوێ.

لەبەرەکەتەکانی مانگی ڕەمەزان:

١. خوای گەورە فەرمانی پێ کردوی و تۆی ئیمانداریش جێبەجێت کردوە.

٢. مانگی ڕەمەزان، مانگی بەرەکەتە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: (أيُّها النَّاسُ أتاكُمْ رَمَضان، شَهْرُ بَرَكَةٍ). ئەی خەڵکینە، مانگی ڕەمەزان بوو بەمیوانتان و هات بۆلاتان. مانگی بەرەکەتە، بەڕاستی هەمووومان هەست بەبەرەکەتی دین و دونیا دەکەین. پارشێوی پڕبەرەکەت، بەئاشکرا بەرەکەت لەخواردن وخواردنەوەو سەرسفرەکانمان دەبینرێ. بەرەکەت دەکەوێتە ڕزق و ڕۆژیمانەوە. بازاڕو ئەهلی کەسابەت هەمووی بازاڕیان دەجوڵێ و بەرهەمیان زیاد دەکات. هەموو کەس هەست بەبەرەکەت دەکات مەگەر کەسێك خۆی بەرەکەتی نەوێت.

٣- ڕەمەزان مانگی ڕەحمەتە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (شَهْرٌ أوَّلُهُ رَحْمَةٌ وأوْسَطُهُ مَغْفِرَةٌ، واخِرُهُ عِتْقٌ مِنَ النَّارِ). مانگی ڕەمەزان سەرەتاکەی ڕەحمەتەو ناوەڕاستەکەی لێخۆشبوونە و کۆتاییەکەشی ئازاد بوونە لەئاگر.

دەی قۆناغ بەقۆناغ لەگەڵیدا برۆ.

٤- ڕەمەزان مانگی بەهەشتە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (إذا جاءَ رَمَضانُ، فُتِحَتْ أبْوابُ الجَنَّةِ، وغُلِّقَتْ أبْوابُ النَّارِ، وصُفِدَتِ الشَّياطينُ).

واتە: هەرکاتێ مانگی ڕەمەزان هات، دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوەو، دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن و شەیتانەکان کۆت و بەند دەکرێن.

بەڵێ دەرگاکانی بەهەشت بریتی یە لەمزگەوت، لەنوێژی جەماعەت، تەراویح، مەوعیزەو ووتار، زیکر و یادی خوا، خەتمی قورئان، سەلای پارشێو، دوعای بەربانگ.

ئەمە هەرلەدنیادا، هەموو ڕۆژێ هەست بەم شتانە دەکەین، لەگەڵ ئەوەدا کەدەرگاکانی بەهەشتیش دەخرێنە سەرپشت و هەرکەسێ ئەمڕۆ لەڕەمەزاندا خۆی بخاتە ناو ئەو بەهەشتانەوە سەرەنجام دەچێتە بەهەشتی نەبڕاوەی هەتا هەتایی یەوە.

دەرگاکانی دۆزەخیش: قومارخانە، عەرەق خانە، ڕووتی ئافرەت، زمان شڕی، ڕژدی، بەخیلی، تێری و تەکەبور، کەلەڕەمەزاندا ئەم دەرگایانە کەمرۆڤ بانگ دەکەن بۆ دۆزەخ دادەخرێن. بازاڕیان نامێنێ، خەڵکی تەوبە دەکەن، پەشیمانن کەلەم دەرگایانە یان داوەو بەرەو دۆزەخیان دەبات، بەهەزاران کەس هەتاهەتایە وازیان لێ دێنێ و لەدەرگای بەهەشت دەدا و لەگەرماوی پاککەرەوەی ڕەمەزاندا خۆی خاوێن دەکاتەوە. بەڵێ شەیاتینەکانیش کۆت و زنجیر دەکرێن، ئەوەتا ئیمان لاوازەکانیش خۆی بۆ ئامادە دەکەن، ئەو تۆزو گەردەی لەسەر ئیمانە بەبای ڕەحمەتی ڕەمەزان لادەچێ، سەید قوتب فەرمویەتی: ئیمان وەکو ئاڵتونە، نارزێ و نافەوتێ، جائەو زێڕە یان لەناو زیودایە، یان لەزبڵداندایە. هەیە بەیەك فوو خاوێن دەبێتەوە. هەشە دەبێ بەتەواوی گڵ و خۆڵەکەی لەسەر لاببەی ئەمجا جوانیەکەی دەردەکەوێ، بەڵام هەندێ کاتی دەوێ.

کەواتە: ئەوەی لەمانگی ڕەمەزاندا نەگەڕێتەوە بۆلای خواو سوکایەتی بەمانگی ڕەمەزان بکاو بەبێ عوزری شەرعی بەڕۆژوو نەبێت. ئەوە لەشەیتان پیسترە و هەرخۆی شەیتانە، بەڵام شەیتانی مرۆڤ. (مِنَ الجِنَّةِ والنَّاسِ).

٤- ڕەمەزان مانگی تەوبەیە، مانگی پێداچونەوەی لاپەڕەکانی ژیانمانە. هەموو شەوێك بانگ دەکرێ: (ياباغِيَ الخَيْرِ ثَمِّمْ وأبْشِرْ، وياباغِيَ الشَرَّ أقْصِرْ وأبْصِرِ). ئەی چاکەکار، خەرمانی عیبادەت هاتەوە. موژدەت لێ بێ هەر کۆکردنەوەی دەوێ، هەرچەند نەخۆشی، هەرچەند قەرزاری مەزڵومی. مادام ئەهلی ڕۆژوی هەرفازانجت کردوە و دڵخۆشبە. موژدەت لێ بێ. دڵخۆش بە بەچاکەکانت، چاکتریان بکە، حەسەن بکە بەئەحسەن.





ئەی خراپەکار، تۆش وەرە پەشیمان ببەوە، وەرە تەوبەبکە، تەوبەیەکی ڕاستەقینە با خوالێت خۆش بێ، وەرە ئاشتبەوە لەگەڵ خوا، لەگەڵ ماڵی خوا، لەگەڵ ئیسلام. لەگەڵ ئیمان، لەگەڵ بەختەوەری، لەگەڵ سەرفرازی، لەگەڵ خەڵك، لەگەڵ ماڵ و خێزان و منداڵت، وەرە دەرگای خێرکراوەتەوە و دەرگای شەڕ داخراوە. وەرە بەڵکو ئاخر خێر بی، وەرە لەگەرماوی ڕەمەزاندا خۆت پاك بکەرەوە. (إن شاءالله) خوا لەهەموو ڕابردووە خراپەکەت خۆش دەبێت سەرنجی ئەم ڕووداوە بدەن:

مامۆستای بانگخواز (عەمر خالید) لەکتێبەکەیدا: (قِصَص الهِدايَة). ئەم بەسەرهاتە واقیعی یە سەرنج ڕاکێشەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: کۆمەڵە گەنجێکی خراپەکار لەیەکێك لەوڵاتەکانی کەنداو، یەکیان گرتبوو، ئیش و کاریان ئازاردانی خەڵکی بوو، هەرکەسێك بەو ڕێگایەدا بڕۆیشتایە کەئەوانی لێ بوون، یان کۆمەڵێ جوێن و قسەی ناشرین و ئیهانەی لەم کۆمەڵەوە پێ دەگەیشت ئەگەر بۆیان نەگیرایە، یان ئەگەر بەردەستیان بکەوتایە بەهەمویان لێیان دەداو ئازاریان دەدا. هیچ کەس لەترسی خراپەکاری ئەوان نەیدەتوانی ئوتومبێلەکەی لەو کۆلانە ڕابگرێ، خەڵکی کچ و ژنی خۆیان قەدەغە دەکرد کەبچنە دەرەوە بۆ بازاڕو بۆ سەردان، تاوەکو ئەو باندە دەڕۆیشتن، لەهەمووی خراپتر، بەردەوام چاوەڕێی بانگی نوێژیان دەکرد و دەچونە مزگەوت، بەڵام نەك بۆ نوێژ کردن، بەڵکو بۆ ئازاردانی نوێژکەران و کاتێ خەڵکەکە نوێژیان دادەبەست و دەگەیشتنە ڕکوع و سجود پێڵاویان تێ دەگرتن. هەندێ جار میزیان دەکردە پێڵاوی نوێژ خوێنانی مزگەوتەوە، ئەمانە ئەوەندە شەڕانی و خراپەکاربوون، هەموو کەسێکی بەئەدەب و خاوەن شەخصیەت خۆی لێ دەپاراستن و لەبەر گێچەڵ و خراپەیان شکاتی لێ نەدەکردن و تاقەتی ئەوەی نەبوو. لەگەڵیان ڕووبەڕوو ببێتەوە لەمەحکەمە وبەردەم دادوەردا. چونکە دواتر لەکۆڵی نەدەبونەوە، چەند ساڵێك بەم شێوەیە بوون، تالەیەکێك لەشەوەکانی مانگی ڕەمەزاندا، وەکو جاران. ئەم کۆمەڵە خراپەکارە چونە مزگەوت بۆ ئازاردانی نوێژکەران، لەناو ئەم باندە خراپەکارەدا. گەنجێکی ڕەش ئەسمەری (تاقانەی کەس وکاری) تیادابوو. کەلەهەمویان تاوانبارتر ودڕەندەتر بوو. لەوشەوەی مانگی ڕەمەزاندا جیا لەشەوەکانی تر، ئەو گەنجە هەستێکی

غەریبی بۆهات. پێشنیاری بۆ جەماعەتەکەی کرد کەبچنە مزگەوت بۆ نوێژی عیشا. ئەوانیش ڕازی بوون ودەست نوێژیان هەڵگرت ونوێژی فەرزی عیشایان ئەنجامداو وویستیان بچنە دەرەوە. دوای ئەوەی کەبۆیەکەم جار بوو هیچ خراپەیەکیان نەکردبوو. چونکە ئەو گەنجە کەسەرکردەیان بوو. ئامۆژگاری کردبوون کەئەمجارە بەواقیعی نوێژ دەکەین و ئازاری کەس نادەین. کاتێ وویستیان بڕۆنە دەرەوەی مزگەوت. ئەو گەنجە پێی ووتن: ماوەیەکی زۆرە نوێژم نەکردوە، لێم گەڕێن واموڕتاحم ودەمەوێ بەردەوام بم لەنوێژکردن. ئەوانیش بەجێیان هێشت ولەمزگەوت چونە دەرەوە. ئەو گەنجە بەردەوام بوو لەنوێژکردن، تادرەنگانی شەو. تائەوکاتەی کەخزمەتکاری مزگەوت هاتەلای و پێ ی ووت: نزیکی پارشێو بۆتەوەو دەمەوێ مزگەوت دابخەم. بەڵام ئەوگەنجە ڕەش ئەسمەرە بەتەنها ووشەیەکیش وەڵامی نەدایەوە. بۆیە خزمەتکارەکەی مزگەوت وازی لێ هێناو، ڕۆیشتە دەرەوە. (سُبْحانَ الله) باوکی کوڕە لەماڵەوە هەرچاوەڕێ ی کوڕە تاقانەکەی دەکرد کەبێتەوە.

بەڵام واشەو زۆری ڕابردوەوهێشتا دیارنیە. بۆیە ئاگری جگەر هەڵی گرت ودڵنیابوو کەلەمزگەوت نیە. بەڵام لەناچاری دا لەمجێوری مزگەوتەکەی پرسی: ئەرێ کوڕەکەی منت نەبینیوە ونەهاتۆتە مزگەوت؟! مجێورەکە ووتی: کوڕەکەی تۆ ناناسم. بەڵام گەنجێکی لێ یە ئەمشەو نەبێ لەجەماعەتدا نەمبینیوە. هەرچەندە پێم ووت مزگەوت دادەخەم وەڵامی نەدامەوە. باوکەکە بەدڵە کوتێوە ڕای کرد بۆناو مزگەوت. ئای خوایە تۆ بڵێ ی ئەوەی دەیبینێ ڕاست بێ. تۆ بڵێ ی کوڕە تاقانەکەی ئەوبێ، خۆوا نوێژ دەکات. لێ ی نزیك بۆوە، بەڵێ خۆیەتی. زۆر سوپاسی خوای گەورەی کرد. زۆر دڵخۆش بوو. باوەشی بەکوڕەکەیدا کردو فرمێسکی شادی وخۆشەویستی بەسەر ڕومەت و ڕیشە سپی یەکەیدا هاتە خوارەوە! بەیەکەوە گەڕانەوە بۆ ماڵەوەو کوڕە گەنجەکە داوای گەردن ئازادی لەدایك و باوکی کرد. ئەو دایك و باوکە دڵسۆزەی کەبێ ئومێد نەبوون لەڕەحمی خواو بەردەوام دوعایان بۆ دەکرد. کەخوا هیدایەتی بدات وچاویان ڕۆشن بکات کەکوڕە تاقانەکەیان. جێگای هیوا وئومێدیان ڕوو لەمزگەوت بکات و ببێتە هاوڕێ و هاوەڵی گەنجانی فریشتە ئاسای مزگەوت و واز لەهاوڕێ شەڕانی وخراپەکارەکانی بێنێ. کەکوڕەکەی ئەمان سەرپەرشتیاریان دەکات.

ئەم دایك و باوکە پیرۆزباییان لەکوڕەکەیان کرد کەسوپاس بۆخوا، لەم مانگی



ڕەحمەتەدا گەڕایەوە بۆ ڕەحمەتی خوای أَرْحَمُ الرّاحِمين. (یاڕەبی خوایە لێت دەپاڕێینەوە. چۆن دڵی ئەو دایك و باوکەت خۆش کرد بەتەوبەی کوڕەکەیان.

کوڕە لاسارەکەیان، سەرلارەکەیان، کەبو بەسالآرو مەردو جوان و گەنجی ڕاستەقینەی گەنجینە. بەهۆی ئەوەی کەڕوی کردە خوا. یاڕەبی خوایە لەم پێشوازی مانگی ڕەمەزانەدا. دڵی هەموو ئەو دایك و باوکانەش خۆشکەی کە ئەولادی لارو لەوێریان هەیەو بونە شەڕ بۆیان و بۆ خەڵکی. خوایە هیدایەتیان بدەی وخۆشی بخەیە ناومالْ وخێزانەکانیانەوە. بەتەوبەی ڕۆڵە بێ دینەکانیان. ئامین).

بەڵێ ئیمانداران: هەرلەماڵی ئەو کوڕە گەنجە تەوبەکارەین. دوای ئەوەی دەستی دایك و باوکی ماچ کرد وداوای لێ بوردنی لێ کردن. بەڵێن و پەیمانی پێ دان. کەبەرەو باشی بچێت وداوای لەدایك وباوکی کرد کەبۆ نوێژی بەیانی بەئاگای بهێننەوەو چوە جێگاکەی وخەوت.. دوای چەند کاتژمێرێك وەختی پارشێو هات و دایکی هەڵساو ڕۆیشت بۆلای کوڕەتاقانە خۆشەویستە لەدلآشیرینەکەی، بۆئەوەی بەخەبەری بکاتەوە بۆ پارشێوو پاشان نوێژی بەیانی. بەلآم هەرچەندە دایك سەرەتا هێواش هێواش بانگی دەکرد. کەوەلآم نەبوو. ئەمجا بەدەنگی بەرزتر، کەهەر وەلآم نەبوو. دەست لێدان وڕاوەشاندن. کەچی هیچ وەلآم و جوڵەیەك نیە. بۆیە دایك بەشپرزەیی یەوە بانگی باوکی کوڕەکەی کردو پێ ی ووت کەکوڕەکەیان جوڵەی نیە. باوك پەلاماری کوڕەکەی داو هەرچی جولآندی، نەجولآ!!، دەستی خستە سەردڵی. دڵنیابوو کەگیانی تیانەماوە!! لاإلهَ إلا الله مُحَمَدٌ رَسُولُ الله.

بردیان بۆ مزگەوت بۆ شۆردن وکفن کردن ونوێژی جەنازە. مردوو شۆر لەگەڵ باوکی و یەك دووکەس بردیانە ژوری شۆردنی مردوو. دەستیان کرد بەشتنی، (سُبْحانَ الله) سەیریان کرد. لەگەڵ ئاوپێداکردنی دا. جار بۆجار ئەو ڕەنگە ڕەش ئەسمەریەی ئەو گەنجە مردوە. سپی دەبێ، سپی یەکی جوان وسەرنج ڕاکێش. بەدەست خۆیان نەبوو. بەبینینی ئەم دیمەنە دەستیان کرد بە اللهُ أكبر کردن. (سُبْحانَ الله) تالەشتنی بوونەوە. ئەو گەنجە دەم وچاو ڕەشە، ڕەنگی هەموو لاشەی بوو بەسپی یەکی پاك و بێ گەرد. کەس نازانێ ئەمە تاوانەکانی بوو ڕۆیشتن وسپی بۆوە لەگوناه وچەپەڵی و خراپەکاری. یان مەلائیکەتەکان شۆردیان. یان ئەمە ئەو هەموو دوعا بەکوڵانەبوون، کەلەدڵی

گەرم وچاوی بەفرمێسکی دایك و باوکیەوە بۆ هیدایەتی کرابون، کەهەردەم دەیانگوت: خوایە ڕەحم بەوکورە تاقانەمان بکە بەڕووڕەشی نەیەتەوە بۆ حزورت وخوایە بەڕووی سپی بەخزمەتت بگات.

وا هەموو ئەو دوعایانە بونە پاککردنەوەی و ڕووسپی بوونی. هەرلەدنیادا پێش قەبروقیامەتی. یاخود ئەم سپی بونەوەیە، بەزەیی ورەحمی ئەو خوایە بوو. کەهێندە فراوانە. هەمووشتێ دەگرێتەوە. وائەزانین. هەموویانە، هەزاران سوپاس بۆ ئەو خوایەی کەلەسەر عەرشی پیرۆزی نووسی: (إِنَّ رَحْمَتِي سَبَقَتْ غَضَبِي) بەڕاستی ڕەحمەتم پێش غەزەب و توڕەبونم کەوتوە. بەم شێوەیە ئەم گەنجە عاقیبەت خێربوو. لەمانگی ڕەمەزاندا گەڕایەوە بۆلای خواو زۆر بەسەربەرزی و ڕوو سپی یەوە دونیای بەجێ هێشت، **خوایە گیان هەموولایەکمان** عاقیبەت خێربکەی. ئامین.

٥- لەمانگی ڕەمەزاندا تۆی موسڵمان بەهۆی ئەو برسی بوون وتینووبونەوە، کەئازار بەجەرگت دەگەیەنێ وکاردەکاتە سەرگەدە ودەمت وتەنانەت بۆنی ناودەمت دەگۆڕێ. بەهۆی ئەمانەوە. تۆ دەبی بەخۆشەویستی خوا. ئەمە فەرمودەی پێغەمبەری خوایە ﷺ کەفەرموی: (وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَخَلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللهِ من رِيحِ المِسْكِ). سوێند بەوکەسەی کەنەفسی محمدی بەدەستە کەزاتی (الله) یە. ئەوبۆنەی کەلەدەمی ڕۆژووەوان دێ (کەلای مرۆڤ ناخۆشە) بۆن خۆشترە لای خوای گەورە لەبۆنی میسك!..

(سُبْحانَ الله) نافەرموێ وەکو بۆنی میسك وایە. کەخۆشترین بۆنە. بەڵکو بۆن خۆشترە لەبۆنی میسك. ئای مرۆڤ ئەگەر ڕوو لەخوابێ و بەگوێ ی خوای خۆی بکات. چەند گەورە دەبێت لای خوای گەورە. چەند خۆشەویست دەبێت لەلای خوای گەورە.

٦- پێویستە هەمووومان ئاگاداری ئەوەبین کە: ڕەمەزان مانگی خۆشی وفەڕەحی یە، نەك توڕەیی وترس. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (لِلصَّائِمِ فَرْحَتانِ) بۆ ڕۆژووەوان دوو شادمانی ودڵخۆشی هەیە.

١- (فَرْحَةٌ عِنْدَ فِطْرِهِ) خۆشیەکیان لەکاتی بەربانگ و ڕۆژوو شکاندنی ئێوارەدا، بەڕاستی فەرەحی وخۆشیەکی بێ وێنەیە کاتێ کەمرۆڤی ڕۆژووەوان لەکاتی



بەربانگدا، هەست بەسەرکەوتنێکی گەلێك گەورە دەکات. پاشان هەمومان هەستمان پێ کردوە کەئەو قومە ئاوەی بەربانگ چ تام ولەزەتێکی هەیە. توخوا لەخۆت بپرسە: ئایا لەویانزە مانگەدا هەرگیز بەئەندازەی بەربانگی ئێوارانی ڕەمەزان، تام وچێژت لەئاوو نان کردوە؟! دڵنیام کەنەخێر.

پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بەربانگی دەکردەوە ورۆژوی دەشکاند، دەیفەرموو: (ذَهَبَ الظَّمَأُ، وابْتَلَتِ العُرُوقُ، وثَبَتَ الاجْرُ إنْ شاءَ اللهُ) صَحيح سُنَن أَبي داود، وقالَ الالْباني حَسَنٌ.

واتە: تینوایەتی ڕۆیشت ورەگەکان ودەمارەکان تێراو بوون وپاداشتیش (إن شاء الله) لای خوای گەورە نوسراوەو جێگیر بوە.

٢- خۆشی وشادمانی دوەم بۆ ڕۆژووەوان (وَفَرْحَةٌ عِنْدَ لِقاءِ رَبِّهِ). لەکاتی گەیشتنە بەخوای پەروەردگار. کەمرۆڤ بەدەستی خاڵی دەچێتەوە حزوری خوا. تەنها کردەوەکانی ژیانی دنیای پێ یە. ئالەوکاتەدا کەپاداشتی ڕۆژوەکەی دەبینێ، بەڕاستی شادمان دەبێ. شادمانیەك کەزۆر زیاترە لەشادی و خۆشحاڵی ئەوکەسەی، کە لەوپەڕی تەنگانەو موحتاجی دا. کەهیچ مەجال ودەرفەتێکی لەبەردەستدا نەماوە بۆ پارە پەیداکردن وزۆریش ئاتاج وموحتاجە. ئالەوکاتەدا خەزێنەیەکی گەورەی بێتە بەردەست. ئەوەندە خۆشحاڵە. کەباس ناکرێ.

ئەم ڕۆژووەوانەش کەلەقیامەتا، لەوکاتەدا کەمرۆڤ موحتاجی تەنها یەك چاکەیە وتازە چاکەشی پێ ناکرێ. ئالەوکاتەدا کەئەو هەموو پاداشتە زۆرەی ڕۆژوەکەی دەبینێ. گەلێ لەوکەسە خۆشحاڵترە. کەئەو خەزێنە گەورەی هاتە بەردەست.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (إنَّ لِلصّائِمِ عِنْدَ فِطْرِهِ دَعْوَةٌ ماتُرَدُّ) رَواهُ إِبْنُ ماجَة بِإِسْنادٍ صَحيحٍ.

واتە: ڕۆژووەوان لەکاتی بەربانگدا. کەخەریکە ڕۆژوەکەی دەشکێنێ، دوعاو پاڕانەوەی، داواکاریەك کە لەخوای گەورەی داوا دەکات. ڕەت ناکرێتەوە.

دەی بەخوا ئەگەر مرۆڤ تەنها یەك دوعای گیرابێ لای خوای گەورە، بەسیەتی و لەهەموو گەنجینەی دونیا گەورەترە.

ئیمانداران: پێم خۆشە هەندێ لە فەلسەفەی ڕۆژوو بدوێین:

١- ڕۆژوو ڕوکنێکی ئاینی ئیسلامە. لەدوای شایەتمان ونوێژو زەکات، موسڵمان

کۆڵەکەیەکی ئیسلامەتیەکەی. لەپێنج بنچینەوکۆڵەکەکانی ئیسلامەتی، بریتی یە لەڕۆژووی مانگی پیرۆزی ڕەمەزان.

٢- ڕۆژوو پەروەردەت دەکات. چونکە نەفس بەتێربوون بوغرا دەبێت. دەبێ بەبرسی کردن جڵەوی بگری .. ڕۆژوو دەیسەلمێنێ کە: موسڵمان نەك هەرحەرام ناخوات، بەڵکو بۆ ماوەیەکی دیاری کراو، واز لەخواردن خواردنەوەی حەڵاڵی، ماڵی خۆشی دێنێ ودەم ودەستی لێ نادات. واز لەحەڵاڵی خۆشی، کەهاوسەری ژیانیەتی دێنێ ولێ ی نزیك نابێتەوە. کەواتە: ڕۆژوو گەورەیی وئیرادەی مرۆڤ دەسەلمێنێ. بۆیە هەرکەسێ ڕۆژووی بۆ نەگیرێ، بەبێ عوزر وبەهانەی شەرعی، ئەوە نیشانەی لاوازیەتی، ئایا غەیری ئەم ئیسلامە گەورە، کێ هەیە. کام بەرنامە هەیە. مرۆڤی ئاوا گەورە بەرهەم بهێنێ ودروست بکات؟!

ئیمانداران: یەکێ لەفەلسەفەی ڕۆژوو. ئەوەیە کەسەرکردەی گەل و وڵات پەروەردە دەکات ئەوەتا حەزرەتی یوسف. لەسەر خەزێنەی هەموو دنیابوو. کەچی بەردەوام بەڕۆژوو دەبوو. دەیفەرموو: بۆیە ئەوەندە ڕۆژوو دەگرم. بۆئەوەی هەرگیز تینویەتی وبرسیەتی میللەتم بیرنەچێتەوە. بەردەوام لەیادم بێت کەکەسانێك هەن تینون، برسین، هەژارن، نەدارن، سفرەیان خاڵی یە، گیرفانیان خاڵی یە، سکی برسیان داوایان لێ دەکات.

ئەگەر بەحەڵاڵ تێرنەکرێ، داوای حەرام دەکات، لەبەرئەوە دەبێ خەمیان بخۆم. بەم شێوەیە ڕۆژوو بەردەوام وەکو ڕاوێژکارێکی دڵسۆزو خەمخۆرم، لەگەڵمایەو بەئاگام دێنێتەوە.

بەڵێ بەڕێزان: یەکسانی نێوان سەرکردەومیللەت، کەداواکاری هەموو شۆڕشگێڕان و یەکسانی خوازان و ڕۆشنبیران و چاکسازانە. لەڕۆژوودا دەردەکەوێ.

گەورەترین سەرکردەو دەسەڵاتدار، دەوڵەمەندترین کەس، لەگەڵ بێ کەس ترین و لاوازترین وهەژارترین کەسدا. هیچ جیاوازی نیە لەنێوانیانداو، دەبێ لەیەك کاتدا پارشێو وازی لێ بێنن ولەیەك کات وخولەکدا، بەربانگ بکەنەوە.

بەڵێ خۆشەویستان: ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان دەورەیەکە، خولێکە، بەڵام جیاواز لەو خول ودەورانەی کەمرۆڤ دەیکاتەوە. خولی مانگی ڕەمەزان، هەموو کەسێك






لەژن و پیاو لەگەورەو بەساڵاچوو تا گەنج ومێرد مناڵ ومناڵ، لەدەوڵەمەندو هەژار، لەسەرکردەو سەرباز، لەبەڕێوەبەرو کارگوزار، هەرهەمووی لەیەك کاتداو لەیەك دەوامداو لەیەك وەرزو مانگ و ڕۆژدا، بەشداری ئەوخولە دەکەن.

دەورەی مانگی ڕەمەزان فۆڕمەکەی لەلایەن خوای پەروەردگارەوە دابەش کراوەو لەسەرەوەی نوسراوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ أَيَّامٗا مَّعۡدُودَٰتٖۚ ﴾ البقرة: ١٨٣ - ١٨٤.

هەر تەنها بەوەی کەنیەتت هێنا کەلەم مانگەدا بەڕۆژوویی، ئیتر هیچی تری ناوێ و لەماڵی خۆتەوە، ناوت دەچێتە ڕیزی ئەو ملیار موسڵمانەی کەلەو خولەدا بەشداری دەکەن! جائەم خولەی مانگی ڕەمەزان هەرهی وەرزی هاوین نیە. وەکو خولەکانی مرۆڤ، بەڵکو لەهەموو وەرزەکانی ساڵدا هاتوچۆ دەکات وپایزو زستان و بەهار وهاوین وەکو یەك.

ئەم خولەی تێدادەکرێتەوەو بەماوەی چەند ساڵێك، لەتەواوی ساڵدا دەسوڕێتەوە.. هەدەف وئامانجی خولەکەش (لَعَلَّكُمْ تَتَّقُون) بەدەست هێنانی شەهادەی تەقوایە. کەمرۆڤ وای لێ دێ بەردەوام هەست بەچاودێری خوای پەروەردگاری دەکات وتەنها لەبەرخوا واز لەهەموو قەدەغە کراوەکان دێنێ ومرۆڤێکی بەڕێزی، دەست پاکی، داوێن پاکی، چاو پاکی، زمان پاکی. حەڵاڵ خۆری. دوور لەزەرەرو زیان گەیاندن بەخەڵکی پێ دەگەیەنێ، مرۆڤێك لەم خولەدا پەروەردە دەبێ کەنەك هەرشەڕ لەگەڵ کەس ناکات. نەك قسە بەکەس ناڵێ وسەمعە وکەسایەتی کەس ناڕوخێنێ. نەك شەڕ بەکەس نافرۆشێ، بەڵکو شەڕیش لە کەس ناکڕێ ، بەڵکو ئەگەر شەڕیشیان پێ فرۆشت، قسەی زبرو ترش و تاڵیشیان پێ ووت. ئەگەر ئازاریشیان دا. ئەم تەنها ئەوەندەی وەڵام دەداتەوە کەپێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ فێری کردوە کەبڵێ: (إنِّی صائِمُ) من بەڕۆژووم. من لەخولی مانگی ڕەمەزاندام.

تۆ نادانی من دانام. تۆ نەفامی من فامیدەم. تۆ شەڕانی من ئاشتی خوازم. تۆ شەڕ دەفرۆشی، من کڕیاری نیم، من بەڕۆژووم، من بەڕۆژووم.

بەڕاستی مرۆڤیش هەربەم پەروەردەیە بەختەوەر دەبێ، کەحەزی لەبۆنی خوێن و باروت نەبێ، حەزی لەبۆنی گوڵ بێ، دژی ووشەی ناشیرین بێ، دۆستی ووشەی ناسك وشیرین بێ. ئەگەر خەڵکی (أَخْشَنْ) بوو. ئەو (أَحْسَنْ) بێ!

شاعیر جوانی فەرمووە کەدەڵێ:

خۆشەویستان.
ئەوەی دەستمان لەگەردنی
کێلی ئازادی وەردێنێ.
ئەوەی دواخشتی بنچینەو
دیوانی ستەم دەردێنێ
ئەوەی بارانی بەختیاری.
بەسەر ژیندا دەبارێنێ.
ئەوەی ئەمرۆ دەپشکوێنێ
خونچەی هیوا وئاواتی هەزاران دوێنێ.
بێ چەندوو چوون.
تەنیا هەردوون.
یەکەم: ساغ بونەوە بۆ خوا
دووەم: یەکبون.

٣- فەلسەفەی سێ یەمی مانگی ڕەمەزان ئەوەیە: مانگی ڕەمەزان مانگی چاکەکاری وخێرخوازی یە. ئەوەندەی خێر وخێرات لەمانگی ڕەمەزاندا دەکرێ، بەهەر یانزە مانگەکەی تر، ئەوەندە بەخشندەیی وخێر وخێرات زۆر نی یە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەوەشدا لەلایەنی ماددی ودارایی یەوە کەسێکی هەژار ودەست کورت بوو. بەڵام هەمیشە بەخشندە بوو. بەتایبەت لەمانگی ڕەمەزاندا. لەهەمووکات زیاتری دەبەخشی. صەحابەکان دەفەرموون:

(كانَ النَبِيُّ ﷺ أَكْرَمَ مايَكوُنُ فِي رَمَضانَ. كانَ أَجْودَ مِنَ الرِّيحِ بالخَيْرِ الْمُرْسَلَة).

دەی تۆی ئیمانداریش لەئێستەوە، لەپێشوازی مانگی ڕەمەزاندا، هەوڵ بدە خێرێك ئەنجام بدەی. ئەگەر پەرداخە ئاوێك. یان دەنکە خورمایەکیش بێ بۆ بەربانگی مانگی ڕەمەزان. ئەمرۆ ماڵی دونیات هەیە ولەبەردەستی خۆتایە. سبەینێ نامێنێ ومیراتگر دەبێ خێرت بۆبکات. ئەویش ئەگەر بۆت بکات. دەئەمرۆ بەدەستی خۆت بیبەخشە. بیبەخشە تەنها لەبەرخوا. دوور لەمنەت و ڕیاکاری، دڵنیاش بە ئەو چاکەیە ڕۆژێ دێتەوە ڕێت.

ئەوەی ئەمرۆ تۆ چاکەی لەگەڵ دەکەی و دەستی دەگری وهاوکاری دەکەی، هیچ بەدوری مەزانە ڕۆژێك بێتە پێشەوە. ئەو خێرت پێ بکات. چونکە






هەرگیز دونیا لەسەر بارێك ناوەستێ و ﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ ﴾
آل عمران:١٤٠



ڕۆژان ڕۆژی لەدوایە. سەرنجی ئەم ڕوداوە بدەن بۆزیاتر تێگەیشتن لەم باسە، کەئەم بەسەرهاتە ڕاستەقینەیە لەکتێبی (كَما تَدينُ تُدان) لەنوسینی: سَيِّد عَبْدُالله سَيِّد عبدالرَّحْمن الرفاعي، ص١٦٥، دا باس کراوە بەم شێوەیە: نوسەرو ڕۆژنامەنوسی بەناوبانگی میصری (مصطَفَى أمين) دەڵێ لەساڵی (١٩٦٥) دا، لەسەردەمی جەمال عەبدول ناسردا لەمیصر گیرام وخرامە زیندانەوە. زیندانیەکان زۆر ئەشکەنجە دەدران. لەو شێوازانەی کەسزاو تەعزیبی زیندانیەکانیان پێ دەدا، بریتی بوو لەبرسی کردن و تینووکردن، ڕاستەئازاری برسیەتی زۆر ناخۆشە ، بەڵام هێشتا مرۆڤ لە ئاستی دا تۆزێ خۆی ڕادەگرێ ، بەڵام تینوایەتی بەربەرەکانی لەگەڵ ناکرێ، بەتایبەتی لەوەرزی هاویندا، بەتایبەتتر بۆ کەسێکی وەکو من، کەنەخۆشی شەکرەم هەبوو. وەئەو کەسانەی کەنەخۆشی شەکرەیان لەگەڵە، ئاوێکی زۆر دەخۆنەوە، دوای ئەوەی ماوەی چەند ڕۆژێك ئاویان لێ بڕین تینویەتی ئاگری لەجەرگم بەردا، بەبیانوی چونە سەرئاو، چومە سەرئاوەکەو پەلاماری مەسینەی ئاودەستەکەمدا. بەڵام قەترەیەك ئاوی تێدا نەبوو. ئاودەستەکە پڕبوو لەکلێنس کەخۆیان پێ پاك کردبۆوە. ئەوەندەم تینوو بوو. هەندێ میزی خۆمم خواردەوە!! لەڕۆژی سێ یەمدا میزیشم نەدەهات تامیز بخۆمەوە!.



تینویەتی ئەوەندە پەرێشانی کردم. هەروەکو شێت بەژوری زیندانەکەدا دەگەڕام، بڕوابکەن بەزمان بەردەرگای زیندانەکەم دەلستەوە. دەمگوت بەڵکو پاسەوانەکە ئاوی خواردبێتەوە ودڵۆپە ئاوێکی لێ ڕژابێ و بەردەمم بکەوێ!

هەرکەسێك وەکو من ئازاری تینویەتی نەچەشتبێ. دڵنیابن نازانێ چ ئازارێکم هەبوە لەتینوان. چاوەکانم خەریك بوو بەتەواوی لەبینین دەکەوتن لەتینوان. بەدەوری خۆمدا دەخولامەوەو دەکەوتم. بێ دەنگ دەرگای زیندانەکە زۆر بەئاسپایی کرایەوە، تارماییەك هاتە بەرچاوم. لێم نزیك کەوتەوە سوراحیەکی بەدەستەوە بوو. دەستی ڕاکێشا بۆلام ودایە دەستم. هەرکەدەستم بەری کەوت. ئاوێکی زۆر ساردی تێدابوو، هەرکەپەنجەم بەری کەوت. هەموو لەشم تەزوی پێداهات. شڵەژام. وام زانی شێت بوم ونەوە لەتینوان بەخەیاڵ ئاو دەبینم. پەنجەم خستە ناو سوراحەکەوە. ئاوێکی زۆر ساردی تێدابوو، بەپەنجە

لەرزۆکەکانی هەردوو دەستم توند سوراحیە ئاوەکەم گرت. بەو فورگ وزمانە ووشکەمەوە وویستم بڵێم تۆ کێی. بەڵام دەستی خستە سەردەمی و بەئاماژە پێ ی ووتم. بێدەنگبە! دەرگاکەی بەهێواشی داخستەوەو منیش دەستم کرد بەئاو خواردنەوە.

بەڵام بڕوابکەن هەرگیز وەکو ئەو ئاوانە نەبوو کەپێشتر لەژیانمدا خواردبومەوە. وەدواتریش لەدوای ڕزگاربونم. هەرگیزاو هەرگیز ئاوی وابەلەزەت وبەتامم نەخواردۆتەوە. سوێند بەخوا ئەگەر یەك ملیۆن جونەیهم لابوایە لەوکاتەدا. لەپاداشتی بەخشینی ئەوسوراحیە ئاوەدا، دەمدا بەوپاسەوانەی کەنەشمدەزانی چ کەسە.

تەواوی ئاوەکەم خواردەوە وهەستم کرد وەکو لاشەیەکی مردوو ڕۆحی بەبەردا کرابێتەوە وابوو. کەتێرئاو بووم و چاوەکانم ڕوناکیان بۆ گەڕایەوەو تەواوی ژووره بچکۆلە تاکە کەسیەکەمم بینی. زۆر شادمان بوم. ووتم: بەسمە، ئیتر نانم ناوێ، بەڵکو ڕزگاربونیشم لەزیندان ناوێ. ئەمجا بیرم لەوە دەکردەوە. ئەوپاسەوانەی کەئاوەکەی دامێ کێ بوو. هاتەوە بەرچاوم کەگەنجێکی ڕەش ئەسمەری باڵا کورت بوو. بەڵام لەدڵی خۆمدا ووتم: ئەمە مرۆڤ نەبوو، بەڵکو فریشتە بوو.

خوای گەورە بەهاوارمەوە هات و ئەو فریشتەی لەسەرشێوەی ئەو پاسەوانی زیندانە بۆ ناردم وئەو ئاوەی پێ بەخشیم. چونکە هەرگیز قەناعەتم بۆبەخۆم نەدەکرا کەپاسەوانی زیندان، خێر وچاکەی ئاوای لەدەست بێت!

دوای ماوەیەك کەتۆزێ سزا وتەعزیبمان سوك بوو. کەم کەم خوارن وئاویان دەداینێ. ئیتر لەزیندانی تاکەکەسیەوە بردیانم بۆ قاعەی گەورە کەچەندین زیندانی تێدابوو. لەوێدا بارودۆخی زیندانیەکان باشتر بوو. شوێنەکە ڕووناك بوو. تەنانەت بۆمان هەبوو لەگەڵ پاسەوانەکان قسەبکەین و پارەیان بدەینێ وشتمان لەدەرەوە بۆبکڕن.. ڕۆژێکیان ئەوکەسەم هاتەوە بەرچاو، ئەو پاسەوانەی کەئاوەکەی بۆ هێنام. لەدەرگاکە نزیك بومەوە ولەم دیوو شیشەکانەوە بانگم کرد وهات بۆلام. بەهێواشی ووتم: دەمەوێ چەند قسەیەکت لەگەڵ بکەم. ووتی: فەرموو. وتم: تۆ ئەوکەسە نیت کەئاوەکەت پێدام ولەمردن ڕزگارت کردم؟! ووتی: بەڵێ، من بوم. بەڵام بۆئەوەی هەست بەمنەتێك نەکەی بانەم



ڕونکردنەوەیەت بدەمێ. تۆ من ناناسی. بەڵام من تۆ دەناسمەوە، ڕەنگە لەبیرت بێت پێش (نۆ) ساڵ لەمەوبەر، پیاوێکی جوتیاری گوندنشین. نامەیەکی بۆ بەڕێزت نوسی وحاڵی خۆی بۆباس کردی. کەماوەی (٧) ساڵە پارە کۆدەکاتەوە وخێزانەکەشی پارچە ئاڵتونێکی هەبوە فرۆشتویەتی وبەهەموی مانگایەکیان پێ کڕیوە.

ئەو پیاوە لەنامەیەکدا بۆی نوسیبوی، کەبەکڕینی ئەو مانگایە خۆم وماڵ ومناڵم هەتا بڵێ ی خۆشحاڵ بوین. وامان دەزانی هەموو دنیامان هەیە. ماڵ ومناڵ وخێزانم ڕوو لەخوان ونوێژ دەکەن و ڕۆژوو دەگرن. بەڵام ئەم خۆشحاڵیەمان زۆری نەخایاند، چونکە مانگاکەمان دوای شەش مانگ مردار بۆوە وئیتر خەم وپەژارەو ناڕەحەتی باڵی کێشاوە بەسەرماندا. تکایە بەڵکو لەڕێ ی خێرۆمەندانەوە بەهانا وهاوارمانەوە بێن و بەپشتیوانی خوای گەورە هاوکاریەکمان بکەن.

ئەوپیاوە جوتیارە کەنامەکەی بۆ تۆ نووسی باوکم بوو. ئەوکاتە بەڕێزت سەر نوسەری (أَخْبارُ اليَوْم) بوی و هەموو مانگێکی ڕەمەزان پارەت لەدەوڵەمەندان کۆدەکردەوەو هەموو ئەو هەژارانەی کەلەحاڵی بێ حاڵی خۆیان ئاگاداریان دەکردی. لێکۆڵینەوەت لێ دەکردن وئەوەی ڕاستگۆ بوایەو موستەحەق بوایە لەشەوانی قەدری مانگی ڕەمەزاندا. کۆمەك و یارمەتیت پێ دەگەیاندن. ئێمەش یەکێ بوین لەوماڵە هەژارانە کەباوکم بەونامەیە ئاگاداری کردبوی وئێستا لەبەرچاومە. کەلەشەوی ٢٧ی ڕەمەزاندا هاتی بۆ گوندەکەمان ومانگایەکی زۆر باشت بۆ کڕیبوین. باشتر لەمانگاکەی خۆمان وبەئوتومبێلێکی بارهەڵگر بۆت هێناین بۆ ماڵەوە وهەمومانت شادمان کرد وتەنانەت جل وبەرگی جەژنیشت بۆ هەمومان کرد! دوای ئەو نۆ ساڵە وامن گەورە بوم وبومە پاسەوانی ئەم زیندانە. کاتێ زانیم تۆ مامۆستا (مصطفى أمين)ی. وەچاوم لێ بوو چۆن بەزمان ئەو زەویە وشکە پیسەت ئەلستەوە لەتینواندا. ئەوچاکە وپیاوەتیە گەورەی تۆم هاتەوە بەرچاو کەنۆ ساڵ لەمەوپێش لەگەڵ ئێمەت کرد. هەربۆیە ڕۆحی خۆم خستە مەترسی یەوە. بەئومێدی ئەوەی بتوانم بچوکترین وەفاداری بنوێنم وشتێك لەپاداشتی چاکەکانت بدەمەوە.

بەڵێ ئیماندارانی بەڕێز: ئەم نوسەرە بەڕێزە پێش نۆ ساڵ، بەدەم ئەو ماڵە هەژارەوە هات لەبەرخاتری ڕەزامەندی خوا. بێ هیچ بەرامبەرێك وئومێدێك.

لەوکاتەدا کەلەئەوپەڕی دەسەڵات ودەست ڕۆیشتویدا بوو. کەڕمنگە هەرگیز بیری لەوە نەکردبێتەوە کەڕۆژێ لەڕۆژان کوڕی ئەو پیاوە هەژارە، لەگەورەترین تەنگانەی ژیاندا بەهاواریەوە بێت. ومئەومشمان بیست کەبەڕاستی لەکاتی تەنگانەدا سوراحیەك ئاو، پەداخێك ئاو بەنرخترە لەهەموو سامانی دونیا. دەی تۆی ئیمانداریش وا لەسەرەتای مانگی ڕەمەزان نزیك دەبیتەوە. هەر ئێستا نیەتی لێ بێنە کەببەخشی بە هەژاران، بە نەداران، بە قەرزاران، بە نەخۆشان، بەوانەی کەچاوەڕێ ی تۆن کەخوای گەورە بەهەبون بەسەری کردویتەوە. تۆش ئەو نەبوانە بەسەربکەیتەوە. تۆ یارمەتی برای ئیماندارت بدە.

خوای گەورەش یارمەتیت دەدات. (واللهُ في عَوْنِ العَبْدِ، ماكانَ العَبْدُ في عَوْنِ أخيهِ).. بەوردی گوێ بگرن بۆ فەرمودەی خوای گەورە، کەلەقورئاندا فەرمویەتی: ﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنفُسِكُمْ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ ٱللَّهِ وَمَا تُنفِقُواْ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ﴾ البقرة: ٢٧٢.

(سُبْحانَ الله) ئەم قورئانە چەند سەرنج ڕاکێشە، هەموو ووشەیەکی، بەڵکو هەموو پیتێکی وانەیەکی تایبەتی گەورەمان پێ دەبەخشێ. ئەومتا دەفەرموێ: (وماتُنْفِقُوا من خَيْرٍ فَلانْفُسِكُمْ) بۆخۆتانە، تۆ خێر وچاکە لەگەڵ خەڵك دەکەی کەچی خوای گەورە دەفەرموێ ئەو چاکەیە لەگەڵ خۆتانی دەکەن. بەڵام کەی خوای گەورە لێت وەردەگرێ کە (إبْتِغاءَ وجْهِ الله)بێ.. هیچ ڕیا وروپامایی یەکی تێدا نەبێ. پاشان خوای گەورە دڵنیامان دەکاتەوە لەوەی کەهەرچاکەیەك بکەن، دێتەوە ڕێمان ڕۆژێك فریامان دەکەوێت ولەتەنگانە ڕزگارمان دەکات (يُوَفَّ إلَيْكُمْ) هەروەکو چۆن لەم بەسەرهاتەدا، چاکەی ئەوکەسە لەزینداندا هاتەوە ڕێگای لەشوێنێکدا هاتەوە ڕێ ی، کەهەرگیز بیری نەکردبۆوە لەوێدا. ئەومالە هەژارە کەسێکیان تێدا پەیدابێ، بتوانێ ئاوا یارمەتیان بداتەوە.

لەکۆتایی دا، ئیمانداری بەڕێز: لەئێستاوە هیمەتت بەرزبکە وبڕیاری تەواو بدە. بەپشتیوانی خوای گەورە هیچ ڕۆژویەکی ئەم مانگی ڕەمەزانە ناخۆی وبەویستی خوا بەسەرکەوتویی دەیگری. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (من أفْطَرَ يَوْماً من رَمَضانَ في غَيْرِ رُخْصَةٍ رَخَّصَها اللهُ لَهُ. لَمْ يَقْضِ عَنْهُ صِيامُ الدَّهْرِ وإنْ صامَهُ) رَواهُ التِرْمِذي - كِتابُ الصَّوْم بِرَقَمْ: (٧٢٣).

واتە: هەرکەسێك ڕۆژوویەکی مانگی ڕەمەزان، بەبێ ڕوخصەتێك و مۆڵەتێك کەخوای گەورە مۆڵەتی داوە (وەکو نەخۆشی وسەفەر) بشکێنێ وبەڕۆژوو نەبێ.



ئەوە ئەگەر دوای مانگی ڕەمەزان تەواوی ساڵەکە بەڕۆژوو بێ. هێشتا خێرو پاداشتی ئەو ڕۆژوەی کەبەبێ عورز شکاندویەتی. بۆی قەرەبوو ناکرێتەوە. ڕاستە بەگرتنەوەی گوناهەکەی لەسەر لادەچێت. بەڵام هەرگیز ئەو خێرو پاداشتەی کەهەرخوای گەورە خۆی دەیزانێت چەندە، دەستی ناکەوێتەوە.

ئیمامی زەهەبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەفەرموێ:

ئەوە لای موسڵمانان بەڵگە نەویستێکی بڕیاردراوە چونکە هەرکەس ڕۆژوی ڕەمەزان بێ عوزری نەخۆشی (بێ گومان سەفەرو ئەوانی تریش) بشکێنێت ئەوکەسە لەزیناکارو شەراب خۆر خراپترە، بگرە هەندێك زانا گومانیان لەئیسلامەتیەکەی هەیە، هەن لەڕیزی زەندیق وخراپەکارانی تردا حیسابیان کردون...

خوای گەورە یارمەتیمان بدەی کە بەجوانی پێشوازی لەمانگی ڕەحمەتی ڕەمەزان بکەین وپشتیوانمان بی کە بەجوانترین شێوە بەعیبادەت وخواناسی بیبەینە سەر.

ٱللَّهُمَّ ءَامِينَ



## سەرچاوەکان


١- قورئانی پیرۆز.

٢- تەفسیری ئاسان، بورهان محمد امین.

٣- منهاجُ الصَّالِحین فِي الاداب الإِسْلامِيَّة، محمد عَبدُالعاطي بُحَيْرى، ص١٩٦، ص٢٠١.

٤- گوڵبژێرێك، شعری وەرزێر پشدەری، ل١٦٠.

٥- كَما تَدينُ تُدان، عَبْدُالله سَيِّد عبدالرحْمن الرفاعي، ص١٦٥.

٦- ڕۆژوو، ئازاد نجم الدين، ل١٨.

مانگی ڕەمەزان
وتاری یەکەم

# پێشوازی مانگی
# پڕبەرەکەتی ڕەمەزان



الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمِين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبهِ أجْمَعِين.

ئیمانداران؛ هەزاران هەزار جار سوپاسی خوا دەکەین وصەلاوات دەنێرین بۆ ڕۆحی هەمیشە زیندوی سەروەرو سالارمان، پێغەمبەری ئاخر زەمان. حەزرەتی محمد ﷺ، کەسوپاس بۆخوا ئەمسالیش بەخزمەت مانگی پیرۆزو پڕبەرەکەت و ڕەحمەتی ڕەمەزان شاد بووین. خوایەگیان یارمەتیمان بدە بەجوانی تێ ی دا بەڕۆژوبین وعیبادەتی تێدابکەین ومزگەوتەکانی مالی تۆی تێدا ئاوەدان بکەینەوە. ئەوەی دەیکەین بەهەموو کەم وکوڕیەکەوە، تۆ بەگەورەیی وعەزەمەتی خۆت لێمان قبولْ بکەی.. ئامین. بەم شێوەیە بەخێرهاتنی مانگی ڕەمەزان دەکەین ودەلێین:

بەخێرهاتی مانگی پڕ نوور.
شەمعی دەستمان بۆ ڕێگای دوور.
بەخێرهاتی سونبولی واتای خواناسی.
هەوێنی بۆ خوا سولحان.
مەرحەبا بارانی ڕەحمەت.
کلاو ڕۆژنەی مالی دلمان.
بەخێرهاتی یوسفی نێو دوانزە برا.
لەدەیجور ویەلدای سالدا.
بوی بەشەمع وبووی بەچرا.
بەخێرهاتی لەنێستاوە، ژیلەمۆی ئیمانی دلمان.
چاوەڕوانی باوەشێنی، شاپەڕی پڕسۆزی تۆیە.
بەخێرهاتی کەناری ئارامبەخشی دلْ.
کەشتی هیوا. دەریای ئیحسان.
بەخێرهاتی لەگەلْ خۆتدا، جوانترین دیمەنت هێنا.
تەپلی پارشێو، سەلای بەیان، سفرەی بەربانگ.
ئاپۆرای نوێژی تەراویح.
دوعای بەکولْ، خەتمی قورئان.
بەخێرهاتی کەژاوەی قافلەی خواناسی.
بەخێرهاتی مانگی غوفران.
بەخێرهاتی مانگی قورئان.

بەڕێزان: ئەمڕۆ ئێمە لەلایەنی مادیەوە، چوینەتە پێشەوە، ئەو ئوتومبێلە تازەو پێشکەوتوانەی لەشەقامەکانی ئێمەدان ، بەدەست گەنج و لاوەکانی ئێمەوەن ڕەنگە لە ئەو ولاتەی لێ ی دروست دەکرێ وازۆر نەبێت. کۆشك وتەلار چۆتە ئاسمان، چەندی لەسەرەوە دەبینرێ. ئەوەندەی لەژێر زەوی دایە. بەلام ئەمە پێشکەوتنی ئاگرو ئاسن وچیمەنتۆیەو لەبەرامبەردا:

ویژدان، سۆز، بەزەیی، بەدەم یەکەوە بوون، دراوسێ یەتی، خەم خۆری، قەناعەت، شوکرکردن، ئەمانەمان لا کاڵ بونەتەوە. ئەگەر لەدەستمان نەدابن. کەواتە پێویستیمان بەگۆڕانکاریە. ئەو گۆڕانکاری و بەخۆداچونەوەیەش، پێویستی بەخولێکە بۆ خوێندنی چەند وانەی گەورە وگرنگ. کەدەورەی سالانەی مانگی ڕەمەزانە، ئەم خولە وەکو خولەکانی دونیا نیە. بەڵکو تایبەت نیە بەچین و توێژو تەمەنێکەوە بەڵکو: گەورە وبچوك، ژن وپیاو، لادێ وشار، تاك وخێزان، هەموو چین وتوێژێك تێ ی دا بەشداری دەکات.

لەخولەکەدا نوسراوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴾ البقرة: ١٨٣

بەڵێ هەرچی ئیمانداربێ بۆی هەیە بەشداری ئەم خولە بکات. ئامانجەکەشی بریتی یە لەفێربونی تەقوا. کەڕەوشتی کەسانی موتەقی لەقورئاندا ئەمانەن: ﴿ الٓمٓ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ﴾ البقرة: ١-٢.



ئەمجا خوای گەورە باسی موتەقینمان بۆ دەکات، کەئەمە صیفەتەکانیانە:

١- (الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ): ئەوانەی باوەڕ بەنەبینراوەکان دەهێنن (وەکو خوای گەورەو فریشتەکان و قیامەت و بەهەشت و دۆزەخ). ئەوکەسانەی کەئەگەر هیچ کەسیش چاوی لێیان نەبوو. یەقینیان هەیە کەخالیقیان چاوی لێیانە. لەبەرئەوە لەبەرخوا وچاودێری خوا بەسەریانەوە دەست لەخراپە دەکێشنەوە، کەبەڕاستی هەرئەمەشە مرۆڤ ئیصلاح دەکات کەبڵێ: أَيْنَ الله؟ خۆکەکەس چاوی لێم نیە. (الله) چاوی لێمە. ئیمانی بەوە هەبێ دونیا هەرئەم چوار پێنج ڕۆژە نیە. بەڵکو قیامەت هەیە، پاداشت وسزا هەیە. دونیایەکی تر هەیە. نەك بڵێ: ئەونانە نانە ئەمڕۆ لەخوانە. نەك بڵێ: حازر بەقەرز مەدە. ئاخر ئەگەر بڕوات بەقیامەت نەبێ، حازرەکەشت دەفەوتێ. ئەمە صیفاتی یەکەمی



موتەڤین، کەبڕوایان بەغەیب هەیە.

٢- (ويُقِمُونَ الصَّلاة): نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن. دڵیان شاد دەبێ بەوەی کەنوێژەکەیان لەکاتی خۆیداو لەمزگەوتاو بەجەماعەت کردوە. چاویان گەش دەبێ کەدەبینن مزگەوت جمەی دێ لەنوێژخوێنان،کە (سِماهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ من أثر السُّجُود). دەم و چاوانێکی گەش وسپی. کە ڕووناکی ناخ ودڵ ودەرونیان لەدەم و چاویاندا دەردەکەوێ. کەبەرهەمی نوێژەکانیانە.

٣- (ومِمّا رَزَقْناهُمْ يُنْفِقُونَ): لەو رزق وڕۆزیە حەلاڵەی پێمان بەخشیون، دەبەخشن. ئەگەر پارە وسەروەت وسامانیان هەبوو. لەوە دەبەخشن. چونکە دەزانن ئەمەیان بەئازایەتی خۆیان پەیدانەکردوە. ئەمە ئەمانەتی خوایە لەبەردەستیاندا..

ئەگەر عیلم وزانیاریان هەبوو. لێ ی دەبەخشن وخەڵکی فێردەکەن. لەوحەیاو حورمەتەی کەلەڕەوشتە بەرزەکانی ئیسلامەتیەوە وەریان گرتوە، بەشی کەسانی تریشی لێ دەدەن وحەزدەکەن خەڵکیش وابێ. ئەو خوشکەی کەحیجابی لەبەردایە و باڵاپۆشە، حەزدەکات لەو بەرگی حەیا وحورمەتە. لەو سەرپۆشە کە تاجی زێڕینە، خەڵکیش بەشی هەبێت.

ئەمە سێ صیفەتی سەرەکی موتتەڤین بوون، کەخوای گەورە لەقورئاندا دیاری کردون. دەی ئەم سێ صیفەتە، هەرسێکیان لەڕۆژووی مانگی ڕەمەزاندا دەبینرێن. وەکو: ئەوە ئیمان هێنانە بەغەیب، کەکەسێك بەبێ ئەوەی هیچ کەس پێ ی بزانێ خۆی لەخواردنەوەی ئاوی سارد دەگرێتەوە لەکاتێکا کەجەرگی کزەی لێ دێ لەتینوان. نەك هەرناوەکە ناخواتەوە. لەکاتی دەست نوێژدا، بەحەزەرەوە ئاو لەدەمی ڕادەدات، نەوەکو پرپشکێ، دڵۆپی ئاو بپەڕێتە قورگی یەوە ئەمە ئەوپەڕی ئیمان بونە بەغەیب، بەخوای گەورە، بەو فریشتانەی کەکردەوەکانی مرۆڤ دەنوسن، بەوقیامەت و بەهەشتە خۆشەی کەبۆئەهلی ئیمان دانراوە.

وەهەروەها لەمانگی ڕەمەزاندا، بەجوانترین شێوە نوێژ دەکرێت. ئەوەی کەکەم نوێژیش بوە مەردانە قۆڵی لێ هەڵدەکات ویەك نوێژی نافەوتێ، ئەوەی مزگەوتی بۆ جەماعەت نەبینیوە، هەموو نوێژەکانی بەجەماعەت لەمزگەوتا

دەکات.

نەك هەربۆ نوێژە فەرزەکان بەڵکو بەشەوق وزەوقەوە نوێژی تەراویح بەجەماعەت لەمزگەوتا دەکات. ماوەیەکی زۆر دەمێنێتەوە بۆ گوێ گرتن لەئامۆژگاریەکانی ڕەمەزان و ووتاری عەسران و شەوان. بەڕاستی چاوی ڕۆشن دەبێ بەنوێژەکانی لەمانگی ڕەمەزاندا.

وە پاشانیش صیفەتی سێ یەمی موتەقین کەبریتی یە لەوەی:

دەبەخشن لەوماڵەی کەخوای گەورە پێ ی بەخشیوون. ئەوە بەڕاستی زۆر بەجوانی لەمانگی ڕەمەزاندا بەخشین وخێرو خێرات و دەست گیرۆیی هەزاران دەبینرێ. تەنانەت هەرکەوتت ڕەمەزان یەکسەر بەخشین و صەدەقەو زەکات وسەرفیترە، دێتە بەرچاو. دڵەکان والادەبن. دەستەکان کراوە دەبن. دەرونەکان سەخی دەبن. هەژارەکان دڵشاد دەبن.. بەم شێوەیە مرۆڤ لەخولی ساڵانەی مانگی ڕەمەزاندا، بەڕاستی فێری تەقوا دەبێت وبەکردەوە لەژیانی دا بەرجەستە دەبێت.

٤- یەکێکی تر لەصیفاتی موتەقین ئەوەیە کەخوای گەورە دەفەرموێت:
﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ﴾ الاعراف: ٢٠١.

واتە: بەڕاستی ئەوانەی کەپارێزکارو تەقوادار بوون.کاتێك خەتەرەوخەیاڵێك لەلایەن شەیتانەوە توشیان بێت. ئەوە خێرا بێداردەبنەوەو خوای خۆیان بیردەکەوێتەوەو هۆشیار دەبنەوە، ئیتر دەستبەجێ بینادەبن وبەرچاویان ڕوون دەبێت – ڕێبازی ڕاست بەدی دەکەن ولێیان ناشێوێت.. ٧٤

بەڵێ لەخولی بەرۆژوو بونی مانگی ڕەمەزاندا، موسڵمان بەئاگادێتەوەو ئەفرەت لەشەیتان و ڕێبازی شەیتان سیفەتان دەکات. بەڵێ ئەوەی لەم ڕەمەزانەدا بەئاگانەیەوەتەوە. ئیتر زەحمەتە بەئاگابێتەوە..

٥- پێغەمبەری خوا ﷺ لەباسی صیفاتی موتتەقیندا فەرمویەتی: (لايَبْلُغُ العَبْدُ أَنْ يَكُونَ مِنَ المتَّقينَ، حَتَّى يَدَعَ مالا بَأْسَ بِهِ، حَذَراً مِمَّا بِهِ بَأْس) رَواهُ البُخاري.

واتە: مرۆڤ ناگاتە پلەی تەقواو ڕیزی موتەقین، هەتاوەکو وازنەهێنێت لەوەی کەهیچ شك وگومانی تێدانیە. لەترسی ئەوەی ئەوەکو توشی ئەوشتانە ببێ کەگومانێکیان تێدایە لەحەرام.

واتە: واز لەهەندێ حەڵاڵیش دێنێ بۆئەوەی توشی ئەوشتانە نەبێ کەبۆنی



حەرامیان لێ دێت. ئەوەتا لەڕۆژودا ئەمە بەرجەستە دەبێت، چونکە ڕۆژوەوان لەکاتی بەڕۆژوبون دا، نان وئاوی حەڵاڵی خۆشی. کەماڵی خۆیەتی. نایخوات. ئەوئاوە ساردە، ئەو هەموو میوەو خۆراکە لەبەردەستیایەتی. حەڵاڵی خۆیەتی، هی ماڵی خۆیەتی، بەپارەی خۆی کڕیویەتی، کەچی ئەگەر نیودەقیقەی مابێ بۆ بانگ. دەمی لێ نادات و نایخوات ونایخواتەوە. ئیتر چۆن حەرامی پێ دەخورێ؟! ئیتر چۆن دەست بۆ ماڵی حەرامی خەڵك ئەبات؟ چۆن دزی دەکات؟! چۆن غەش وخیانەت دەکات؟! نەخێر نایکات. چونکە ئەم موسڵمانە، بۆیە ڕۆژوی مانگی ڕەمەزانی گرتوە بۆئەوەی فێری تەقوا ببێت. تەقواش لەگۆڕانکاریدا دەردەکەوێ، کەبەسەر ڕەوشت وگوفتاروکرداری مرۆڤدا هاتووە، لەخراپەوە بۆ چاك. لەچاکەوە بۆ چاکتر. بەڵێ، هەروەکو گۆڕانی دروست کرد لەخواردن وخواردنەوەتدا وژەمەکانی گۆڕی. نانی بەیانیانت بردە پارشێو، پێش بانگی بەیانی، کەیانزە مانگی ڕابردوو هەرگیز وات نەکردوە. ژەمی نیوەڕۆت بۆماوەی یەك مانگ لابرد. لەتەواوی ڕۆژدا ئاوت نەخواردەوە. ئایا بەهەمان شێوە ڕەوشت وئاکار یشت گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ئایا هاتنت بۆناو مزگەوت وجەماعەت وتەراویح لەگەڵ پێش ڕەمەزاندا گۆڕانی بەسەردا هاتوە، یان هەروەکو جارانی وهەرجومعە وجومعە مزگەوت دەبینی؟! جائەگەر ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان صیفەتی تەقوادارنی تێدا دروست نەکردی کەباسمان کرد. ئەوە دیارە تەنها هاتوچۆی خولەکەت کردوەو وانەکانت نەخوێندوەو ڕێك وەکو ئەوکەسە وای. کەلەخولێکدا بەشداری دەکات، بەڵام تەنها بەلاشە لەوێ یەو هیچ وانەیەك ناخوێنێ وهیچ لەزانست و زانیاری زیاد ناکات وتەنها ماندوبونێکی بۆدەمێنێتەوەو لەوسەرەوە هیچ بڕوانامەیەك بەدەست ناهێنێ ولەسەر کارتەکەی دەنوسرێ: (من لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ والعَمَلَ بِهِ، فَلَيْسَ لِلَّهِ حاجَةٌ في أنْ يَدَعَ طَعامَهُ وشَرابَهُ). رَواهُ أحمد (٩٨٠٠) وصَحَّحَهُ الالْباني في صَحيح الجامِع (٦٥٣٩)

حەزرەتی رسول الله ﷺ فەرمویەتی: هەرکەسێك لەکاتی بەڕۆژوبوندا، واز لەقسەی درۆ ونابەجێ نەهێنێ و واز لەکردەوەکردن بەقسەی بەتاڵ وبوختان نەهێنێ، (واتە هەربوختانێکی بیست یەکسەر بڕوا بکاو کاردانەوەی بۆی هەبێ) ئەوە بەڕاستی خوای گەورە هیچ پێویستی بەوەنیە کەئەوکەسە واز لەخواردن و خواردنەوە بێنێ).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی ونەگەر ووریای خۆت نەبی، چۆن

ئاگات لەخۆتە کەقومە ئاوێك. تەنانەت دڵۆپە ئاوێکیش نەپەڕێتە گەروتەوە. وەپارچەیەکی بچوك خۆراك نەچێتە گەدەتەوە، دەبێ زۆر لەوە زیاتر ئاگاداربی کەقسەی درۆ وغەیبەت وبوختان بەدەمتا نەیەت، ڕووت گرژ نەبێ، زمانت شڕنەبێ، چاوت پیس نەبێ لەسەر ماڵ ومناڵی خەڵك نەبێ. چونکە ئەوکەسانە لەسەر بڕوانامەکەیان دەنوسرێ: دەرنەچوە، چونکە: (رُبَّ صائمٍ لَيْسَ لَهُ من صِيامِهِ إلا الجُوعُ) - رَواهُ إبْنُ ماجَة، وحَسَّنَهُ الالْباني في صَحيح الجامع بِرَقَمْ: (٣٤٨٨)

واتە: هەندێ ڕۆژوەوان هەن لەڕۆژووگرتنەکەیاندا تەنها برسیەتیان بۆ دەمێنێتەوە.

شاعیر جوانی فەرمووە کەدەڵێ:

واعْلَمْ بِأَنَّكَ لاتَنالُ قُبُولَهُ.... حَتَّى تَكوُنَ تَصُومَهُ وتَصُونَهُ.

واتە: بزانە تۆ ناگەی بەپلەی قبوڵ بونی ڕۆژوو لای خوای گەورەو پاداشتی ڕۆژوەکەت مسۆگەر ناکەی، تاوەکو چۆن بەڕۆژوو بوی. ئاواش نەیپارێزی لەوشتانەی کەخێر وپاداشتی ڕۆژوو بەتاڵ دەکەنەوە. لەگوفتار وکرداری ناشەرعی، کەلەڕەمەزان وغەیری ڕەمەزانیشدا حەرامن.

خۆشبەختی بۆ ئەو کەسانەش کەلەکۆتایی خولی مانگی ڕەمەزاندا. لەسەر بڕوانامەکەیان دەنوسرێ: (من صامَ رَمَضانَ إيماناً واحْتِساباً، غُفِرَ لَهُ ماتَقَدَّمَ من ذَنْبِهِ) مُتَّفَق عَلَيْهِ..

واتە: هەرکەسێك مانگی ڕەمەزان بەڕۆژووبێت، بەبیر وباوەڕێکی تەواو بەپاداشتی خواوە نەك وەکو چاولێکەری وخوو پێوەگرتنێك. بەڵکو بەردەوام چاوی لەپاداشتەکەی بێت وبەتەماع بێت بۆ کۆکردنەوەی چاکەی زیاتر، ئەوە خوا خۆشدەبێت لەگوناهی ڕابردوی و لاپەڕەی کردەوەکانی کەبەڕەش وتاوان پڕبونەتەوە. سپی دەبنەوە. خوای گەورە بمانگێڕی بەیەکێ لەوکەسانەی کەئاوا بەسەرفرازی و بەختەوەری یەوە خولی مانگی ڕەمەزان تەواو دەکەن.

ئیمانداران: خەڵکی بەرامبەر مانگی ڕەمەزان چەند دەستە وچینێکن: چینێکی ناوکۆمەڵگا بەبێ عوزرو بەهانە ناچنە ناو خولەکەوە ودور ونزیك بەشداری ناکەن، ئەوانەن کەبەڕۆژوو نابن. ئەمانە بڕوایان بەپاك بونەوە نی یە وبڕوایان بەوەنی یە لەخراپەوە بگۆڕێن بۆ چاکە. خراپترینی ئەمانە، ئەوکەسانەن کە بەئاشکرا وبێ شەرمانە دەخۆن ودەخۆنەوە. ئەمانە هەرچەند بەناسنامە موسڵمانن، بەڵام ئەگەر تەوبە نەکەن. لەجولەکە خراپترن. بۆچی؟



چونكه كاتى خۆى كه‌جوله‌كه له‌م كوردستانه‌دا بون زۆربه‌يان زۆر حورمه‌تى مانگى ڕه‌مه‌زانيان گرتووه. پياوێكى به‌ته‌مه‌نى دانيشتوى سلێمانى. له‌يه‌كێك له‌ڕاديۆكاندا، ووتى: له‌سلێمانى كاتى خۆى جوله‌كه‌يه‌ك دراوسێمان بوو. ئه‌وزه‌مانه چێشتخانه (مَطْبَخْ) له‌ژوره‌وه نه‌بوه و خه‌ڵكى به‌دار وچيلكه ئاگريان كردۆته‌وه‌و له‌حه‌وشه‌دا چێشتيان لێ ناوه.

ئه‌و پياوه به‌ته‌مه‌نه ووتى: هه‌موو ڕه‌مه‌زانێك تامانگى ڕه‌مه‌زان ته‌واو نه‌بووه، ئه‌وماڵه جوله‌كه چێشتى نيوه‌ڕوانيان له‌ماڵى خۆيان و ناوحه‌وشه‌ى خۆيان لێ نه‌ده‌نا، له‌به‌رحورمه‌تى ماڵى ئێمه كه‌دراوسێيان بوين و موسڵمان بوين وبه‌ڕۆژوو بووين!!.به‌ڵام بێ دينه‌كانى ئه‌مڕۆ، هه‌رچى حورمه‌ت و ڕێزبێ نيانه، ته‌ماشاده‌كه‌ى به‌ئاشكرا خواردن وخواردنه‌وه ده‌خۆن و ده‌فرۆشن و وه‌كو سوكايه‌تى كردن نوسراوه: به‌بۆنه‌ى مانگى ڕه‌مه‌زانه‌وه چێشتخانه‌كه‌مان كراوه‌يه!!

يان په‌رده‌يه‌كى درۆزنانه‌يان داداوه‌ته‌وه‌و بۆنى گۆشتى برژاوى لێ دێته ده‌ره‌وه. ئه‌وبه‌ناو په‌رده‌يه كاتى خۆى پێيان ووتوه (ڕوتخانه). به‌ڵێ ناوێكى پڕبه‌پێستيانه چونكه ئه‌وانه شه‌رمه‌زارن، ڕويان نيه به‌وشێوه‌يه خۆيان نيشانى كۆمه‌ڵگا بده‌ن. ئه‌وانه‌ى له‌وديوو په‌رده‌كه‌وه خواردن و خواردنه‌وه ده‌خۆن. بێ شه‌رمانه، به‌زمانى حاڵيان له‌ڕێى ئه‌وپه‌رده‌يه‌وه ده‌ڵێن: ئێمه خه‌جاڵه‌تين، ئێمه تێدا چووين، ئێمه نامۆين به‌كۆمه‌ڵگا. ئێمه دابڕاوين. ئێمه جياوازين له‌خه‌ڵكى خۆمان.. جا ئه‌م چينه كه‌ئاوا به‌بێ عوزرى شه‌رعى به‌ڕۆژوو نابن. وه‌له‌گه‌ڵ به‌ڕۆژوو نه‌بونه‌كه‌شياندا سوكايه‌تى به‌مانگى به‌رز وبه‌ڕێزى ڕه‌مه‌زان ده‌كه‌ن. پێويسته له‌سه‌ر حكومه‌ت و ده‌سه‌ڵات. ئه‌و بێ حورمه‌تانه، بێ حورمه‌تتربكاو به‌نديان بكا وله‌به‌نديخانه‌دا فێرى دين وڕه‌وشت وڕێز بكرێن. ئاشنابكرێنه‌وه به‌كۆمه‌ڵگا موسڵمانه‌كه‌يان ودينه پڕبه‌ره‌كه‌ته‌كه‌يان. چينێكى تر: ئه‌وكه‌سانه‌ن كه‌له‌مانگى ڕه‌مه‌زاندا به‌ڕۆژوو نابن. به‌ڵام به‌هۆى عوزرێكى شه‌رعيه‌وه. كه‌خواى گه‌وره ڕێ ى پێداون به‌ڕۆژوو نه‌بن. كه‌ئه‌مانه‌ش دووبه‌شن: (فَمن كانَ منكُمْ مَريضاً أوْ عَلى سَفَر، فَعِدَّةٌ من أيامٍ أُخَر).

يه‌كه‌م: ئه‌وكه‌سانه‌ى كه‌نه‌خۆشن. كه‌به‌ڕاستى له‌م سه‌رده‌مه‌دا نه‌خۆش زۆره. به‌ونه‌خۆشانه ده‌ڵێين كه‌به‌چاوى پڕله‌فرمێسكه‌وه، به‌دڵى پڕله‌خه‌مه‌وه، له‌تاوى ئه‌وه‌ى كه‌له‌به‌ر نه‌خۆشى ناتوانن ڕۆژووى ڕه‌مه‌زان بگرن. له‌زانايانى ئيسلام

دەپرسن: حوکمی ئێمەی نەخۆش چی یە؟! وەڵامی ئەوجۆرە کەسانە دەدەینەوەو دەڵێین: لەبەرئەوەی ئێوە لەساغی ولەش ساغیتاندا، ڕۆژووی ڕەمەزانتان بەعەمدی نەخواردوەو ئێستا نەخۆشی ناچاری کردون بەڕۆژوو نەبن.

مزدەتان لێ بێ و دڵتان شادبێ، بەم فەرمودەی دڵسۆزترینی هەموو دڵسۆزان. حەزرەتی محمدی مصطفی ﷺ کەدەفەرموێ: (مايُصيبُ المُسْلِمَ من نَصَبٍ ولا وَصَبٍ، ولاهَمٍّ ولاحَزَنٍ، ولاأذى ولاغَمٍّ. حَتَّى الشَّوْكَةُ يُشاكها. إلا كَفَّرَ اللهُ بِها عَنْ خَطاياهُ). رَواهُ البُخاري ومُسْلِم.

واتە: موسڵمان توشی هەر ئازار وناڕەحەتی وخەم ودڵتەنگی وئازارو لەش بەباریەك ببێ. تەنانەت دڕکێ کەپیادەچێ، ئەوا خوای گەورە دەیکاتە کەفارەتی گوناهەکانی و بەئەندازەی ئەو ئازارە، گوناهی لەسەر ڕەش دەکاتەوە. ئەمە مزدەی یەکەم، کە(إن شاءالله). بەئەندازەی هەموو ئەو ئازارەی لەو نەخۆشیەدا دەیچەژن. بەئەندازەی ئەو دەرزیانەی لەلاشەتان دەدرێ. ئەو دەرمانە تاڵ و ناخۆشانەی کەدەیخۆن. خوای گەورە گوناهتان لەسەر لادەبات.

مزدەی دووەم: مزدەیە لە (رَسُولُ الله) وە ﷺ بۆ یەك بەیەکی نەخۆشانی ئوممەتەکەی ئەوانەی کەلەکاتی لەش ساغی و لاشە تەندروستیاندا، ئەهلی ڕۆژوو نوێژو مزگەوت وتەراویح بوون. ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ مزدەیان دەداتێ کەلەکاتی نەخۆشیەکەیاندا. کەهەرچەندە بەڕۆژووش نین. بەڵام خێر وپاداشتەکەیان هەربەردەوامە وخێرەکەیان ناپچڕێ. ئەمەش دەقی فەرمودەکەی پێغەمبەری خۆشەویستمانە ﷺ کەفەرموی: (إذا ابْتَلى اللهُ العَبْدَ بِبَلاءٍ في جَسَدِهِ، قالَ اللهُ عَزَّوَجَل: (أُكْتُبُوا لَهُ صالِحُ عَمَلِهِ. فَإنْ شَفاهُ غَسَلَهُ وطَهَّرَهُ. وإنْ قَبَضَهُ غُفِرَلَهُ ورَحِمَهُ) - رَواهُ أَحْمَد في مُسْنَدِهِ (١٢٤٤٢) وحَسَّنَهُ الألباني في صَحيح الجامِع بِرَقَمْ: (٢٥٨).

واتە: هەرکاتێ خوای گەورە بەندەی خۆی تاقی کردەوە، بەوەی کە لاشەی نەخۆش بوو. خوای گەورە بەفریشتەکان دەفەرموێ: هەرکردەوەیەکی چاکە لەکاتی ساغیدا وپێش ئەم نەخۆش کەوتنەی کردویەتی وئێستا بەهۆی ئەم لەش بەباری وئازارو نەخۆشیەوە، ناتوانێ وەکو جاران ئەنجامی بدات. ئەی فریشتەکان بەردەوام پاداشتی ئەوکردەوانەی بۆبنوسن. لەساغی دا ڕۆژی چەند سوننەتی کردوە، ئێستا لەکاتی نەخۆشی دا. هەرچەندە نایکات. بەڵام ڕۆژانە پاداشتی ئەوەندە سوننەتەی هەر بۆ بنووسن. جاران کەساغ بوو. پارەی



لەدەستا بوو. هەموو حەفتەیەك ئەوەندە پارەی دەكردە خێرو صەدەقە، ئێستا بەهۆی نەخۆشی یەوە پارەی لەدەستا نەماوە وهەموی لەخۆیدا صەرف دەكات وكاروكەسابەتی بۆ ناكرێ. ئەی فریشتەكان جاران حەفتەی چەندە پاداشتی خێر وخێراتەكەتان بۆ دەنوسی. ئێستاش هەرچەندە خێرەكە ناكات. بەڵام لەپاداشتەكەی كەم مەكەنەوە!!.

(سُبْحانَ الله)، ئەم خوای پەروەردگارە چەند بەرەحم و بەزەیی یە بەرامبەر بەبەندەكانی. بەمەرجێ بەندە خوای خۆی لەیاد نەكات، خوای گەورە هەرگیز لەیادی ناكات.

جا ئەی ئەو نەخۆشانەی، كەلەكاتی لەش ساغیتاندا ئەهلی مزگەوت بوون وبەردەوام هاتوچۆی مزگەوتتان كردوەو لەرەمەزاناندا ئامادەی تەراویح و مەوعیظە ی عەسران و شەوان بوون. بەڵام ئێستا بەهۆی نەخۆشی یەوە لێمان دابڕاون وجێگاتان لەمزگەوتا دیارە. ئەوە موژدەتان لێ بێ. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: بەردەوام خێرو چاكەكەتان هەر بۆ دەنوسرێ. وەفەرموی: ئەگەر ئەو نەخۆشە، چاك بۆوەو خوای گەورەو كاربەجێ شیفای دا. ئەوە لەگوناهەكانی دەیشواتەوە و پاكوخاوێنی دەكاتەوە. ئەگەر بەو نەخۆشیەشەوە مرد. ئەوا لێ ی خۆش دەبێت و رەحمی پێ دەكات. گرنگ ئەوەیە تۆ موسڵمان بی ولەكاروانی صالحان و خواناساندابی. ئەگەر ساغ بوی، ئەوە خۆت ئامادەی. ئەگەر نەخۆش بوی، خوای گەورە لەریزی ئیماندارانی ئەهلی چاكە ومزگەوت داتنابرێ وهەرلەریزی كاروانی خواناساندای. ئەوەتا كاتێ كەپێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ غەزای تەبووك، لەگەڕانەوەدا فەرموی: (لَقَدْ تَرَكْتُمْ بالْمَدينَةِ أَقْواماً، ماسِرْتُمْ مَسيراً، ولاأَنْفَقْتُمْ من نَفَقَةٍ ولاقَطَعْتُمْ من وادٍ، إلا وهُمْ مَعَكُمْ!! قالُوا: يارَسُولَ اللهِ وكَيْفَ يَكونُونَ مَعْنا وهُمْ بالْمَدينَةِ؟! قالَ: حَبَسَهُمُ المَرَضُ) رَواهُ مُسْلِمْ (١٩١١).

واتە: لەناوشاری مەدینەدا كۆمەڵە كەسانێكتان بەجێ هێشتوە، كەهیچ هەنگاوێكیان لەم غەزایەدا لەگەڵ ئێوەدا نەناوە. وەهیچ ماڵ وسامانێكیشیان لەرێگای ئەم غەزایەدا نەبەخشیوە. كەچی هەر هەنگاوێك كەئێوە لەم رێگایەدا نابێتتان. وە هەرماڵ وسامانێك كەبەخشیبێتتان، وە هەرشیوو دۆڵێكتان بڕیبێت. ئەوە ئەوانیشتان لەگەڵ بون ولەخێر وپاداشتا وەكو ئێوە وان!!

صەحابەكان بەسەرسوڕمانەوە ووتیان: جاچۆن ئەوانە لەگەڵ ئێمەدا حیسابن لەئەجر و پاداشتا لای خوا. لەكاتێكا خۆت دەفەرموی، ئەوانە لەناومەدینە

نەهاتونەتە دەرەوە؟! پێغەمبەر ﷺ فەرموی: نەخۆشی نەیهێشت لەگەڵ ئێوە بەشداری ئەوغەزایە بکەن. بەدڵ وبەگیان ئاواتەخواز بوون بەڵام بەهۆی نەخۆشی یەوە نەیانتوانی لەگەڵتان بن. هەربەونیەتە پاکەی خۆیان بەوخۆزگە وئاواتە ڕاستەقینەی ئاودڵیان. خوای گەورە وبەبەزەیی وەکو ئێوە ئەجر وپاداشتی بۆ نوسیوون!.

وەهەروەها پێویستە ئەوەش ڕون بکەینەوە کە: ئەوکەسەی کەنەخۆشە ورۆژوی بۆناگیرێ، ئیتر مانای وانیە کەلەو هەموو بەرەکەتەی مانگی ڕەمەزان خۆی بێ بەش بکات. چونکە مەرج نیە هەموو نەخۆشێ، پەککەوتەی سەرجێگا بێ. بەڵکو ئەی ئەوکەسەی کەتوانای ڕۆیشتن وجوڵەت باشە. ئەمانە بکە:

١- لەبەرچاوی کەسانی ناوماڵەکەت، کەلەگەڵیان دەژی شت مەخۆ. ئاو مەخۆرەوە، ئەوەندە بەپەنهانی ودوور لەچاوی ئەوان. تەنانەت منداڵەکانیش نان وئاو بخۆ. کەهەر هەست نەکەن بەڕۆژووبێت.

٢- زمانت بەزیکری خواو صەلاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ ڕابهێنە، خۆ ئەگەر لەسەر پشتیش کەوتبی دەتوانی ئەم زیکری خوایە بکەی.

٣- ئەگەر توانیت وڤاچت زەوی دەگرت وتوشی کەوتن وئازار نەدەبوی، بەپێ ی توانا هاتوچۆی مزگەوت بکەو جەماعەت وتەراویح وکۆڕی ئامۆژگاری لەدەست مەدە.

٤- بەدڵ وبەکوڵ لەخوای گەورە بپاڕێرەوە، کەبەشیفای خۆی شیفات بدات و بەلەشی ساغەوە بگەڕێیتەوە بۆ ڕیزی ڕۆژووەوانان و ئەهلی مزگەوت، لەنیوەی شەواندا هەڵسەو دەست نوێژێکی پوخت بگرەو دوو ڕکات نوێژ بکەو ڕوو لەخوای گەورە بکەو بپاڕێوەو بەزەلیلی و زەبونی وملی کەچیەوە هاواری بۆببە، کە ڕەحمت پێ بکات و شیفات بدات. دڵنیاش بە لەوەی کەخوای گەورە وەڵامت دەداتەوە.

سەرنجی ئەم ڕوداوە ڕاستەڤینە بدەن: پیاوێك باسی خۆی دەکات ودەڵێت من تووشی نەخۆشیەك هاتم، هەردوو چاوم کوێر بوو، وەزمانم لەڤسەکردن کەوت، دەست وڤاچم لەجوڵەکردن وەستا. چەند مانگێك وابووم. تانەمدەتوانی پێداویستی خۆم جێ بەجێ بکەم وخۆم پاك بکەمەوە. خێزانم تارەتی پێ ی دەکردم وخاوێنی دەکردمەوە! ماوەیەکی زۆر ئاوا مامەوە، هەموو ئەندامەکانی لاشەم لەکارکەوتبوون. تەنها گوێم مابوو. گوێبیستی شت دەبووم. وە عەڤڵ

وهۆشم وەکو جاران ساغ بوو. ڕۆژێکیان گوێم لێ بوو یەکێ لەوکەسانەی کەبۆ سەردانم هاتبوو. لەخێزانمی پرسی: ئێستا چۆنە؟ خێزانم ووتی: بەخوا هەرئەوەیە ماوە. نەلەکۆڵمان دەبێتەوە و بۆخۆی وئێمەش ئیسراحەت بکەین. نەئەوەیە چاکیش ببێتەوە!!

کە ئەوەم لەخێزانەکەم گوێ لێ بوو. کەدیاربوو گەیشتبونە ئەوەی لێم بێزاربن. زۆر بەزەییم بەخۆمدا هاتەوەو ووتم: خوایە گیان، پڕبەدڵ داوات لێ دەکەم تۆ شیفا دەدەیت، من ناڵێم وەکو موعجیزەیەك. بەڵام گەورەیی خۆت لەمندا بنوێنیت، من هیچ هیوام نەماوە. هەرچی دکتۆر هەیە ئیزنیان داوم. ئایا غەیری تۆ ئەی پەروەردگارم کێ چارەسەری منی پێ دەکرێ؟! خوایە خۆت فریام بکەوی.

وەبەئاماژەی چاو کڕنوشێکی بەکوڵم بۆخوای گەورە بردو دەستم کرد بەگریانێکی زۆر بەکوڵ. (سُبْحانَ الله) هەستم کرد هەموو لەشم گەرم داهات وهەمووگیانم هەژاو دەلەرزی. تاگەیشتە ئەو ڕادەیەی ئاگام لەخۆم نەما، ئیتر چەندە ئاگام لەخۆم نەماوە نازانم ماوەی چەند ئاگام لەخۆم نەمابوو. کاتێك هاتمەوە هۆشی خۆم وهەستم کرد دەستم دەجوڵێت! هەستام قاچم جوولاو چاوم کردەوە چاوم دەبینێ، بوومەوە کەسەکەی جاران. زۆر سوپاسی خوای گەورەم کردو هەمووومان زۆر شادمان ودڵخۆش بووین.

خوای گەورەومیهرەبان لەم سەرەتای ڕەمەزانەدا. ئاوا شیفاش بۆهەموو نەخۆشەکان بنێرێ. (إِنَّهُ عَلى مايشاءُ قَدير). وەئەوانیش بەشداریمان لەگەڵ بکەن لەتەراویح و جومعەو جەماعەتدا.



بەڵێ ئیمانداران: لەڕوانگەی شەرعەوە، نەخۆشی سێ جۆرەو سێ حوکمی جیاوازی هەیە:

١- نەخۆشێکە کەکتوپڕ لەمانگی ڕەمەزاندا نەخۆش دەکەوێت. هەرچەندە ئەمرۆ بەڕۆژوو نەبوە. بەڵام بۆ ڕۆژوی بەیانی، بانیەت بێنێ وهەڵسێ پارشێو بکات و ئەگەر دەرمانی هەیە بیخوات و پاشان لەهەروەختێکی ڕۆژەکەدا. کەوتە حاڵەتێکی واوە کەهیلاك دەبوو. توانای لێ دەبڕا، ئەوکاتە با ڕۆژووەکەی بشکێنێ ودوای مانگی ڕەمەزان قەزای بکاتەوە.

٢- نەخۆشێکە لەپێش ڕەمەزاندا نەخۆش بووە و ئێستا چارەسەری سێ

ژەمەی هەیە ودکتۆرێکی پسپۆڕی تایبەتمەندی ئەو نەخۆشی یە. وەموسڵمان وئیمان بوو بەخواو ئیمان و ئیسلام، پێ ی بڵێ: ڕۆژوی ئەم مانگی ڕەمەزانە بۆ ئەم نەخۆشی یەی تۆ زەرەری هەیە. ومنەخۆشیەکەت خراپتر دەبێ یان درەنگتر چاك دەبیتەوە. ئەگەر بێتوو بەڕۆژوو بی ئەوا لەڕوی شەرعەوە، ئەم نەخۆشەش ڕێ ی پێ دراوە بەڕۆژوو نەبێت وهەرکات چاك بۆوە، لەدوای مانگی ڕەمەزان قەزای دەکاتەوە. وە ئەم نەخۆشە پێویست بەوە نی یە کەنیەت بهێنێ و پارشێو بکات. چونکە یەقینی هەیە کەنەمرۆشی هەروەکو دوێنێ یە.

٣- نەخۆشێکە، نەخۆشیەکی درێژخایەنی هەیەو دکتۆرێکی پسپۆڕی شارەزای ئەو نەخۆشی یە، وەموسڵمان و ئیماندار، پێ ی وتووە کە: ئومێدی چاك بونەوەیەکی وای لێ ناکرێ کەبتوانێ بەڕۆژوو بێت. ئەم کەسەش هەر هیچ ڕۆژێك ناگرێت و چونکە ئومێدی چاك بونەوەی نی یە. بەتەمای ئەوەش نی یە قەزای بۆ بکرێتەوە. هەر بۆیە فیدیە دەدات. بەخۆراك یان بەپارە.

هەروەها کەسانێکیش هەن کە ڕۆژوو بۆیان حەرامە. ئەو پیرەی یان ئەو نەخۆشەی کە بەهۆی ڕۆژوەوە بەشێکی لاشەی بفەوتێ ، یان پەککەوتەی بکات ، حەرامە لەسەری کە بەڕۆژوو بێت و پێویستە لەسەری فیدیە بدات.

بەنیسبەت ئافرەتی دووگیان (حامیلە) وشیردەرەوە: ئەگەر دکتۆرەیەکی پسپۆڕی بواری ژنان ومناڵ بوون، پێ ی بڵێ: ئەگەر بێتوو تۆ بەڕۆژوو بی. ئەوا سکەکەت. یان بۆخۆت، توشی مەترسی دەبی. ئەوە ئەو ئافرەتەش دەتوانێ بەڕۆژوو نەبێت و دوای ئەوەی مناڵەکەی بوو. وەگەورە بوو. قەزای ڕۆژوەکەی بکاتەوە.

وە لەشەریعەتی ئیسلامی دا، ڕۆژوو بەمانە ناشکێ:

١- دەرزی بەسمت ودەمار، ئەمە ڕۆژوو ناشکێنێ.

٢- ئاو هەڵواسین. کەسێك بەڕۆژوە، بەڵام نەخۆش دەکەوێت. ئەگەر بتڵێ ئاوی تێ بکرێ باش دەبێت وباری تەندروستی جێگیر دەبێ بەبێ ئەوەی ڕۆژوەکەی بشکێنێ. ئەوە لەلای زۆربەی زانایان، ڕۆژوەکەی ناشکێنێ. هەرچەندە لای مەزهەبی شافیعی ئاوی ژێندەر ڕۆژوو دەشکێنێ. کەڕەنگە بەڵگەیان ئەوەبێ. ئەوکەسەی کەبەڕۆژوە وکەوتە حاڵەتێکەوە کەبگاتە نەخۆشخانە وپێویستی





بەئاو هەڵواسین بێ. ئەوە پێویست ناکات خۆی عەزیەت بدات وعوزری ڕۆژوو شکاندنی هەیە وحوکم بەوە دەکرێ کەبەو ئاو تێکردنە ڕۆژووەکەی شکاوە.

٣- شاف هەڵگرتن. کەسێك ناچاربوو کەڕۆژانە شاف هەڵبگرێ. بەهۆی ئەوەی پلەی گەرمی لەشی زۆر بەرزە . تای لێ یە. یان مایەسیری هەیەو دکتۆر وای بۆ داناوە کەپێویستە بەڕۆژیش بەکاری بهێنێت وتەنها هەڵگرتنی لەپارشێوو بەرێنگدا بەس نیە. ئەوە ئەم کەسە بەم شاف هەڵگرتنە. نەڕۆژووەکەی دەشکێ ونەلەشی گران دەبێ و پێویستی بەخۆشتن نیە.

٤- قەترە، چ لەگوێ. لوت. چاو، بکرێ ڕۆژوو ناشکێنێ. ئەگەر ناچاربوو ڕۆژیش بەکاری بهێنێ. هەرچەندە واباشە کەتەنها لەشەودا تێ ی بکات ولەکاتی بەڕۆژوو بوندا، قەترە بەکارنەهێنێ، بۆئەوەی لەوخیلافە دەرچێ. کەلای مەزهەبی شافیعی بەلایەوە وایە کەقەترە بکرێتە چاوەوە یان لوتەوە یان گوێ وە ڕۆژوو دەشکێنێ..

٥- پەمپی ڕەبۆ لای زۆربەی زانایان ڕۆژوو ناشکێنێ. لای شافیعی یەکان ڕۆژوو دەشکێنێ.

٦- خوێن لەخۆگرتن ڕۆژوو ناشکێنێ، هەر چەندە لەبواری تەندروستی دا باش نیە.

٧- پشکنین (فەحص)ی دامێن بۆ ئافرەت لەلایەن دکتۆرەی ژنەوە بۆ نەخۆشی ژنان ڕۆژوو ناشکێنێ ولەشیشی پێ گران نابێ.

٨- ڕشانەوە. ئەگەر بەئەنقەست نەبێ وقوتی نەداتەوە، ڕۆژوو ناشکێنێ.

پرسیار: ئایا ئافرەت بۆی هەیە کەئەو دەرمانانە بەکاربهێنێ، کەعادەبونەکەی – خوێنی بێ نوێژیەکەی بوەستێ و دوای بخات لەوادەی خۆی. بۆئەوەی لەمانگی ڕەمەزاندا بێنوێژی بەسەردا نەیەت و ڕۆژووەکانی نەخوات؟!

لەوەلامدا دەڵێین: بەڵێ دروستە.بەلام واباشترە بەڕاوێژ لەگەڵ دکتۆری بواری ژنان و منداڵ بون دا بێت و سەربەخۆ دەرمان بەکارنەهێنێت.

وە واباشترە کەئافرەت هیچ جۆرە دەرمانێکی دواخستنی مانگانە، بەکارنەهێنێ و ڕۆژووەکانی بگرێ و ئەوڕۆژانەی بێ نوێژی بەسەرداهات بەڕۆژوو نەبێ

ولەدوای مانگی ڕەمەزان قەزایان بکاتەوەو هیچ لەئەجرو پاداشتی ڕۆژووەکەی کەم نابێتەوەو وەکو ئەوە وایە کەلەمانگی ڕەمەزاندا ڕۆژووەکانی گرتبێ.

چونکە ئەمە بەدەست خۆی نیەو خوای گەورە بەحیکمەتی خۆی لەئافرەتدا دایناوە وهیچ پێویست بەدەستکاری کردنی ناکات. وەپێویستە خوشکان ودایکانی بەڕێز ئەوەبزانن کەلەماوەی بێ نوێژی و خوێنی دوای منالْ بوندا غەیری نوێژو ڕۆژوو قورئان خوێندن و تەوافی کەعبە. ئافرەت بۆی هەیە هەموو زیکرەکان بکات وگوێ لەقورئان بگرێت. بەتایبەتی لەم مانگی ڕەمەزانەدا. گوێ گرتن لەقورئان بکەن بەپیشەیان وزۆربەی کاتەکانی خۆیانی پێ بەسەرببەن..

بەڕێزان: کەسانێك پرسیار دەکەن، ئایا دروستە دەم و ددان شتن بەفلَچەو مەعجون لەکاتێکدا کەبەڕۆژوی؟ بەڵێ دروستە بەمەرجێ هەوڵ بدەی هیچ شتێ قوت نەدەیتەوە. وەبزانن: نینۆك کردن و لابردنی موی لاشە، ڕیش تاشین، ڕۆژوو ناشکێنن. وەلەش پیسی ڕۆژوو بەتاڵ ناکات وهەتا کاتی خۆشتن مرۆڤی موسڵمانی بەڕۆژوو دەتوانێ بەتەیەموم نوێژەکانی بکات. بەهەرحاڵ لەش گرانی ڕۆژوو بەتاڵ ناکاتەوە. ئەگەرچی تابەربانگیش خۆی نەشوات.

وەهەروەها ئافرەت، کەلەخوێنی دوای منالْ بون. یان سوڕی مانگانە پاك دەبێتەوە. هەرچەندە فریاش نەکەوێت خۆی بشوات. بانیەت بێنێ و بەڕۆژو بێ و پاشان لەڕۆژدا کەبۆی گونجا خۆی بشوات. وەئەو ئافرەتانەی کەبەهۆی نەخۆشی یەوە، بەردەوام خوێن دەبینن. ئەوانیش دوای ئەوەی کەسەردانی پزیشکی پسپۆڕیان کردو پێ ی ووترا: کەئەمە خوێنی بێ نوێژی نیەو خوێنی نەخۆشی یە. وە بەعیلاج چارەسەر نەبوو. ئەوە ئەو ئافرەتە بۆی هەیە بەڕۆژووبێت و هەرچەندە لەکاتی ڕۆژوەکەیدا خوێن ببینێت ڕۆژوەکەی بەتاڵ نابێت.

کەسانێك هەن لەم ڕەمەزانەدا لەشیان ساغە، بەلاّم بەهۆی کرێکاری یەوە ناتوانن بەڕۆژووبن ئەوە ئەگەر کەسێك قەرزارێکی وانەبێ، کەوەختی دانەوەی قەرزەکەی هاتبێ، وەئەوەندەی هەبێ کەنان وگوزەرانی خۆی وماڵ ومناڵی دابین بکات بۆئەو مانگی ڕەمەزانە. ئەوە حەرامە بەڕۆژوو نەبێ وهەرکاسپی یەك بکات وڕۆژوی لەسەر بخوات ئەوە پارەکەی حەرامە. ئاخر چۆن دەڵێ ی دنیاش پێ ی دەوێ، ئەی گوایە قیامەت پێ ی ناوێ.





دڵنیابە هەرئەو ماڵ ومناڵەی کەتۆ لەبەرخاتری ئەوان بەڕۆژوو نابی، لەقیامەتا لێت ڕادەکەن ﴿ يَوْمَ يَفِرُّ ٱلْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ ‎وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ‎وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ‎لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ ﴾ عبس: ٣٤ - ٣٧

وەدڵنیاش بین کەڕزق و ڕۆزی تەنها پارەو پوڵ نیە. بەڵکو خوای گەورە بەوە تەعویز و قەرەبوت بۆدەکاتەوە کەتۆ لەبەربەجێ هێنانی فەرمانی خوا، لەو مانگەدا کارو کاسپیت نەکردوە. خوای گەورە لەنەخۆشیەکی وادەتپارێزێ کە ئەگەر ئەو نەخۆشیە ڕوی بکردایە لاشەی خۆت، یان ژن ومناڵت. ئەوا نەك پارەی پەیداکراوی مانگێکت. بەڵکو پارەی ساڵێکت بەشی نەدەکردی و هەمویت لەدەرزی ودەرمان دەداو لەکاسپی چەند مانگیشی دەکردی.

کەواتە: ئەگەر لەم مانگی ڕەمەزانەدا بژێوی ژیانی خۆت وئەوکەسانەی کەتۆ کارو کەسابەتیان بۆ دەکەی لەدایك وباوك وژن ومناڵت، دابینەو موحتاج نی. وەکارەکەشت وایە دەتوانی لەگەڵیا بەڕۆژوش بی، بەڵام کەمتری بکەی. ئەوە بەهیچ شێوەیەك ئەم خێرو بەرەکەت و ڕەحمەت و مەغفیرەتەی خوای گەورە، لەدەست خۆت مەدە وڕەمەزانیش وەرزی عیبادەت وپڕکردنی توێشە بەرەی قیامەتە.

خۆ ئەگەر لەم ڕەمەزانەدا هیچت نیەو ڕۆژانە ئەوەی پەیدای نەکەی نیتە بیخۆی وماڵ ومناڵتی پێ بەڕێوەببەی ئەوا ئیش بکە، بەڵام هەوڵبدە لەبەرچاوی کەس خواردن و ئاو مەخۆ، وەهەوڵبدە هەموو ڕۆژێ لەشەودا نیەت بێنەو هەڵسە پارشێوبکەو بەڕۆژووبە.

هەتا ئەوکاتەی کەلەسەر ئیشەکەت تەواو تینت بۆدێ. ئەمجا ڕۆژوەکەت بشکێنە. بەڵام لەبەرچاوی خەڵکی هیچ مەخۆ، وەلەدڵەوە خەمباربە بۆئەوەی کەنەتتوانی ڕۆژوەکەت ببەیتەسەر. وەلەناخی دڵەوە داوا لەخوابکە، کەئەوەندەت پێ ببەخشێ کەبتوانی لەساڵانی داهاتودا. مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوبی وموحتاجی وئیحتیاجی توشی ئەوەت نەکات کەڕۆژوت بۆ نەگیرێ.

وە هەوڵبدە بەپێ ی توانا بەشداری نوێژی جەماعەت وتەراویحی شەوانە وکۆڕی ئامۆژگاری ڕەمەزان وگوێ گرتن لەقورئان بکەو وامەزانە کەئەگەر ڕۆژوەکەت بۆنەگیرا ئیتر پێویست ناکات بچیتە مزگەوت ولەهەموو خێر وبێرێکی مانگی ڕەمەزان خۆت بێبەش بکەی.

لەکۆتایی ووتارەکەماندا: ڕوولەوکەسانە دەکەین کەتائێستا کەچەند ڕۆژێکی لەمانگی ڕەمەزان ڕۆیشتوە وڕوویان لەعیبادەت وڕۆژوو نەکردوە. وەرن تەوبە بکەن. وەرن بەگوێ ی دوژمنی گەورەتان، شەیتان مەکەن، وەرە هەرئێستا بەڕۆژووبە وخۆت مەخەڵەتێنە بەوەی کەبڵێ ی ساڵێکی تر بەڕۆژوو دەبم، یان دوای ڕەمەزان لەزستاندا قەزای دەکەمەوە. چونکە هیچ کەس نیە بتوانێ زەمانەتی ئەوەت بداتێ کەتائێوارە دەژی، بەڵکو تاخولەکێکی تر لەژیانتا دەبی ومردن یەخەت پێ ناگرێ.

بانگخوازی گەورەی ئیسلام دکتۆر محمد راتب النابلسی، لە (مَوْسوعَة أَسْماءالله الحُسْنَى) دا ج١ ص٢٦٣ دا دەفەرموێ: جارێکیان کەسێکی ناسیاوم نەخۆشیەکی زۆر سەختی گرت و دوای مانەوەیەکی زۆر لەنەخۆشخانە ئەودکتۆرەی کەسەرپەرشتی ئەم نەخۆشەی دەکرد وکەسێکی زۆر شارەزا بوو، بەکەس وکاری ئەونەخۆشە دەڵێت: بیبەنەماڵەوە، چونکە تەنها چوار کاتژمێری تری لەسەر زەوی ماوەو دەمرێت. باڵەناو ژن و مناڵەکەیدا بمرێت باشترە.

وە لەدواساتی ژیانی دا چاوی پێیان بکەوێ وئەوانیش بەدەوریەوە بن. کەس وکاری دەستبەجێ نەخۆشەکە دەبەنە ماڵەوە ودوو سێ کەسیان دەڕۆن لای خۆشنوس لافیتەی بۆ دەنوسن وخێمە وپێویستی پرسە ئامادە دەکەن. بەڵام (سُبْحانَ الله)، ئەم نەخۆشە نەمرد وخوای گەورە شیفای دا وچاك بۆوە. ئەم نەخۆشە، ماوەی (سی) ساڵی تەواو لەدوای ئەونەخۆشی یەوە ژیا، ئەمجا مرد.

بەڵام ئەودکتۆرەی کەپێ ی وتبوو، دوای چوارسەعات دەمرێ، دوای (دوانزە) ساڵ لەم ڕوداوە مرد. واتە: نەخۆشەکە (هەژدە) ساڵ دوای دکتۆرە ساغەکە مرد!!

وە بەبیر خۆشم و ئێوەشی دێنمەوە: کەڕاستە وەخت زۆر گەرمەو بەڕۆژوو بون سەختە. بەڵام بەسەدان ساڵی تربوە کەڕەمەزان لەم وەختەدا بوەو خەڵکیش لەگەڵ ئەوەدا وەکو ئێستا تێرو تەسەل نەبون و بەربانگ و پارشێویان خواردنێکی زۆر سوك و سادە بوە.

ئەو هەموو خۆراك وخواردنە باشەی ئێستا لەهەموو پارشێوو بەربانگێکدا، لەزۆربەی ماڵەکان وسەرسفرەکان هەیە. لەجەژنیش دا لەسەر سینی وسفرەی خۆیان نەیانبینیوە. وە بەهۆی کزی بواری ئابوری ونەبونی پارەوە. هەمویان






لەکاردابون و درویێنەیان کردوەو تائێواره شوانیان کردوه. کەچی هەربەڕۆژووش بوون. ئەمە بەچی؟ تەنها بەپشت بەستن بەخوا وپاشان هیمەت بەرزی خۆیان.

دەبا ئێمەش هیمەتمان بەرزبێ و هەرچەندە تینوو برسی بین، هیلاك بین، دڵنیابین هەرزیاتر قازانجمانە، چونکە تەنهاو تەنها هەرلەم ڕۆژوو عیبادەتی خوایە پەشیمان نین. وەرن باهەریەکە لەئێمە بیر لەژیانی ڕابردوی خۆی بکاتەوەو تەماشای شریتی ژیانی بکات وبزانێ ئایا ئەوەی کردویەتی لەڕاکەڕاکی ئەم دونیایە، ئایا لەزۆربەی هەرە زۆری پەشیمان نیە. هەیە چەندان جار ژیانی کەوتۆتە مەترسی واوە لەلێواری مەرگ گەڕاوەتەوە. تەنها لەپێناوی کەسێکدا. لەپێناوی فکرەیەکدا کەچی ئێستا ئەوەتا دوای دەیان ساڵ لێ ی پەشیمانەو نەفرەتی لێ دەکات. بەڵام ئایا هەرگیز بوە تۆ پەشیمان بی لەڕۆژویەکی ڕەمەزانت؟ لەجومعەیەکت؟ لەتەراویحێکت؟ لەسوجدەو ڕکوعێکت؟ نەخێر. ئەگەر بەئیخلاص ودور لەڕیا کردبێت، هەرگیز لێ ی پەشیمان نی و نابی. بەڵکو تەنها بەو دڵخۆشی. تەنها ئەوعیبادەتەی بەدڵسۆزی بۆخوات کردبێ، دەست مایەتەو لەکاتی تەنگانەدا پێ ی لەخوای گەورە دەپاڕێیتەوە کەبەهاناو هاوارتەوە بێت.

وە ئەوساتەی کەدواساتی ڕوح دەرچونتە وبۆ دواجار چاوت بەدەوروبەردا دەگێڕی و خواحافیزی یەگجارەکی لەخانوەکەت، لەئوتومبێلەکەت، لەماڵ و سامانەکەت دەکەی کەچەند بەناڕەحەتی پەیدات کرد. خواحافیزی لەژن و مناڵەکانت دەکەی. بۆ دواجار ئەو دونیایە دەبینی کەوات دەزانی بەجێ ی ناهێڵی. ئالەو وەختە چارەنوس سازەدا، لەوکاتی داماوی وبێ کەسیەدا (کەبێ کەسی چونکە کەس ناتوانێ لەمردن ڕزگارت بکات) لەو وەختەدا ئەوەی دڵت خۆش دەکات وفریات دەکەوێ و تروسکەی هیواتە. تەنها تەنها ئەم جومعەو مزگەوت و ڕۆژوی ڕەمەزانەتە، کەدێتەوە بەرچاوت و پێ ی دڵخۆش دەبێ، تەنها ئەو (لا إلهَ إلا الله، مُحَمَّدٌ رَسُولُ الله) یە کەلەکاتی ساغی دا، لەناخی دڵەوە دەتگوت، دێتەوە سەرزمانت و پێ ی سەرفراز دەبی، بەڵام بەخوا گەنج وخەزێنەی قارونت هەبێ و هەموو دونیا حەرەس وحیمایەت بێ و لەکۆشکی پاشایەتی دابی، ئەگەر خواناس نەبوبی، ئەگەر ژینت بەدین نەڕازاندبێتەوە لەسەرەمەرگدا هەمویت لێ دەبێتە دوژمن و هاوار دەکەی وبەزمانی حاڵ دەڵێ ی: ﴿ مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ ﴾ الحاقة: ٢٨- ٢٩.

**خوای گەورەو میهرەبان لێت دەپاڕێینەوە، بەڕەحمەتی خۆت ڕەحممان پێ بکەی، هیدایەتمان بدەی هیممەتمان بەرزکەی کە بە جوانی و چوست و چالاکی یەوە لە خزمەت مانگی ڕەمەزاندابین، نوێژو ڕۆژوو تاعەت و عیبادەتمان لێ قبوڵ بکەی، شیفای نەخۆشەکانمان بدەی، لە مردووەکانمان خۆش بیت، عاقیبەتمان خێربکەی.**

ٱللَّهُمَّ ءَامِينَ



**سەرچاوەکان**




١- قورئانی پیرۆز، لەگەڵ تەفسیری ئاسان.

٢- ڕۆژنامەی یەکگرتوو، ژ: ٦٠٨ لە ٢٠٠٦/٩/٢٦، ل٨ شعری: عوسمان سەنگاوی.

٣- منهاج الصّالِحِين في الآداب الإسْلامِيَّة ، محمد عبدالعاصي بُخَيري، ص٤٩٢.

٤- مَوْسُوعَة من أَخْلاقِ الرَّسُول ﷺ محمود المِصري، ص١٤١.

٥- خۆشماندەوێیت، حاجی کاروان، ب١، ل٣٥٩.

٦- يَسْأَلُونَكَ، د.حِسام الدِّين عَفَّانَة، ج٢، ص٨٥.

٧- مَوْسُوعَة أَسْماء اللهُ الحُسْنَى، د.محمد راتب النابُلُسي، ج١، ص٣٦٢.




# بەخشین
# لەپێناوی
# ڕەزامەندی خوای گەورە





الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِه أجْمَعين.

ئیماندارانی بەڕێز: یەکێ لەودیاردانەی کەمانگی پیرۆزی ڕەمەزان زیاتر دەرازێنێتەوەو قەشەنگترو جوانتر وشیرین تری دەکات، هەردوو چینی ناوکۆمەڵ (دەوڵەمەندو هەژار) ئامادەکاری بۆدەکەن وچاوەڕێ ی دەکەن. یەکیان بە بەخشین و ئەویان بەوەرگرتن. بریتی یە لەزەکات وصەدەقە وخێر وخێرات. جالەو سۆنگەیەوە کەڕەمەزان بەمانگی بەخشین ناسراوە. بەپشتیوانی خوای گەورە لەم ووتارەدا، باسی ئەوکەسانە دەکەین کەدەبەخشن، کەکۆڵی فورس و باری لاری خەڵکی ڕاست دەکەنەوە. لەبەرخاتری خوا، لەگەڵ میحنەتی هەژاراندا دەژین ویارمەتیاندەدەن و غەیری ڕەزامەندی خوای گەورەش، هیچ ئامانج و مەرام و مەبەستێکیان لەوکارەدا نی یە. جابابچینە خزمەت قورئان. ئەوقورئانەی کەمرۆڤ تەنها بەو پەروەردە دەبێت. ئەو قورئانەی کەفێری کۆمەڵکاریمان دەکات. ئەوقورئانەی کەبەتەنها یەك ئایەتی هەموو هۆڕمۆنەکانت پارسەنگ دەکات و بەیەك ئایەتی: ترس وبیم و خۆشەویستی وحەزت، لەیەك سات وکاتدا بۆ دروست دەکات. بەڵێ قورئانە وات لێ دەکات کەلەدنیادا کەسێکی تەمەڵ و چاو لەدەستی خەڵکی نەبی. کەهەبووش بوی بیگەیەنی بەخەڵکی تریش. قورئانەکە ئەو تەوازونە جوانەی دروست کردوە. لەبەرئەوە دڵنیابن، ئەوەی کەیەك ئایەتی قورئان فێرت دەکا وتێت دەگەیەنێ، خوێندنەوەی (سەد) کتێب ئەو تێگەیشتنە وردەت پێ نابەخشێ. دەبابچینە خزمەت ئایەتێکی قورئان کەدەفەرموێ: ﴿ مَن ذَا ٱلَّذِى يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضۡعَافًا كَثِيرَةً وَٱللَّهُ يَقۡبِضُ وَيَبۡصُۜطُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴾ البقرة: ٢٤٥.



فەرمون با بەوردی لەچەند لایەنێکی ئەم ئایەتەو شێوازی تێگەیاندن و پێگەیاندنی موسڵمانان بکۆڵینەوە:

١- دەفەرموێ: (من ذَالَّذي يُقْرِضُ اللهَ)، بە إسْتِفْهامُ پرسیار، نەك بفەرموێ: دەی قەرز بدەن بەخوا (بەئەمر)، چونکە ئاشکرایە (إسْتِفْهامُ) پرسیارکردن جۆرێکە لەهەڵنان و تەشجیع کردن. گوێگر زیاتر ڕادەچڵەکێنێ و بەئاگای دێنێتەوە.

٢- قەرزەکە لەگەڵ کێ یە؟! دەفەرموێ: (يُقْرِضُ اللهَ)، لەگەڵ خوا. خوای گەورە پێویستی بەپارە وپوڵی کەس نیەو (وللهِ خَزائِنُ السّماواتِ والارْضِ). خوای گەورە ئەوخوایەیە کە (وللهِ ميراثُ السّماواتِ والارْضِ).

بەڵام بۆئەوەی کەدڵنیات بکات کەتۆ ئەوپارەی لەپێناوی خوای گەورەدا



دەیبەخشی و نافەوتێ و بۆت پـارێزراوە، بەوشێوەیە دەفەرموێ کێ قەرز دەدات بەخوای گەورە، لـەموختەصەری تەفسـیری (إبْنُ كثير) دا ج١ ص٢٢٢ دا هاتوە کە: خوای گەورە لەفەرمودەی قودسی دا فەرمویەتی: (من يُقرِضُ غَيْرَ عَديمٍ ولاظَلُومٍ).

بۆ زیاتر ڕونکردنەوە، نمونەیەك دێنینەوە (ولِلّهِ المَثَلُ الأعْلى). کەسێك دێتە دوکانەکەت. ئەڵێ ئەوەندە پارەم پێویستە. تۆش ئەوکەسە باش دەناسی، کەکارو کەسابەتی باشی هەیە. ئەهلی متمانەو سیقەیە. زۆر دەوڵەمەندە. موڵك وماڵێکی یەگجار زۆری هەیە. بەردەوام تۆش ئیشت پێ یەتی. تەماشاکە: چەند خۆشحاڵ دەبی کەئەوە فلان کەسە داوای قەرزی لێ کردوم، ئەگەر نەشتبێ دەچی بۆی قەرز دەکەی. دەی تەشبیە نەبێ خوای گەورە لەم بانگەوازەدا دەفەرموێ:

ئەوە کێ یە قەرزێکی جوان دەدات بەخوا؟ (قَرْضاً حَسَناً).

واتە: ماڵی حەڵاڵی خۆت بێ. حەرام نەبێ. چونکە خوای گەورە تەنها ماڵی حەڵاڵت لێ وەردەگرێ، پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ فەرمویەتی: (من كَسَبَ مالا حَراماً، فَتَصَدَّقَ بِهِ، لَمْ يَكُنْ لَهُ فيهِ أَجْرٌ، وكانَ إصْرُهُ عَلَيْهِ). حَديْثٌ حَسَن - رَواهُ إبنُ حَبّان (٣٢١٦) في صَحيحهِ وحَسَنَّهُ الارْناؤوط.

واتە: هەرکەسێك پارە وسامانێکی حەرام بەدەست بێنێ، پاشان خێر وخێراتی لێ بکات.ئەوا چونکە ئەوماڵە حەرامە. خوای گەورە هیچ پاداشتی بۆ نانوسێ. وەتاوان وگوناهەکەشی لەسەرە. هەرچەندە فەقیرو هەژار دەیخوات. بەڵام ئەم تاوانەکەی لەسەر دەنوسرێ، چونکە بەحەرام پەیدای کردوە ومافی خەڵکی پێوەیە.. بەڵێ ئەگەر پارەکەت حەڵاڵ بوو، خوای گەورە بەدەستی خۆی لێت وەردەگرێ. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (ماتَصَدَّقَ عَبْدٌ بِصَدَقَةٍ من مالٍ طَيِّبٍ، وَلايَقْبَلُ اللهُ إلا الطَّيِّبَ، إلا أَخَذَها الرَّحمنُ بِيَمينِهِ) رَواهُ البُخاري (١٤١٠) وَمُسْلِم (١٠١٤).

واتە: هەرکاتێ بەندە خێر وچاکەی کرد لەماڵی حەڵاڵ. کەخوای گەورە ماڵی پاك و حەڵاڵ نەبێت وەری ناگرێ. ئەوا خوای گەورە بەدەستی ڕاستی خۆی وەری دەگرێ! بەڵێ دڵنیابە، هەرخێرێك کەبەدڵسۆزی لەبەرخاتری خوا بیبەخشی. وەماڵەکەشت حەرام نەبێ. بە حەڵاڵی پەیدات کردبێ، مافی کەسی پێوە نەبێ. ئەوە پێش ئەوەی بچێتە دەستی هەژارەکەوە، خوا بۆخۆی لێت وەردەگرێ!

لەکتێبی (السّعي إلى الاخِرَة) کەنوسراوی زانای پایەبەرز شێخ (محمد مُتَولی

الشّعراوی) یە، باسی فاتمەی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات ودەفەرموێ: رۆژێکیان فەخری کائینات، سەرداری پێغەمبەران حەزرەتی محمد ﷺ سەردانی فاتمە ی کچی دەکات. تەماشا دەکات. خاتوو فاتمە دیرهەمێکی بەدەستەوەیەو خاوێنی دەکاتەوە وبەشتێکی زبر، کەشایانی ئاماژە بۆکردنە ئەوە ڕوون بکەینەوە کەدیرهەم لە (زیوو) دروست کراوە ویەکێکە لەو ماددانەی کە (ئۆکساندن) تێ ی دا ڕوونادات. واتە: هەروا بەسپیەتی و پاکی دەمێنێتەوە.بەڵام چونکە زیوو لەخۆی دا ماددەیەکی نەرمەو بەتەنها لەسکە نادرێ. زۆربەی جار ماددەیەکی تری لەگەڵ تێکەڵ دەکرێ. کەتوندی دەکات و پێ ی قایم دەبێ و ئەمجا لەسکە دەدرێ و دەکرێ بەپارە. جا کەئەو ماددەیەی تری تێکرا. توشی (ئۆکساندن) دەبێ و ڕەنگی ڕەش و ناشیرین دەبێت.

خاتوو فاتمە دیرهەمەکەی بردبۆوە سەرشێوە بنەڕەتیەکەی خۆی کەزیووی سپی یە.پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی فاتمە گیان. ئەوە چی یە بەدەستەوەیە؟ فەرمووی: بابەگیان ئەوە دیرهەمە. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: باشە دیرهەمە. بەڵام بەنیازی چی لێ بکەی واخۆت لەگەڵ ماندوو کردوەو چڵك و پیسیت لێ کردۆتەوەو بردوتەتەوە سەرشێوە ئەصڵیەکەی خۆی؟! خاتوو فاتمە فەرمووی: بابەگیان بەنیازی ئەوەم بیکەم بەخێرو بیبەخشم لەپێناوی خوای گەورەدا.

وە ئەگەر خوای گەورە بەلوتفی خۆی لێم قبوڵ بکات، دەزانم کەخێرو صەدەقە پێش ئەوەی بکەوێتە دەستی هەژارەکەوە، دەکەوێتە دەستی خوای پەروەردگارەوەو خوای گەورە وەری دەگرێ. جابەڕاستی حەزم کرد کەزۆر بەپاکی وخاوێنی و درەوشاوەیی بیبەخشم و بچێتە دەستی پەروەردگارمەوە!..

بەڵێ بەڕێزان: پاشان خوای گەورە فەرموی: (فَيُضاعِفَهُ لَهُ أَضْعافاً كَثِيرَةً). بەچەندین قاتی ئەوەی بۆخوا بەخشیویەتی، خوای گەورە بۆی فەرمبوو دەکاتەوە. ئەمەش شتێکی بەڵگەنەویستەو نموونەکان لەژمارە نایەن.

سەرنجی ئەم ڕوداوە بدەن کەلەکوردستانی ئازیزی خۆماندا ڕووی داوە: ساڵی نەوەدەکانە. سەرەتای نەوەدەکان، وەختی گرانی یە هەرە گەورەکە. ئەو گرانیەیەی کەحەق وایە هەرگیز لەبیرمان نەچێتەوە. ئەوکاتەی کەتاکە هیوای زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی تەنها تێرخواردن بوو لەنانی ووشکی ، ئەم پیاوە





دەڵێ: خێزانێکی زۆری تابڵێ ی هەژار بووین. خۆم وخێزانم و سێ کچ ودوو کوڕ. کەهەمویان تەمەنیان کەم بوو. تەنها خۆم کاسپیم پێ دەکرا. کاسپیەکەشم ئەوەبوو. کەعەرەبانەیەکی سێ تایەم هەبوو. بەزەبری شان پاڵم پێوەدەناو ڕۆژانە شتم بۆخەڵکی پێ دەگواستەوە. پارەیەکی زۆر کەمم دەست دەکەوت. سەرباری هەموو نەداریەکیش کرێ چی بوم مانگی بە (٢٥٠) دیناری سویسری.

بەوە باش بوو خاوەن ماڵەکەمان پیاوێکی دینداری بەویژدان بوو. ئەینا زۆرجار کرێکەشمان پێ نەدەدراو بەشەرمەزاریەوە داوای لێبوردنمان دەکردو ئەویش بەڕوی دا نەدەدایەوە. پاش ماوەیەك بەیەگجاری شەکرو چا لەماڵمان کۆتایی پێ هات چونکە بۆمان نەدەکڕدرا. میوە ئەوە هەرمەگەر لەبازاڕدا بمانبینیایە ئەینا تامەمان نەدەکرد. ڕۆژانە بەوپارەیەی بەعەرەبانەکە پەیدامان دەکرد، دووکیلۆ ئاردو دەسکێ تەڕەپیازم ئەگەر بۆ بکڕدرایەو بەعەلادین بمانکردایە بەکولێرە، خۆم بەپاشا دەزانی. هەرچی کەلوپەلی ناوماڵ بوو لە: سەلاجە، تەلەفزیۆن، فەڕش و بەتانی، هەمویمان یەك لەدوای یەك فرۆشت بۆ نان. ماڵێکی چۆڵ و هۆڵ! تاکە تروسکایی کەهیوامان پێ ی بوو ڕەحمی خوا، پاشان ئەوەی کەخوای گەورە دەرگای خێرمان لێ بکاتەوەو هەرزانیمان بۆبێتەوە. بەیانیەکیان لەماڵ چومە دەرەوەو پاڵم بەعەرەبانە سێ تاییەکەمەوە نا، زۆر چاوەڕێم کردو گەڕام وسوڕام. هیچ کەس هیچی پێ بارنەکردم و نەگواستمەوە، تەنها یەك دیناری ئاسنم دەست کەوت! دەمەو ئێوارە بەدەستی خاڵی بەرەوماڵ دەگەڕامەوە پیرەمێردێکی پشت چەماوە هاتە بەردەمم وزۆر بەزەلیلی وداماوی داوای یارمەتیەکی لێ کردم ووتی: زۆرم برسیە وهیچ نیە کولێرەیەکی پێ بکڕم. برسیەتی بەدەم وچاویەوە دیاربوو. منیش کەهەموو سەروەت وسامانی دنیا، ئەم دینارە ئاسنەم شك دەبرد. ماڵ ومناڵەکەمم هاتەوە بەرچاو. بەڵام خۆئەم تاکە دینارە خێزانێکی گەورەی پێ تێرناکرێ. بەڵام لانی کەم کەلێنێك بۆ ئەم پیرە برسیە دەگرێ، ووتم: خوایەگیان وامن بەخشیم بەخەزێنەی تۆ تۆش خاوەنی ڕەحمەتی زۆری و لەخێر وشادی بێ بەشمان نەکەیت. کابرای ڕیش سپی دەستی هێناو دینارەکەم خستە دەستیەوەو گەلێ دوعای خێری بۆکردم. لەناخەوە هەستم بەئاسودەیی دەکرد. بەڵام ئەی خوایەگیان ئەمشەو ئەم خێزانە زۆرە دەبێ بەسکی برسی ڕۆژبکەینەوەو بەتەمای تۆ خوایەگیان ئەگەر بەیانیش شتێکمان دەست بکەوێ.

بەڵێ بەدەستی خاڵی یەوە چومەوە ماڵ وهەموو ماڵ ومناڵم سەیری دەستی خاڵیان دەکردم. شەو بەبێ نازی وسکی برسیەوە خەوتین. نیوەشەو بوو بەدەنگی تەپە تەپی سەربانەکەمان بەخەبەرهاتین. کاتێکم زانی سێ کەس کەدەم وچاویان هەڵبەسترابوو، خۆیان کرد بەژوردا. دوانیان کلاشینکۆف و یەکیان دەمانچەی پێ بوو. مناڵەکان وخێزانم وویستیان هاوار بکەن. لولەی تفەنگیان خستە سەرسەریان و ووتیان: بێدەنگ بن ، دوانیان بەماڵەکەدا گەڕان. بەلآم خۆهیچ شتێك، کەلوپەلێك. خواردنێك. پارەیەکیان بەردەست نەکەوت. سەرکردەکەیان بەتوڕەیی یەوە پێ ی ووتم: کوا پارە، ئاڵتون، لەکوێت قایم کردون. ووتم: کاکەگیان ئێمە ماڵە هەژارین. خاوەنی یەك عارەبانەی سێ تاییم، کرێ چیم، ئەم ئێوارەیە بەبێ شێو سەرمان ناوەتەوە، جوان نیە ئەگەر بڵێم چەند ڕۆژێکە ئاگر لەماڵمان نەکراوەتەوە. یەکێکیان وویستی: بەشەق لێم بدات، بەلآم ئەوەی بەسەرکردەیان دەردەکەوت ووتی: لێ ی گەڕێ، دیارە ئێمە بەهەڵە هاتوین وئەوماڵە نیە کەئێمە بۆی چوین!.. بەلآم دیارە ئەمانە هەر هیچ شتێکیان نیە. وەرە ئەوپارەیەی پێمانە بیدە ئەو مناڵانە. ئەوی تریان هەندێ بۆڵە ومنجەمنجی کردبە باخەڵیاو دەستی کرد پارەیەکی زۆر دیاربوو. دایە دەستی کچە بچکۆڵەکەم. منیش لەکچەکەمم وەرگرتەوەو دامەوە دەست خۆیان و ووتم: سوپاس پارەی ئێوەمان ناوێت. مناڵەکانم بەپارەی حەرام گۆش نەبوون!.. بەلآم سەرکردەکەیان هەرسور بوو لەسەرئەوەی پارەی مامی خۆیانەو نابێ ڕەتی بکەنەوە، ناچار کچەکەم وەری گرت. ڕۆیشتن. منیش زەردەخەنەیەکم کرد. گەڕایەوەو ووتی: توخوا بەچی زەدەخەنەت هاتێ؟ ووتم: کەسێك ویژدانی زیندووبێت وبەزەیی بەمناڵی هەژار وبرسی دا بێتەوە، حەیفە دزی بکات، حەیفە خەڵکی ئازار بدات! ووتی: ئیتر بەسمە.. لەماڵەکەمان چونە دەرەوە. مناڵەکان پارەکەیان هێناو ژماردمان (٥٠٠) دیناری سویسری بوو.

کەلەوکاتەداو بۆ ئێمە پارەیەکی یەگجار زۆر بوو!. ئەودینارە ئاسنەی کەئێوارە بەخشیم بەوپیاوە پیرە برسیە هەژارە. خوای گەورە یەك بەپێنج سەد پاداشتی دامەوە، هەرلەشەوەکەیدا. خوای گەورە ئەگەر ڕزق و ڕۆزی بنێرێ. بەچەتەو دزیش بێت هەردەینێرێت.

ئیماندارانی بەڕێز: پرسیارێك دروست دەبێت. ئەویش ئەوەیە: باشە ئەگەر



بەخشین ئەو هەموو پاداشتەی لەدونیاو قیامەتدا هەیەو خوای گەورە بەڵێنی قەرەبوکردنەوەی داوە. ئەی باشە بۆچی نابەخشین؟! خۆمرۆڤ یەقینی هەیە، هیچ گومانی لەوەدا نی یە کە ئەومالْ و سامانەی بەجێ دێڵێ. ئەی باشە بۆچی نایکەین بەشەفاعەتخوازی خۆمان، لەو ڕۆژەدا کەدیرهەم ودینارو دۆلار نی یە؟!

بۆ نایکەین بەشوراو پەرژینێك لەدەوری خۆمان و ماڵ وسامان و خێزان و منالْمان، تابەڵکو بەوخێرو صەدەقەیە خوای گەورە بمانپارێزێ لەشەڕی شەیتان. لەفیتنەی ئاخر زەمان لەبەلای ناگەهان، لەنەخۆشی خراپ. خۆ هەمووکەس دەزانێ کەبەخشین بەرەکەتە. ئەی بۆ مرۆڤ نابەخشێ؟! لەوەلامدا دەڵێین:

١- لاوازی ئیمانە، چونکە وەختێ مرۆڤ دەیەوێ صەدەقەو خێرێك بکات، لەنێوان دوو وەعدو بەڵێندایە. ئەوکاتەی پارەکەت بەدەستەوەیە، یان نیەتی خێرکردنەکە بەدڵتادێ. شەیتان هانت دەدا ودەکەوێتە ئامۆژگاری کردنت، لەهەمان کاتدا لایەنی خواییش ئامۆژگاریت دەکات. ئامۆژگاری شەیتان ئەوەیە کە: ﴿ ٱلشَّيۡطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلۡفَقۡرَ وَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡفَحۡشَآءِ ﴾ البقرة: ٢٦٨. شەیتان پێت دەڵێ: دەزانی ئەگەر ئاوا دەست و دڵ والابی وئاوا ببەخشی، هەژار دەکەوی. خۆ خۆشت موحتاجی، ڕەفیقی تۆ زەکات لەخەڵك وەردەگرێ. ئەی منالْەکانی خۆت کێ یارمەتیان دەدات کەهەژار کەوتی؟! بەم شێوەیە بەردەوام هانت دەدات بۆئەوەی پەشیمانت بکاتەوە. لەهەمان کاتدا دەنگێکی تر لەناختدا قسەت لەگەڵ دەکات و پێت دەڵێ: مەترسە، خێرەکە بکە ئەودەنگەش لەلایەنە خواییەکەوەیە. قورئان دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغۡفِرَةً مِّنۡهُ وَفَضۡلًاۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ البقرة: ٢٦٨.

بەڵێ کاتێ تۆ دەبەخشی خوای گەورە دوو بەڵێنت دەداتێ. ئایا کێ وەعدو بەڵێنی لەخوا ڕاستترە؟! بەڵێنی یەکەم: (مَغْفِرَةً) لێخۆشبونی خوا لەوکەسەی کەلەماڵی حەلالْی خۆی خێرو خێرات دەکات. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (الصَّدَقَةُ تُطْفِيء الخَطِيئَةَ كَما يُطْفِيء الماءُ بالنَّارِ). واتە: صەدەقەو بەخشین، گوناە و تاوان ڕەش دەکاتەوە هەروەکو چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە.

بەڵێنی دووەم: (وفَضْلا). ئەمە حەقیقەتێکە وڕاستیەکە، هەرکەس دنیای بینیبێ دەزانێ وایە. ئەگەر بەخشین لەماڵی کەم بکردایە. دەبوایە بەخیل وچرۆکەکان، کەهەرگیز نابەخشن وهیچ لەماڵیان دەرناچێت. هەرگیز هەژار نەبونایە. وەسەخیەکان وبەخشندەکان، کەبەدەستی ڕاست وچەپ دەبەخشن

وسفرەیان بێ میوان نیە، ئەبوایە هەزار بکەوتنایە وهیچیان نەمایە. بەلام بەعەکسەوەیە، بەپێچەوانەوەیە. سەخی وبەخشندە، بەردەوام خوای گەورە بۆی زیاد دەکات. هەربەلای لێ لادەدا. هەر دڵخۆش ودەم بەپێکەنینە. هەرماڵی ئاوا وئاوەدانە. هەر دوعای خێری بۆ دەکرێ. هەرقەدر وحورمەتی لێ دەگیرێ. لەدوای مردنیشی بەمەردو تەبیعەت سەخی ناودەبرێ و ڕەحمەتی بۆ دەچێ. بەڵێ خوای گەورە بەڵێنی داوە (فَضْلا) تۆ بەدیرهەم دەبەخشی. خوای گەورە بەدینار پێت دەبەخشێتەوە. تۆ بەمسقاڵ دەبەخشی خوا بەتەن دەتداتەوە.. لەکۆتایی ئایەتەکەشدا دەفەرموێ: (وَاللهُ واسِعٌ عَليم) دوو ناوی خوای گەورەی هێناوە (الواسِعُ) لەگەڵ (العَليم). جاسەیری تەعبیری قورئان بکەن، چەند ووردە. (واسِعٌ) لەگەڵ (عَليمٌ) بەکاردێنێ، بۆچی؟! بۆئەوەی تێمان گەیەنێ و پێمان بڵێ: ئەی مرۆڤ سەرنج بدەو ووردببنەوە، وامەزانە خوای گەورە ڕزق و ڕۆزی ئەوخەڵکەی خستۆتە سەرتۆ. نەخێر، بەڵکو ڕزقی تۆش لەسەر خوایە. ئەوماڵەی تۆش هەرهی خوایە. ئەوە کەداویەتی بەتۆ، تۆی پێ تاقی کردۆتەوە. کەکاتێ فەرمانت پێ دەکات بەبەخشین. ئەوە دەیەوێ زیاترت بداتێ. جائایا شایانی ئەوەی زیاترت بداتێ؟! خوای گەورە چەندان نمونەمان نیشان دەدات. کەخوای گەورە خۆی ڕۆزی دەرە، ملیارەها گیانداری ناو دەریاکان، ئەگەر خوا ڕزقیان نەدا بەمرۆڤ ڕۆزی دەدرێن و تەنها یەك ژەمیش تێردەکرێن؟! ئایا ئەزانی کەنەهەنگی واهەیە لەیەك ژەمدا خواردنی (١٠٠) هەزار کەس دەخوات!! هەرگیز لەبرسانیش نامرێ وزۆر لەمرۆڤی دەوڵەمەند وکاسب تێرترە.



هەردوو گەورە زانای فەرمودەناس (بوخاری وموسلیم) لەصەحابی بەڕێز (جابری کوڕی عبدالله)وە دەگێڕنەوە. کەفەرمویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمەی بۆ ڕوبەڕوبونەوەی کاروانێکی قوڕەیش نارد. (ئەبوعوبەیدە)ی سەرکردەمان هەبندێ خواردنی ووشك — (قەسپی) پێ داین. لەبەر زۆری لەشکرەکەوکەمی خورماکەو نەبونی خۆراکی تر ئەبوعوبەیدەی سەرکردەمان، دانە دانە قەسپی بەسەردا دابەش دەکردین وهەریەکەمان یەك دەنکە قەسپی دەست کەوت. وەکو منالْ دەمانمژی وپاشان ئاومان بەسەردا دەکرد. (سُبْحانَ الله) ئەو سوپا زۆرەو ئەوخۆراکە کەمە کەشایانی باس کردن نیە. وەدوریمان لەئاوەدانی یەوە مایەی نیگەرانی بوو.

بەلام دەرگای ڕەحمی خوا بەردەوام کراوەیە. لەکاتێکا سوپاکەمان لەجوڵەدا



بوو. لەکەناری دەریادا، نەهەنگێکی گەورەمان دۆزی یەوە وەکو تەپۆلکەو گرد وابوو. ئەوەندە گەورە بوو. ئێمە (٣٠٠) کەس بوین، ماوەی یەك مانگ لێمان خوارد – دیارە بەرێگەی پاراستنی گۆشتی ماسی، گۆشتەکەیان پاراستوە وماوەی یەك مانگ ئەو (٣٠٠) کەسە لێیان خواردەوە! جابری کوڕی عبدالله. دەفەرموێ: ئەونەهەنگە ئەوەندە گەورە بوو. کە (١٣) کەسمان دەچوینە تەنها یەك گێلانی کونە چاوێکیەوە. ئەسپ سوار بەژێر پەراسوەکانی دا دەرۆیشت.. ئەمە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ. لەم ڕۆژگارو سەردەمەی ئێستاشدا ئەوە هەیەو بینراوە. لەڕۆژنامەی (الاخبار الجدیدَة) لەژمارەی (٣٩٦)ی بەرواری ١٩٥٣/٩/٢٧ دا، بلاّوی کردەوەکە: لەپاریس، نمایشی حوتێك کرا بەناوی حوتی (ئونا) کەقورسی یەکەی (٨٠,٠٠٠) کیلۆ بوو. واتە: (٨٠) تەن بوو!!! دەمی کرابۆوەوکۆڵەکەیان لەناو دەمیدا دانابوو. جاری دە نەفەر (١٠) کەس. دەچونە ناودەمیەوە. گڵۆپی کارەبایان لەناودەمیا دانابوو. تەمەنی ئەوحوتە (١٨) مانگ بوو. بەئوتومبیلێکی بارهەلگر هەڵیان گرتبوو. کەدرێژیەکەی (٣٠) مەتر بوو!!. بەڵێ تەنها (الرَّزاقَ) کەرزق ورۆزی ئەم دروستکراوانەی دەدا وزۆر لەمرۆڤ تێرو تەسەل تر دەژین.

دووەم: بۆیە خەڵکی بەزۆری نابەخشن، چونکە وەکو پێویست تامی بەخشینمان نەکردوەسوێند بەخوا. بەومەرجەی تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە ببەخشی و هیچ ڕیابازی و منەت بەسەراکردنی تێدا نەبێ، وەماڵەکەشت حەلاڵ بێ ومافی کەسی بەسەرەوە نەبێت. هیچ شتێ لەوە خۆشترنیەو بەتام و چێژتر نیە، کەدڵی هەژارێك. داماوێك، لێقەوماوێك، نەدارێك، قەرزارێك. نەخۆشێکی هەژار کەوەکو توشی (فقد الدَّم) بوە. توشی (فقدُ الجیب)یش بووە. چۆن دەماری خوێنی ووشك بوە، گیرفانیشی ووشك هەلاتووە. منالێکی نازداری بێ باوك دڵخۆش بکەی بەوەی کەهەندێ باری گرانی هەژاری لەسەر سوك بکەی وئەویش لەناخی دڵەوەو بەڕوی کراوەوە چاو بەرەو ئاسمان هەڵبڕێ وبڵێ: دەی خوای گەورە پاداشت بداتەوە. دەی خوای گەورە هەزاران ئەوەندەت پێ ببەخشێ... ئەزانی لەوکاتەدا هەموولاشەت موچڕکەی خۆشی پێدادێ. هەموو خانەیەکی لەشت هەست بەجۆرێك لەخۆشی دەکات، کەمرۆڤ ناتوانێ بەزمان باسی بکات، کەسینەت ساف دەبێ، دڵت ئارام دەبێ، دەرونت ئاسودە دەبێ ئەڤین وخۆشەویستی دەکەوێتە ناختەوە بەرامبەر مرۆڤەکانی دەوروبەرت.

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ کەدکتۆری هەموو دکتۆرانە، فەرمویەتی: (داووا مَرْضاكُمْ بالصَّدَقَةِ) نەخۆشیەکانتان بەبەخشین و صەدەقەو خێرو خێرات تیمارو دەرمان وچارەسەر بکەن!!

ئایا نەخۆشی بەصەدەقە وبەخشین چارەسەر دەبێت؟! بەڵێ، چونکە نەخۆش لەوکاتەدا کەخێرو صەدەقە دەکات، لەوکاتی بەخشندەیی یەدا، هەناو وناخ ومێشك وبیر ودەماری. تەزوی خۆشی پێدادێ ودەمارەکانی دەکرێنەوە وخانەکانی دەست دەکەن بەجوڵە وشیفای بۆدێت بەئیزن و ویستی خوای پەروەردگار.

بەلام بەومەرجەی کەئاوا بۆ ڕەزامەندی خوا وبەدڵ وبەگیان خێرەکە بکەی. بڕواتان ببێ چەندە چروك وپارە پیس لەزەت لەوە دەکات کەپارەکانی دەژمێرێ ولەصندوقی دەکات سەدان قاتی نەوە، مرۆڤی سەخی لەزەت لەوە دەکات کەپارەی حەلاڵی خۆی دەبەخشێ.

ئیماندارانی بەڕێز: بەڕاستی ئەوەی ژیان خۆش دەکات وکۆمەڵگا جوان دەکات. بونی کەسانی سەخی تەبیعەتە. بونی دەوڵەمەندی دەست ودڵ والایە. کەماڵی زۆری هەیە. بەلام ماڵەکە لەدەستیایەتی. نەك لەدڵیا.. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (إذا رَضِيَ اللهُ عَنْ قَوْمٍ، جَعَلَ المالَ في سُمَحائِهِم، واسْتَعْمَلَ عَلَيْهِم خِيارَهُم. وإذا سَخَطَ عَلى قَوْمٍ، جَعَلَ المالَ في بُخَلائِهِم. واسْتَعْمَلَ عَلَيْهِمْ شِرارَهُم).

واتە: ئەگەر خوای گەورە لەقەوم وگەل وهۆزێك ڕازی بوو. ماڵ وسامان دەخاتە دەستی ئەو کەسانەیانەوە کەلێبوردەو دەست ودڵ بەخشندەن. وەباشترینیان دەکات بەکاربەدەست و فەرمانڕەوایان. وە ئەگەر لەقەوم وگەل و نەتەوەیەکیش تورە بوو. ئەوا ماڵ و سامان دەخاتە دەستی چروك و ڕەزیلەکانیانەوە وەخراپترینیان دەبێت بەفەرمانڕەواو کارەبەدەستیان..

بشزانە، ئەمڕۆ تاخۆت لەژیانداى، فرسەتە شتێك بۆ قیامەتت بنێرە، بۆناو گۆڕە تاریکەکەت. بۆ مەیدانی مەحشەر وتای تەرازووەکەت، نەك چاوەڕێ بی کەمردی خێرت بۆ بکەن. کەزەحمەتە بۆشت بکەن. ئەگەر بۆشت بکەن، هەرگیز ناگاتە ئەوخێرەی کەبەدەستی خۆت بەخشیوتە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی:

(لَأَنْ يَتَصَدَّقَ المَرْءُ في حَياتِهِ بِدِرْهَمٍ خَيْرٌ لَهُ من أَنْ يَتَصَدَّقَ بِمِائَةِ دِرْهَمٍ عِنْدَ مَوْتِهِ).



واتە: ئەگەر مرۆڤ لەژیانیدا بەتاکە یەك دیرهەم خێرو صەدەقە بکات. باشترە بۆی لەوەی کەبەسەد دیرهەم لەکاتی مردنی دا خێرو صەدەقە بکات.

لەوکاتەدا کەخەریکە بەتەواوی لەدونیا نائومێد دەبێ. دەست دەکات بەخێرو خێرات کردن و وەصیەت کردن بۆئەوەی لەدوای مردنی خێری بۆبکەن. دەی تاماوی و لەشت ساغەو ماڵ و سامان لەبەردەستی خۆتدایە، دریغی مەکە. وەرە بە بەشێك لەماڵەکەت، بەبەشێکی کەمی دینت بپارێزە، تەندروستیت بپارێزە، ماڵ و سامانەکەت لەفەوتان بپارێزە. دڵنیاشبە، ئەگەر تۆ ببەخشی، خوای گەورەش پێت دەبەخشێ. وەعد وبەڵێنی خوایە: (یاابْنَ ادَم. أَنْفِقْ أُنْفِقْ عَلَيْكَ). وەهەوڵ بدەن لەبەخشیندا، ئەوە ببەخشن کەخۆتان حەزتان لێ یەتی ودڵتان پێوەیەتی. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ ۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴾ آل عمران: ١- ٩٢.

واتە: ئێوە هەرگیز ناگەنە پلەی چاکیی وچاکە کاریی هەتا لەوشتانەی کەخۆشتان دەوێت نەبەخشن، هەرشتێکیش ببەخشن ئەوە خوا ئاگا وزانایە پێ ی، لێ ی ون نابێت وبێ پاداشت نابێت..

سوپاس بۆخوا لەم سەردەمەی ئەمڕۆماندا. لەسەردەمی تەماح و هەرکەس بۆخۆی دا. موسڵمانانێك زۆرن کەئەم ئایەتە قورئانیە، بەکردەوە جێ بەجێ دەکەن ولەوەی کەخۆیان زۆریان لاخۆشەویستە. دەبەخشن.

مامۆستایەکی بەڕێزی بانگخواز دەفەرموێ: ئێستەش لەبیرم ناچێتەوە، کەخوشکێك پێویستی بەنەشتەرگەری هەبوو. هەردوو دەستی ڕەق ببوو. منداڵێکی ساوای هەبوو. نەیدەتوانی بەودەستانەوە بەخێوی بکات. نزیکەی (هەزار وشەش سەد) دۆلاری دەویست. ئافرەتێك بەبێ ئەوەی هیچ خزمایەتیەك لەنێوانیاندا بێت، کەئەم باسەی زانی وچاوی بەم ئافرەتە کەوت. کەسەرەڕای ئەم نەخۆشیەش، زۆر دەست کورت بوون. دوو بازنی ئاڵتونی گەورەی هەبوو. بازنەکانی زۆر قورس وگەورە بوون. یەکی بایی (پێنج سەد) دۆلار بوون. هەردووکیانی فرۆشت بە (هەزار دۆلار) وپارەکەی بۆئەم خوشکە نەخۆشەی هێناو ووتی: ئەوەی هەمەو نیمە ئەو دوو بازنە ئاڵتونیەمە. با ئەودەستەی من بۆئەو دەستە بێت. دەستی من بابێ ئاڵتون بێت ودەستی ئەویش وەکو دەستی من بکەوێتەوە کارو بتوانێ بەدڵی خۆی منالەکەی بەسنگیەوە بگوشێ.

بەڵێ، خۆشەویسترینماڵی خۆی (کەئەو دوو بازنە ئاڵتوونە گران بەهایە بوو) لەپێناوی خوای گەورەدا بەخشی وبەکردەوە ئایەتەکەی﴿ لَن تَنَالُواْ ٱلۡبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ ﴾ی جێ بەجێ کرد...

وە پێویستە ئەوەش بۆ موسڵمانانی ئازیز. بەتایبەت خوشکانی بەڕێز ڕوون بکەینەوە. کەئایەتی (مِمَّا تُحِبُّونَ ....) ئەو خوشکانەش دەگرێتەوە، کەلەکاتی هاوسەرگیریدا مێردەکەی یەك ملوانکەی ئاڵتونی بۆ کڕیوە. زۆر دڵی پێی خۆشە. بەڵام سەیر دەکات لەماڵەوە سەلاجەیان نیە. یان هەیانبووەو بێ کەڵك بوە وچاك ناکرێتەوە. ئەم ئافرەتە ملوانکە ئاڵتونەکەی خۆی، دادەنێ و بەڕویەکی خۆشەوە بەزمانێکی نەرم وشیرین بەهاوسەرەکەی دەڵێ: ئەم ملوانکەیە بگرەو بڕۆ لەبازاڕ بیفرۆشەو سەلاجەیەکی تازەو باشی پێ بکڕە. باخۆمان ومناڵەکانمان ومیوانمان، بێ ئاوی سارد نەبین وچاو لەدەستی خەڵکی نەبین ومناڵمان لەدەرگای ماڵە دراوسێ نەدا بۆهەندێ سەهۆڵ. ئەوە ئەم ئافرەتە بەر مەدح وستایشی ئەوئایەتە قورئانیە دەکەوێت. ڕاستە بۆماڵی خۆی ومێردو مناڵی خۆیەتی، بەڵام یارمەتی پیاوەکەی داوە. خوای گەورە بەچاکترین وگەورەترین صەدەقەو خێر بۆی دەنوسێت (إنشاءالله).ڕەحمەتی خوا لەو ژنانەی کەبەڕاستی دڵسۆزی هاوسەرەکانیان بوون، ئافرەتی واهەیە، ئەڵقەی پەنجەی فرۆشتوە. تەنها بۆ ئەوەی پیاوەکەی موحتاج نەبێت. ئەوانە پاداشتیان لای پەروەردگاریانە. بەمەرجێ ڕۆژێ لەڕۆژان وەکو منەت نەیدەنەوە بەچاوی هاوسەرەکانیاندا.

سەرچاوەکان 


١- تەفسیری ئاسان، بورهان محمد امین.

٢- صَفْوَةُ التَّفاسیر، محمد علی الصَّابُونِي، ج١، ص١٥٦.

٣- السَّعي إلی الاخِرَة ، محمد مُتَوَلِي الشَّعْراوي، ص٢٠٨.

٤- ئەسرینەکانی سەدەی بیستەم، ئاوات ابوبکر ، ل٣٦.

٥- خەمبار مەبە، د.عائض القَرْني ، وەرگێڕانی: احمد عبدالله وەرتێ، ل٤٧٧.

٦- خۆشماندوێتی، حاجی کاروان، ب١، ل٢٢٧.




# زەکات و

# بەخشینی خێر





الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجْمَعين.

ئیمانداران: دەچینە خزمەت قورئانی پیرۆز وئەم ئایەتە قورئانیە. بەپێ ی توانا وبەویستی خوای گەورە شی دەکەینەوە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّاْئَةُ حَبَّةٍ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ البقرة: ٢٦١.

بەکورتی و بەکوردی مانای ئایەتەکە بەم شێوەیەیە: نموونەی ئەوانەی کەماڵ و سامانیان دەبەخشن لەپێناوی خوادا. وەکو تۆوێك وایە کەبڕوێت وحەوت گوڵی گرتبێت. لەهەرگوڵێکدا سەد دانەی تێدابێت. خوایش بۆ هەرکەس کەبیەوێت (بەگوێرەی نیەتی وجێگرتنی خێرەکەی) پاداشت چەند بەرامبەر دەکات وخوای گەورە فراوانگیر وزانایە.

ئیمانداران: وەرن بابەیەکەوە بچینە خزمەت ئەم ئایەتە وبزانین چۆن پەروەردەمان دەکات. سەرنج بدەن، دوو شێوازی داناوە: یەکەم: (شاهِدُ العَیان) کەبەچاو دەبینرێ دووەم: (شاهدُ الإیمان) کە لەقیامەتا پاداشتەکەی دەبینرێ.

یەکەمجار (شاهِدُ العَیان)ەکەی خستۆتە پێش چاو. هەمووکەس تێ ی دەگات، تەنانەت ئەوکەسەشی کەهیچ کات لەژیانی دا کشتوکاڵ و فەلاحەتی نەکردوە، بەڕونی و سادەیی نمونەیەك دەخاتە بەرچاوو دەفەرموێ: ئەوانەی لەپێناوی خوای گەورەدا ماڵیان دەبەخشن (کَمَثَلِ حَبَّةٍ) وێنەی دەنکە تۆوێکە. چۆن جووتیار، دەنکە گەنمەکە دەخاتە ژێر زەوی یەوە کەجوتی کرد، دیارنامێنێ و دادەپۆشرێ و لەزاهیردا بەفەوتاو دێتە بەرچاو. بەڵام ئەو فەلاحە تەوەکولی بەخوا هەیەو داویەتیە دەست خوای گەورەو چاوەڕێ ی بەرهەمی زۆرە.

بەهەمانشێوە، ئەوکەسەش کەزەکات لەماڵەکەی دەردەکات، کەخێر وصەدەقە دەکات، بەزاهیر دینارێك، دۆلارێ: دەبەخشێ. لەوکاتەدا پارەکە لەگیرفان ودەستیا نەماوە. بەزاهیر فەوتاوە. بەڵام نەخێر. داویەتیە دەست خوا، چاوەڕێ ی ئەوەیە خوای گەورە لەدونیاو قیامەتدا، چەندان قاتی بەزیادەوە پێ بداتەوە. ڕێك وەکو فەلاحەکە. جائایەتەکە دەفەرموێ، ئەو دەنکە تۆوە ـ بۆ نموونە گەنمە. حەوت گوڵ دەردەکات. هەرگوڵەی (سەد) دەنك دەگرێ. کەسەرجەم دەکاتە (حەوسەد). پاشان جارێکی تر لەووشەی (کَمَثَلِ حَبَّةٍ) ووردبینەوە. باسی یەك دەنك گەنم دەکات نافەرموی: (کَمَثَلَ زارِعٍ بَذَرَ حَبَّة). چونکە فەلاح تەنها یەك دانە دەنکە تۆو ناچێنێ. بەڵکو زۆر دەچێنێ، بەملیۆن دەنکە تۆو دەچێنێ.





لەمەوە تێ دەگەین، کەموژدەی ئەم ئایەتە هەربۆ ئەوکەسانە نیە کەخاوەنی سەرمایەیەکی زۆر گەورەن. خاوەنی کۆشك وباڵەخانەن، خاوەنی کۆمپانیا وکارگەن. یان ئەوکەسانەی کەئەوەندە ماڵ وسامانیان هەیە کەدەگاتە حەددی شەرعی واجب بونی زەکات. نەخێر، بەڵکو هەمووکەس دەگرێتەوە. هەژارترین کەس دەگرێتەوە، چونکە ئایەتەکە باسی تەنها یەك دانە دەنکە تۆو دەکات. جاهەروەکو چۆن هیچ کەس نیە بڵێ: ناتوانم تەنها یەك دەنکە تۆو بچێنم و بەوویستی خوا چاوەڕێ ی ڕوان و بەرهەم گرتنی (حەوسەد) دەنکە گەنم بکەم. بەهەمان شێوەش هیچ کەس نیە نەتوانێ تەنها یەك دینار، یەك دۆلار ببەخشێ، مەگەر هەرخۆی نەیەوێت. دەی هەروەکو ئەوکەسەی کەتەنها یەك دانە دەنکەتۆو دەچێنێ چاوەڕێ ی بەرهەمە. تۆش دەتوانی بەبەخشینی تەنها یەك دینار لەڕیزی بەخشندەکاندا خۆت تۆمار بکەی و چاوەڕێ ی پاداشتی بێ سنوری خوای پەروەردگاربی. دووبارە بابچینەوە خزمەت قورئان، کەبۆمان ڕوون دەکاتەوە بەخشین و صەدەقەو بەشداری خێرو خێرات هەر بۆ دەوڵەمەند نی یە.

تەنها بەیەك ووشە ئەوە ڕوون دەکاتەوە. دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ فِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ مَّعۡلُومٞ لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ ﴾ المعارج: ٢٤-٢٥.

واتە: ئەوانەی کەبەشێکی دیاری کراو لەماڵ و سامانیاندا هەیە، بۆ هەژاری داواکارو بێ نەوای داوانەکەر بەڵام لە شوێنێکی تری قورئاندا ، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ فِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ مَّعۡلُومٞ لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ ﴾ تەنها ووشەی (مَّعۡلُومٞ) نەهاتوە. باشە هۆی چی یە دوو ئایەتی قورئان تەنها یەك ووشە نەبێ کە (مَّعۡلُومٞ) هیچ جیاوازیەکیان نیە و لەدوو شوێنی قورئاندا هاتوون؟!

لەوەڵامدا دەڵێین: ئەم قورئانە یەکێ لە (إعجازەکانی) ئەوەیە کەهیچ ووشەیەکی بەبێ مەبەست نەهاتووە. لەئایەتی یەکەمدا، کەووشەی (مَّعۡلُومٞ) هاتوە، مەبەست لەماڵی ئەوکەسانەیە کە دەگاتە ڕادەی زەکات و(مَّعۡلُومٞ) ئەوبڕە دیاری کراوەیە کە لەشەرعدا بۆ زەکات دانراوەو بڕێکی مەعلوم و دیارە. بەڵام لەئایەتەکەی تردا کە ووشەی (مَّعۡلُومٞ) نەهاتوە. مانای ئەوەیە! مەرج نیە ماڵ وسامان هەربگاتە ڕادەی زەکات. ئەمجا مافی هەژارو نەداری پێوەبێ. نەخێر، هەرچەندە زۆرکەمیشت هەبێ هەرئەبێ ببەخشی. بایەك تاکە دیناریش بێ، وەکو یەك دەنکە تۆوەکە.

تەماشاکە، ئەوکەسەی کەلەماڵ وسامانی دنیادا (١٥) هەزاری چاپی نویّ ی هەیە. ئەگەر دەستی تیّ چوو، هەزاری لیّ بەخشی. ئەوە بەدڵنیاییەوە زۆر بەلایەوە ئاسایی دەبیّت کە ئەگەر خوای گەورە (٣٠) هەزاری پیّ بەخشی، ئەمجا (٢) هەزاری لیّ ببەخشیّ. وەئەگەر خوای گەورە (یەك ملیۆنی) چاپی پیّ بەخشی. زۆر بەدڵشادیەوەو سینە فراوانی یەوە (٢٥) هەزاری لیّ دەبەخشیّ.

کەواتە: قورئان وامان پەروەردە دەکات کەلەسەرتاوە، لەوکاتەوەی کەماڵەکەمان کەمەو ناگاتە ئاستی زەکات ببەخشین. بۆ ئەوەی مرۆڤ لەکەمەوە دڵ و دەرونی رابێنیّ.

لەم ڕوانگەیەوە، ئەو ماڵانەی کەمناڵی بیّ باوکی نازداری تێدایە ومناڵەکان هێشتا باڵغ نەبون، ئەو ماڵانەش دروستە خێریان لیّ بکریّ. بەڵام بەبڕێکی کەم. ئەگەر خەڵکی بە (٢٥) هەزار دینار بەشداری پرۆژەیەکی خێری دەکات، ئەمان بە (٢٥٠) دینار بەشداری بکەن. بۆئەوەی ئەومناڵنە هەرفێری وەرگرتن وخێر پیّ کردن نەبن. بەڵکو فێری بەخشینیش ببن.

بەڵیّ ئیمانداران: دەچینەوە خزمەت ئایەتەکە، دەفەمرویّ: ﴿ أَنۢبَتَتۡ سَبۡعَ سَنَابِلَ ﴾ البقرة: . ٢٦١ لەعەرەبی دا — جَمْع القِلّة — و — جَمْع الكَثْرَة — مان هەیە. بۆنموونە — (فَلْس) — تاکە — موفرەدە، ئەوەی لەکوردەواریدا پێیان دەووت: فلس. جەمعەکەی — فلوسیش هەیە و (أَفْلُوس) — یش هەیە. ئەفلوس ئەگەر کەم بوو. فلوسیش ئەگەر زۆر زۆر بوو.. یان وەکو — ألف — هەزار. ئەگەر بڵێین هەزاران. دەڵێین: آلاف. بەڵام ئەگەر بڵێین: هەزاران هەزار، دەڵێین: (الوف). هەروەکو خوای گەورە دەفەرمویّ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَهُمۡ أُلُوفٌ حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِ ﴾ البقرة: ٢٤٣

بەهەزاران هەزار کەس بوون، بۆیە (الوف) ی بەکارهێناوە.

لێرەشدا ئەوەی کەمەبەستی بابەتەکەی ئێمەیە: (سُنۢبُلَةٍ) موفرەدە، جەمعە قیلەکەی (سنبلاتَ). وەکو لەخەونەکەی مەلیکدا لەسورەتی یوسف دا دەفەرمویّ: ﴿ وَسَبۡعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٍ ﴾ یوسف: ٤٣. چونکە تەنها باسی حەوت گوڵە گەنمە، دەفەرمویّ (سبع سنبلات). کەبەڵگەیە لەسەر حەوت گوڵە گەنمی بچوك نەك زۆر قەڵەو و بەرچاو.





بەڵام: (سُنۢبُلَٰتٍ ) جەمعە کە موفرەدەکەی (سنبلة) کەلێرەدا لەبەرزۆری خێرو پاداشتەکە دەفەرموێ: (سُنۢبُلَٰتٍ ) نافەرموێ: (وَسَبۡعَ مِن سُنۢبُلَٰتٍ )... (سبحان الله) ئەم قورئانە چەند ووردە. چۆن بەگۆڕینی تەنها یەك ووشە، ئەم هەموو مانایەمان دەداتێ و بۆمان جیادەکاتەوە لەیەکتری. کە ئەمە لەغەیری قورئاندا هەرگیز بەرچاو ناکەوێت.

پاشان دەفەرموێ: (فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٖ مِّاْئَةُ حَبَّةٖۗ ). لەهەرگوڵە گەنمێکیشدا (سەد) دەنکی تێدایە. چونکە جاری واهەیە گوڵەکە بۆشە. یان چەند دەنکێکی کەمی تێدایە. بەڵام قورئان دڵنیامان دەکات، کەهەرحەوت گوڵەکە پڕن وهەریەکەیان سەد دەنکی تێدایە. کەسەرجەم دەکاتە حەوت سەد. کە لەلای فەلاح، ئەگەر دانەوێڵەیەك وسەد ببرێ. بەلایەوە جێگای باس وخواسە ولەیادی ناکات. ئەی ئەگەر یەك بەحەوت سەد ببرێ. ئەوە دەبێتە مێژویەکی لەبیرنەکراو.

دواتر دەفەرموێ: (وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ) سەرنج بدەن دەفەرموێ: ( لِمَن يَشَآءُ) چونکە هی واهەیە خوای گەورە یەك بەحەوت سەدیش زیاتری پێ دەداتەوە. کەهەرخوای گەورە خۆی دەزانێ ئەو زیادەیە. یەك بەحەوت هەزارە، یان حەوت سەد هەزارە، یان زۆرتریشە. بەڵام ئەم زیاتر لەیەك بەحەوت سەدە، بۆ هەمووکەس نیە. بەڵکو( لِمَن يَشَآءُ).

دەی خۆ خوای گەورە هەموو عەبدەکانی خۆش دەوێت. ئەی باشە بەچی بزانی کەئەو خێرەی تۆ لەو (٧٠٠) تە بەرەوژورە. کەبەڕاستی موسڵمان دەبێ هەوڵی ئەوە بدات کەزیاتری دەست بکەوێ. چۆن ئەگەر بەجوتیارو فەلاحێك بڵێن: ئەم زەویە یەك وحەوت سەد دەبرێ، بەڵام ئەگەر هەمان تۆو بیکەیتە ئەوزەویەی ترەوە، ئەوە نەك یەك بەحەوت سەد. بەڵکو لانی کەم یەك بەحەوت هەزار دەبرێ و لەوانەیە یەك وحەوت سەد هەزاریشی، بگرە زیاتریشی لێ هەڵبگری. چۆن ئەگەر زۆریش زەحمەت ونارەحەتی هەبێ ئەو فەلاحە، هەرخۆی دەگەیەنێتە ئەم زەویەیان.

دەی بۆ پاداشتی زۆرو گەیشتن بەڕیزی (وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ) ئەبێ ئاوا زیاتر هەوڵ بدەی جاگوێ بگرن بۆهەندێ لەومەرجانەی کە (يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۚ )ت، بۆمسۆگەر دەکات (إن شاء الله)..

١- زۆر دڵخۆش بی لەوکاتەدا کەخێرەکە دەکەی. وەهەروەکو فەلاحەکە ئومێدەواربی کەخوای گەورە بەڕەحمی خۆی بۆت پڕدەکاتەوە، ئیمانت کامڵ

بێ بەوەعدی خوا کەدەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَىْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴾ سبأ: ٣٩.

واتە: هەرشتێك کەئێوە دەیبەخشن، خوای گەورە بۆتان پڕدەکاتەوە. هەندێك جار هەرلەدنیادا. پاداشتی قیامەتیش بابوەستێت: چونکە ئەو خوایە چاکترین ڕزق و ڕۆزی بەخشە. بەسەرجەم بەندەکانی.

٢- ئەو ماڵەی کەدەیبەخشی لەباشترین وجوانترین جۆری ماڵ بێ، نەك لەخراپترینی و ئەوەی خۆت لێی بێزار بوبیت. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنفِقُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ۖ وَلَا تَيَمَّمُوا۟ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُوا۟ فِيهِ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴾ البقرة: ٢٦٧.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە: ببەخشن لەباشترین بەروبوم وبەرهەمێك کەبەدەستتان هێناوەو لەو بەروبومانەی کە لەزەویدا بۆمان دەرهێناون وڕواندومانە نەکەن نیازی بەخشینی شتی ناپوخت وبێ کەڵك بکەن و لەوببەخشن. لەکاتێکا خۆتان ئەوجۆرە شتانە وەرناگرن و پێ ی ڕازی نابن ئەگەر بتاندرێتێ، مەگەر چاوی لێ بنوقێنن، بزانن کەخوای گەورە دەوڵەمەند وبێ نیازە وشایستەی سوپاسە. پێویستی بەبەخشینی شتی بێ نرخ نیە.

خوای پەروەردگار نموونەی بەدەنکە تۆوێك هێنایەوە کەفەلاح دەیخاتە زەوی یەوە و دەیچێنێ. جائایا فەلاح ئەوگەنمەی، ئەودانەوێڵەی کەدەیچێنێ بن بێژنگەو پیسی و پاشماوەیە یان ئەودانەوێڵەیە دەکات بەتۆو کەلەبێژنگ درابێ وجوانترین و ساغ ترین بێ؟! بێگومان فەلاح هەوڵ دەدات، کام گەنمەی جوان و قەڵەو و هیچ پیسیەکی پێوە نەماوە. ئەوە دەچێنێ. بەوئومێدەی کەجوانترین بەرهەمی دەست بکەوێتەوە.

دەی کەواتە: باتۆش ئەو پارەیەی دەیبەخشی دڕاونەبێ، لەوەی لەبەرچاوت جوانەو دڵت پێ ی خۆشە لەوە ببەخشە. هەرچەندە بەبەخشینی کۆنەکەش (٧٠٠) چاکەت مسۆگەرە. بەڵام بەتەماح بەو هەوڵی زیاتر بدە، بالەڕیزی (يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ)دا، ناوت تۆمار بکرێ.

مامۆستایەکی بانگخواز دەڵێ: گەنجێك کەخوای پەروەردگار ماڵ وسامانێکی زۆری پێ بەخشیوە، وەئیمان وبڕوایەکی بەهێزیشی هەیە سوپاس بۆ خوا. کارگەیەك دەکرێ وکارگەکەی زۆر بەلاوە بەنرخ دەبێ، لەم کاتەدا دەیەوێ ئایەتی ﴿ لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ ..... ﴾ آل عمران: ٩٢جێ بەجێ بکات. بڕیاردەدات کەهەرچی قازانجێك لەوکارگەیە دەستی دەکەوێت خۆی هیچی لێ هەڵنەگرێ وهەمووی






بەخشێ بەهەژاران و ئاتاجان، لەپێناوی ڕەزامەندی خوای گەورەدا، چونکە خۆی سەرچاوەی دارایی تریشی هەبوە. سەرەتا قازانجی مانگانەی کارگەکە دابەش دەکات بەسەر (١٠) ماڵە هەژاردا، مانگی (٧٥٠٠٠) هەزار، ئێستا ئەو (١٠) ماڵە بۆتە (٢٥) ماڵ وخوای گەورە بەرەکەتی تێ خستوە. واتە: چەند بەرهەمی کارگەکەی زیادی کردوە، ئەوهیچی بۆخۆی لێ نەگێڕاوەتەوە وهەموی بەخشیوە.

٣- ئەوکەسەی صەدەقەو زەکاتەکەی پێ دەبەخشی، چاك وایە ئەم مەرجانەی تێدابێ:

أ) باموتەقی ولەخوا ترس بێ. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (لاتُصاحِبْ إلا مُؤمِناً ولايَأْكُل طَعامَكَ إلا تَقِيٌّ) رَواهُ أحمَد في مُسْنَدِهِ (١١٢٧٦) وأَبُوداود (٤٨٣٢) والترمذي وحَسَّنَهُ (٢٣٩٥) وحَسَّنَهُ الالْباني في صَحيح الجامِع: (٧٢١٨).

واتە: هاوڕێیەتی ئیماندار نەبێ مەیکەو موتەقی و لەخوا ترس نەبێ بالەسەر سفرەت نەخوات.. هەرچەندە خێرو بەخشین بەهەمووکەس دەشیا. تەنانەت ئەگەر گاورو جولەکەیەکی موحتاجی ناو موسڵمانانیش بێت.

بەڵام ئەگەر بیبەخشی بەکەسێکی دیندارونەهلی مزگەوت، پاداشتەکە زیاتر دەبێ. چونکە بەوپارەی تۆ هەرجل و بەرگێکی کڕی ونوێژی پێوەکرد، تۆ دسبیە هاوبەشی پاداشتی ئەو نوێژەی. ئەگەر بەربانگی پێ کردەوە تۆ دەبیتە هاوبەشی خێری ڕۆژوەکەی بەبێ ئەوەی لەخێرو پاداشتی ئەویش کەم ببێتەوە.

ب) بیدەی بەوکەسەی کەخزمەت بەئیسلام دەکاو حەق و ڕاستی دەڵێ، بەو نیەتەی کەئەو بانگخوازە خزمەتکارەی ئیسلام. موحتاجی ودەست کورتی و هەژاری وای لێ نەکات، کە لەبەر چاوبەرەژێری ئەم و ئەو وئەولایەن و دەزگا. توشی لاڕێ بون و حەق نەوتن ببێ!.

زانای گەورە (الليث بن سعد)، جارێکیان لەکۆڕی ئامۆژگاری و ووتاردانی (مەنصوری کوڕی عەممار)دا، دانیشتبوو، ئەم مامۆستایە ئەوەندە و وتارێکی بەهێزو بەپێزی خوێندەوە زانای گەورە (الليث) دەستی کرد بەگریان.. دوای تەواوبونی ووتارەکەو چۆڵ بونی مزگەوت چوو بۆلای وکیسەیەکی دایە کە (هەزار دیناری ئاڵتونی) تێدابوو. کەئەمڕۆ لە (١٠٠٠٠) دە هەزار دۆلار بەنرختربوە!. پاشان فەرمووی: مامۆستا مەنصور، ئەم پارەیە بگرەو بۆ پێویستی ژیانت خەرجی بکە، بەهۆی ئەم پارەیەوە بێ ئیحتیاج بە لەپارەی کاربەدەستان و ئەم ووشە بەنرخە ئاڵتونیانە بپارێزە لەوەی لەبەردەرگای سەلاطین وکاربەدەستاندا

بوەستن وچاوەڕێ ی شاباشێك بن. وەبەو زمانە ڕەوان وپاراوەت کەخوای گەورە پێ ی بەخشیوی. مەدح وستایشی هیچ مەخلوقێکی پێ مەکە. دوای ئەوەی بەو زمانەت مەدح وستایشی خوای جیهانیان (رَبُّ العالمين)ت کردوە. وەخەمی پارە و پوڵت نەبێ و هەموو ساڵێ لەلایەن منەوە (هەزار دیناری ئاڵتونت) بەدەست دەگات!!. خۆزگایە دەوڵەمەندو دەست ڕۆیشتوەکانی ئێمەش لەم سەردەمەدا، ئاوا ماڵ وسامانەکەیان دەخستە خزمەتی ئیسلامەوەو زانایانی بوێرو دلێریان دەپاراست لەوەی کەموحتاجی وپێداویستی ژیان، توشی مەرحەبایی وچاو لەدەستی نامەردانیان بکات وکار لەقسەوگوفتاریان بکات. چونکە گومانی تێدانی یە. مرۆڤ تانەوکاتە ئازادەو قسەی بەدەست خۆیەتی کەدەستی بۆماڵی کەس درێژ نەکردوە، ئەینا بەقەدەر درێژکردنی دەست، دەبێ لەبەرامبەردا زمان کورت بکرێتەوە!..

ج) هەژارو لێقەوماوێکە، پێشتر داراو هەبوو بووە، ئێستا نەدار کەوتوە، کەچی خەڵکی دەوروبەری وادەزانن هەروەکو جاران هەبووەو دەست ڕۆیشتوە. خۆشی چونکە هەرگیز دەستی پان نەکردۆتەوە، داوای یارمەتی بۆلەکەس ناکرێ. بەڕاستی ئەم دەوڵەمەندە لێکەوتوانە لەهەمووکەس زیاتر موحتاج ولێقەوماون.

چونکە هەژاری دیار وناسراو لەناوخەڵکا، خەڵکی نەیناسن وخێری پێ دەکەن و پەکی ناکەوێ. قورئان باسی ئەودەوڵەمەندە موحتاج کەوتوانە دەکات و دەفەرموێ: ﴿يَحْسَبُهُمُ الْجَاهِلُ أَغْنِيَاءَ مِنَ التَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَاهُمْ لَا يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافًا﴾ البقرة:٢٧٣.

واتە: ئەو هەژارانە. ئەوەندە کەسایەتی خۆیان ڕاگرن ونەفس بەرزن، ئەوەی نەیانناسێت وادەزانێت دەوڵەمەندن. بەڵام ئیماندار بەڕەنگ وڕوخسار وسیمایاندا دەیانناسێت. داوا ناکەن لەخەڵکی بەزۆر شتی لێ بسێنن وڕوو گیریان بکەن.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمویەتی: (لَيْسَ المِسْكينُ الَّذي يَطُوفُ عَلى النَّاسِ فترده اللُّقْمَةُ واللُّقْمتانِ، والتَّمْرَةُ والتَّمْرَتانِ، ولكِن المِيسكين الَّذي لايَجِد غِنَيَّ يُغْنيه، ولايُفْطِنُ لَهُ فَيَتَصَدَّقُ عَلَيْهِ، ولايَقُومُ فَيُسْأَلَ النّاسَ) - صَحيح الجامِع: (٥٣٨٤).

واتە: هەژار ئەوکەسە نیە کەدەرکا ودەرکی خەڵکی دەگەڕێ ولەهەموو دەرگایەك دەدات و پارویەك دوو پاروی دەدەنێ، پارەیەك دوو پارەی دەدەنێ،



دەنكه‌ خورمایه‌ك یان دوو دەنكه‌ خورمای دەدەنێ (مەبەست لەوەیه‌ كه‌پارەیەكی كەمی دەست دەكەوێ لەهەرماڵێك) بەڵكو بەڕاستی هەژاری ڕاستەقینه‌ ئەوكەسەیه‌ كەنەئەوەندەی هەیه‌ گوزەرانی پێ ی دابین بێ، نەخەڵكی بەحاڵی هەژاری ونەبونی دەزانن تاخێری پێ بكەن وڕزگاری بكەن نەبۆخۆشی لەڕوی دێ سواڵ بكات و لەدەرگای خەڵكی بدات وداوای كۆمەك و یارمەتیان لێ بكات..

لەشەرعیشدا دەفەرموێ: پاداشتی بەخشین بەوكەسه‌ نادیارانه‌، زۆرخێری زیاتره‌ لەوكەسانەی كەبەئاشكرا سواڵ دەكەن ولەدەرگای خەڵك دەدەن و موحتاجن.

د) ئەوانەی نەخۆش و پەككەوتەی سەرجێگاو عارەبانەن. ڕەئیس عائیلەن و خاوەن ماڵ و منداڵن وئەوەی موسڵمانان نەیانداتێ نیانه‌. ئەوانه‌ دەچنه‌ ڕیزی ئەوكەسانەی كەخوای پەروەردگار لەئایەتی (٢٧٣)ی سوڕەتی (البَقَرَه)دا دەفەرموێ: ﴿ لِلْفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحْصِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ ئەم كەسانەش توانای هیچ كاروكەسابەت و جموجوڵێكیان نیه‌ بۆ كاسپی كردن و بەڕاستی خێرو زەكات پێ بەخشینیان پاداشتەكه‌ بەویستی خوا چەندان قات دەكات.

ه) ئەوكەسەی خێرو زەكاتەكەی پێ دەبەخشی، ئەگەر خزمت بێ، كەسی نزیكت بێ، وەكو برا، خوشك، پور، مام، خاڵ، ئامۆزا، پورزا، ئەوه‌ مادام موحتاجن و چاویان لەوەیه‌ كەخوای گەوره‌ بەبون تۆی تاقی كردوٚتەوەو بەسەركردوٚتەوە، تۆش چاوت لەوان بێ وبەسەریان بكەیتەوە. خێركردن بەم كەسه‌ نزیكانەت لەخەڵكی تر پاداشتی زیاتره‌ پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ فەرمویەتی: (الصَدَقَةُ عَلى المِسكينِ صَدَقَة، وعَلى ذي الرَّحِمِ ثِنْتانِ، صَدَقَة وصِلَةٌ) رَواهُ النَّسائِي.

واته‌: صەدەقەو بەخشین بەهەژارێك كەبێگانەبێت، خێرو پاداشتی بەخشینی هەیە. بەڵام خێرو بەخشین بەخزم و كەس وكارت كەموحتاج و ئاتاج بن. دوو پاداشتی هەیە. پاداشتی بەخشینەكە، وەپاداشتی سیلەی ڕەحمەكە.

و) حاڵەتی نەفسی موحتاجەكە، جاری واهەیه‌ ئەوكەسەی خێرەكەی پێ دەبەخشی. تەنها خۆیەتی، ژنێكی بێ مێردومناڵه‌، پیاوێكی پەككەوتەی بێ ژن ومناڵه‌،جل و بەرگەكانی كۆن بوه‌، پێڵاوەكانی دڕاوه‌، نەخۆشه‌، پارەشی نیه‌ وموچەی دەوڵەتیشی نیەو كاسپیشی پێ ناكرێ و ڕووشی نیه‌ سواڵ بكات.

نەفسی ناموڕتاحه‌، تۆ خۆت ملی دەگری و پۆشته‌ وپەرداخی دەكەیتەوەو

بۆ جەژن بەدڵخۆشی یەوە، بەجل و بەرگی نوێ وە دەچێتە هەموو ماڵ و مەجلیسێکەوە. جاری واش هەیە، ئەوکەسەی خێرو زەکاتەی کەی پێ دەبەخشی. بێوەژنێکەو منالی هەتیوو هەژاری هەیەوبەرەو جەژنەو واقوتابخانەش خەریکە دەکرێتەوە. ئەم دایکە. یان جاری واهەیە باوکیشیان هەیە. بەلام زۆر هەژارەو منالی زۆرە. هەموو ڕۆژێ ئەم دایکە، یان ئەم دایك وباوکە، کەسەیری منالە بێ ناز ورەش وڕووتەکانی دەکات. کسپە لەجەرگی یەوە دێت. وەمنالەکەش هەست بەداماوی وکزۆلی و هەژاری خۆی دەکات.. لەم حالەتەدا باوك ودایکەکە، یان دایکی منالە بێ باوکەکان، لەدوولایەنەوە دەرونی نائارامە. هی خۆی وهی منالەکانیشی. کەهاوکاریت کردن ولەوەدەست کورتیە ڕزگارت کردن، دوولایەنت ڕزگارکردوە، هەم دایك وباوکەکە، هەم منالەکان.

یاخود وادەرگای خوێندنگا بۆ سالی تازەی خوێندن کراوەتەوە. منالێکە پاپوچ و نەعلەکانی دڕاون و بۆ مەکتەب نابن. باوکی دەیەوێ جوتێ پاتەی لاستیکی بۆ بکڕێ، بەلام تۆ دەچی جووتێ کالە یان قۆندەرەی زۆر جوان وباشی بۆ دەکڕی.. یان، پانتۆڵ وکراسەکەی سالی ڕابردوی لەبەردەکاتەوە. بەدڕاوی ودوراوییەوە. چونکە لەبەرهەژاری ودەست کورتی ناتوانن هی تازەی بۆبکڕن. کەچی تۆ دەچی چاکترین وجوانترین جل وبەرگی بۆدەکەی. لەم حالەتەدا چەند نەفسێکت دلخۆش کرد. باوك ودایکەکە، یان دایکی منالە نازدارە بێ باوکەکە، کەوادەزانێ ئەو جل و بەرگ و پێلاوە لەبەری خۆیدایە. وەدلی ئەو منالەشت خۆش کردو هەرجارەی سەیریان بکات وخۆشی وشادی بەدلیا بێت. بەدلنیاییەوە تۆ ئەجرو پاداشتەکەت لای خوای گەورە بۆ نوێ دەبێتەوە. بەم شێوەیە لەیەك بە (حەوت سەد) زیاتر بەدەست دێنی.

م) زەمەن وکاتی بەخشینەکە: کەسێك پێویستە بە (١٥٠) هەزار دیناری چاپ هەیە. کاتەکەش ڕۆژی عەرەفەیە. بۆ ئەوەی هەرئەو ڕۆژە بیدات بەپێداویستیەکانی جەژن. ئالەوکاتەدا، لەو ڕۆژەدا ئەو (١٥٠) هەزار دینارە بەیەك ملیۆن هەیە بۆ ئەو کەتۆ دوای جەژن بیدەیتێ. چونکە ئەوتازە دلی شکا ونانی جەژنی بەخۆشی نەخوارد. خۆهەرچەندە لەدوای جەژنیش (٧٠٠) چاکەکەت هەرمسۆگەرە، بەلام ئەگەر لەپێش جەژندا بیدەیتێ و لەوکاتە زەرورەدا پێویستی یەکانی جێ بەجێ ببن. ئەوە بەدەستی خوا لە (أَضْعَافاً كَثِيراً) بەرت دەکەوێت.





ن) جۆری موحتاجیەکە: زستانە وسوپای نیە. فریای دەکەوی وبۆی دەکڕی جیاوازی زۆرە لەگەڵ ئەوەی لەهاویندا (٢٠٠) هەزاری پارەی سۆپاکەی بدەیە. چونکە موبەریدە وپانکەی هاوینی هەیە. ئەو لەزستاندا زۆر داماوو موحتاج بوو. بۆیە لەکاتی پێویستیەکەدا خێر وپاداشتەکەی زۆر لەیەك بەحەوت سەد زیاد دەکات.

برایەك دەناسم. دوو خانوی کرێ ی هەیە. هەموو مانگی ڕەمەزانێك کرێ ی ئەو دوو خانوە لەکرێ چیەکانی وەرناگرێ و وەکو هەدیە پێیان دەبەخشێتەوە. بۆئەوەی بۆمانگی ڕەمەزان بیکەن بەمەصرەفی ماڵ ومناڵیان.. بەڕاستی ئەمە پاداشتەکەی لەیەك بەحەوت سەد زۆر زیاتر دەبێ (إن شاءالله).

بەپشتیوانی خوا لەووتاری داهاتوودا، ئەم بابەتە تەواو دەکەین.



سەرچاوەکان

١- تەفسیری ئاسان ، بورهان محمد أمین.
٢- منهاجُ الصَّالِحین في الآداب الإسْلامِیَّة، محمد عبدالعاطی بُحَیري، ص٢١٣.
٣- خۆشماندەوێیت، حاجی کاروان، بـ١ ل١٠٨. ئامادەکردنی: عوسمان سەنگاوی.

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجْمَعِين.

**ئیماندارانی بەڕێز: لەووتاری ڕابردودا لەخزمەت ئەوئایەتەی قورئاندا بوین، کەخوای پەروەردگار دەفەرموێ:** ﴿ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّاْئَةُ حَبَّةٍۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾البقرة: ٢٦١

**سوپاس بۆ خوای گەورە لەووتاری ڕابردوودا، بەپێ ی زانینی خۆمان و تێگەیشتنی زانایانی ئیسلام لەئایەتەکە، هەندێکمان قسە لەبارەوە کردو گەیشتینەسەر** ﴿ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ البقرة: ٢٦١، **کەهەندێ خاڵمان باس کرد کەدەبنە هۆی ئەوەی لەکاتی بەخشین ودەرکردنی زەکاتی ماڵەکانمان، خوای گەورە بەلوتفی خۆی زیاتر لەیەك بەحەوت سەد پاداشتمان بداتەوە. لەم ووتارەشدا، پشتیوان بەخوای گەورە هەندێکی تر لەوخاڵانە باس دەکەین:**

**أ. حاڵەتی ماددی ودارایی خۆت لەکاتی بەخشینەکەدا:**

**جاری واهەیە تەنها (سەد هەزار) دیناری چاپ لەگیرفان وهەموو ماڵتا هەیە، بەڵام (پێنج) هەزاری لێ دەبەخشی. ئەوە بەوویستی خوا. پاداشتی تۆ گەورەترە لەوکەسەی کە (دە ملیۆنی) هەیەو (پێنج سەد) هەزار دەبەخشێ.. شێخی سەعدی لەگوڵستاندا دەفەرموێ: حاتەمی طی، کەمەشهورە بەسەخاوەت و بەخشندەییەکی وا کەناوی پێ دەربکات و وەکو ڕەمزی سەخاوەت تەماشا بکرێ، جارێکیان کابرایەك پرسیاری لێ دەکات و دەڵێ: ئەی حاتەمی طی ئایا هەرگیز لەخۆتت سەخی تەبیعەت تر بینیوە؟! ووتی: بەڵێ بینیومە. ووتی: کێ بوە؟!**

**حاتەم ووتی: جارێك بووم بەمیوانی ماڵێك، ئێوارە خواردنی بۆدانام. منیش لەناو هەموو گۆشتەکەدا تەنها جگەرەکەیم خوارد. ووتم: جگەر خۆشە. بۆ سبەینێ خواردنەکە هەمووی جگەر بوو. تاچەند ڕۆژێ هەرجگەری دانا، کەسەیرم کرد بۆم دەرکەوت کە (دە) مەڕی هەبووە. هەر (دە) مەڕەکەی سەربڕیوە، منیش لەپاداشتا (سەد) حوشترم دایە. کابرا ووتی: دەی کەواتە تۆ لەوسەخی تر بووی!**

**حاتەم ووتی: ئەو هەموو ماڵەکەی بەخشی، بەڵام من سەد حوشترم لەهەزاران حوشتر داوەتێ. کەواتە: ئەو لەمن بەخشندە ترە!!.**

**بەڵێ ئەوکەسەی بتوانێ لەماڵێکی کەم ببەخشێ، خوای گەورە پاداشتەکەی**

بۆ زیاد دەکات.

ب. شێوەی گەیاندنی خێرەکە: ئایا بەئاشکرا دەیبەخشی یان بەنهێنی. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِن تُبْدُوا۟ ٱلصَّدَقَـٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ ۖ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّـَٔاتِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾البقرة: ٢٧١

واتە: ئەگەر خێروچاکە وبەخشینەکانتان بەئاشکرا ئەنجام بدەن، ئەوە شتێکی چاکە، خۆ ئەگەر بیشارنەوەو بیدەن بە هەژاران بەنهێنی ئەوە چاکترە بۆتان ، جا بەو بەخشینە خوا هەندێك لەگوناهەکانتان دەسڕێتەوەو خوا ئاگایە بەوکارو کردەوانەی کەئەنجامی دەدەن جاری واهەیە بەئاشکرا خێرەکە بکەی باشترە. بەنومێدی ئەوەی کەئەگەر کەسانی تریش کەنەیانزانیوە ئەوخێرە هەیە، بەشداری بکەن. جاری واش هەیە خێرەکە بەنهێنی بکەی باشترە. بۆی بکەیتە زەرفێکەوەو بیدەیتە دەستی، کەچوەماڵەوە بزانێ نامە نیەو پارەیە. بۆیە دەفەرموێ: (فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ). بۆ ئەوکەسەی کەدەبەخشێ باشترە، چونکە توشی ڕیاو منەت نان لەسەر کەس نابێ.

کەواتە: هەرچەندە بۆ هەژارەکە بەئاشکرا بیبەخشی باشترە. (فَهُو خَيْرٌ لكُمْ). نافەرموێ بۆ فەقیرەکە. بۆخۆتان باشترە، بەڵێ ئەگەر بەنهێنی بەخشیت، ئەوا بۆت باشترە چونکە لەدنیادا لەڕیا ومنەت نان لەسەر هەژارەکە ڕزگارت دەبێ و بۆ قیامەتیشت قازانجە، هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: حەوت تاقم وچین هەن لەڕۆژی قیامەتدا لەژێر سێبەری خوای گەوەدان. لەوڕۆژەدا کەهیچ سایەو سێبەرێك نیە تەنها سایەو سێبەری خوای گەورە نەبێ. یەکێ لەو حەوت تاقمە: (ورَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ، فَأَخْفاها حَتَّى لا تَعْلَمَ شِمالُهُ ماتُنْفِقُ يَمِينُهُ). حَديْثٌ صَحيح - صَحَّحَهُ الالْباني (٣٧٦٠) في صَحيح الجامِع.

واتە: کەسێکە، مەرد وقارەمانێکە — چونکە (رجل) بەمانای نێرینە نیە، بەڵکو بەمانای جوامێرو مەردە. کەژنیش دەگرێتەوە، ئەو جوامێرەیە کەدەبەخشێ لە ماڵ و سامانی حەلاڵی خۆی. بەڵام ئەوەندە بەنهێنی دەیبەخشێ. کەنەوەی دەستی چەپی نازانێ بەوەی کەدەستی ڕاستی چی بەخشیوە!!

واتە: لای هیچ کەس، تەنانەت نزیکترین کەسی خۆشی باسی ناکات، چونکە ئەو تەنها لەبەرخوا ئەو خێرەی ئەنجام داوە وخوای گەورەش پێ ی ئاگادارە،






ئیتر پێویستی بەوە نی یە کەس مەدح وستایشی بکات وپێ ی بزانێ.

وە لەفەرمودەیەکی تردا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (إِنَّ صَدَقَةَ السِّر، تُطفيئُ غَضَبَ الرَّبِ).

واتە: خێرو بەخشینی نهێنی، غەزەبی خوای گەورە لەسەر بەندە دەکوژێنێتەوە.

ج. شێوازی بەخشینەکە: ئایا بەچ شێوەیەك پێشکەش بەهەژارەکەی دەکەیت. سەرنجی ئەم ڕوداوە بدەن، بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی باسەکەمان. ئەدیبی گەورە (عەلی تەنتاوی) دەڵێ: ڕۆژێك ئەوکەسەی کەماڵەوە یارمەتی دەداین وکاروباری ماڵی بۆ جێ بەجێ دەکردین. بینیم تۆزێك فاصۆلیاو برنجی کردە سەرسینیەکی مس و تۆزێك باینجان و چەند لەتەخەیارو دەنکە قەیسیەکیشی فڕێدایە سەرو هەڵی گرت تاببیات!. پێم گوت: ئەمەت بۆ کێ یە؟ ووتی: بۆ پاسەوانەکەمە. خانم فەرمویەتی بۆی ببەم. پێم گوت: بگەڕێوە، چ بێ زەوقیەکە ئەم کارەی تۆ! ئادەی سینیەك وچوار قاپ وکەوچکێك و چەقۆیەك وپەرداخێك ئاو بهێنە وهەرجۆرە خواردنێك لەقاپێکی سەربەخۆی پاك و خاوێندا دابنێ. دوای ئەوەی، ئەوەی پێم گوت جێبەجێ ی کردو هەمووی لەسەر سینیەك دانا، هاوڕێ بەکەوچك و چەقۆو پەرداخەکە، گوتم: ئێستا بۆی ببە!! دواتر پێم گوت: بەم کارەت هیچ زیانێکت کرد؟! ئەم ڕێکوپێکیە لەخودی خواردنەکە باشترە! چونکە خواردنەکە بەخشینی ماڵە، بەڵام ئەم کارە سۆز بەخشینە، یەکەمیان: سك تێر دەکات ... بەڵام دووەمیان: دڵ .. شێوازی یەکەم پاسەوانەکە زەلیل دەکات، وادەکات کەهەست بکات وەك سواڵکەرێك وایە وپاشماوەی خواردنی پێ دەدەن. بەڵام شێوازی دووەم وادەکات کەهەست بکات، دۆستێکی ئازیز، یامیوانێکی بەڕێزی ئێمەیە.. ئەم ئەدەبە بەرزە و ئەم زەوقە جوانە، پێویستە هەمومان فێری ببین وبزانین کەبەخشینی سۆز وخۆشەویستی، لەهەموو جۆرەکانی بەخشین گەورەترە. هاوکات دەبێت ئەوەش بزانین کەنابێت بەهۆی هەژاری و پێداویستیەکانی ژیانەوە، مرۆڤایەتی مرۆڤەکانمان لەلا کاڵ ببێتەوە. کاتێکیش دەمانەوێت یارمەتیان بدەین، مەبەستمان سەلماندنی خودی خۆمان وچاو شۆڕکردنی بەرامبەر بێت. هەژاران وکەمدەرامەتانیش وەکو ئێمە مرۆڤن وزۆرجار لەناو پۆشاکی دڕاوو پینەکراوی ئەواندا، دڵێکی گەورەو هەستێکی بەرزو کە لەمرۆڤێکی گەورە دەژی.

زۆر بەهەڵەدا دەچین، ئەگەر تەنها بەچاوی سەروەت وسامانەوە لەمرۆڤەکان بڕوانین. بۆسارێژی برین وناسۆریەکانی ئەوانیش ئەگەر هیچمان لەتوانادا نەبوو. خەندەیەکی گەش، ووتەیەکی خۆش، سڵاوێکی گەرم، دەستێکی نەرم، باوەشێکی پڕ سۆز، گەورەترین بەخشینە.

دەی ئەم شێوازە لەبەخشین خێر وپاداشتەکە لای خوای گەورە زۆر زیاد دەکات. لەسەرویەك بەحەوتسەدەوە (إن شاءالله) جارێکیان برایەك ڕاوێژی پێکردم، لەبارەی ئەوەوە کەباوکی کۆچی دوایی کردوە وکۆمەڵێ جل وبەرگی زۆر تازە وباشی لەدوا بەجێماوە. ئایا فرێیان بدەن، یان ببیبەخشن، منیش پێم ووت: لەبەرئەوەی سوپاس بۆخوا باوکت هیچ نەخۆشیەکی جەستەیی، پێستی وای نەبوە کەمەترسی بۆسەر کەسێك دروست بکات کەجل وبەرگی ئەو لەبەربکات، وەزۆر پاك وخاوێن ژیاوەو مردوە، ئەو جل وبەرگانە ببەخشن بەخەڵکی هەژار. بەڵام تکام وایە ئاگاتان لەجۆری بەخشینەکە بێت. ووتی: چۆن؟! ووتم: جل و بەرگەکان. هەرئاوا لول مەدەن بەسەریەکداو بیکەنە عەلاگەیەکەوە وبۆی ببەن و بۆی فڕێ بدەن!.

بەڵکو بامالەوەتان بەغەساڵە، یان دەست زۆرجوان بیشۆن وپاشان کەووشك بونەوە. زۆر ڕێکوپێك ئوتویان بکەن و هەرڤاتە جل وبەرگەی بیکەنە زەرفێکی تایبەتی خۆیەوەو بەعەترێکی زۆر بۆنخۆش، بۆنداری بکەن پاشان زۆر بەحورمەتەوە بۆنەو هەژارەی ببەنە ماڵەوە وداوای دوعای خێری لێ بکەن. بەم شێوەیە ئەم جل وبەرگە هەرهەمان جل وبەرگە. بەڵام ئەم هەژارە دەیکاتەوەو بەم بۆن خۆشی وئوتوکراوی و پوختەییەوە دەیبینێ، بڕوابکە لەیادی دەچێ کەئەمە جل وبەرگی مردوە. بەڵکو واهەست دەکات هەرئەوکاتە لەلای بەرگ درو بۆی هاتوە! بەپێچەوانەی ئەوەوە بۆی بدەی بەسەریەکدا. کەڕەنگە زیاتر بەزەیی بەخۆی دا بێتەوەو تەنانەت بێزیشیان لێ بکاتەوە! دەی تۆ هەوڵبدە بەم شێوازە جوانەی بەخشینە پاداشتەکەت زیادبکە.

بەڵێ ئیمانداران: هەروەکو چۆن خوای گەورە نموونەی هێنایەوە بەدەنکە گەنم و زیادبونە بۆ چاکەو بەخشین وخێرو خێرات، ئاواش چۆن فەلاحەت و زراعەت، ئەگەر ئاگاداری نەبی، ئافات لێ ی دەداو هیچی لێ هەڵناگری. یان جاری واهەیە بەرهەمەکەی کەم دەکاتەوەو بەحاڵ بنە تۆوت دەست دەکەوێتەوە.



زەكات و صەدەقە بەخشینیش بەلای خۆی هەیە.

ئەویش ئەوەیە كەخوای گەورە باسی دەكات و دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ لَا يُتْبِعُونَ مَآ أَنفَقُواْ مَنًّا وَلَآ أَذًى لَّهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ البقرة: ٢٦٢.

واتە: ئەوانەی ماڵ وداراییان دەبەخشن لەڕێگەی خوادا. بەدوای ئەوەی بەخشیویانە هیچ جۆرە منەتێك نانێن وهیچ جۆرە ئازارێك ناگەیەنن. ئەوانە تەنها پاداشتیان لای پەروەردگاریانە. هیچ ترس وبیمیان لەسەر نی یە. لەكەم وكوڕیی پاداشت و تەنگانەی قیامەت، غەم وپەژارەش ڕوویان تێناكات.

بەڵێ ئیمانداران: لەناوبەری خێرو پاداشتی زەكات و صەدەقە، بریتی یە لە (منەت بەسەردا كردن).

جامنەت كردن جۆری زۆرە: زانای بەناوبانگ (إبنُ القیمّ) دەفەرموێ:

١- منەتی دڵ: كەمنەتی دڵ ئەمە پێناسەكەیەتی (مَنٌ بِقَلْبِهِ من غَيْر أَنْ يُصَرِّحَ بِلِسانِهِ) بەدڵ منەتی بەسەردا بكات، بەبێ ئەوەی بەزمان هیچ دەرببڕێ، وەكو ئەوەی كەكاتێ زەكاتەكە، یان صەدەقەكە دەداتە دەست هەژارەكە، لەدڵی خۆیدا واهەست بكات كەئەو لەوهەژارەوە گەورەترو بەڕێزترە!..

٢- منەت كردن بەزمان، وەكو منەتی بەسەرچاودا دانەوە، كەپێ ی بڵێ، ئاها من لەوكاتی هەژاریەتدا چۆن یارمەتیم دای وزەكاتم پێ بەخشی! (عَبْدُالرَّحمن ی كوڕی زەید) كەیەكێكە لەتابعین، دەفەرموێ: هەموو جارێك باوكم ئامۆژگاری دەكردم و پێ ی دەوتم: (إذا أَعْطَيْتَ رَجُلا شَيْئاً، ورَأَيْتَ أَنَّ سَلامَكَ يُثْقِلُ عَلَيْهِ، فَكُفَّ سَلامَكَ عَنْهُ).

دەیفەرموو: ڕۆڵە گیان. هەركاتێك شتێكت بەخشی بەكەسێك و پاشان زانیت ئەگەر سەلامی لێ بكەیت. لەسەر دڵی قورس دەكەوێ و بەو سەلامكردنەت لێ ی، هەست بەوە دەكات كە چاوبەرە ژێرتەو منەتی تۆی لەسەرە، ئەوە سەلامی لێ مەكە، واتە: ئەگەر زانیت بەرەو ڕوت دێ. تۆ خۆت بەكۆڵانێكدا بكە. یان بەو شوێنەدا مەڕۆ كەئەو كاروكەسابەتی لێ دەكات، تا ناچاری سەلام لێ كردنی نەبی وبەو سەلام كردنەت ئازاری نەدەی. چونكە سەلام كردنەكە، (١٠) چاكەت بۆ مسوگەر دەكات. بەڵام صەدەقە وبەخشینەكە. ئەگەر خوای گەورە قبوڵی بكات ومنەت لەسەركردن نەیسوتێنێ وبەتاڵی نەكاتەوە، بەلانی كەمەوە (یەك بەحەوت سەد) پاداشت مسوگەر دەكەی، دەی لەپێناوی (١٠) چاكەدا، (٧٠٠)

چاکەت مەسوتێنە!!

زانایان دەفەرمون: جاری واهەیە ئەم منەت کردنە بە (لچ هەڵقورچاندنێك) دروست دەبێ، ئەوکەسەی زەکات و صەدەقەکەت پێ بەخشیوە، بەلاتدا تێ دەپەڕێ و سەلامت لێ ناکات، تۆ بەزمان هیچ ناڵێ ی، کەچی لچێکی لێ هەڵدەقرچێنێ و لەناختدا ئەوە دەڵێ ی: باشە تۆ بلێ ی دەوڵەمەند بوبێ وا سەلامم لێ ناکات! خۆمن دوێنێ بوو زەکات وسەرفترە وپارەی خێرم دەدایە! ئەمە خێر وپاداشتەکەت بەتاڵ دەکاتەوە. ڕەنگە یەکێ بپرسێ: باشە بۆچی منەت لەسەرکردن، ئاوا چاکە لەناو دەبات؟! لەوەڵامدا دەڵێین:

١- چونکە صەدەقە وزەکات وبەخشین، خۆشەویستی دروست دەکات، بەڵام کەمنەت وبەسەرچاو دادانەوەی تێدابوو. دەبێتە هۆی دروست بونی ڕق وقین لەنێوان بەخشەر وپێ بەخشراودا.

٢- بەخشین وزەکات بۆئەوەیە کەئەوکەسەی یارمەتی دەدەی، باری سەرشانی سوك بکەی و لەزەلیلی و قەرزاری و نەبونی ڕزگاری بکەی. بەڵام کەمنەتت بەسەردا کرد، تۆش لەهەموان خراپتر زەلیلت کردو ئامانجی بەخشینەکەت هەڵوەشاندەوەو خێرو پاداشتەکەشت هەڵدەوەشێتەوە.

٣- هەر وەختێ منەتت کرد بەسەر ئەوکەسەدا کەپێت بەخشیوە، ئەوە تۆ ئەوکاتە ئەوماڵەت بەهی خۆت زانیوە. نەك بەوەی کەخوای گەورە وەکو فەزڵ وبەخشش خستویەتیە ژێردەستی تۆ. دەی کەبەهی خوای گەورەشت نەزانی (پەنا بەخوا) خواش پاداشتت ناداتەوە.

٤- هەرکەسێ منەت بکات، ئەوە تەکەبوری هەیە. موتەکەبیریش جێگای جەهەنەمە. زانایان دەفەرمون: لای منداڵەکانتان، لەلای کوڕو کچەکانت مەڵێ: ئەمرۆ باش بوو یارمەتی ماڵی فلان کەسی دراوسێمانمدا. یان یارمەتی ماڵی فلان کەسی خزممدا وهەندێ زەکات وخێرم پێ بەخشین. چونکە ئەمە لەوانەیە ببێتە هۆی ئەوەی منداڵەکانت بەچاوی سوك سەیری دراوسێکەت بکەن وخۆیانی بەسەردا ڕادەن و تەکەبور بەسەر ماڵ و منداڵیدا لێ بدەن وبەمەش دڵیان ئازار بدەن. وخوای گەورە خێرەکەت لێ وەرنەگرێ.

٥- هەرکەسێ بۆیە ببەخشێ ویارمەتی فەقیر وهەژاران بدات. تاوەکو منەت بەسەر خەڵکی دا بکات وپاشان هەرکەسێك لەوانە، ئیشێکی بۆنەکرد. یان





بێ دڵیەکی کرد. یەکسەر بەسەرچاویدا بداتەوە. ئەوە خوای گەورە بەعەدلی خۆی، ئەوکەسە خێرپێکراوە والێدەکات کەچاکەی ئەو خێرەومەندەی لەبەرچاو نەبێ، چونکە هەرکەسێ لەدڵێکی پاکەوە لەماڵێکی پاك خێر بکات ولەکاتی بەخشینەکەدا، چەندە هەژارەکە دڵی خۆشە ودوعای خێر دەکات. ئەمیش ئەوەندە دڵی خۆش بوو. وەئەوەندە سوپاسی خوای کرد، کەبەفەزڵ وکەرەمی خۆی ئەوەندەی پێ بەخشیوە کەزەکات دەدا ودەبەخشێ. نەك زەکات وەربگرێ وموحتاج بێ، وەبیری لەوە نەدەکردەوە ئەم هەژارە ڕۆژێ لەڕۆژان سوپاسی بکات. یان چاکەیەکی لەگەڵ بکاتەوە. (سُبْحانَ الله)، خوای گەورە زمانی ئەم هەژارە ڕادێنێ لەسەر ئەوەی کە بەردەوام باسی خێرو پیاوەتی و چاکەی ئەم خێرەومەندە بکات. وەبەپێچەوانەشەوە، ئەگەر کەسێك بۆ ڕیابازی ومنەت کردن لەسەر خەڵکی خێری دەکرد. ئەوە خێر وەرگرەکە بەدەست خۆی نیە، لەجیاتی خۆشی بوێ ودوعای بەخێری بۆبکات، ڕقی لێ دەبێ ولەناو خەڵکا زەمی دەکات.

جاموسڵمانی بەڕێز: بۆ ئەوەی لەم بەڵا لەناوبەرە ڕزگارت ببێ، ئاگاداربە هەرگیز منەت بەسەر کەسدا نەکەی، نەك هەرلەکاتی بەخشینەکەدا، بەڵکو دوای چەندینساڵیش. ئەگەر منەتت بەسەردا کرد وباسی ئەوخێر وزەکاتەت کردەوە، یان دڵت ئازاردا بەوەی کە لەلای خەڵکی باست کرد، ئەوە دوای ئەو هەموو ساڵەش چاکەکانت سفر دەبێتەوە. بەووردی سەرنجی ئایەتەکە بدەن، دەفەرموێ: (ثُمَّ لَا يُتْبِعُونَ مَآ أَنفَقُواْ مَنًّا وَلَآ أَذًى). ئاشکرایە لەڕێزمانی عەرەبی دا، (ثُمَّ) بۆ تەڕاخیە. واتە: باماوەیەکی زۆریش بەسەر ئەوزەکات وصەدەقە بەخشینەدا تێپەڕیبێ، هەرمنەت کردن وباس کردنەوەکە هەڵی دەوەشێنێتەوە. چونکە ئایەتەکە (واو)ی بەکارنەهێنا ونەیفەرموو: (لَا يُتْبِعُونَ مَآ أَنفَقُواْ ....). وەکو نموونەی ئەو فەلاحەی کەدانەوێڵەکەی هەڵگرتوە وکردویەتیە فەردەوە ولەماڵەوە دایناوە. دوای چەند ساڵ ئاگرێك لەوماڵ و مەخزەنەدا کەوتەوە وسوتاندی. هەرهەمان ڕەنج بەخەساربونە، ئەگەر پێش دوێنەکردنیش فەلاحەتیەکەی بسوتایە. بەڵکو ئێستا ئاخ و حەسرەتی زیاترە! بەڕاستی زۆرکەس هەیە دوای چەند ساڵ ئەجر وپاداشتەکەی لەدەست دەداتەوە. هی واهەیە لەکاتی گرانیەکەی سەرەتای نەوەدەکاندا تەنەکەیەك گەنمی داوەتە ماڵێکی زۆر هەژار وداماو وموحتاج.

کەڕەنگە لەوکاتەدا یەك بەحەوت سەد هەزار پاداشتی بۆ نوسرابێ. کەچی دوای ئەو هەمموو ساڵە، کەئێستا دەبینێ کوڕی ئەوماڵە کەئەوکات مناڵ بوە. ئێستا پێ گەیشتوەو سەیارەیەکی باش و بەرچاوی پێ یەو دەڵێین ئەوە کوڕی فلان کەسە، ئەم یەکسەر لەبەرچاوی مەجلیسەکە دەڵێ: ئای دنیا چۆنە. دەی ئەوە لەکاتی گرانیەکەدا من تەنەکەیەك گەنمم دانێ، ئەینا خەریك بوو بمرن لەبرسان. ئابەم قسەکردنە، یەکسەر تەواوی ئەو چاکانەی کەلەوتەنەکە گەنمەدا کاتی خۆی بۆی نوسراوە، بەتاڵ دەبێتەوە ونامێنێ. جا لەترسی ئەوەی کەناوا منەت و ئازاردان صەدەقەوخێرو خێرات بەتاڵ دەکاتەوە. خواناسان زۆر زۆر خۆیان لێ پاراستوە. هەردوو دایکانی ئیمانداران. هەردوو خێزانی بەڕێزی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ خاتوو (عائیشەو ئوموسەلەمە) کاتێك خێرێکیان بناردایە بۆ ماڵە هەژارێك. بەوکەسەیان دەگوت کەخێرەکەیان پێدا ناردوە. تکایە باش گوێ بگرە، بزانە ئەو هەژارە چ دوعایەکی خێرمان بۆ دەکات، جوان لەبەری بکەو وەرەوە بۆمان بگێڕەوە. ئەوکەسەش دەیگوت: باشە ئاخر چ مەبەستێکتان هەیە لەوەی کەبزانن چ دوعایەکی بۆکردون، خۆ خوای گەورە ئاگای لێ یە. ئەوانیش دەیانفەرموو: ئاخر مەبەستمان ئەوەیە، ئەو چ دوعایەکمان بۆ دەکات، ئێمەش هەمان دوعای بۆبکەینەوە. بەم شێوەیە (هذا بِذاكَ حَتَّى تخلِصَ لَنا صَدَقَتَنا) ئەم دوعایەمان بەرامبەر بەدوعاکەی کەبۆی کردوین و صەدەقە وبەخشینەکەمان بەخالیصی و پاڵەفتەیی بۆبمێنێتەوە وهیچ لەپاداشتەکەی کەم نەبێتەوە!..

فوزەیلی کوڕی عیاض. بەوکەسەی کەخێری دەدایە دەیفەرموو: بەڕاستی تۆ گەلێك چاکەت بەسەر منەوە هەیە، زۆر مەمنونتم. چونکە تۆ توێشوەکەمان بۆ هەڵدەگری بۆ ڕۆژی قیامەت ودای نانێ ی هەتا دەیخەیتە تای تەرازوی خێرمانەوە. لەبەردەم خوای پەروەردگاردا. وە لەبەرامبەریشدا، هیچ کرێیەکمان لێ داوا ناکەیت.

بەڵێ ئیمانداران: پاداشتی ئەوکەسانەی کەخێر دەکەن ودەبەخشن، بەبێ ئەوەی منەت بەسەر خێر پێکراوەکەدا بکەن. یان هەرباسیشی بکەن لەلای کەس. بەڵکو داویانەتە دەست خوای گەورەو لەبیرخۆیان بردۆتەوە، پاداشتیان ئەمەیە:

١- خوای گەورە فەرموی: (لَّهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ) جا توخوا مرۆڤ پاداشتی چاکەکەی مسۆگەربێت لای خوای گەورە، ئیتر چی دەوێت لەمە زیاتر؟!





٢- خوای گەورە بەڵێنیان پێ دەدات بەوەی کە:(وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ) کەبەڕاستی ئەمە ئەو موژدەیەیە کەخوای گەورە دەیدات بەدۆستانی خۆی. بەئەولیاو پیاوچاکان. کەنە لەدنیادا ونە لەسەرەمەرگدا، ترس وخەمیان نیە. وەکو دەفەرموێ: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ یونس: ٦٢ بەڵێ مرۆڤی موسڵمان، بەخێروخێرات وبەخشین ودەرکردنی زەکات. دەبێ بەوەلی و دەچێتە ڕیزی دۆستانی خوای پەروەردگارەوەوهەمیشە دڵ ئارام وئاسودەیە. یاخود بەجۆرێکی تر مانای ئایەتی: (وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ) دەکرێ.

(وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ): ترسیان نیە. بەڵام لێرەدا مەبەستیان لەوەیە کەترسی هەژارکەوتنیان لەسەر دڵ ودەرون نیە. کەمرۆڤ زۆر لەهەژاری وهەرژارکەوتن دەترسێ، بەڵام ئەوکەسەی کەدەبەخشێ، هەرچەندە نەفسی پێ ی دەڵێ: ئەی بۆخۆت بۆ هەڵناگری ئەی منالەکانی خۆت. ئەی ئەگەر موحتاج بوی کێ یارمەتیت دەکات؟! بەڵام ئەم سەخی و بەخشندانە. ئەم وەسوەسە ولەبن گوێ خوێندنەی شەیتان کاریان لێ ناکات وساردیان ناکاتەوەو هیچ ترسیان نیە لەهەژارکەوتن و موحتاج بون، چونکە تەوەکولیان لەسەر خوایەو یەقینیان هەیە ئەوماڵەی کەئێستا زەکاتی لێ دەدەن ولێ ی دەبەخشن بەئازایەتی خۆیان بەدەستیان نەهێناوە. بەڵکو خوای گەورە پێ ی بەخشیون. دەی ئەو بەخشندەیە هەرماوەو هەرکات وویستی لەسەربێ، بەرەوام پێیان دەبەخشێ. پاشان: (وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ). هەرگیز دڵ بەخەم نابن. جا خوای گەورە دڵخۆشیان دەکات ولەدڵ بەخەمی ڕزگاریان دەکات بەوەی کە:

١- جاری واهەیە. خوای گەورە هەر ڕاستەوخۆ لەدوای بەخشینەکە، بۆی دەنێرێتەوەو چەند قاتی ئەوەی کەبەخشیویەتی، پێ ی دەبەخشێتەوە. هەروەکو ئەم بەسەرهاتە: دکتۆر: إبراهیم فقێ. لەکتێبەکەیدا: (قُوَّةُ الحُبِّ والتَّسامُحِ)دا، دەڵێ: لەیادمە جارێکیان هەموو سامانەکەم بریتی بوو لە (١٠٠٠) دۆلار، چوم بۆ مزگەوت. بۆ ئەوەی نوێژ بکەم. دوای نوێژ، پێشنوێژی مزگەوتەکە ووتی: مزگەوتەکەمان پێویستی بە (١٠٠٠) دۆلار هەیە، منیش هەزار دۆلارەکەم دایە ئەو مزگەوتە وگەڕامەوە بۆماڵ و دەستەکانم بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و ووتم: خوایەگیان، کاری خۆم سپاردەی تۆ کرد. (سُبْحانَ الله)، گەیشتمەوە ماڵ وکەسێك پەیوەندی پێوە کردم و داوای کرد کاری لەگەڵدا بکەم وپرسی مانگی چەندت دەوێ؟! منیش هەزار دۆلارەکەم کەڕەتی (١٠) کردو ووتم: مانگی (١٠) هەزار

دۆلارم دەوێت. هەرچەندە ئەوە پارەیەکی زۆر بوو، بەڵام خاوەن کار هاتەلام و گرێبەستی لەگەڵدا مۆرکردم بۆ ماوەی سێ ساڵ!! بەڵێ کەسی بەخشندە. مەحزونی ودڵ بەخەمی ڕوی تێ ناکات دەی ئیمانداری بەڕێز بیبەخشە، تاماڵەکەت بەدەست خۆتەوەیە.

ئەبو زەڕی غیفاری زۆر جوانی فەرمووە کەدەڵێ: (فِي المالِ شُرَكاءُ ثَلاثَة) لەماڵ و ساماندا سێ هاوبەش و شەریك هەیە.

١- القَدَر: هاوبەشی یەکەم قەدەری خوای گەورە. کەبەردەوام ماڵ وسامان قابیلی ئەوەی هەیە کەلەڕوداوێکدا تێدا بچێت. بەچاوی خۆمان چەندمان بینی وچەندمان گوێ لێ بوو کەفلان بازاڕ سوتاو زەرەری چەندین دەفتەر دۆلاری گەیاندو چەندین دوکان وکۆگا هیچی لێ دەرنەچوو. بازرگانی واهەبوە ئێوارە کۆگاو مەخزەنەکانی پڕکردوە لەکەل وپەل وهەموو سەرمایەکەی لەوێدا بوە، کەچی شەو بەیەك شۆرتی کارەبا هەموی سوتاوەو هیچی نەماوە!. چەندین کێلگەی پەلەوەری بەخێوکردنی مریشك. بەهۆی یەك ڤایرۆسەوە، کەپزیشکی ڤێتنەریش لەئاستیدا داماوەو نازانێ ئەو جۆرە ڤایرۆسە چی یە. دەیان خاوەن کێلگەی لەماوەیەکی کورتدا ئیفلاس پێ کردوە. لەمانگی ٢٠١١/٧ دا. لەڕۆژنامەی هەولێردا. باسێکی لەڤایرۆسی کوشندەی پەلەوەر کردبوو. کەخاوەنی کێلگەیەکی پەلەوەری ووتبوی: لەماوەی (١٠) ڕۆژدا زیاتر لە (١٠) هەزار مریشکی کێلگەکەم مردوون! یەکێکی تر وتبووی: لەیەك وەجبەدا، بەدوو سێ ڕۆژ زیاتر لە (٣٥) ملیۆن دینارم زەرەر کردوەو هەموو مریشکەکان لەناوچون. بەڵێ، هی واهەبوە ئاژەڵدار بوە. لەیەك شەودا گەلە گورگ لێ ی داوەو (١٠٠) سەرمەڕی لەناوبردوەو هیچی بۆ دەرنەچوە!.. بەڵێ، قەدەر بەردەوام لەپێش مرۆڤە کەسامانەکەی کەزۆر دڵی پێ ی خۆشە وپشتی پێ دەبەستێ، بەشی خۆی لێ ببات. ئەگەر هەموشی لەگەڵ خۆی نەبات!

٢- الوارث: شەریکی دوەمی ماڵ وسامانەکەت بریتی یە لەمیراتگرەکان. کەلەدوای مردنت ڕاستەوخۆ دەست دەکەن بەدابەش کردنی و وانازانن هەرتۆش ڕەنجت پێوە دیوە وپەیدات کردوە. زۆر بەپەلە دابەشی دەکەن وتۆشیان لەیاد نابێت!





٣- بۆخۆتی، جاتوخوا حەیف نیە بۆ خۆشت، وەکو یەکێ لەوانەشت تەماح نەبێ و بەشی خۆشتی لێ لانەدەی. بەڵام دەزانی کامە بەشی خۆتە؟ ئەوەی کەلەپێش مردنتا ناردبێتت بۆ قیامەتی خۆت. ئەو خێرو صەدەقە نەبڕاوانەی کەوەکو ئاوی جاری بەردەوام لەبەری دەڕوات و هەرگیز کۆتایی پێ نایەت.

بەداخەوە زۆر دەوڵەمەند هەیە تەنها بەشی خۆی لەبیرنیە وهەموی بۆ دوو شەریکەکەی قەدەر ومیرات گر داناوە، یان وەصیەت دەکات کەئەگەر مردم، فڵان خێرەو ئەوەو ئەوەم بۆبکەن بەخێر. وەکو ئەوەی خۆی دەستی بەسترابێ ونەتوانێ تاخۆی لەژیاندایە، بەدەستی خۆی خێر بکات.

ئیمانداران: پێم باشە چەند بابەتێکی فیقهی تان دەربارەی زەکات بۆ باس بکەم:

١- ئەوکەسەی قەرزی لای خەڵکە و خۆشی قەرزارە: ئەوکەسە زەکاتی لەسەرنیە ئەگەر قەرزاریەکەی بەئەندازەی ئەو قەرزە بوو کەلەلای خەڵك هەیەتی. هەروەکو لە عبداللە کوڕی عومەرەوە گێردراوەتەوە، کەفەرموویەتی: (إذا كانَ لِرَجُلٍ أَلْفُ دِرْهَمٍ وعَلَيْهِ أَلْفُ دِرْهَمٍ، فَلا زَكاةَ عَلَيْهِ). ئەگەر کەسێك هەزار دیرهەم (دۆلار)ی هەبوو. لای خۆی بوو یان قەرز بوو لای خەڵکی. لەبەرامبەردا، هەزار دیرهەم (دۆلار)یش قەرزار بوو. ئەوە هیچ زەکاتی لەسەر نی یە. بەم پێ یە: ئەگەر دوکاندارێك، بەپارەی دانراوو ئەشیاوکەلوپەلی ناو دوکانەکەی بەهەموی دەگەیشتە (٢٠٠٠) دۆلار — بەڵام لەهەمانکاتا (١٥٠٠) دۆلاریش قەرزار بوو. کەکەلوپەلی هێنابوو، هێشتا پارەی نەدابوو. ئەوە لەکاتی زەکات دەرکردنی دوکانەکەیدا. تەنها زەکاتی (٥٠٠) دۆلاری لێ دەدات.

٢- مەرج نیە ئەوپارەیەی زەکاتی لێ دەدرێ، هەموو دینار و دۆلارێکی، ڕێك ساڵێکی تەواوی بەسەردا ڕۆیشتبێ. نەخێر، بەڵکو تەماشای ڕۆژی دانانی ئەم پارە دەکرێ. بۆنموونە: کەسێك لەمانگی (یەك)دا، هەزار دۆلاری هەبوو. کەگەیشتەوە مانگی یەکی ساڵێکی تر، واتە دوای (دوانزە مانگ) سەیری کرد پارەکەی بووە بە (٣٠٠٠) هەزار ئەوە زەکات لەهەموو (سێ) هەزارەکە دەردەکات. هەرچەندە لەوانەیە (هەزار) یان هی مانگی (١١) بێت کەدەستی کەوتوەو هێشتا دوو مانگی بەسەردا تێ پەڕیوە. چونکە ناکرێ موسڵمان ساڵ دوانزەی مانگ لەزەکات دەرکردن دابێ ولەسەر هەموو پارەیەك بنوسێ لەبەرواری چەندی چەندا دەستی کەوتوە وکەی ساڵێکی تەواوی بەسەردا دەڕوات تازەکاتی لێ بدات،





ئەمە بەکەس ناکرێ بەڵکو دوای تێپەڕبونی یەك ساڵ بەسەر دانان و پاشەکەوت ودەست کردن بەمعامەلە و کرین و فرۆشتنەوە بەوپارەیەوە، زەکاتی هەموو پارەکە لەوسەری ساڵەدا دەردەکات و ئیتر زەکات ناداتەوە تاساڵی داهاتوو.

٣- زەکاتی قەرز کەلەلای خەڵکە: قەرز دوو جۆرە. جۆرێکیان ئەومیە کەلەلای کەسێکە دان دەنێت بەوەدا کەقەرزەکەی لایەو وەختی دانەوەی هاتوە وکەسێکی دیندار ومتمانەدارە وهەیەتی وئەتداتەوە. چاوەڕێ ی هێنانەوەی، ئەوە مادام ساڵێکی بەسەردا تێ پەڕیوە، پێویستە لەسەری ساڵدا زەکاتی لێ دەربکرێ، لەگەڵ ماڵەکەی تریدا. باهێشتا وەریشت نەگرتبێتەوە، چونکە وەکو لەماڵەوە بێ وایە. وەزەکات دەرکردنەکە لەسەر خاوەن پارەکەیە. نەك لەسەر قەرزارەکە!.

هەندێکیش لەزانایان دەفەرمون: زەکاتەکەی لێ نادات، هەتا وەری دەگرێتەوە. ئەوکاتە واجبە زەکاتی هەموو ئەوسالآنەی لێ بدات. کەلەلای ئەوکەسە بوە. کەکەسێکی جێگامتمانە ودان پێداهێنەری قەرزاریەکەی بوە.

زانای گەورە (عطاء) دەفەرموێ: ئەگەر ئەوقەرزەی تەنها لەبەرڕەزامەندی خواو دەست گیرۆیی برای موسڵمانی خۆی بوەو هیچ مامەڵەوکڕین وفرۆشتنێك لەنێوانیاندا نەبوەو، تەنها لەبەرڕەزامەندی خواو یارمەتی دانی ئەوبرا موسڵمانەی وازی لەقازانج وبەرهەمی ئەوپارە هێناوە کە لەلای فلآن کەسە، کە ئەگەر لای خۆی بوایە، قازانجێکی باشی پێ دەست دەخست. ئەوە لەوکاتەدا، چونکە دەزانێ فلآن کەس نیەتی بیداتەوە، ئەینا قەرز کوێر نی یە. ئەمیش چاوپۆشی لێ دەکات. خوای گەورەش کارئاسانی بۆ دەکات و تەنها یەك جار زەکات دەدات لەوپارە قەرزە ئەویش ئەوکاتەی کەقەرزەکەی وەرگرتەوە، ئەوە پێویستە هەرئەو ڕۆژەی کەوەری گرتەوە، زەکاتی لێ بدات. بەڵام زەکاتی یەك جار لەوپارە. باچەند ساڵیش بێ لای ئەو قەرزارە بێ. کەبەڕاستی ئەم فەتوایە بۆ ئەم سەردەمە زۆر گونجاوەو ئەگەر وانەبێ، زۆرکەس کەقەرزی لای کەسێکە وکەسەکە نەدارو هەژارە. ئەینا مل کەچە بۆ دانەوەی. ئەگەر هەموو ساڵێ زەکاتی ئەم پارە قەرزەی بدات. ئەوا لەئەنجاما هیچی نامێنێتەوەو بەمەش خەڵکی لەدەست گرتن و قەرز پێدان، سارد دەبنەوەو ئەو دەرگا خێرە گەورەی یارمەتی و قەرز پێدان لەپێناوی خوادا، بەرەو داخستن دەچێ و ئەمەش لەگەڵ ئامانج ومەبەستی ئیسلامدا ناگونجێ. کەڕوحی شەریعەت. ئاسانکاریە.

٢- قەرزەکەی لای کەسێکە، کەزۆر نەدارەو هیچی بەدەستەوە نی یە. یان



هەرقەرز كوێرە وكەم واهەیە قەرزی درابێتێ وبەسەر ڕاستی دابیەتیەوە بەخاوەنەكەی. یان ئینكاری دەكرد كەقەرزی لابێ. چونكە نوسراو وشاهید لەنێواندا نەبوو. ئەوە لەم كاتەدا واجب نیە لەسەر خاوەن پارەكە زەكات لە قەرزەكەی بدات، هەتا ئەوكاتەی كەپارەكەی دەست دەكەوێتەوە ودێتەوە دەستی یەوە، دوای ئەوەی لێ ی مەئیوس ببوو ئەوكاتە تەنها زەكاتی یەك سالٚی لێ دەدات، هەرچەندە چەندین سالٚیش بێ لای ئەم قەرز كوێرە بێ. چونكە ئێستا كەوەری نەگرتۆتەوە، وەكو نەبوو وایە.

٣- پێویستە ئاگاداری ئەوەبین كە: زەكات بەباوك ودایك ونەنك وباپیر ناشێ. وەزەكاتی باوك ودایك بەكوڕ وكچ وكوڕەزا وكچەزایان ناشێت.

٤- نەقلٚی زەكات، لەشوێنی دانیشتنی خۆتەوە، بۆشارێكی تر، گوندێكی تر دروستە. بەمەرجێ هەژاری دەوروبەرت لەبیرنەكەی. ئەوە دروستە بەشێكی بنێری بۆ شوێنێكی تر. بەتایبەت ئەگەر ئەوهەژارەی لەوشارە دەژیا، كەسێكی نزیكت بوو. وەكو، برات، خوشكت، پورت. وەچاوی لەوەوە بوو كەتۆ یارمەتی بدەی و زەكاتی بۆ بنێری.

٥- پێویست نیە لەكاتی بەخشینی زەكات. بەوكەسەی كەزەكاتەكەی دەدەیتێ، پێ ی بلٚێ ی ئەمە زەكاتی مالٚەكەمەو واپێم بەخشی وئەویش بلٚێ، واقبولٚم كرد. نەخێر ئەمانەی پێویست نیە. هەرلەوكاتەدا كەجیات كردەوە، لەنیەتی دلٚتا هەبێ كەئەمە زەكاتی شەرعیەو جیات كردەوە. ئەوەندە بەسە وئیتر پێویست نیە بەهەژارەكە بلٚێ ی، ئەمە زەكاتە. تەنانەت زانایانی شەرع دەفەرمون: ئەگەر بەناوی هەدیەشەوە بیدەیتێ هەر دروستە.

٦- ئەگەر هاتوو زەكاتت بەخشی بەكەسێك، بەحیسابی خۆت واتزانی هەژارەو موستەحەقی خێرە. كەچی دوایی بۆت دەركەوت، نەخێر دەولٚەمەندە. بەلاٚم هەرخۆی بەهەژار نیشان دەدات، ئەوە لەم كاتەدا تۆ زەكاتەكەت لەسەر لاچوە و پێویست ناكات جارێكی تر بیدەیتەوە. بەلاٚم ئەوكەسە گوناهبار دەبێ، كەموستەحەقی زەكات نەبێ وەری بگرێ و ئەوبەشەی كەمالٚی موستەحەق و هەژارانە بۆخۆی ببیات.

٧- كەسێك دوكانی ووشكەی هەیە. وەكو ڕۆن وبرنج وشەكرو... هتد. ئەوە دروستە بەئەندازەی ئەوەی كەپێویستە لەزەكاتدا بدرێ، برنج وڕۆن وشەكر بدات بەهەژارەكە ودروستیشە پارەی بداتێ، وەكەلوپەل وخۆراكەكانی دوكانەكەی

بەنرخی فرۆشتنی کۆ (جوملە) حیساب دەکرێت..
بۆ زیاتر شارەزابون لەبابەتەکانی زەکات. پێویستە موسڵمانان لەنزیکەوە، پرس بەمامۆستایانی بەڕێزو شەرع زان بکەن وئەندازەی ماڵەکەیانیان پێ بڵێن و لێیان بپرسن کەزەکات بەکێ دەشیەت وبەکێ ناشیەت.
وەهەرکەسیش بۆی گونجا، دەتوانێ تەماشای (الفِقْهُ الشَّرْعِيُّ المُيَسَّر - فَرِيضَة الزَّكاة)ی – محمد علی الصابونی بکات. زۆرجوان ڕونی کردۆتەوە.

لەکۆتایی ووتارەکەماندا دەڵێین: بەڕاستی فرسەتێکی زێڕینە، کەلەم مانگی ڕەمەزانەدا، ئەوانەی کەخوای گەورە سەروەت وسامانی پێ بەخشیون، فریاکەون وبەهەشتی پێ بکڕن. هەزار ڕەحمەت لەوماموستایەی کەفەرمویەتی:
(کەی ئاوابوی؟.. کەساوابوی، نۆ مانگ لەناو هەناودا بوی، لەپزدان وشلاوا بوی کەچی ئەمرۆ زێد سازی، کەشخە وشازی، دەم بەنازی، ژیربە، خوای پێ بکە ڕازی ... گەر لەکاسپیدا دلێری، دنیا جەنگەڵ و تۆ شێری ... بار دەنێری، جەمی دەکەی، دەیبژێری ... گیرفان پڕو وورگ تێری، بەسەفەر وسەیران فێری ... بیرت بێ ئاخری دەمری ... ڕۆژێك دێت میوانی قەبری ... خەرمانی ڕەنجت هەڵدەگری... دەلێبڕێ لەبەهەشتا جێیەك بگری..
ئەوەی کەبەتۆ دراوە، ئەگەر نانە ... ئەگەر ناوە ... ئەگەر عەقڵ ودڵ وچاوە ... ئەگەر پوڵە وسەریەکت ناوە ... سپاردمیە ودانراوە ... تۆ وەکیلی ... عەبدێکی دەست بەکلیلی ... بۆبەخشینی مل بامەدە ... وەکو قارون بەفیزەوە خۆت بامەدە ... لەکاری خێر خۆت لامەدە ... ئەوەی کەگیرفانی پڕە، بەڵام داری دینی زڕە، ویژدان سڕە وەکو سۆتە لەسەر هێلکەی پارە کڕە ... بۆ پڕۆژە چەند لێزان ونەرمە بڕە ... مادام خوای بیرچووەتەوە ... گەوج وگێل وگێژو ووڕە ... ئەی نابینی چۆن بۆدنیا تێدەکۆشێ، وەك بێهۆشێ، خۆش دەنۆشێ، جوان دەپۆشێ، بەڵام بۆقیامەت ناجۆشێ، کراسی تەقوا ناپۆشێ ... زەکات وصەدەقاتی چی؟! پوشێك بەخوا نافرۆشێ.
دەی دەست درێژکە بۆبەخشین، ... بۆ نەداران، ببە بەسێبەرو پەرژین، سارێژی کە دڵی پڕ لەئۆف وبرین ... نەخوازەلا بۆ نازداران ... بباریێ وەك نەرمە باران ... ئەومناڵەی لێ ی قەوماوە ... ناز شکاوە ... باب نەماوە ... هێشتا مناڵە، فرۆیە ... چاو لەتۆیە ... دڵ بەسۆیە ... فیتنە وئنتیحانی تۆیە ... دەفرمێسکی





گۆنای بسڕە ... دەکالاببڕە بەهەشت پێ لەخوا بکڕە..

پێش خۆتی خە ... با بۆ ناو گۆڕی نادیاری ... ببێ بەصەدەقاتی جاری ... خۆت مەست مەکە بەدنیای پڕ لەجەنجاڵی، گەرخاوەنی کۆگای گەورەو ئیمێڵ وگورزو گۆپاڵی ... ببە حاڵی ... ئامان دەستم بەدامانت نەڕۆی بەدوو دەستی خاڵی...

کەسی ژیر ئەلفێکی بەسە ... بۆ داماوان فریاد ڕەسە ... لەجێ ی هەرچی خزم و کەسە ... ژیان ودارایی هەلە ... وەك گرەوە ... ئەم گرەوە مەدۆڕێنە ... بیبەرەوە ... ئەمڕۆ ڕۆژە ... سبەی شەوە ... تەمەن کورتە ... وەکو خەوە ... بەخشندەبە، لەکاروانی چاکەخوازان دوامەکەوە ... پارە تاسەر بۆت نامێنێ ... بەهەشت بکڕە، فریاکەوە..).

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾

ٱللَّهُمَّ ءَامِينَ

سەرچاوەکان


١- قورئانی پیرۆز.
٢- گۆڤاری بڕیار، ژمارە: ٣١، کانونی یەکەمی (٢٠١٠) ، ل٤٨.
٣- السَّعي إلى الآخِرَة، محمد مُتَوَلي الشَّعْراوي، ص١٤٩، ص١٤٧، ص١٥٠، ص٣٦٩.
٤- منهاجُ الصَّالِحين في الداب الإسْلامِيَّة، محمد عَبْدالعاطي بُحَيري، ص٢١٠.
٥- گۆڤاری بڕیار ، ژمارە: ٢٧، ل٢٧.
٦- الفِقَهُ الشَّرْعي المُيَسَّر، فَرِيضَة الزَّكاة، محمد علي الصَّابوني؛ ص٥٠ -٥٢، ص١٢٣، ص١٤٣، ص١٤٥.
٧- گۆڤاری دوانگە، ژمارە: ٣٨، ل٤٤- پەخشانە شیعری مامۆستا غریب پێنجوێنی. (بەکورت کردنەوەوە).

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِين.

ئیمانداران: لەئاینی ئیسلامدا چۆن ڕۆژ پیرۆزە، کاتی هەوڵ وتێکۆشان وکارو کەسابەت و بەدەست هێنانی بژێوی ژیانە. لەگەڵ بەجێ هێنانی دوو فەرزی نوێژ تێ ی داو نوێژی جومعە لەڕۆژدا، شەویش بەهەمان شێوە پیرۆزە. یەك سوڕەتی تەواو لەقورئاندا بەناوی شەوەوە ناونراوە. (سورَة الَّيْل). جاچۆن بێ دینان شەو بۆخراپەکاری بەکاردەهێنن وسوود لەتاریکیەکەی وەردەگرن. خواناسان بۆ چاکەکردن تێ ی داو موناجات و دوعاو پاڕانەوە لەخزمەت پەروەردگارا بەکاری دەهێنن. کەبەڕاستی لەزەتی عیبادتی شەو، لەوکاتە هێمنەدا، کەخەڵکی لەخەودان و خواپەرستان بەئاگان و زیکرو یادی خوا دەکەن و داواکاری پێشکەش دەکەن. ئەم لەزەتەو ئەم تامە شیرینە هەرخواناسان دەیزانن، کەتام وچێژیان لێ بینیوە. بۆیە یەکێ لەپیاوچاکان دەفەرموێ: خوایەگیان، تەنها لە لەزەتی موناجاتی نیوەشەوانم نەکەی ئیتر بەسمە!..

بەڵێ شەوەکان هەموویان پیرۆزن. ئەی ئەگەر شەوێك قورئانی پێدا هاتبێتە خوارەوە ئەبێ چەندە پیرۆز بێ؟! ئەوە قورئان دیاری دەکات ولەپیرۆزیدا ناوی شەوی پیرۆزو پڕقەدرو ڕێزی لێ دەنێ ویەك سوڕەتی قورئانی بەناوەوە دەبێ. سوڕەتی: (القدر). شەوە پیرۆزەکە، پڕبەهاکە. گران قەدرەکە. کەخوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ﴾ بەڕاستی ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە لەشەوی پیرۆزدا. جابۆ زیاتر دەرخستنی گەورەیی ئەوشەوە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ ؟! ﴾ جا تۆ چوزانی شەوی بەفەڕ کامەیە وچ خێرو بەرەکەتێکە. باشە ئەم شەوە بەچی واگەورەو پڕبەرەکەت بوە؟! بەم (سێ) شتە:

١-لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٌ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٍ : شەوی قەدری بەڕێز لەهەزار مانگ ڕێزدار وخێردارترە، واتە: پاداشتی عیبادەت وخواپەرستی ئەوشەوە بێ سنورە.

٢- تَنَزَّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذۡنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمۡرٍ : لەوشەوەدا فریشتەکان کەجوبرە ئیلیشیان لەگەڵدایە، دادەبەزن لەسەر ڕوخسەت و مۆڵەتی پەروەردگاریان، بەجۆرەها فەرمان وکار، بەتایبەت بۆ سەردانی خواپەرستان، بۆ سەردانی مزگەوتەکان. بۆ گوێگرتن لەقورئان خوێندنی قورئان خوێنان. بۆ ئامادەبون لەمەجلیسی تەوبەکاران و سەیرکردنی ئەودڵۆپە فرمێسکە ڕێزدارانەی کەلەخۆشەویستی خوادا بەگونایاندا دێتەخوارەوە..

٣- سَلَٰمٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطۡلَعِ ٱلۡفَجۡرِ : ئەوشەوە ئاسودەیی وئاشتی

وهێمنی و ڕەحمەت و میهرەبانیە، هەتا کاتی بەرەبەیان. پێغەمبەری خواش ﷺ لەبارەی گەورەیی و قەدری ئەم شەوە پیرۆزە، موژدەی داوە بەئیماندارانی ئوممەتی. بەوکەسانەی کەعەودالْی ئەومن بەوشەوە پیرۆزە بگەن و عیبادەت وخواناسی تێدا بکەن. دەفەرموێ: (من قامَ لَيْلَةَ القَدْرِ إيْماناً واحْتِساباً، غُفِرَلَهُ ماتَقَدَّمَ من ذَنْبِهِ).. مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

واتە: ئەوکەسەی شەوی قەدر بەخواپەرستی ویادی خوا بباتەسەر، بەئیمان وباوەڕی دامەزراوو بەتەمابونی پاداشت وڕەحمەت، خوای گەورە لەهەموو گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێت.. بەڵێ دەبێ ئاگاداربین. دانیشتن لەشەوانی قەدردا، تەنها هەربەوە نابێ کەنەخەوی وتەواو. بەڵکو دەبێ ئاگاداری (إيماناً وإحْتِساباً) بین. هەموو دەقیقەیەکی چاومان لەپاداشتی خوایی بێ کەلەوشەوەدا پێمان دەبەخشێ. یەقینمان ببێ کەبەپاکی بەیانی دەکەینەوە ودەبینەوە بەمرۆڤێکی پاکی تازە لەدایك بوو.

بۆیە نابێ لەڕۆژەکەیدا دیسان دەست بەگوناە وخراپەکانی ڕابردوو بکەینەوە یان تورەبین وخەڵکی ئازار بدەین. ئەمە چی یە شەوەکەی دانیشتوین وماندوین!

بەڵێ ئیمانداران: لەبارەی کاتی ئەم شەوە پیرۆزە، پڕبەرەکەتە، لەمانگی ڕەمەزاندا. ئایا دەکەوێتە کەیەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی باس کردوین وفەرمویەتی: (تَحَرَّوا لَيْلَةَ القَدْرِ في الوِتْرِ مِنَ العَشْرِ الأواخِرِ من رَمَضانَ) رَواهُ البُخاريُّ.

واتە: عەودالْ بن وبگەڕێن بەشوێن — شەوی قەدردا، لەشەوە تاکەکانی دەی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا. واتە شەوەکانی (٢١، ٢٣، ٢٥، ٢٧، ٢٩).

خۆ ئەگەر کەسێك توانی هەردە شەوەکەی دابنیشێ، ئەوە زۆر باشترە. چونکە لەوگومانە ڕزگاری دەبێ کەنەواکا ڕەمەزان شەوی یەکەمی، نەپێکرابێ. کەهەرچەندە لەم سەردەمەدا ئەوگرفتە زۆر کەمترە. وە ئەگەر کەسێکیش هەرنەیتوانی وبۆی نەگونجا شەوەکانی قەدر دابنیشێ، ئەوا بەتایبەت باناگای لەشەوی (٢٧) بێت وئەوشەوە بەهیچ جۆرێك لەدەست خۆی نەدات، چونکە هەرخوای گەورە خۆی دەزانێت، ساڵێکی تر دەگەیتەوە بەمانگی ڕەمەزان وشەوانی قەدرت بەنسیب دەبێتەوە یان نا!! ئای چەند کەس پار ئەم کاتانە لەگەڵمان بوو لەمزگەوتا. کەچی ئێستا وا لەژێر خاکدایە!..





بەڵێ موسڵمانان: ئەم شەوە بەبەرەکەتی قورئانەوە وابەڕێز بووە. گەورەترین شەوی هەموو ساڵە. زۆربەی هەرەزۆری موفەسیرینی قورئان لەسەرئەوەن کەئایەتی ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ ۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ أَمْرًا مِّنْ عِندِنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ﴾ الدخان: ٣-٥ .

دەفەرمون: ئەوشەوە موبارەکە. شەوی (لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ ) ی مانگی ڕەمەزانە، نەك شەوی (١٥) شەعبان. کەلەکوردەواری پێ ی دەڵێن: بەرات!

بەڵێ لەشەوی قەدردا، هەموو نەخشەسازیەکی ساڵی داهاتوو، لەلایەن خوای پەروەردگارەوە تەسلیمی فریشتەکانی جێ بەجێ کاری ئەوبوارانەی دەکات، لەشەوی قەدردایە. هەرکەسێ کەلەساڵی داهاتودا لەڕیزی مردواندا بێ. خوای گەورە ناو وکات وشوێنی ڕوح دەرچونی دەدات بە (مَلَكُ المَوْت). وە بڕیار دەدرێ چەند منداڵ لەساڵی داهاتودا لەدایك دەبن وچەندیان دەمرن. کێ دەوڵەمەند دەبێ و کێ هەژار دەکەوێ بەهۆی کار وکردەوەکانی خۆیانەوە.. بەڵێ ئەم شەوە بەبەرەکەتی قورئانەوە وابەڕێز بوە. ئەی باشە دەبێ قورئانەکە بۆخۆی چەند گەورە بێ. ئەی ئەوەی کەلەخزمەتی قورئاندایە چەند گەورەیە؟!

حەزرەتی (رَسولُ الله) ﷺ موژدە ئەدا بەتۆی ئیماندار کەلەخزمەت قورئاندا بووی بەوەی کەبەخوێندنەوەی یەك پیتی. بەڵێ تەنها یەك پیتی. نەك ووشەی، خوای گەورە (١٠) چاکەت بۆ دەنوسێ!! ئای لەوقازانجە لەکۆتایی نەهاتوە. وەموژدەی پێداوی قورئان خوێن لەگەڵ فریشتەکاندا دەبێ بەهاودەم و هاو مەجلیس. فریشتەکان پارێزگاری لێ دەکەن و دوعای خێری بۆ دەکەن.



بەڵێ ئیمانداران: زۆرکەس دەپرسێ ودەڵێ: باشە ئەوشەوە گەورەو پڕقەدرە بەچ شێوەیەك وبەچ جۆرە عیبادەت وخواپەرستیەك زیندوو بکەینەوە؟ لەوەڵامدا دەڵێین: بەم شێوازە عیبادەتانە زیندوی دەکەینەوە:

١- عیبادەتی ئەندامەکانی لاشە، وەکو: نوێژ، قورئان خوێندن، زیکر، صەلاوەت.

٢- عیبادەتی دڵ، وەکو: تەوبەکردن، خاتوو عائیشەی دایکی ئیمانداران عەرزی پێغەمبەری خوای کرد ﷺ: (يارَسُولَ اللهِ، أَرَأَيْتَ إِنْ عَلِمْتُ أَيَّ لَيْلَةٍ لَيْلَةُ القَدْرِ، ماأقولُ فيها؟ قالَ: قُولي: اللَهُمَّ إِنّكَ عَفُوٌّ تُحِبُّ العَفْوَ فَاعْفُ عَنّي). رَواهُ الترمذي، وقالَ: حَديثٌ حَسَنٌ صَحيحٌ.

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ. ئایا ئەگەر بۆم دەرکەوت کام شەوە. شەوی قەدرە، چی تێدا بڵێم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: بڵێ، پەروەردگارا. بەڕاستی

تۆ ئەوەندە لێخۆشبوی لەگوناه وتاوان. کەنەك هەرلەگوناههکه خۆش دەبیت. بەڵکو لەدەفتەری کردەوەکانی بەندەکەتدا. ئاسەواری گوناههکەش ناهێڵی و شوێنەکەی پردەکەی لەچاکە. ئەی خوای پەروەردگارم تۆ کەئاوا (العفو)ی و ئەوەندە لێخۆشبونت لەبەندەکانت پێ خۆشە. خوایەگیان لەمنیش ببوری ولێم خۆش بی.

لەفەرمودەیەکدا هاتووە، کەپێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (للّهُ أَفْرَحُ بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ من: الضَّالِ الواجِدِ، والعَقيمِ الوالِدِ، والضَّمأنِ الوارِدِ).

واتە: خوای پەروەردگار خۆشحاڵترە بەتەوبە وگەڕانەوەی عەبدی خۆی بۆلای خوا لەوکەسەی کەهەموو سەروەت وسامانەکەی بزرکردوە وپاشان دەیدۆزێتەوە. وەخۆشحاڵترە لەوکەسەی کەچەندین ساڵ مناڵی نابێ ونائومێد بوە لەمناڵ بون کەچی پاشان خوای پەروەردگار مناڵی دەداتێ. (ئەو دایکەو ئەو باوکە چەندە شادمانن کاتێ کۆرپەی جگەرگۆشەیان، دوای ئەوهەموو ساڵ چاوەڕوانی و تامەزرۆیی یە لەئامێز دەگرن. خوای گەورە شادمانترە بەوەی کەکاتێ بەندەیەکی گوناهباری تەوبە دەکات).. وەخوای گەورە شادمانترە بەتەوبەی بەندەی گوناهباری لەوکەسەی کەلەچۆڵەوانی وبیابانێکدایەو تینویەتی زۆری بۆهێناوە وهیچ کانی و سەرچاوە ئاوێك پێ نازانێ و یەقینی هەیە کەبەو تینوایەتیەوە ناگاتە هیچ گوندو ئاوەدانیەك وهەتا چاو بڕکات، هیچ کەس نابینێ. کەچی لەوکاتەدا کە لەتینوان بەملاولای خۆیدا دەسورێتەوە، بەبێ ئەوەی بزانێ بۆکوێ دەڕوات، بەسەر بیرەئاوێکدا دەکەوێت. کەئاوێکی سارد وشیرینی تێدایە وتێر ئاوی لێ دەخواتەوەو لەمردن ڕزگاری دەبێ!..

بەڵێ ئیمانداری بەڕێز، خوای گەورە ئەوەندە خۆشحاڵە بەتەوبەی عەبدی خۆی، چۆن کەسێك دوو کوڕی هەبێ، یەکیان هەتا بڵێ ی گوێڕایەڵ ودڵسۆزو ڕێکوپێك. یەکێکیشیان، هەتا بڵێ ی لاسارو سەرلارو خراپەکارە، کاتێ کەئەم کوڕە خراپەکارە واز لەڕەفتارە خراپەکانی و ڕەفیقە لارەکانی دێنێ و دەست دەکات بەڕەفتاری جوان و گوێڕایەڵی باوك ودایکی. ئەم دایك و باوکە چەندە خۆشحاڵن بەوکوڕە چاکەیان. لەوەزیاتر خۆشحاڵن کەکاتێ ئەم کوڕە خراپەکارەیان تەوبەی کردووەوگەڕاوەتەوە. بەڵێ وتراوە: (أنينُ المُذنِبينَ أَحَبُّ إلى اللهِ تَعالي من تَسبيحِ المُرائينَ). ناڵە ناڵی گوناهباران خۆشترە لەلای خوای گەورە لەدەنگی تەسبیحاتی ڕیابازان.

بەڵێ لەشەوی قەدردا. جوبریل و فریشتەکان دێن گوێ لەناڵەو پەشیمان







بونەوەی تەوبەکاران دەگرن. دەی بابەشێك لەوشەوە بۆخۆمان بەتەنها دانیشین وبیری گوناهەکانمان بکەینەوەو داوای لێخۆشبون و لێبوردنی خوای گەورە بکەین.

٣- لەشەوی قەدردا. عیبادەتی (الانْکِسارُ لِلّهِ) بکەین. عیبادەتی مل کەچی و خۆبچوك کردنەوە لەدیوانی خوای گەورەدا. ئەم عیبادەتە بەزۆری بەدڵ دەکرێ، لەوشەوە پیرۆزەدا، بەدڵ ڕوو لەخوای گەورە بکە وبڵێ: خوایەگیان زەلیلی بەرقاپی ڕەحمەتی تۆم ڕەحمم پێ بکەی.

سەرنجی ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەری خوا بدەن: خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموێ: لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە ڕوو لەبەندەیەکی دەکات ودەفەرموێ: باشە بەندەکەم، من لەدنیادا برسی بوم. بۆچی تێرت نەکردم وخۆراکت بەش نەدام؟! بەندەکەش دەڵێ: یائیلاهی، یا رَبَّ العالمین. تۆ پەروەردگاری منی وسەرجەم مەخلوقاتی، ڕزقی هەمووان هەرتۆ دەیدەی، ئیتر چۆن تۆ برسیت دەبێ؟! خوای گەورە دەفەرموێ: ئەی نەتدەزانی و ئاگات لێنەبوو کەفلان بەندەیەم چەند هەژارو ئاتاج و برسی بوو. تۆش هەتبوو. ئەگەر ڕۆژێ لەدنیادا تێرت بکردایەو یارمەتیت بکردایە. (لَوَجَدْتَ ذلك عِنْدي).

ئەمڕۆ پاداشتەکەت لای من دەبینیەوە وئێستا فریات دەکەوت. بەهەمان شێوە خوای گەورە دەفەرموێ: ئەی بەندەکەم تینووم بوو. داوای ئاوم لێ کردی ونەتدامێ. ئەویش دەڵێ: خوای گەورە تۆ چۆن تینوت دەبێ تامن ئاوت بدەمێ؟! دەفەرموێ: ئەی ئاگات لێ نەبوو فلان کەسی دراوسێت چەند بێ ئاو بوو. ئاوی دەکرێ. تۆش بیرە ئاوێکی سەربەخۆت هەبوو. ئەگەر لەدنیادا ئاوت بدایە بەو ئەمڕۆ پاداشتەکەت لای من دەبینی. بەڵام نەتکرد ونەوئەجرە گەورەت لەدەست خۆت دا.. پاشان خوای گەورە دەفەرموێ: ئەی بەندەکەم، من لەدنیادا نەخۆش بووم، ماوەیەکی زۆر لەسەرجێگا کەوتم، تۆش ئاگاداربوی کەمن ئاوا نەخۆشم. کەچی نەهاتی بۆلام ودڵخۆشیەکم بدەیەوە! بەندەکەش دەڵێ: خوایەگیان تۆ (رَبُّ العالمینِ) ی تۆ شیفای هەموو نەخۆشان دەدەی. ئیتر چۆن نەخۆش دەکەوی، تامن بێم بۆلات؟ خوای گەورە دەفەرموێ: ئەی نەتزانی کەفلان کەس نەخۆش بوو. زۆرچاوی تێتەوە بوو. تۆش ئاگاداری حاڵی بوی، (أما عَلِمْتَ أنَّكَ لَوْ عُدْتَهُ لَوَجَدْتَني عِنْدَهُ!!) ئایا نەتدەزانی ئەگەر تۆ بچویتایە بۆ هەواڵپرسین وسەردانی منت لەلای ئەونەخۆشە دەبینی!، منت لای ئەو دەست دەکەوت.

جاسەرنج بدەن وبەوردی لەفەرمودەکە بڕوانن. بۆ تینویەتی و برسیەتیەکە، فەرمووی: (لَوَجَدْتَ ذلك عِنْدي) بەڵام بۆ نەخۆشەکە فەرمووی: (لَوَجَدْتني عِنْدَهُ). بۆچی؟ چونکە ئەوکەسەی تینوو برسی یە. هەوڵێك هەردەدات، جوڵەیەك دەکات. بەڵام نەخۆشی ناوجێگا زەلیلەو توانای جوڵەی نیە ودڵی ناسك بۆتەوە. بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ بۆخۆم لەلای دەبم ومنت لای ئەو دەست کەوت.

بەڕێزان: لە (١٧)ی مانگی ڕەمەزاندا بوو کەجەنگی بەدر ڕوی دا. کەپێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە لەخوای گەورە پاڕایەوەو دەستی بەرز کردەوە، هەتا عەباکەی سەرشانی کەوتەخوارەوە. ئەوەندە بەزەلیلی و ملکەچی یەوە لەخوا دەپاڕایەوە. لەم کاتەدا ئەم جۆرە عیبادەتەی دەکرد. عیبادەتی: (الإنْكِسارُ لِلّهِ). ئەوەبو حەزرەتی أبوبکر فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەسە ودەستت داگرە، خوای گەورە وەڵامت دەداتەوە. جا خوای گەورە باسی ئەوەمان بۆدەکات، کەهۆکاری سەرکەوتنی موسڵمانان بەو ژمارە کەمەوە لەڕوی سەربازەوە، وە بەو چەکە سادانەی کەبە مەبەستی شەڕ هەڵیان نەگرتبوو. لەبەرامبەردا لەشکری دوژمن بەو ژمارە زۆرەی وبەو هەموو وڵاخی جەنگی وچەکی بەهێزەوە. کەچی موسڵمانان سەرکەوتنێکی یەکجار گەورەیان بەدەست هێنا. کە بەپێوەری سەربازی، شتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو. بۆ؟! چونکە موسڵمانان لەدەرگای زەلیل بوون ومل کەچ بونیان دا بەرامبەر بەخوای پەروەردگار. وەکو دەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ فَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢٣﴾ ﴾ آل عمران:١٢٣.



هەرلەسیرەی پێغەمبەری پێشەوامان‌دا هاتوەکە: کاتێ لە (طائف) گەڕایەوەو سەرەڕای ئەوەی ئیمانیان پێ نەهێنا، سەرکردە ودەست ڕۆیشتوەکانیان، مناڵ و هەرزەکاریان شوێن خست و بەردیان تێگرت و قاچی پیرۆزی خوێناوی بوو.

ئالەم کاتەدا وەختی عیبادەتی -(الانكسار للهِ)یە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (اللّهُمَّ أَشْكُوا إلَيْكَ ضَعْفَ قُوَّتِي وقِلَّةَ حيلَتي. وهَواني عَلى النّاسِ، أَنْتَ رَبُّ الْمُسْتَضْعَفينَ وأَنْتَ رَبِّي)... بیهێنە بەرچاوی خۆت چۆن زەلیلانە و مل کەچانە لەخوای گەورە دەپاڕێتەوە. تادەگاتە ئەوەی کەدەفەرموێ: ئەی پەروەردگارا ئەگەر تۆ لێم تووڕە نەبی، ئەوا هەرچەندە ئازار بدرێم، وەڵامم نەدەنەوە، بەربارانم بکەن، دڵم بشکێنن. (فَلا أُبالي) من گوێ نادەمێ وگرنگی پێ نادەم. تەنها چاوم لەڕەزامەندی تۆیە. دەی تۆی ئیمانداریش، ئەگەر بەهەرشتێ دڵت



ئازار دراوە. دڵت شكێنراوە، بێدینێك بە بەڕۆژوو نەبونی وبەئاشكرا خواردن وخواردنەوەی لەسەر جادەكان. دڵی ئازار داوی، كێشەی خێزانیت هەیە، چونكە ماستاوچی نی، ئیش وكارت ناڕوات لەفەرمانگەكاندا، وەرە ئاوا لەقاپی خوای گەورە بدە ولەشەوی قەدردا. ئەم عیبادەتە ئەنجام بدە وبەودوعایەی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ، لەخوا بپاڕێوە. جا هەروەكو چۆن لەدوای ئەمە دەرگای خێر وخۆشی وعیزەت وهێز لەپێغەمبەری خوا كرایەوە وشەو ڕەوی پێكراو پاشان هیجرەت بۆمەدینە دەستی پێ كردو دەوڵەتی مەدینە دامەزراو ئیسلام بۆهەمیشە عیزەت داربوو. (إن شاءالله) تۆش ئاوا دەرگای خێرت لێ دەكرێتەوە وشادمانی ڕووت تێدەكات. هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ لەكاتی سەركەوتنیشدا، لەفەتحی مەككەدا، لەوسەركەوتنە گەورەدا. كە بۆ دواجار بت پەرستی ڕەگ و ڕیشەی دەرهات بەئایەتی ﴿جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَزَهَقَ ٱلۡبَٰطِلُۚ إِنَّ ٱلۡبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقٗا﴾ الاسراء: ٨١.

لەو ڕۆژەدا كەپێغەمبەری خوا ﷺ نزیكەی (١٠) هەزار صەحابەی لەخزمەتدا بوو. ئالەوكاتەدا كەچوە مەككەوە، سەری خستە سەرپشتی ولاخەكەی وگریا. بۆچی؟! خۆئەمە وەختی خۆشی یە! ئەمە ئەوساتە وەختەیە كەپێغەمبەری خوا ﷺ خەونی پێوە دەبینی. ئیتر بۆچی ئاوا دەكات؟! ئەمە وەختی عیبادەتی (الانكسار لِلّهِ) یە.

لەكاتی كۆچی دوایی وبەجێ هێشتنی دونیای فانی دا. فەرموی: (لا إله إلا الله، إنَّ لِلْمَوتِ سَكَرات. اللَّهُمَّ أعِنِّي عَلى سَكَراتِ المَوْتِ). دەیفەرموو: لا إله إلا الله بەڕاستی مردن ناڕەحەتی تایبەتی خۆی هەیە. خوایەگیان یارمەتیم بدەی لەسەر ئازاری ڕوح دەرچوون!! باشە خۆمردن ودونیا بەجێ هێشتن لەگەڵ مانەوە تاقیامەت لەدونیادا، خرابوە بەردەستی خۆی. بەلام پێغەمبەری خوا ﷺ چونەوە قیامەتی هەڵبژاردو فەرموی: (بَلِ الرَّفيق الاَعْلى). ئەی باشە بۆچی ئاوا باسی مردن دەكات داوای كۆمەك لەخوای گەورە دەكات بۆ ئەوەی یارمەتی بدات لەسەر ئازاری ڕوح دەرچون؟! چونكە لەم وەختەدا ئەم عیبادەتی زەلیلی نواندنە بەرامبەر بەخوای گەورە، كاتی ئەنجام دانیەتی. چونكە هەتا مرۆڤ زەلیلی بنوێنێ بەرامبەر بەخوای گەورە، خوای گەورە زیاتر ڕەحم وبەزەیی پێدادێتەوە دەی تۆی ئیمانداریش، بەشێكی شەوی قەدر، بەیادی مردن و قەبرو قیامەتی خۆت ئاوەدان بكەوە.

بیر لەوکاتە بکەوە کە بۆدواجار خواحافیزی لەدونیا دەکەی، بڵێ: خوایە لەکاتی تەنهایی و زەلیلی ڕوح دەرچوندا ڕەحمم پێ بکەی، ئیمانم سەلامەت بکەی.

دەچینە خزمەت حەزرەتی عومەری کوڕی خطاب. ئەو عومەرەی کەحەسەنی بەصری دەفەرموێ: ئەگەر دەتانەوێ، کۆڕو دانیشتنتان ڕازاوە بێ، باسی عومەری کوڕی خەطابی زۆر تێدا بکەن... حەزرەتی عومەر کەکاتێ بوو بەخەلیفە لەبەرچاوی هەموو جەماوەری موسڵمانان لوتفی خوای گەورەی هێنایەوە بیرخۆی و فەرموی: خەڵکینە بەخوا من ڕۆژگارێك بوو برسی بووم، تائێوارە بەمشتێ مێوژ ئاوم بۆ خەڵکی دەکێشا!!

لەکاتی حەجیشدا، کەبەدەیان هەزار کەس لەخزمەتی دا بوو. فەرموی: ڕۆژێك بوو، من لێرەدا شوان بوم. ئەمە هەموی فەزڵی خوایە کەئاوا منی کردوە بەئەمیری ئیمانداران. خۆزگایە کاربەدەستان بیریان لەوە بکردایەتەوە، کەپێش ڕاپەڕین وەزعیان چۆن بوو. چەند نەدار وهەژار بوون، چۆن ئاوارەی وڵاتان بوون، ئێستا خوای گەورە لوطفی لەگەڵ کردون ودەسەڵات وکورسی وکولێرەی پێ بەخشیون.

تۆی ئیمانداریش لەشەوی قەدردا، بیر لەخۆت بکەوە کەچۆن ساڵانێك ژیانت بەنەبونی وهەژاری بردەسەر، ئێستا خوای گەورە ئەم هەموەی پێ بەخشیوی. هەزاران جار سوپاسی خوای گەورەی لەسەربکە... بەڵێ، حەزرەتی عومەر لەسەرەمەرگایە وبەدەستی کافر بریندار کراوە. لەمیحرابی مزگەوتەکەی (رَسولُ الله) دایە. کەچی بەعبدُالله ی کوڕی دەفەرموێ: ڕۆڵەگیان، سەرم لەسەر ڕانت لابە وڕومەتم بخەرە سەرزەوی یەکە، بەڵکو خوای گەورە لەم کاتەدا بەزەیی بەزەلیلی وداماویمدا بێتەوە ولێم خۆش بێت. پاشان فەرموی: (وَيْلٌ لِعُمَر، إنْ لَمْ يَغْفِرِ اللهُ لِعُمَر). ئای هاوارو ڕۆڕۆ، ئای تیاچون بۆ عومەر، ئەگەر خوای گەورە لە عومەر خۆش نەبێت.

باشە حەزرەتی عومەر چۆن حوکمڕانی کردوە، ئاوا دەترسێ؟! بابزانین چۆن فەرمانڕەوایی کردوە!.. لەوڵاتی بەحرەینەوە، میسك هاتبوو بۆشاری مەدینە، وویستی دابەشی بکات بەسەر دانیشتوانی مەدینەدا. بۆیە فەرموی: بزانن ژنێکی لێزان بانگ ناکەن بەسەر ئافرەتاندا دابەشی بکات. خێزانەکەی






ووتی: من دەتوانم ئەوکارە بکەم. حەزرەتی عومەر فەرمووی: نا، نا، تۆ دەستی لێ مەدە. خێزانە بەڕێزەکەی فەرمووی: بۆچی؟! فەرمووی: لەترسی ئەوەی نەوەکو دوای ئەوەی بەدادپەروەرانە دابەشت کرد، دەست بێنی بەسەرملتاو دوایی من بۆنی بکەم!! ئەی ئەگەر ئەمە فەرمانڕەوایەتی بوە ئاوا حوکمڕانی کردوە، بۆچی ئاوا لەسەرەمەرگا. کەلەسەر دینی خوا شەهید دەکرێ، ئاوا دەفەرموێ وسەری دەخاتە سەرخۆڵ؟! چونکە ئەم کاتی سەرەمەرگە وەختی ئەم عیبادەتەیە. عیبادەتی زەلیلی و مل کەچی نواندن بەرامبەر بەخوای گەورە.. بەڵێ هەروەختێ کاربەدەست ئاوا بەزەلیلی و مل کەچی لەبارەگای خوا پاڕایەوە. ئەوا میللەت بەسەر بڵندی دەژی. بەپێچەوانەشەوە. هەروەختێ کاربەدەست لوتی لەئاسمان بوو. ڕۆژێ لەڕۆژان ناوچەوانی نەخستە سەرزەوی بۆخوا. ئەوا ئەوکاتە میللەتەکە سەر ودەم ولوتی لەقوڕ دەچەقێ. کام قوڕ؟! قوڕی خوێنڕێژی، ماف خۆری، گەندەڵی، گرانی...

بەڵێ ئیمانداران: صەحابەکان چاك لەم عیبادەتە تێگەیشتبون: عبدُالله ی کوڕی ئوم‌مەکتوم.. کام عبدُالله؟! ئەو عبدُالله یەی کەنابینابوو. کاتێ لەمەککەدا ئیمانی هێناو موسڵمان بوو. حەزی دەکرد بەردەوام ئەو قورئانە وەرگرێ کەبۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتوەو لەبەری بکات، بۆیە هەموو ڕۆژێ دەهاتە خزمەتی. ئەوەبوو ڕۆژێکیان بەودڵە پڕلەئیمانەیەوە، وەکو هەمیشە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵام خۆئەو نابینایە وچاوی لێ نیە کێ ی لێ یە یان نا. ئالەوکاتەدا کۆمەڵێك لەسەرکردەکانی قوڕەیش دانوسانیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ کردبوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر خۆشحاڵ بوو کەئامادەن گفتوگۆ بکەن وزمانی ووتوێژ بکەوێتە ناویانەوە وپەیامی خوایان پێ بگەیەنێ، لەم کاتەدا کەعبدُالله ی نابیناهات، پێغەمبەری خوا ﷺ لەدڵەوە پێ ی خۆش نەبوو. چونکە حەزی دەکرد ئەم کاتە لەگەڵ ئەو ناودارانەی قوڕەیش بەسەر ببات و قسەیان بۆبکات و بانگیان بکات بۆئیسلام. وە ئەم پێ خۆش نەبونەی ناودڵی تۆزێ لەسەر دەم وچاوی پیرۆزی دەرکەوت وهەندێ ڕووی گرژ بوو. بەڵام خۆبەزمان هیچی نەوتبوو. خۆ عبدُالله ش دەم وچاوی پێغەمبەری خوا نابینێ. تابزانێ پێناخۆش بونێکی پێوە دیارە. بەڵام لەم کاتەدا خوای گەورە لەعەرشی

عەزیمەوە، جوبریلی ئەمین دەنێرێتە خزمەت فەخری کائینات، حەزرەتی محمد ﷺ وەسورەتی (عبس) بۆ دێنێ: (عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ)

عبس: ١—٣.

کەلەدوای ئەوەوە هەرکاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ تۆشی ئەم صەحابە بەڕێزە نابینایە ببوایە دەیفەرموو: سەلامی خوا لەکەسێك بێ، کەخوای گەورە لەسەرئەو لۆمەی پێغەمبەرەکەی کرد!! بەڵێ لەسەردەمی مەدینەشدا ئەم عَبْدُالله یە بوو بەبانگدەری پێغەمبەری خوا ﷺ وەپێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ کەتەشریفی ببردایە بۆجیهاد وشاری مەدینەی بەجێ بهێشتایە عبدالله ی کوڕی ئومومەکتومی لەشوێنی خۆی دادەنا، وەکو لێپرسراوی شاری مەدینە! جاکاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، عبدالله هەرلەژیاندا بوو. وە لەخزمەت ئیمامی ئەبوبەکریشدا دڵسۆزانە خزمەتی ئیسلامی کرد. پاشان لەسەردەمی حەزرەتی عومەردا، عبدالله ی کوڕی ئومومەکتوم کاتێ بیستی لەشکری ئازادی بەخشی ئیسلام بەرەو عێراق بەرێ دەکەوێت بۆ هەڵتەکاندنی زوڵم وستەمی ڕەشی فارسەکان. عبداللەش چوە خزمەت ئیمامی عومەر وداوای لێکرد کەناوی تۆماربکات لەگەڵ سوپاداو بڕوات بەرەو عێراق.

حەزرەتی عومەر فەرموی: ئاخر تۆ نابینای وخوای گەورە (إن شاءالله) بەو نیەتە پاکە ودڵە پڕ لەئیخلاصەتەوە، پاداشتی تەواوت بۆ دەنوسێ بەڵام چون بۆ عێراق بەو ڕێگا دوریە وبەشداری جەنگ (کەخوای گەورە لەسەر نابینای لابردوە) بۆتۆ زۆر ناڕەحەتە وهەرلەمەدینە بمێنەرەوە. بەڵام عبدالله فەرموی: قوربان حەزم لەغەزایە و بەئومێدی ئەوەم کەخوای گەورە شەهیدیم بەنسیب بکات وڕوخصەت دەگۆڕم بۆ عەزیمەت. وەلەمەیدانی جەنگا بەویستی خوا، ئالای لەشکری موسڵمانان هەڵدەگرم و چونکە نابینام هەڵنایەم و ورە دەبەخشم بەسەربازەکان. وەسەریشم گەورەیە و ڕەشایی موسڵمانانم پێ زیاد دەبێت، لەبەرامبەر کافردا!! حەزرەتی عومەر کەگوێ ی لەم هەموو هەوڵ وهیممەتە بوو. لەم عەزم وئیرادە پۆلاینە بوو. لەم عاشق بوونی شەهیدیە بوو، ڕێگای پێداوخواحافیزیان لەیەك کردو لەگەڵ سوپادا بەرەو عێراق هات و سەرەنجام لەمەیدانی غەزادا شەهید کرا!!، جالەوکاتەدا کەلەمەیدانا برینداربوو، خوێنی پاکی بەجەستەی پاکیا دەهاتە خوارەوە. ئالەم کاتەدا، عبدالله ی





نابینا بەچاو بەلام خاوەن بەصیرەتی دڵ. زانی کاتی عیبادەتی (الانکسارُ للهِ) یە، بۆیە خوێنەکەی کەلەگەڵ خۆڵی بیابان تێکەڵ ببوو. خۆڵ وخوێنەکەی بەهەردوو دەستی هەڵگرت ولەدەم وچاوی هەڵسوو. وەفەرموی: خوایە زەلیلم بەزەییت پێمدابێتەوە!!.. خوایە لەم کاتەدا کەدواساتی ژیانمە بەچاوی ڕەحمەت تەماشام بکەی. بەم شێوەیە بەزەلیلی لەخوای گەورە دەپاڕایەوە تاڕوحی پاکی دەرچوو، شەهید بوو.

دەی ئیمانداری بەڕێز: تۆش لەشەوی قەدردا بیربکەوە کەچیت بۆئەم ئیسلامە کردوە. ئایا غەمی ئیسلام وعیزەتی ئەم دینە وپابەندبون بەشەریعەتی ئیسلامەوە، لەپلەی یەکەمدایە لەبەرنامەکانی ژیانتدا. یان پەراوێزی ژیانتەو ڕۆژێ دەیکەی وڕۆژێ (پەنابەخوا) کوفر دەکەی!..

یەکێ لەزانایانی بانگخوازو خەمخۆری گەیاندنی ئەم ئیسلامە، ناچێ بۆحەج. لەگەڵ ئەوەشدا کەئیمکانیەتی ماددی باشی دەبێ و ڕێگاشی پێ دەدرێ. بەسەرسوڕمانەوە هەندێ لەدۆستانی پێ ی دەڵێن: باشە چۆنە ناچیت بۆحەج؟! دەفەرموێ: لەبەر هیچ کەم وکوڕیەك نیە. تەنها لەبەرئەوە جارێ ناچم، چونکە بەڕاستی ڕوم نیە کاتێ دەچمە مەدینەو دەچمە خزمەت گۆڕی پێغەمبەری خواو سەلامی لێ دەکەم، ڕوم نیە پێ ی بڵێم، چیم بۆ دینەکەت کرد کە بە خەلات دوای خۆت بۆت بەجێ هێشتین.. حەزدەکەم کارێکی وابکەم کەدڵم پێی خۆش بێت ولەڕوم بێت بچمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ.

دەی براکەم، دایکەکەم، دادەکەم، لەشەوی قەدردا بیرلەوە بکەرەوە ئەگەر مردی: ئایا لەگەڵ خۆت دین وئیمان و بەرماڵ وقورئان لەماڵەکەت دەپێچرێتەوەو لەگەڵ خۆتدا ئەویش دێ بۆ سەرقەربران،؟! چونکە زۆرکەس کەمرد، ئیمانیش لەگەڵیا لەماڵەکەی دەپێچرێتەوە! بیربکەوە ئاها لەکوردەواری دا دەیانگوت: وەرە ماڵە موسڵمان، ببیستە یاسین وقورئان. ئایا دەنگی قورئان لەماڵەکەت دێ یان دەنگی گۆرانی. ئایا مناڵەکانت صەلاوەت لەمحمد المصطفى ﷺ لێ دەدەن. یان جل و بەرگی بێ شەرعیان لەبەردایە وناوی بوترس ویوحەنای مەسیحی دەزانێ!

ئیمانداران: یەکێك لەو عیبادەتە گەورانەی کەموسڵمانان ئەنجامی دەدەن لەتەواوی ساڵدا. بەتایبەت لەمانگی ڕەمەزاندا، وەبەتایبەتتر لە (شەوی قەدر)دا، بریتی یە لەنوێژی تەسبیحات (صَلاةُ التَسْبيح) کەپێغەمبەری خوا ﷺ بەعەبباسی

مامی فەرموە. ئایا ئاشنات نەکەم بەنوێژێك کەئەگەر ئەنجامی بدەی، خوای گەورە لەگوناهی سەرەتاو کۆتایت، گەورەو بچوکت، ڕابردوو داهاتوت، خۆش ببێت. (ئەوگوناهانەی لەنێوان بەندە وپەروەردگاردان، نەك لەنێوان بەندەو خەڵکی تردا، وەکو ماڵ خواردنی خەڵکی)..

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئەوە نوێژی تەسبیحاتە (صَلاةُ التَسْبيح).. کەلەهەرچوار ڕکاتەکەدا (٣٠٠) جار زیکری (سُبْحانَ اللهِ والحَمْدُ لِلّهِ ولا إلهَ إلا اللهُ واللهُ أكبر)ی تێدا دەکرێت. بەڵام پێویستە کەلەکاتی ووتنی زیکرەکاندا، لەماناکەی وورد ببینەوە. کاتێ کەدەڵێ ی: (سُبْحانَالله) یانی پاکی وبێگەردی بۆتۆ یا الله. هەموو کارەکانت لەجێگای خۆیەتی. (وَالحَمْدُ اللهِ)، سوپاس وستایش هەر بۆ تۆیە یا الله. هەرچی هەمە، لەلاشەی خۆم. نانم، ناوم، بڕوانامەم، ماڵ وسامانم، قاسەو کاسەم، سەیارەو سەروەتم، خێزان و منالْم. هەموی هی تۆیەو بەخشش وخەڵاتی تۆیەو پێت بەخشیوم ومنیش تەنها بەهی تۆی دەزانم وتەنها سوپاسی تۆی لەسەر دەکەم. (لا إلهَ إلا الله) خوایەگیان لەناخی دڵمەوە ڕەفزی هەموو پەرستراوێك دەکەم وبەزمانیش دەری دەبڕم کەهیچ شتێ نیە شایانی پەرستن بێ، تەنها تۆ نەبێ (یاالله) خوایەگیان تۆ تاك وتەنهای، بێ شەریکی، هاوبەشت نیە. هەمووشت ئاتاجی تۆیەو تۆ موحتاجی هیچ نی، کەست لێ نەبوە ولەکەس نەبوی.

(اللهُ أكبر). خوایە دەسەڵات هەرهی تۆیە. تۆ لەهەموو گەوران گەورەتری، من گەورەییم، بونم، دەسەڵاتم، هێزم، عیزەتم. هەموی بەهۆی گەورەیی وشکۆمەندی تۆوەیە یاذَالجَلالِ والإكْرام.. دەی وەرە بەدڵ ئەم زیکرانە لەناو نوێژی (صَلاةُ التَسْبيح) دا. لەڕکوع وسوجدە – دابکە، بزانە چ تام ولەزەتێکی لێ دەکەی، نەك خەمی ئەوەت بێ کەئایا بەچەند دەقیقە لێ ی دەبیتەوە!!.

شێخ عبدُالقادری گەیلانی دەفەرموێ: لەزۆر دەرگام دا بۆگەیشتن بەخوای گەورە. بەڵام سەیرم کرد هەموو دەرگاکان پڕبوون. بەهەزاران خەڵك لەدەرگای نوێژکردن و شەونوێژو نوێژە سوننەتەکانی ترەوە. خەریکی خواناسی بون و دەیانویست بگەن بەڕەزامەندی خوا، لەدەرگای ڕۆژوەوە بەهەزاران خەڵکی لێ بوو. لەڕێگەی حەج و عومرەوە بەهەمان شێوە.

بەڵام کەسەیرم کرد دەرگایەك هەیە چۆڵە وزۆرکەم خەڵکی لێ یە، کەدەیانەوێ لەورێگەیەوە بگەن بەڕەزامەندی پەروەردگاریان. کەئەویش دەرگای زەلیل بون







وملی كه‌چی نواندنه به‌رامبه‌ر به‌خوای گه‌وره. بۆیه له‌ده‌رگای – الانكسار لِلّه – م داو له‌وێوه به‌ره‌و خوای گه‌وره چووم. سه‌ره‌نجام ژیانی شێخی گه‌یلانی پڕبه‌ره‌كه‌تترین ژیانی ناو ئه‌ولیاو پیاوچاكان ده‌رچوو. خۆی فه‌رمویه‌تی (وه‌كو ده‌ربڕینی فه‌زڵی خوا به‌سه‌ریه‌وه): پێنج هه‌زار گاورو جوله‌كه به‌هۆی ئامۆژگاری ونزیكی له‌منه‌وه، خوای گه‌وره هیدایه‌تی دان وموسڵمان بوون.. ده‌ی تۆی موسڵمانیش ئه‌گه‌ر وه‌كو شێخی گه‌یلانیشت پێ ناكرێ، لانی كه‌م مه‌هێڵه ماڵ ومناڵه‌كه‌ت ببێ به‌جوله‌كه وگاور. زۆر حه‌یفه، ئینسان ئه‌گه‌ر مه‌ڕێكی، بزنێكی، مانگایه‌كی، بگره مریشكێكی دیارنه‌بێ وبزربێ، دنیای لێ ده‌گه‌ڕێ وجاڕی بۆده‌داو شه‌و خه‌وی لێ ناكه‌وێ. نه‌وه‌كو دز بردبێتی وله‌ده‌ستی بچێ، كه‌چی به‌داخه‌وه مناڵه‌كه‌ی له‌گه‌ڵ كێ بڕوا وكچ وكوڕه‌كه‌ی له‌ناوه‌ندی وئاماده‌یی و په‌یمانگاو زانكۆ ڕه‌فیقی كێ بێ و سه‌ربه‌كێ بێ، هیچ به‌لایه‌وه گرنگ نیه. گرنگ نیه نوێژ ده‌كات یان نا، گرنگ ئه‌وه‌یه بچێته خوێندنه‌كه‌ی یان سه‌رئیش وكاره‌كه‌ی. به‌ڵام ئاخر ئه‌میش ده‌دزرێ. دزی شه‌یتان، شه‌یتانی مرۆڤ ده‌یدزێ وله‌خشته‌ی ده‌بات، بێ دین وبێ ژینی ده‌كات. ده‌ی له‌شه‌وی قه‌دردا، حیسابێك بۆئه‌وه‌بكه سه‌رمایه‌كه‌ت كه‌مناڵه‌كانتن – با (ولد صالحٍ) بن وله‌دوای مردنت دوعات بۆبكه‌ن. نه‌ك دوعات لێ بكه‌ن وگاڵته‌ت پێ بكه‌ن!..

له‌به‌شی كۆتایی شه‌ویشدا، زۆر دوعابكه. چونكه (الدُّعاءُ هُو العِبادَة). دوعای نیوه‌شه‌وی كۆتایی. نزیكی پارشێوو زۆر گیرایه. به‌ره‌و قیبله، به‌ده‌ستنوێژه‌وه به‌دڵ وبه‌كوڵ دوعابكه وبڵێ: (اللّهُمَّ إنِّي أسْألُكَ العَفْو والعافِية). وا له‌خوا بپاڕێوه كه‌له‌دڵه‌وه یه‌قینت هه‌بێ كه‌خوا وه‌ڵامت ده‌داته‌وه (أدْعُوا الله وَأنْتُمْ مُوقِنُونَ بالإجابَةِ). دوعای هیدایه‌ت بكه‌و بڵێ: ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾.

سه‌یری ژیانی خۆت وخێزانیشت بكه، چی گاور و جوله‌كه‌ی تێدایه لایبه دڵت خۆش بێ كه‌له‌كاروانی پێغه‌مبه‌راندای. له‌كاروانی (ئاده‌م ونوح وإبراهیم وعیسى و موساو محمد المصطفى) دایت. له‌كاروانێكا ڕێ ده‌كه‌ی كه‌به‌خوێنی زه‌كه‌ریاو یه‌حیا نه‌خشاوه. به‌گیانی عومه‌رو عثمان وعه‌لی ئاودراوه. به‌سه‌دان زانای گه‌وره له‌خزمه‌تیا بوه‌و گه‌یاندویه‌تی. تۆ به‌خته‌وه‌ری كه له‌گه‌ڵ به‌خته‌وه‌راندای. وه هه‌روه‌ها زۆر دوعای ئیستیقامه‌و ڕاگیراوی بكه، كه‌خوا

یارمەتیت بدات و لەشەقامە ڕێگەی ئیسلام لانەدەی وقاچت لارێ نەبێ، بڵێ: خوایە دامەزراوم بکەی لەسەر دینەکەی خۆت، لەشەڕی بێ دینان و پیلان و تەڵەکەیان بمانپارێزی. وەهەروەها، لەپاشملە دوعا بۆبراوخوشکانی ئیماندارت بکە. بەتایبەت ئەوکەسانەی کەنەخۆشن، دەردەدارن، لەش بەئازارن، ئەوکەسانەی. هەژارن، نەدارن، قەرزارن، ئەوانەی دڵبەخەمن، کێشەیان هەیە، گرفتارن، دوعایان بۆبکە کەخوا ڕزگاریان بکات و ڕەحمیان پێ بکات، چونکە دوعای موسڵمان بۆ موسڵمانی براو خوشکی لەپاشەملە. کەکەس ئاگای لێ نیە، خوانەبێ، گیرایە. وە فریشتە ئامینی بۆ دەکات، وە بەئەندازەی ئەوخێرو چاکەی کەئیماندار لەپاشەملە بۆبرای ئیمانداری داوای دەکات، خوای گەورە چاکە بۆئەویش دەنوسێت.

دەگێڕنەوە: ڕۆژێکیان کوڕە گەنجێك دێتە ماڵی ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و دەڵێ: ئەی مامۆستا، دایکم ماوەی بیست ساڵە لەناوجێگادا کەوتوە وبەڕاستی زۆر زەلیل بوە، ئەمڕۆ داوای لێ کردم کەبێمە خزمەتت ودوعای خێری بۆبکەی بەڵکو بەبەرەکەتی دوعای جەنابت، خوای گەورە شیفای بۆبنێری. ئیمام ئەحمەد مەیلەو توڕەبوو لەگەنجەکەو فەرموی: بەخوا ئێمە موحتاج ترین بەوەی کەدایکت دوعای خێر بۆئێمە بکات، نەك ئێمە دوعای خێری بۆبکەین. (خۆی بەپیاو باش نیشان نەدا وبڵێ، باشە من دوعا بۆهەرکەس بکەم، خوای گەورە شیفای دەدات. نەخێر، پیاوچاکان توڕەبون کاتێ خەڵك داوای دوعای خێریان لێ کردون!).

بەڵێ کاتێ گەنجەکە ڕۆیشت، ئیمام ئەحمەد دەست نوێژی گرت ودووڕکات نوێژی کردو زۆر لەخوا پاڕایەوە، کەخوای گەورە شیفا بۆ دایکی ئەوکوڕە گەنجە بنێرێ، چونکە ئەوان حوسنی زەنیان بەم بردوە خوای گەورە، بەشیفای خۆی شیفای بۆبنێرێ. کاتێ گەنجەکە گەیشتەوە ماڵەوەو لەدەرگای دا، (سُبْحانَ‌اللهُ) سەیری کرد، دایکی بەقاچی خۆی دەڕوات و لەناو جێگاکەی هاتۆتە دەرەوە وڕوی لەکوڕەکەی کردو ووتی: ڕۆڵەگیان موژدەت لێ بێ خوای گەورە شیفای بۆناردم و تەندروستی و لەش ساغی پێ بەخشیمەوە.

خوای گەورەو میهرەبان بەناوە جوانەکانت لێت دەپاڕێینەوە. کەخێر وپاداشتی شەوی قەدرمان بەنسیب بکەی. لەو شەوە پیرۆزەدا، لەگوناهەکانمان





خۆش بی ڕەحم و بەزەییت بڕێژی بەسەرماندا. شیفای نەخۆشی ئێمەو هەموو ئیمانداران بدەی و عاقیبەتمان بەخێر بگێڕی و لەهەموو بەڵاو نەخۆشی وناخۆشیەك بمانپارێزی و هەموو خۆشی و بەرەکەتێکی دونیاو دوارۆژمان بەسەردا برێژی.

ٱللَّهُمَّ ءَامِينَ

## سەرچاوەکان


١- قورئانی پیرۆز.
٢- تەفسیری ئاسان ، بورهان محمد أمین.
٣- مَوْسوعَة أَسْماء الله الحُسنَى ، د.محمد راتب النابلُسي ، ج٢ ، ص١٢٣٠.
٤- الإنْكِسار لِلّهِ، عمر وخالِد.
٥- مَوْسوعَة الأخلاق الإِسْلامِيَّة ، سَعد یوسف أبوعَزیز ، ج٣ ، ص٢٩٩.

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجْمَعين.

ئیمانداران: لەیەکەم ووتاری دوای مانگی پڕبەرەکەتی ڕەمەزاندا، نازانم پیرۆزباییتان لێ بکەم بەبۆنەی جەژنەوە. یان سەرەخۆشیتان لێ بکەم بەبۆنەی ڕۆیشتنی ئەومیوانە دڵسۆزە، ئەودکتۆرە دڵ پڕ لەسۆزە، ئەو پاککەرەوەیە، کەپاکی کردینەوە لەژەنگی گوناهوتاوان، بۆیە ئەمەش دەڵێم، چونکە سەلەفی صالحی ئەم ئوممەتی ئیسلامە ئاوایان دەگوت. صەحابی بەڕێز، (عبدالله ی کوڕی مەسعود) دەفەرموێ: کاتێ کەمانگی ڕەمەزان تەواو دەبوو. دەیفەرموو: (واللهِ مانَدْري من هذا المَقْبُولِ فَنُهَنيهِ ومن هذا المَحْرُومِ فَنُعَزِّيهِ). ئێمەش ئەی مانگی پڕبەرەکەتی رەمەزان چەندە بەهاتنت خۆشحاڵ بووین. بەڕۆشتنیشت ئەوەندە غەمبارین (وَإنّا عَلى فِراقِكَ يارَمَضانُ لَمَحْزوُنُونَ). لەم ساتەدا دەڵێین:

ئەی ڕەمەزان، مانگی ڕەحمەت، جارێ زوو بوو. هێشتا لەدیدار تێرنەبووین، ئێمە شاگردو تۆ وەستا، قوربان هێشتا باش فێرنەبووین، میوانی خوای میهرەبان بووی، زۆر ئازیز بووی، متواضع و بێ فیزبوی، بوویتە میوانی گشت ماڵە موسڵمانێ، نەتئەپرسی ماڵی پاشاو گەدا کوانێ، چویتە سەرگشت سفرەو خوانێ، ئەی ڕەمەزان: بۆ ئۆغری پڕلەخێرت، ئێمە هەموو مەحزون ماوین، واتاساوین، دڵمان گەرمەو هەموو مات و مەلول ماوین،...

ئاخر قوربان تۆ میوانی خوای باری بووی، دەرفەتی تەوبەکاری بووی، چەندین ئافرەت بەکاڵای سوڕەتی نوری شەوی قەدرت سەروگەردنیان داپۆشی، گوناح باران، لەجیاتی مێزی قومارو پێکی عارەق، شەرابی تەوبەیان نۆشی، ئەی مانگی شای گشت مانگەکان، مانگی ڕۆژوو تەراویح و نوری قورئان، لەدیداری شەوی (ليلة القدْ)ت دا، خەومان لەچاوانمان تۆراند...

ئەی ڕەمەزان: تۆ خۆشەویستی ئێمە بووی. نەك هەرئێمە لەمزگەوتا، هەتا دایەپیرەی ماڵان، هەتا منداڵانی کۆڵان، ڕێزیان لێ نای، چۆن دڵت هات واجێت هێشتین،.. گریانمان دێ بۆسەڵای پارشێوانی تۆ، بۆتریفەی مانگە شەوی، شەوانی تۆ، بۆ زایەڵەی مەرحەبای بەخێرهاتن و ویداعی گشت یارانی تۆ، گریانمان دێ بۆ ئاوازی گەرمی فەجری کوڕی قورئان خوێنانی تۆ. بۆسەدای وتاری دەم عەسرانی تۆ..بۆسرودی مەلەکوتی دەنگی بانگی شێوانی تۆ. کە هەموومان لەسەر بەرماڵ ، چاوەڕێ بوین ، بانگ بێ و ڕۆژو بشکێنین. نەفس و شەیتان ببەزێنین، تا ئالەوساتە ناسکەدا، دەستمان بەرز بکەینەوە،

بەکزۆڵی لەخوای گەورە پاڕێینەوە. تالەبەر لێزمە بارانی ڕەحمەتی خوای میهرەباندا بژیەینەوە... دەساخوایە ڕۆژوی مانگی رەمەزانمان شەفاعەت خوازی مەحشەربێ. داوای ئیستیقامەت دەکەین، خواناسیمان هەتاسەربێ. تینوێتیمان لەم مانگەدا زەمانەتی نۆشینی ئاوی کەوسەربێ، تەراویحی سوننەتی شەوەکانیشی مایەی زەردەخەنەی دەمی پێغەمبەربێ ﷺ... بەبێداری شەوانی (ليلة القدر)ی قەبرمان پێ ی مونەوەر بێ.. بەخواحافیزی مانگی ڕەمەزان، خوای میهرەبان، تۆش گەردنمان لەجەهەنم ئازادبکە وبەشمان بەهەشتی پڕبەربێ..

ئیمانداران: ئایا ئێمەی موسڵمان لەدوای مانگی ڕەمەزانەوە پێویستە چۆن بین؟! بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە دەچینە خزمەت سەروەرو سالارمان، حەزرەتی محمد ﷺ. صەلاوەت لەدیداری دەدەین: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وعَلى آلِهِ وصَحْبِهِ وسَلم). لێ ی دەپرسین: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئێمە لەدوای مانگی ڕەمەزانەوە، چی بکەین بۆ ئەوەی بەردەوام هەروەکو مانگی ڕەمەزان لەخزمەت پەیامەکەتدا بین ولەخواپەرستی دانەبڕێین؟ خۆشەویستمان بەم فەرمودەیە وەڵاممان دەداتەوەو دەفەرموێ: ئیماندار ئاگاداربە، لەگەڵ یەك بەیەکمانیەتی، بەکۆ (جمع) قسەمان لەگەڵ ناکات، تاك تاك دەماندوێنێ ودەفەرموێ:

١- إتَّقِ اللهَ حَيْثُما كُنتَ: لەهەرجێگاو شوێنێکدابی، لەمزگەوتابی، یان لەبازاڕدا، لەناو ژوری خەوتندابی، یان لەناو یاریگا، لەپرسەدابی، یان لەشایی دا، لەناو ماڵدابی یان لەزانکۆدا. بەتەنها بی یان لەناو خەڵکا: تەقوای خوابکە وسنورە قەدەغەکراوەکانی مەشکێنە وبەردەوام چاودێری خوا بەسەرخۆتەوە ببینە.

دەخۆ هەدەف وئامانجی ڕۆژوی مانگی ڕەمەزانیش هەرئەوە بوو. کەبمانکات بەموتتەقی (لَعَلَّكُمْ تَتَّقون) ئایا تەقوا چی یە؟ ئەم پرسیارەیان ئاڕاستەی هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوهوڕەیرە کرد. لەوەڵامدا فەرموی بەوکەسەی کەپرسیارەکەی لێ کرد: (هَلْ أَخَذْتَ طَرِيقاً ذا شوكٍ؟) هەرگیز ڕوی داوە کەبەڕێگایەکدا بڕۆی دڕك و داڵی زۆری تێدا بوبێ؟ کابرا ووتی: بەڵێ، فەرموی: (فَكَيْفَ صَنَعْتَ؟!) ئەی لەوکاتانەدا چیت دەکرد؟! پیاوەکە ووتی: (إذا رَأَيْتُ الشوكَ، عَزَلْتُ عَنْهُ، أَوْ جاوزْتُهُ، أَوْ قَصَرْتُ عَنْهُ).

واتە: هەرکات چاوم بەدڕکەکان کەوت. خۆم لاداوە لێیان، یان بازم بەسەردا داوە، یان خۆم هەڵکردوە، بۆئەوەی بەجل وبەرگەکەمەوە نەنوسێ ودواتر ئازارم

نەدات. حەزرەتی أبوهُریرە فەرموی: (ذاكَ التَّقْوى) دەی ئەمە تەقوایە. حەرام وبێ شەرعیەکان کەدێنە سەر ڕێگات لەکاروبارو ژیانی ڕۆژانەتدا، ئەودڕکە بەئازارانەن. کەسی موتتەقی ئاوا بەوسێ شێوە خۆیان لێ دەپارێزێ و بەوریایی وحەزەرو بەرچاو ڕوونی یەوە هەنگاو هەڵدەنێ..

باهەریەك لەئێمە لەخۆی بپرسێ: ئایا وەکو لەڕەمەزاندا، بەبێ ئەوەی کەس ئاگای لێت بێ. تەنها لەبەرخوا ونەشکاندنی سنورەکانی خوا، خۆت لەهەموو ئەوشتانە دەپاراست کەڕۆژوو دەشکێنێ. ئایا ئێستاش نەوترسی خوایە. ئەو ئیمانە بەو چاودێری خوایە بەسەرتەوە، هەرلەدڵتا ماوە؟! ئەگەر ماوە ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە (إن شاءالله) ڕەمەزانت لێ قبوڵ بووە.

ئایا هەروەکو چۆن لەڕەمەزاندا بالاپۆش بویت، نوێژەکانت لەکاتی خۆیدا دەکرد. نوێژی بەیانیانت دەکرد. پابەندبوی بەمزگەوتەوە. بەگوێ گرتن لەقورئانەوە. ئایا ئێستاش هەروای؟! لەخۆت بپرسە وسەیری ئەم چەند ڕۆژەی دوای مانگی ڕەمەزان بکە.ئەگەر بەردەوامبوی. ئەوە ڕەمەزانت لێ قبوڵ بوە وبەرهەمەکەی دەخۆی.

پیاوچاکان فەرمویانە: نیشانەی قبوڵ بونی ڕۆژوی ڕۆژووەوان لەلای خوای گەورە، ئەوەیەکە: مرۆڤی ڕۆژووەوان لەدوای مانگی ڕەمەزانەوە، حاڵ وباڵی باشتربێ لەخواپەرستی دا وباشتر تەقوا وخواناسی بکات. چونکە تاعەت وعیبادەتی خوا لەمانگی ڕەمەزاندا، هەربەوشێوە فەرزە کەلەغەیری ڕەمەزاندا فەرزە. جگەلە ڕۆژووە فەرزەکەی ڕەمەزان. چونکە تۆی ئیماندار عیبادەت وبەندایەتی بۆ خوایەك دەکەی کەگۆڕانی بەسەردا نایەت. بڕیارەکانی ناگۆڕدرێن، خوایەك نەدەخەوێ و نەخەوە نوچکە دەیگرێ. خوایەك کە (الحَيُّ القَيُّومَ). تۆ عیبادەتی ئەوخوایە دەکەی، ئیتر چۆن دەبێ لەڕەمەزاندا بیپەرستی وگوێڕایەڵی بی. کەچی لەغەیری ڕەمەزاندا پشتی تێ بکەی ومزگەوت نەبینیتەوە؟!

ئایا لەدوای مانگی ڕەمەزانەوە تەقوا چۆتە ناوناخ و دڵتەوەو خۆشەویستی خوای گەورەو پێغەمبەری سەروەرو سالارو ئیسلام و قورئان، لەگەڵ خوێن وهەناسەتدا تێکەڵ بوە، یان هەر ڕوکەش وتوێکڵ بوو. بێ کاکڵ بوو؟! مەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆسینەی نەکردو نەیفەرموو: (التَّقْوى هاهُنا، التَّقْوى هاهُنا، التَّقْوى هاهُنا). تەقوا ئەوەیە کەلەناوجەرگ ودڵ وسینەتدا جێگیر بوبێ، لەگەڵ هەموو لێدانێکی دڵتدا. لەگەڵ هەموو هەناسەیەکتدا. خوای

گەورەت لەبیربێ و لەیادی نەکەی. سەیری ژیانت بکە: ئایا دوای ڕەمەزانیش دروشمەکانی ئیسلام لەنوێژو ڕۆژوو بەخشین وخێرو خێرات، باسی دین و قورئان.

لەماڵەکەتدا ماوە یان نا؟! چونکە خوا فەرمویەتی: ﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴾ الحج: ٣٢.

ئەگەر خەڵکی هاتنە ماڵەکەت وسەیری بەرماڵ ودەنگی قورئان وداپۆشراوی خێزان و کچەکانتی کرد، سەیری ئەدەب وحورمەت و ڕێزی کوڕەکانتی کرد، کەبەدەوام ئامادەی نوێژی جەماعەتن لەمزگەوتا. ئەوکات ووتی؛ بەخوا چومە ماڵی فلان کەس، خۆدەڵێ ی مزگەوتە. کوڕە خۆلای ئەوان هێشتا هەرڕەمەزانە! ئەوە دڵشادبە و بزانە خوای گەورە ڕۆژوی ڕەمەزانی لێ قبوڵ کردوی وسودت لەڕۆژوەکەت بینیوە ولێ ی حاڵی بووی. بەڵام ئەگەر خوانەکردە، هەرلەجەژنی ڕەمەزاندا کەسێك ڕێ ی کەوتە ماڵت ونیشانە وسیمای موسڵمانیەتی وخواناسی بەخۆت ماڵ ومناڵتەوە نەبینی، کەچوە دەروە، ووتی: بەڕاستی بەداخم وحەیف وخەسار، خۆماڵی فلان کەس هەردەڵێ ی ڕەمەزان بەڕۆژوو نەبون، چونکە هیچ شوێنەوارێکی ڕۆژوویان لەسەرنەماوە! ئەوەبزانە بەداخەوە ڕۆژوی ڕەمەزانەکەت هەروەکو فەرز لەسەرلاچوە (ئەگەر خوا بەڕەحمی خۆی لێت قبوڵ بکات) وەتەنها کاتەکانی نان خواردنی گۆڕیوی، نەك ئاکارو ڕەفتارت!..

ئایا ئەگەر کاسبکاری و ئەهلی بازاڕی، هەروەکو چۆن لەڕەمەزاندا دەتگوت: بەڕۆژوم وسوێند ناخۆم، ئایا لەدوای ڕەمەزانیش ئاوا خۆت لەسوێند خواردن وشتی خراپ فرۆشتن دەپارێزی؟! هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (لايَبْلُغُ العَبْدُ أَنْ يَكُونَ مَعَ المُتَّقِينَ. حَتَّى يَدَعَ مالا بَأْسَ بِهِ، حَذَرَاً مِمّابِهِ بَأْسٌ) رَواهُ البُخاريُّ.

واتە: مرۆڤ هەرگیز ناگاتە ئەو ئاستەی کەلەگەڵ موتەقین دا، هاوڕێ بێ. تائەوکاتەی کەوازدێنێ لەهەندێ لەوەی کە حەرام نییە. لەترسی ئەوەی ئەوەکو بکەوێتە ناوئەوەی کەگومانی تێدایە..

یەکێ لەزانایان و پیاوچاکان کەناوی (ئیبراهیمی ئەدهەمە) جارێکیان وڵاخێکی بەکرێ گرتبوو بۆ ئەوەی پێ ی بچێ بۆشارێك. لەڕێگادا گۆچانەکەی لێ کەوتە خوارەوە. لە وڵاخەکەی دابەزی وبەستیەوە وبەپێ گەڕاوەو گۆچانەکەی هەڵگرتەوە! هاوڕێکانی پێیان ووت: باشە بۆچی بەسواری وڵاخەکە نەگەڕایتەوە؟! فەرموی: ئاخر من کەئەو وڵاخی سواریەم لەخاوەنەکەی بەکرێ





گرت، تەنها لەسەرنەوە ڕێك کەوتین کەپێ ی بڕۆم. باسی ئەوەمان نەکردبوو: ئایا ئەگەر شتێکیشم لێ کەوتە خوارەوە. پێ ی بگەڕێمەوە یان نا!! ئەمە ومرعە، کەبەرهەمی تەقوایەو تەقواش بەرهەمی ڕۆژووە.

ئایا هەروەکو کەلەمانگی ڕەمەزاندا، لەگەڵ ئەهلی مزگەوتا، لەگەڵ قورئان خوێنان و دەم بەویردان وبەخشندەکاندا، کەلەگیرفانی خۆیان دەریان دێنا ودەیانخستە گیرفانی هەژارانەوە (نەك لەگیرفانی خەڵکی دەربێنن بۆگیرفانی خۆیان!) ئایا لەدوای ڕەمەزانیش هەرلەگەڵ ئەوچاك وپاك وبەخشندانەی ئەهلی مزگەوت هاوڕێ و هاودەمی؟! کەبەڕاستی حەزکردن لەهاوڕێیەتی کەسانی دیندار ورەوشت بەرز، نیشانەی تەقوایە ونیشانەیە کەڕۆژوی ڕەمەزانت لێ قبوڵ بوە، قورئان دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾التوبة: ١١٩.

ئیمامی شافیعی دەیفەرموو: هەرچەندە خۆم پیاوی چاك نیم، بەڵام دڵم بەوەخۆشە کەپیاوچاکانم خۆش دەوێت.. چونکە (المَرْءُ مَعَ من أَحَب).

بەڵێ ئیمانداری بەڕێز: (إتَّقِ اللهَ حَيْثُما كُنْتَ). لەخۆشی وناخۆشی دا، لەدەوڵەمەندی وهەژاری دا، لەساغی ونەخۆشی دا، لەدەسەڵاتداری وبێ دەسەڵاتی دا، کاتێ کەبەتەنهای و کاتێ ودەورت جەمە، تەقوای خوابکە. کاتێ کەحەرام هاتە بەردەستت وکەسیش ئاگای لێت نەبوو، بەئاسانی دەتتوانی بیخۆی بەڵام بەخۆتت گوت: فَأَيْنَ اللهَ؟! خۆئەگەر هیچ مەخلوقێ ئاگای لێم نەبێ، خالیق ئاگای لێمە. ئەوە بەڕاستی ئیمانداری ڕاستەقینەی و ڕەمەزان کاری تێکردوی.

ئامۆژگاری دووەمی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الحَسَنَةَ تَمْحُها). هەرکاتێ گوناهو تاوانێکت کرد. چاکەیەکی بەشوێندا بکە. ئەوچاکەیە خراپەکە دەسڕێتەوەو شوێنەواری ناهێڵێ.. خوای گەورە نەیفەرمووە، مرۆڤ نابێ توشی گوناە ببێ، بەڵکو داوامان لێ دەکات کەتوشی گوناە بوین، کەلەڕاستە شەقام لاڕێ بوین. زووبێینەوە سەرڕێگاو ملی هەڵدێر نەگرین. بەڵێ، ووتمان: ڕۆژوو فێری تەقوای کردین، یەکێ لەصیفاتی (موتتەقین)یش ئەوەیەکە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ﴾ الاعراف: ٢٠١.

لەتەفسیری (ڕامان) دا، ئاوا مانای کردوە: (بێ گومان ئەوانەی کەلەشیرك

وکاری ناشەرعی پارێز دەکەن، هەرکەوەسوەسە وخەتەراتێکیان لەشەیتانەوە پێ دەگا، بەخێرایی ڕادەچڵەکێن وبیرنەکەنەوە ولەسەر ڕێگەی خودا پێ دادەگرن. دەبینی زۆر زوو چاویان ئەکرێتەوە ولەگوناهان دەگەڕێنەوە.

بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: بەشوێن خراپەدا، چاکە بکە. ڕەشی دەکاتەوە. خوای گەورە لەقورئاندا فەرمویەتی: ﴿إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ هود: ١١٤.

جا ئیمانداری بەڕێز: لەوشتانەی کەدەبنە مایەی ڕەش کردنەوەی گوناه لەسەر موسڵمان ئەمانەن، ئەم کردەوە وعیبادەتانەن:

١- پێنج فەرزەی نوێژ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەصەحابەکانی فەرمووە: ئایا ئەگەر جۆگە ئاوێکی پاك وساردو سازگار، بە بەردەمی ماڵی یەکێك لەئێوەدا بڕوات و ڕۆژی پێنج جار خۆی بشوات، ئایا هیچ چڵك و پیسی بەلاشەیەوە دەمێنی؟! صەحابەکان فەرمویان: نەخێر. خۆشەویستمان ﷺ فەرموی: (فَكذلك مِثْلُ الصَّلَواتُ الخَمْس، يَمْحُوا اللهُ بِهِنَّ الخَطايا). رَواهُ البُخاري وَمُسْلم.

واتە: دەی ئەمە وەکو وێنەی پێنج فەرزەی نوێژە، کەخوای گەورە بەهۆیانەوە، تاوان وگوناه لەسەر ئیماندار ڕەش دەکاتەوە.

٢- ئەنجام دانی ئەم کار وکردەوانە، کەلەم فەرمودەیەی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتوون، کەفەرموی: (ألا أدُلُكُمْ عَلى مايَمْحُوا اللهُ بِهِ الخَطايا، وَيَرْفَعُ بِهِ الدَّرَجات؟ قالُوا: بَلى يارَسُولُ اللهِ، قالَ: إسْباغُ الوُضُوءِ عَلى المَكارِهِ، وَكَثْرَةُ الخُطا إلى المَساجِدِ، وَإنْتِظارُ الصَّلاةِ بَعْدَ الصَّلاةِ، فَذلكمُ الرِّباطُ) رَواهُ مُسْلِم.



واتە: ئایا پێتان نەڵێم ورێنمایتان نەکەم لەسەر ئەوشتانەی کەخوای گەورە دەیکاتە ڕەش کەرەوەی گوناهو بەرزرکردنەوەی پلەتان لای خوای گەورە، واتە: هەرکەسێ ئەم کردەوانە بکات. هەم خوای گەورە گوناهەکانی لەسەر ڕەش دەکاتەوە. هەم پاداشتی بۆدەنوسێ. صەحابەکان تێکڕا ووتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێمان بڵێ. فەرموی: دەست نوێژگرتنێکی پوخت وشەرعیانە، لەکاتی نارەحەتی و سەرماوسۆڵەدا. وەهەنگاو هەڵێنانی زۆر بەرەو مزگەوتەکان. وەچاوەڕێ کردنی نوێژێك لەدوای نوێژێك.

٣- تەوقەی گەرم وبەدڵ، بەڕوی خۆش ودەم بەزەردەخەنەوە، هەرومکو



لەفەرمودەدا هاتوە: کاتێ کەدوو موسڵمان بەیەك دەگەن وتەوقەیەکی گەرم وگوڕ لەگەڵ یەکتر دەکەن. ئەوە لەناوپەنجەکانیانەوە گوناهەکانیان هەڵدەوەرێت..

٤- خۆشەویستی نێوان ژن ومێرد، هەرکات ژن ومێرد بەچاوی خۆشەویستی یەوە تەماشای یەکتریان کرد، خوای گەورە بەچاوی ڕەحمەت تەماشایان دەکات و لەگوناهەکانیان خۆش دەبێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (وَفِي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَة) (رَواهُ مُسْلِم) لەجوت بونی پیاو لەگەڵ خێزانەکەیدا، چاکە وخێریان بۆ دەنوسرێت، وەلەفەرمودەدا هاتوە: هەرکاتێ پیاو چووە ماڵی خۆیەوەو سەلامی لەخێزانی کردو، ژنەکەشی بەڕوی خۆشەوە وەڵامی دایەوە، شەیتان دەڵێ: بەڕاستی جێگەمان لەوماڵەدا نابێتەوە.

٥- خۆپاراستن لەئازاردانی خەڵکی، ئەویش صەدەقەو خێرە ودەبێتە هۆی ڕەش بونەوەی گوناە لەسەر مرۆڤ. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (تَكُفُّ شَرَّكَ عَنِ النّاسِ، فَإِنّها صَدَقَةٌ منكَ عَلى نَفْسِكَ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

واتە: خۆپاراستنت لەوەی کەشەڕو خراپەو ئازارت بۆ خەڵکی هەبێ، ئەوە خێرو صەدەقەیە بۆ خۆتی دەکەی. دەی موسڵمانی بەڕێز، ئەو زمانەت بپارێزە لەغەیبەت و بوختان ومەیکە بەهارو مار. ئەو هەموو خێرە هەیە، ئەوەی پێ بڵێ. خۆ ئەگەر خێرت نەگوت، بێدەنگ بە.

بەڵێ ئیمانداران: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: کەخراپەت کرد، چاکەی بەدوادابکە، ڕەشی دەکاتەوە. چەند ساڵە سفور بوی، ئێستا باڵاپۆشی، خوای گەورە لەڕابردوەکەت خۆش دەبێت و ڕەشی دەکاتەوە. بەڵام بەداخەوە، کەسی واهەیە لەمانگی ڕەمەزاندا، چاکەی زۆری کردوە، کەچی لەڕۆژی جەژنەوە خراپەی بەدوادا دەکات!! بەپێچەوانەی ئامۆژگاریەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ.

ئامۆژگاری سێ یەمی پێغەمبەری خوا ﷺ: (وَخالِقِ النّاسَ بِخُلُقٍ حَسَن). بەجوانترین هەڵس وکەوت وڕەوشت. ڕەفتاربکە لەگەڵ خەڵکی دا..

سەرنج بدەن دەفەرموێ: (النّاس). نەك (المُسْلِمِين)، یان (المؤمِنِين). لەگەڵ تەواوی خەڵکی دا، بارەوشتت بەرز وبالآبێت. خوای گەورە کەوەصفی پێغەمبەرەکەمان دەکات، دەفەرموێ: (وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظيم). باسی ڕەوشتی بەرزو باڵاو گەورەی دەکات. پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمویەتی: (إِنَّ المُؤمِنَ لَيُدْرِكُ بِحُسْنِ الخُلُقِ دَرَجَةَ الصّائِمِ القائِمِ) رَواهُ أَبُوداود.

واتە: بەڕاستی ئیماندار بەڕەوشتی جوانی دەگاتە ئاستی ئەوکەسەی

کەبەردەوام بەڕۆژوەو شەوانیش هەرشەو نوێژ دەکات.

کەواتە: بۆ ڕەوشت جوانان هەموو مانگەکانی ساڵ مانگی ڕۆژو و شەونوێژە.

چونکە لەپەیوەندیت لەگەڵ خەڵکی دا، خەڵك سود لەنوێژ و ڕۆژوی تۆ وەرناگرێ، ئەگەر ئەیگۆڕی بۆ کردەوەو لەهەڵس وکەوتدا بەرهەمی خواپەرستیەکەت ڕەنگ نەداتەوە..

برایەك لەدەرەوەی وڵات، چەندین کتێب وکاسێتی قورئان وبابەتی ئاینی ئیسلامی دەدات بەماڵە دراوسێ یەکەیان، بۆئەوەی کەدیراسەی ئاینی ئیسلام بکات. سەرەنجام خوای گەورە هیدایەتی دەدات وموسڵمان دەبێت، کاتێ کەموسڵمانەکە لێ ی دەپرسێ: چ شتێکی ئەم ئیسلامە زۆر کاریگەری لەسەرت هەبوو، کەبوە هۆی موسڵمان بونت؟! ووتی: بەڕاستی ئەوەی کەئیسلامی لاخۆشەویست کردم و هانی دام بێمەسەر ئەم ئاینە حەقە، ئەوهەموو ڕێز وحورمەتە بوو کەلێتان گرتم و ئەوهەموو چێشتە خۆشە پاك وخاوێنە وبەتامە بوو کەئێوە بۆتان دەناردم و خواردنتان بەبێ من نەدەخوارد، بەڕاستی ئەو دڵسۆزی ورەوشت بەرزی وبەخشندەییەتان کاری تێکردم وئەمجا کەوتمە دیراسەی ئیسلام وموسڵمان بوم بەڵێ خەڵکی پێش خوێندنەوەی دێڕی ناوکتێبەکان. سەیری هەڵس وکەوتی موسڵمانان دەکات! کەبەداخەوە زۆرکەس بۆ نوێژو ڕۆژوی تەقلیدی زۆر ئازایە، بەڵام بۆتە مۆرکێکی ناشیرین لەسەر ئیسلام، چونکە: باوکێکی بێ ڕەحمە، هاوسەرێکی زمان پیسە، دوکاندارێکی گران جانی قسە ڕەقە، دەوڵەمەندێکی چروکە، دەست ڕۆیشتویەکی بێ خێرە، مۆزەفێکی ڕووگرژە، دکتۆرێکی بێ ویژدانە، مەلایەکی ماستاو چی یە!

لەکۆتایی دا دەڵێم: لەفەزڵ وکەرەمی خوا بەزیادبێ. لەڕەمەزانا مەردانە ڕومان لەخوا کرد. دەی بائاگامان لەخۆمان بێ، لەدوای ڕەمەزان سارد نەبینەوە، چونکە گرنگ بەردەوام بون ودڵ سارد نەبونەوەیە. جابۆ بەردەوام بونمان پێویستە ئەم کارانە ئەنجام بدەین:

١- زۆر لەخزمەت قورئاندابین، قورئانی پیرۆز بەماوەی (٢٣) ساڵ هاتە خوارەوە. بۆسەر حەزرەتی محمد ﷺ، بۆچی بەوهەموو ساڵە؟ ئەی بۆیەك جار هەمووی نەهاتە خوارەوە؟! خوای گەورە وەڵاممان دەداتەوە ودەفەرموێ: (كذلك لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلا).

بەڵێ هەرکەس بەردەوام لەخزمەت قورئاندابێ، بەردەوام ودامەزراویش





دەبێ لەسەر خواناسی.

٢- بەردەوام لەخوای پەروەردگارمان بپاڕێینەوە کەهیدایەتمان بدات. لەفەرمودەیەکی قودسی دا دەفەرموێ: (ياعِبادي كُلُّكُمْ ضالٌ إلا من هَدَيْتُهُ، فَاسْتَهْدُونِي أَهْدِكُمْ). ئەی بەندەکانم، هەموتان گومڕاو سەرلێشێواون، تەنها ئەوانەتان نەبێ کەمن هیدایەتم داون. دەی داوای هیدایەتم لێ بکەن بۆئەوەی هیدایەتتان بدەم. بۆیە فەرزە لەسەر تاك تاکی ئیمانداران کەڕۆژی (١٧) جار بڵێن: (إهْدِنا الصِّراطَ المُسْتَقيم). بەڕاستی ئەگەر هیدایەتی خوای گەورە لەگەڵمان نەبێ، هەرزوو لاڕێ دەبین.

٣- ڕەفاقەت وهاوڕێیەتی برادەری دیندارو ڕەوشت بەرز، چونکە: (المَرْءُ عَلى دِينِ خَلِيلِهِ) مرۆڤ لەسەر بیروباوەڕی برادەرەکەیەتی. دەی دایك وباوکی بەڕێز، هاوڕێ ی باش بۆمناڵەکەت وکوڕ وکچەکەت هەڵبژێرە، وەرە مناڵەکەت بسپێرە بەمزگەوت. لەگەڵ خۆتا بیهێنە بۆنوێژی هەینی و بڵێ: ڕۆڵەگیان وەرە بابچین وانەیەکی نوێ لەئیسلامەکەمان فێربین. ئیتر پشتیوان بەخوا، لەلاڕێ بون دەپارێزرێ.

٤- ئاگات لەموستەقبەل و دواڕۆژی خۆت ومناڵەکانت بێ، چۆن بۆ دونیا حەزدەکەی خوێندن تەواو بکەن، زەویان بۆ دابین دەکەی، پارەیان بۆ پاشەکەوت دەکەی، ئەمە هەموی بەئومێدی ئەوەی پاشەڕۆژیان ڕووناك بێ.

بەڵام خۆ موستەقبەل و پاشەڕۆژی ڕاستەقینە، دوای ڕوح دەرچونە، کەقورئان دیاری دەکات ودەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ مَن يَأْتِ رَبَّهُۥ مُجْرِمًا فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ۝ وَمَن يَأْتِهِۦ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلْعُلَىٰ ۝ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ ﴾ طه: ٧٤-٧٦.

واتە: هەرکەسێ بەتاوان وگوناهەوە، بگەڕێتەوە بۆلای پەروەردگاری، بێگومان ئەوە دۆزەخ بۆی ئامادەیە، کەنەدەمرێت تیایدا (تا لەسزا ڕزگاری ببێت) نەدەژی (بەئارامی وناسودەیی). ئەوکەسەش بەئیمانەوە بگەڕێتەوە بۆلای وبەڕاستی کردەوە چاکەکانی ئەنجام دابێت، ئەوە بۆ ئەوانە پلە وپایەی بەرزو بڵند ئامادەیە. بەهەشتی (عەدنە) کەباخەکانی چڕوپڕە، دەچنە ناوی. چەندەها ڕووبار بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی هەمیشەیی ونەبڕاوەدا. ئەوەش پاداشتی کەسێکە دڵ و دەرون وڕەوشتی خۆی خاوێن کردبێت.

ئیمانداران: پێغەمبەری خوا ﷺ موژدەیەکی گەورەمان دەداتێ ودەفەرموێ: (أَخْلِصْ دينَكَ، يَكْفِكَ القَليلَ مِنَ العَمَلِ). الجامِعُ الصَغير لِلسُيُوطي ج١ رَقم الحديث: ٢٩٨

دڵسۆزبە لەدینداریتدا وئەوەی دەیکەی تەنهاو تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوا بیکە، ئیترکاروکردەوەی کەمیشت بەسە. خوای گەورە ئەجرو پاداشتی زۆرت دەداتێ. جارێکیان، کەسێك دێتە خزمەت پێغەمبەری خوا وعەرزی دەکات: (يارَسُولَ اللهِ، لاأَفْهَمُ وَلا أَحْفَظُ ماتَقُولُ أَنتَ، وَمايَقُولُهُ مَعاذ بَعْدَ الصَّلاةِ "أي من أَذْكارٍ وَأَوْرادٍ" غَيْرَ أَنِّي أَقُولُ: اللّهُمَّ ارزُقْني الجَنَّةَ وَأَعِذْني مِنَ النّارِ). (أَخرَجَ نَحْوَهُ أَبُوداود في سُنَنِهِ)، رَقَم الحَديث: ٦٧٢.

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من تێناگەم وبۆم لەبەرناکرێ، ئەوەی کەتۆ و مەعاز لەدوای نوێژ دەیفەرموون لەزیکر وپاڕانەوە تەنها من ئەوەندە دەزانم کەدەڵێم: خوایە بەهەشتم پێ ببەخشی ولەدۆزەخ وئاگری جەهەنەم بەدورم کەی. پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی وفەرموی: ئێمەش هەرلەمە دەڵێین وهەرلەدەوری ئەمە دەسوڕێینەوە وداوامان هەرئەوەیە کەخوا بەهەشتمان پێ ببەخشێ ولەئاگری دۆزەخ بەدورمان بکات..

ڕۆژوی شەشەلان: صەحابی بەڕێز، (أبی أیوب) دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (من صامَ رَمَضانَ، ثُمَّ أَتْبَعَهُ سِتّاً من شَوّالٍ، كانَ كِصيامِ الدَّهْرِ). رَواهُ مُسْلِم.

واتە هەرکەسێ مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوبێ وپاشان شەش ڕۆژیش لەمانگی شەشەلان بگرێ. ئەوە وەکو ئەوە وایە، تەواوی ساڵەکە بەڕۆژوو بوبێ.

وەپێویستە ئەوە ڕون بکەینەوەکە: مەرج نیە دوەم ڕۆژی جەژن بەڕۆژووبی. چونکە دەفەرموێ: (ثُمَّ أَتْبَعَهُ). کە (ثُمَّ) لەزمانی عەرەبی دا بۆ (التَّراخی) یە. نەیفەرموو، (فَأَتْبَعَهُ) یان (وأَتْبَعَهُ).

وەهەروەها مەرج نیە کەلەڕۆژوی شەشەلاندا، هەرشەش ڕۆژەکە بەسەریەکەوە بگری. بەڵکو دروستە ناوبەناویش بیانگری. خۆ ئەگەر کەسێك دووشەممەو پێنج شەممە بەڕۆژوو دەبوو، ئەوە هەرزۆر باشەو بەویستی خوا، پاداشتی بەڕۆژوبونی شەشلانەکە وڕۆژوی ڕۆژی دووشەممە وپێنج شەممەکەشی بۆدەنوسرێ..





وه زانایان فەرمویانە: ئەگەر کەسێك قەرزار بوو. ڕۆژوی ڕەمەزانی لەسەر بوو. بالەپێشدا قەزای ڕۆژوە فەوتاوەکانی بکاتەوە. پاشان شەشەلأنەکە بگرێ چونکە قاعیدەیەکی شەرعی یە: (إنَّ الواجِبَ مُقَدَّمٌ عَلى السُّنَةِ).

خۆ ئەگەر کەسێك نیەتی هێناو ووتی: بەیانی بەڕۆژوو دەبم، لەمانگی شەشلان لەجیاتی قەرزی ڕەمەزان، ئەمە نابێ ، چونکە ڕۆژوی قەزای ڕەمەزان، عیبادەتێکی سەربەخۆیە ، ڕۆژوی سوننەتی شەشەلأنیش عیبادەتێکی سەربەخۆیەو، دروست نیە، تێهەڵکێش بکرێن. جائەگەر موسڵمانێك بەوشێوەیەی کردبوو. زانایان هەندێکیان دەفەرمون، بەڕۆژوی شەشەلأن حیسابە ودەبێ قەزاکان جارێکی تر بگرێتەوە. هەندێکی تریش لەزانایانی شەرع دەفەرمون: لەجیاتی ڕۆژوە قەزاکانی دەکەوێ وئەگەر مانگی شەوال ماوەی مابوو. باشەش ڕۆژی سوننەتی شەشەلأنیش بگرێ. وڕئەمەی دوەم کەدەفەرمون: لەجیاتی قەرزەکە دەکەوێ، ڕەئیەکی بەهێزترە چونکە ڕۆژوی قەرزەکە فەرزە و (والعِبادَةُ الَاوْجَبْ لَها الَاوْلَوِیَّةُ). هەروەکو دروست نیە کەسێك بڵێ: نیەتمە دووڕکات نوێژی بەیانی دەکەم وسوننەتی پێش نوێژی بەیانیشی لەگەڵ دەکەم. ئەمە دروست نیە. چونکە فەرز وسوننەت ناچنە ناویەکەوە..

خوای گەورە دامەزراومان بکات لەسەر شەقامە ڕێگەی ئیسلام.

﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴾ .
ٱللَّهُمَّ ءَامِينَ





سەرچاوەکان


١- قورئانی پیرۆز.
٢- تریفەی مانگ ، ڕەخشانی ، مامۆستا غەریب پێنجوێنی.
٣- المَواهِبِ السَّنِیَّة ، فِي الخُطَب المنبَرِیَّة ، أَحمد حسن كعكو ، ص٣٩٠.
٤- بەهاری دڵان ، ئوندازیار: عُثمان ، ل١٧٤.
٥- عَلى مَنابِرِ دِمَشق ، الطَّبیب: محمد خیر الشَّعال ، ج٢ ، ص٧٢.
٦- يَسْأَلُونَكَ ، د.حصام الدین عَفَّانَة ، ج١ ، ص٨١ ، ج٢ ، ص٣٢٥.

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبهِ أجْمَعين.

ئیمانداران: بەبۆنەی کرانەوەی دەرگای خوێندنگاکان بۆئەم ساڵی تازەی خوێندن بەپشتیوانی خوای گەورە، لەووتاری ئەمرۆماندا باسی (خوێندکاری سەرکەوتوو) دەکەین گومانی تێدانیە. لەرۆژگاری ئەمرۆماندا، زۆرترین چینی ناو کۆمەڵگا، خوێندکارانن. لەکوردستاندا، سوپاس بۆخوا ساڵ بۆساڵ رێژەی نەخوێندەواری کەم دەبێتەوەو بەهەزاران کەس، کە ساڵانی پێشوو، بەهۆی هەر بارودۆخ وگوزەرانی تاڵی ژیانەوە بوبێ، کەوازی لەخوێندن هێناوە. ئێستا دەگەرێتەوە بۆ خوێندن ودەست پێدەکاتەوە. ئەوانەی کەخاوەنی بروانامەن وچەندین ساڵە، فەرمانبەر وموچەخۆرن. ئێستا لەزانکۆ ئەهلیەکاندا ، بە پارە درێژە دەدەنەوە بەخوێندن و هەوڵی بەدەست هێنانی بروانامەی باڵاتر دەدەن ، کە ئەمەش هەموی سوپاسی خوای گەورەی دەوێ کە دەریدەخات گەلەکەمان ووشیارە وتێگەیشتوە تەنها خوێندن بەکەڵك دێت و زانست ئەگەر خواناسی لەگەڵ بێ لەهەمووشتێ پیرۆزترە وزانست وئیمان، وەکو دووباڵی مەلێك وان کەخاوەنەکەی دەگەیەننە لوتکەی بەختەوەری دونیا وپلە بەرزەکانی بەهەشت. کەلەراستی دا، زانست وئیمان بەخوا. دووروی یەك دراون. ئەگەر مرۆڤ بەمانای کەلیمە زانابێ و زانستی پێ بێ. ئیماندار دەبێ وئەمجا زیاتر عەزەمەت وگەورەیی خوای تاکوتەنهای بۆ دەردەکەوێ وئەمجا زیاتر تام وچێژ لەقورئان وفەرمودەکانی پێغەمبەری پێشەوا ﷺ دەکات. کەهەموی پرە لەزانست، لەهەموو زانستەکان. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ﴾ فاطر: ٢٨

بەڵێ خوێندکاران وقوتابیانی نیشتمانەکەمان. ئەوکەسانەن کەهیواو دوارۆژی وڵات و گەل بەوانەوە بەستراوە. (هیتلەر) کاتی خۆی وتویەتی: ئەگەر هەرچی کارگەو دامەزراوەی سەربازیمان هەیە، لەشەردا لەناوبچێ، بەمەرجێ پرۆسەی خوێندن بمێنێ وبەردەوام بێ. وڵات وێران نابێ ولەناو نەچووین.

جا بەپشتیوانی خوای گەورە لەم ووتارەدا. روودەکەینە چینی خوێندکاران وپێیان دەڵێن: بۆئەوەی پاشەرۆژتان رووناك بێ. بۆئەوەی رەنجی باوك ودایك وماموستا و ئەو هەموو پارە وسامانەی لەبوودجەی وڵاتدا بۆ بواری پەروەردەو فێرکردن صەرف دەکرێ، بەفیرۆ نەچێت. ئەوە بەوویستی خوای گەورە پابەندی ئەم چەند خاڵەبن، کەوەکو دیاری پێشکەش بەئێوەی بەرێزی دەکەم.

١- هەمیشەو بەردەوام خوای گەورەتان لەبیربێت، چونکە ئەومێشکەی، کەشتی فێربوی تێدا هەڵدەگری. ئەوگوێ یەی پێ ی دەبیستی. ئەوزمانەی قسەی پێ دەکەی. ئەوچاوەی پێی دەبینی. ئەو دەست وپەنجەی پێنوسی پێ دەگری. هەمووی خوای گەورە پێ ی بەخشیوی، دەی بەردەوام پەروەردگارت لەبیربێ و لەهەموو سەرکەوتن وبڕینی قۆناغێك وبەدەست هێنانی نمرەیەکی بەرزدا، سوپاسی خوابکە وسوجدەی شوکر بۆخواببە، جائەم بیروباوەڕ بەخواو بەئاینی ئیسلام کە لەدڵ و دەرون دا چەسپا. وا لەخوێندکار دەکات کەلەکاتی خوێندندا، گوێڕایەڵ و هێمن و سەنگین بێ. وەدواتریش کەخوێندنی تەواوکرد لەبەشێکدا وبڕوانامەی وەرگرت و دامەزرا لەسەر کارێك، دکتۆرێك ومامۆستایەك وئەندازیارێك و پارێزەرێکی بەویژدان و بەرپرس وخزمەتکاری دین وگەل و وڵات بێ وئەو ترسی خواو چاودێری خوایە، وای لێ دەکات کەلەخۆی بایی نەبێ وخیانەت لەکارەکەی نەکات. چونکە زانست بەبێ ئیمان و بیروباوەڕ بەخوا. نەك ناتوانێ خزمەتی مرۆڤایەتی بکات. بەڵکو زۆرجار توشی بەڵاو نەهامەتیشی دەکات.

بۆ نموونە: ئەوکەسانەی کەلەگوللەیەکەوە تاچەکی کیمیایی وکۆمەڵکوژیان دروست کردوە. ئایا هەموی مرۆڤی بەهرەمەندو زیرەك وهەڵگری بڕوانامەی هەرە بەرز نەبون لەزانستەکانی کیمیاو فیزیاو بایەلۆجی دا؟! خۆخەڵکی نەخوێندەوار ئەمانەی دروست نەکردوە. بەڵام ئەو هەموو زانستەو ئەو هەموو بڕاوانامەو تاقیگە زانستی یە، چونکە دینی خوا کەئیسلامە ئاڕاستەی نەکرد. نەك نەبوو بەخزمەت، بەڵکو بوو بەنیقمەت. خۆجەنگی جیهانی یەکەم و دوەم وهەموو جەنگەکان باشترین شاهیدی ئەم ڕاستی یەن.

زانای بەناوبانگی سویدی (نۆبڵ) — دینامیتی دروست کرد، کەمادەیەکی تەقینەوەی بەهێزە، بۆئەوەش دروستی کرد کەخزمەتی مرۆڤ بکات ولەمەبەستە ئاشتی یەکانی وەك ڕوخانی شاخ وتاوێرە بەرد وبڕینی ڕێگا وتونێل وهەڵکەندنی بیرەکاندا، بەکاربهێنرێت. بەڵام لەبری ئەمانە لەجەنگ و دوژمنایەتی وکوشتنی مرۆڤدا بەکارهێنرا، ئەمڕۆ ئەخرێتە ئوتومبێلەوەو ئەتەقێنرێتەوەو ڕوحی سەدان بێتاوانی پێ دەکرێتە قوربانی. بەڵام ئەم زانایە هەستی بەهەڵە وگوناە کرد. بۆئەوەی کەفارەتی ئەم خراپ بەکارنەهێنانەی





داهێنانەکەی بدات، بەشێکی زۆری لەو سامانەی کەلەم پیشەسازی یەوە دەستی کەوتبوو هێشتیەوە وکردیە چەندین خەڵات بۆ ئەوکەسانەی کەهەڵدەستن بەخزمەتگوزاری یە ئاشتی یە مرۆڤیەکان و لەبوارەکانی زانست وزانین دا خزمەتی پێ دەکەن. ئەمە چیرۆکی خەڵاتی نۆبڵە..

بەرێزان: چەندین نوسین و کتێب لەبواری ئابوری دا نوسراون وخوێندران و وڵاتی لەسەر بنیات نرا وحکومەتی لەسەر پێکهێنرا، وەکو مارکیسەت، کەچی چونکە دژی دین بوو، نەك هەرخزمەتی نەکرد، بەڵکو وڵاتێکی زلهێزی جیهانی وەکو ڕووسیا کەموقابیلی ئەمریکا بوو، ئیفلاس پێکرد!!

وە فەلسەفەی داروێن وفرۆید، هەموو خزمەتەکەیان بەمرۆڤایەتی ئەوەبوو، بڵێن: مرۆڤ لەمەیمونەو دەبێ مافی مەیمونی بدرێتێ، وەمرۆڤ تەنها جنس وسێکسە!!

٢- خوێندکارانی خۆشەویست، نیەتتان خاوێن بکەنەوە. بڵێ: خوایە بۆیە دەخوێنم کەژیانی سەربەرزانە وخزمەت کردن بەهەژاران وداماوان دابین بکەم. نەك هێشتا قوتابی بڵێ ی: ئای خۆزگایە دەبومە دکتۆرێك ونەشتەرگەریم بەوەندە دەکردو بەوەندە نەخۆشم دەبینی لەعیادەکەم وزوو دەوڵەمەند دەبوم!. یان خۆزگە ببمە ئەندازیارو مقاوەلات بکەم! ئەم نیەتە وا لەو خوێندکارە دەکات، دوای دەرچونی هەوڵی ئەوئاواتانەی دەدات وکەسێکی بێ خێری خۆپەرستی لێ دەردەچێ. هەرچەندە شەهادەشی بەرزبێ.. چونکە شەهادە وبڕوانامە، بەبێ باوەڕو ویژدان. خزمەتی خاوەنەکەی دەکات، نەك خزمەتکاری مرۆڤ. بەتایبەت مرۆڤە هەژارەکان..

٣- یەقین بۆخۆت پەیدابکە، کەتۆ خاوەنی گەورەترین وپیرۆزترین پیشە و سەرمایەی، شاهیدی قورئانە کەعیلم لەهەمووشتێ گەورەترە، (وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْماً). بەسە بۆگەورەیی زانست، کەئەوسەری نیەو هەرگیز کۆتایی نایەت. (وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِيم).

کەواتە: هەرگیز چاو لەمەسئول و دەوڵەمەند وکادری حزبی و ئەملاولا مەکە. چونکە خوێندن و زانست لەسەرو هەموانەوەیە.

٤- بونی ئامانجی هەرەبەرز. لەمێشکتدا ئامانجت لەم خوێندنە دیاری بکە وبیهێنە بەرچاوی خۆت وئەمجا هەوڵ بدە، ئەوخەونەت بکەی بەواقیع.. نەك

لەئێستاوە بڕیاری خۆت دابێ کەخوێندنت پێ تەواو ناکرێ.

٥- بەردەوامی وکۆڵنەدان. دەبێ ئەوەبزانی کەسەرکەوتن، بەرهەمی ڕەنج وخەبات و تێکۆشانی بێ وچانەو لەخۆیەوە دروست نابێ.

ئەو قسەیە نەت خەڵەتێنێ کەدەڵێ: بەسەعی کردن وهەوڵ دان نیە. خۆت زیرەك بی بەسە... چونکە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَأَنَّ سَعْيَهُۥ سَوْفَ يُرَىٰ ﴾ النجم: ٤٠.

وە زانایانیش دەڵێن: مەهارەت ولێهاتوییەکان لە (١٪)ی خواکردە. لە (٩٩٪)ی بەرهەمی هەوڵ وکۆششەکانە.... پێغەمبەری سەردارمان ﷺ فەرمویەتی: (إنّما العِلْمُ بالتَّعَلُّمِ، والحِلْمُ بالتَّحَلُّمِ). وە پەندێکی جوانیش هەیە کەدەڵێ: (من جَدَّ وجَدَ، ومن زَرَعَ حَصَدَ، ومن سارَ عَلى الدَّرْبِ وَصَلَ).

شاعیریش جوانی ووتوە: (تَرْجُوا النَّجاةَ ولَمْ تَسْلُكْ مِسالِكَها...

إنَّ السَّفينَةَ لاتَجْري عَلى اليَبَسِ).

شاعیری گەورەی ئێرانیش، خاتوو (پەروینی ئیعتیسامیش) دەڵێ:

(شێتی یە، ئەوەك قسەی بەشەرە .... لەبان بەربیەوە بڵێن قەدەرە)

بۆ کەشفی ئاسمان زانست بخوازە ... بۆ کاری وڵات هونەر کارسازە.

گوانێ وەکویەك خۆشی دەچێژێ ... ئەوەی دڕك دەچنێ ونەمام دەنێژێ)

٦- خوێندکاری بەڕێز: هەرگیز بەخۆت مەڵێ: مێشکم هەرئەوەندە وەردەگرێ. چونکە خوای گەورە بەشێوەیەك مێشکی مرۆڤی دروست کردوە، کەتوانا وهێزێکی بێ سنوری پێ بەخشیوە. مێشك لەگەڵ ئەوەدا کەکێشەکەی لەمرۆڤێکی سروشتی دا، دەگاتە: (١٤٥٠)غم. کەچی لەتوانایدا هەیە. (١٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) زانیاری هەڵگرێت وبپارێزێت. بەشێوەیەك کەئەگەر ئەوزانیاریانە بخرێنە سەرکاغەز، ئەوا کتێبخانەیەکی یەگجار فراوان وگەورەی وای لێ پێك دێ، کەملیۆنەها کتێبی لەخۆگرتبێت!! مێشکی مرۆڤ هەموو چرکەیەك دەتوانێ فێری (١٠) شت ببێ. کەلەخولەکێکدا دەگاتە (٦٠٠) شت!

وە ئەگەر مرۆڤ بەردەوام هەوڵبدات بۆ فێربوونی زانیاری، شەو و ڕۆژ بەبێ وچان وەکو میلی سەعات نەوەستێ، بەس تەنها زانیاری تازە فێرببێ، ئەوا بە (٦٠) ساڵ. ئەمجا نیوەی مێشکی پڕدەبێ!!.. وە بە (١٢٠) ساڵ ئەمجا هەموو



مێشکی پڕ دەبێ!! زاناکان لەساڵی (١٩٧٠) دا، هەڵسان بەلێکۆڵینەوەیەك لەسەر مێشکی مرۆڤ، دوای لێکۆڵینەوەکە ووتیان: مرۆڤ توانیویەتی (١٠٪)ی مێشکی بەکاربهێنێ.وە لە ساڵی (١٩٨٠)ا، دووبارە لێکۆڵینەوەیەکی تریان لەسەر مێشك ئەنجامدا دوای لێکۆڵینەوەکە ووتیان: مرۆڤ توانیویەتی (٢٠٪)ی مێشکی بەکار بهێنێ.

لەساڵی (١٩٩٠) دا، هەڵسان بەتاقی کردنەوەیەکی تر، لەدوای تاقیکردنەوەکە ووتیان: مرۆڤ لە (٣٠٪)ی مێشکی بەکاردەهێنێ.. بەڵام ئێستا لەنوێترین تاقی کردنەوەدا، لەگەڵ ئەوهەمموو پێشکەوتن وبەرهەمە نوێیانەی کەبەدەست هاتوون. تازە مرۆڤ توانیویەتی (١٪)ی مێشکی بەکاربهێنێ ولە (٩٩٪)ی هێشتا بەلۆکی ماوەتەوەو بەرکاری نەهێناوە!! ئالێرەدا ڕاستێتی وگەورەیی و ئەو ئایەتە قورئانیەمان بۆ دەردەکەوێ، کەخوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا﴾ الاسراء: ٨٥.

دکتۆر عەلی شەریعەتی، لەپارچە شعرێکیدا، کە (هەژار) کردویەتی بەکوردی دەڵێ:

بژی بۆ خزمەتی خەڵك..................ببی بەخاڵی بەکەڵك.
تۆ، تۆی نەمام ولاو......................وازبێنە لەبیری بلاو.
ئەڵقەی جەغز یەك لاکەوە................ببەڕێگەوە چیاکەوە.
سەردەرخە لەئاوەدانی...................تاتامی ژیانی بزانی.
ببە بەجۆبار، بەڕووبار....................پاراوکە مەزرای چەند هەژار.
ئەوسا دەرژێیە دەریاوە....................بۆ ژیان دەبیە سەرچاوە.
تۆ کەژیای بۆ داماوان......................بۆ هەژاران، زۆر لێکراوان.
ڕۆژ لەڕۆژێ بلندتری.......................لای خەڵك وخوا پەسەندتری.
بەس سیفرۆکەی جەغزۆکەبە...................شەپۆل بە، گێژەلۆکەبە.
باگوڕەت بێ، بگرمێنە.......................درك وپیسی ڕاڕفێنە.
هەڵەموت بەنەناو چیا.......................داربەڕوو بە لەناوگیا...

بەڕێزان: زۆرجار نازانرێ مێشك چۆن بەکاربهێنرێ. جابۆ سود وەرگرتنی زیاتر، بەپشتیوانی خوای گەورە، ئەم شتانە ڕەچاوبکە:

أ. دانانی نەخشەو پلان بۆ کارەکان وسەعی کردنت.

ب. دیاری کردنی ئەندازەی خەوتن، کەلە (٦) سەعات کەمتر نەبێ ولە (٩) سەعات زیاتر نەبێ.

ج. سوودوەرگرتن لەوکاتانەی بیروهۆشت ساف وپاکە وەکو کاتی بەیانیان. کەواتە، نوێژی بەیانی بکە ودوای ئەوە دەست بکە بەسەعی کردن..

٧- خوێندکاری ئازیز، پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ فەرمویەتی: (الحِكْمَةُ ضالَّةُ المُؤمِنِ). کەواتە: قسە وزانیاری بەسوود لەهەمووکەس وەرگرە. پێشەوا غەزالی فەرمویەتی: جارێکیان لەگەڵ کاروانێکدا لەشارێکەوە بۆشارێکی تر دەڕۆیشتم. هەموو کتێبە زانستیەکانم لەسەرپشتی ئەسپەکەم بوو. لەڕێگەدا کۆمەڵێك دزو جەردە ڕێگەیان پێ گرتین وهەموو شتەکانیان لێ سەندین. ئیمامی غەزالی دەفەرموێ: من چومەلای سەرۆکی دزەکان وداوام لێ کرد، کەهەرچی پێمە بیبەن، تەنها چاکەم لەگەڵ بکەن وکتێبەکانم مەبەن.. سەرۆکی دزەکان ووتی: بۆچی؟! ووتم: لەبەرئەوەی زانستەکانمی تێدایە!، لەوەڵامدا پێ ی ووتم: ئەو زانستە هیچ سود وکەڵکی نیە بۆتۆ! چونکە: زانست دەبێ لەسینگ دابێ، نەك لەکتێب دا!!

ئیمامی غەزالی دەفەرموێ: سوێند بەخوا قسەی ئەودزە کاری تێکردم و بڕیارمدا لەو ڕۆژوە، هەرزانستێکم خوێند لەبەری بکەم..

٨- هاوەڵایەتی کردنی خوێندکارانی هیممەت بەرز وزیرەك وبەڕەوشت ومتمانە بەخۆبوو، پێشینان جوانیان فەرمووە: گا ڕەنگی گا ناگرێ، بەڵام خوی دەگرێ.



چەند قوتابی زیرەك وبەتوانا. کەچاوەڕێ ی ئەوەیان لێ دەکرا، کەدواڕۆژێکی ڕووناکیان هەبێ و لەزانکۆدا ببینرێن. کەچی بەهاوڕێیەتی کەسان وخوێندکارانی فاشیل وخراپ توشی وازهێنان لەخوێندن ولاڕێ بوون وسەرگەردان بون هاتن!

٩- ئەوخوێندکارانەی، کەساڵێك دەرنەچوون. یان ماوەیەکە وازیان لەخوێندن هێناوە وئێستا دەستیان پێ کردۆتەوە. باسارد نەبنەوە لەخوێندن..

(مەترلینگ) دەڵێ: ئەگەر لەیەکەمین هەنگاودا، سەرکەوتنمان بەدەست بهێنایە، ئیتر هەوڵ وکۆشش، هیچ واتایەکی بۆ نەدەما..

(کنفوشیوس) دەڵێ: گەورەترین شانازی ئێمە لەوەدا نی یە، کەهیچ کات شکست نەخۆین، بەڵکو لەوەدایە کەهەرکاتێك شکستمان خوارد، سەرلەنوێ جارێکی تر، لەجێ ی خۆمان هەڵسینەوە!..



(گالیلۆ) ووتویەتی: هەرکەس توشی هەڵەیەك نەبوبێ، داهێنانێکی نەبووە. بەڵێ، مێژوو ناوی دەیان گەورە زانای تۆمارکردوە، کەلەدوای شکست لەخوێندن کەچی دواتر بونەتە زانای گەورە. بۆنموونە: ئەلبرت ئینیشتاین، تاتەمەنی چوار ساڵی فێری قسەکردن نەبووە وتاتەمەنی (حەوت) ساڵی نەیدەتوانی هیچ بخوێنێتەوە، مامۆستاکانی ووتیان: گەشەی عەقڵی زۆر لاوازە وکەسیەتیەکی سەرکەوتوی کۆمەلایەتی نیەو خەونی زۆرگێلانەی هەیە.

کەچی لەپاش چەندان ساڵ، شکست و دەرنەچون و دیسان هەوڵدانەوە. بوو بەبەناوبانگترینی زانایان لەبواری بیرکاری وفیزیادا وئەوەبوو کە: (تیۆری ڕێژەیی) (النَّظَرِيَّة النِّسبِيَّة) ی دۆزیەوە وگۆڕانێکی گەورەی لەجیهانی فیزیادا بەدیهێنا..

یان زانای ناودار، (تۆماس ئەدیسۆن): کە (٩٩٩) تاقی کردنەوەی ئەنجامدا پێش ئەوەی سەرکەوێت لەدروستکردنی کارەبادا، بگرە ئەوکاتە هەموو کەس پێ ی پێدەکەنین بۆئەوەی هەوڵە دۆڕاوەکانی ڕاگرێت، بەڵام ئەو پێ ی ووتن: من کۆڵ نادەم. چونکە هەرهەنگاوێك تێدەپەڕم، هەنگاوێك دەمباتە پێشەوە!!..

وەهەر لەنموونەی کەسانی شکست خواردو لەخوێندنداو پاشان هەڵسانەوە وکۆڵ نەدان بریتی یە لەزانای ڕووەکی سویدی: (شارل ڕولینیە). کە لەسەرەتای ساڵی (١٧٠٠)ی زاینی دا ژیاوە. ئەم زانایە لەسەرەتای خوێندنی دا، سەرکەوتوو نەبوو. زیرەکیشی زۆر لاواز بوو. کەگەیشتە ئەوەی مامۆستاکانی ئامۆژگاری دایك و باوکی بکەن بۆ دەرکردنی کوڕەکەیان لەخوێندنگە. وەفێری پیشەیەکی دەستی بکەن. وەخێزانەکەی زۆر دەستکورت ونەداربوون وخەڵکی یارمەتی دەدان. کەچی هەروازی لەخوێندن نەهێناو سەرەنجام لەکۆلێژی پزیشکی وەرگیراو پاشان بڕوانامەی (دکتۆرا)ی لەزانستی پزیشکی دا بەدەست هێنا.. وەجگە لەدکتۆریەکەشی دەستی کرد بەلێکۆڵینەوە لەزانستی ڕووەکی دا وسەرەنجام بوو بەزانایەکی بەناوبانگ لەزانستی ڕووەکیش داو چەندان تیۆری زانستی لەزانستی ڕووەکی دا دۆزیەوە!...

هەروەها هەرلەنمونەکانی سەرکەوتن دوای شکست لەخوێندن، بریتی یە لەنمونەی یەکێك لەفەقیهە دەرکەوتووەکان کەدەستی بەخوێندنی (فقە) کرد، بەڵام بەناڕەحەت لێ ی تێدەگەیشت وبۆی لەبەردەکرا تابێ هیوا بوو لەخۆی. ڕۆژێك لەیەکێك لەبێستانەکانەوە دەڕۆی. ئەسپێکی بینی کەبۆ هەڵکێشانی





ئاو لەبیرێك دا، دۆلکەیەکی پێوەبەستراوە، وەگوریسی دۆلکەکە بەسترابوو بەئەسپەکەوە. بەسەر بەردێك دا تێدەپەری هەرجارێك کەئەسپەکە ڕایدەکێشا، ئەم خوێندکارە بینی کەگوریسەکە شوێنەوارێکی لەسەر بەردەکە جێهێشتوە، لەئەنجامی زۆر دووبارەبونەوەی تێپەڕبوونی بەسەر بەردەکەدا. وەلەدەرونی یەوە ووتی: ئەم گوریسە لەئەنجامی زۆر دووبارەبونەوە، شوێنەواری لەسەر بەردەکە داناوە. ئیتر منیش نابێ بێ هیوابم لەکاریگەری ژیری بەزانستەکان. ئەگەر دوبارە بخوێنمەوە وزانستەکان لەبەربکەم وسوربم لەسەر هەردوکیان، سەرەنجام دەستی کردەوە بەخوێندن وبوو بەیەکێك لەبەناوبانگترین زاناکان..

١٠- قوتابی بەڕێز: بەپشتیوانی خوا، کەسێکی مەبدەئی وخاوەن بیروباوەڕ بەو لاسایی کوێرانە مەکە، دڵنیابە ئەو مەبدەئەش کەهەرگیز لێ ی پەشیمان نابی وهەمیشە پێوەی سەربەرزی، بریتی یە لە (ئیسلام). ئەینا بینیمان غەیری ئیسلام ئەگەر بۆدوێنێ باش بووبێ. بۆ ئەمرۆ بەکەڵك نایەت، ئەگەر ئەمرۆ باش بێ سبەینێ لێ ی پەشیمانی.. ئیمامی عەلی دەفەرموێ: خەڵکی سێ جۆرن:-

١. زاناکان

٢. خوێندکاران وزانست خوازان

٣. ئەوکەسانەی شوێن هەمووکەس دەکەون.. کۆمەڵی سێ یەم وەکو پوش و پەلاش لەکوێوە بای بێت، بەبێ وویستی خۆیان بەرەو ئەوێ دەچن. هەروەکو لەکوردەواری دا دەڵێ: (قانگلاشك ماڵت لەکوێ یە؟ دەڵێ: (با) دەزانێ!!..

بەداخەوە ئەمرۆ هەندێك لەمامۆستاو فێرخوازانیش هەرچاولێکەری خەڵکین. کەلەڕاستی دا دەبوایە پێشەنگ وچاولێکراو بوونایە. وەئەی قوتابی خۆشەویست، شوێن هیچ کەس مەکەوە وتەنها بیر لەخوێندنەکەت بکەوە. وەخۆزگە ڕێکخراوە قوتابی وخوێندکاریەکان، کەتائێستا لەسەر ناوی (قوتابی وخوێندکار) ڕێك نەکەوتوون. وازیان لەناو خوێندنگاو پەیمانگاو زانکۆکان بهێنایە،

وەئەی خوێندکاری بەڕێز: ئەگەر کوڕە هەژاری وگیرفانت بەتاڵەو بەپێ هاتوچۆ دەکەی و پارەی تەکسی وپاسیشت پێ نیە. چ جای بوونی ئوتومبێلی تایبەتی خۆت. ئەوە بائەو هەژاری یە هەرگیز لەخوێندن ساردت نەکاتەوە. چونکە دڵنیابە: زۆرکەم ڕێ دەکەوێ، زانایەکی پایەبەرز لەخێزانێکی ساماندارد





هەڵکەوتبێ. مێژوو شاهیدە: پێغەمبەران هەمویان لەخێزانە نەدارەکانن. وەگوتراویشە: (هەژاری بێشکەی بلیمەتانە).. وەزۆربەی ئەوخوێندکارانەی کەفاشیلن وکەم ئەدەبن و ئاژاوەچی ناوپۆلەکانیانن، ئەوانەن کەپارەی باش وئیمکانیات وهەموو شتێکیان لەبەردەستدایە. بەڵام ئەدەب ورێز ورەوشتی بەرزیان نیە. شاعیر جوانی پێکاوە کەدەڵێ: (إِنَّ الشَّبابَ وَالفراغَ وَالجِدَّة ..... مَفْسَدَةٌ لِلْمَرْءِ أيُّ مَفْسَدَة).

لەکۆتایی دا: ڕوو لەبەرێزانی وەزارەتی پەروەردە دەکەم و دەڵێم: پێویستە ئێوەی زۆر بەرێزیش، خۆتان باش بناسن وناوەکەتان پڕناوەڕۆك بێ. وەزارەتەکەی ئێوە ناوی وەزارەتی (پەروەردە) یە، نەك (فێرکردن). کەواتە: پەروەردە پێش فێرکردن کەوتوە. بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە، هەندێ جار گوێ بیستی ئەوە دەبین کەبڕیاری ئەوە دەدرێ کەپێویستە کوڕوکچ لەقۆناغی بنەڕەتی دا، تێکەڵ بکرێن! کەبەڕاستی ئەم بڕیارە نابەجێ یە تەنها دوو إحتمالی بۆدەکرێ:

١- دژایەتی کردنی ئاینی ئیسلام، کەبۆ بەرژەوەندی کوڕوکچی هەرزەکار، ڕێگەی تێکەڵاوبونی کوڕوکچی قەدەغەکردوە. وەکوڕوکچە بەرێزەکان، باش باش بزانن ئیسلام ومزگەوت ومینبەر دژی ئازادی و بەجێهێنانی خواستەکانی ئێوە نی یە و حەزەکانتان سەرکوت ناکات، بەڵام بزانن ئازادی وسەربەستی، زۆر جیاوازەو لەسەدا سەد دژە لەگەڵ بەرەڵایی: دەی ئەم تێکەڵ کردنە بەرەڵایی لێ دەکەوێتەوە، بۆ؟! چونکە:

أ. قۆناغی سەرەتایی وناوەندی تەمەنی هەرزەکاری یەو وەکو ئەوە وایە کەسێك برسی بێ، ئەگەر لەشوێنێکدابێ، خواردنی لێ نەبێ، زۆری فەرقە لەگەڵ ئەوەی لەکەبابخانەیەکدا دابنیشێ.

ب. مامۆستاو بەڕێوەبەرە بەرێزەکان خۆیان شایەتن کەقوتابی واهەیە، پەلاماری مامۆستای ئافرەتی داوە. نەك تەلەبەی کچ کەلەتەنیشتیەوە دابنیشێ!!

مامۆستا بەرێزەکان شاهیدن کەئەو قوتابیانە لەقۆناغی سەرەتایی وناوەندی دا. لەکوڕان ولەکچان مۆبایلیان پێ گیراوە. وێنەی وای لەسەربوە، مامۆستاکە وتویەتی شەرمم کردوە سەیری بکەم وبانگی کەس وکاری بکەم وپێیان بڵێم: وەرن سەیری مۆبایلی کوڕەکەتان، یان کچەکەتان بکەن. جائایا کێ ئامادەیە کوڕ وکچی خۆی لەتەنیشت ئەو بێ شەرمانەوە دابنێ؟!



خۆئەگەر کەسێکیش بڵێ: ئاخر خۆهەموو کوڕوکچێکی قوتابی وانی یە ئەوانە زۆرکەمن، دەڵێین: ڕاستە، بەڵام خۆیەك کەسی ئاوا خراپ، پۆلێکی (سی) قوتابی دەشێوێنێ وئاژاوە دەخاتە ناوماڵ وئیدارەی قوتابخانە وپرۆسەی پەروەردەوە.

خۆئاشکرایە دەرزی خۆپاراستن لەنەخۆشیش، کەلەهەزاران کەس دەدرێ، تەنها لەترسی خۆپاراستن لەڤایرۆسێکە. جابەڕاستی حەیفە پەروەردە ببێتە شوێنی بەڕەلایی وبێ ڕەوشتی. وەکەسیش دژایەتی ئەم ئیسلامەی پێ ناکرێ وچۆن دارخورما لەسەر پیرەمەگرون ناڕوێ، ئەم بڕیارەش نابێ لەکوردستاندا جێ بەجێ بکرێ. وەحکومەتیش ئەگەر بەهانەی ئەوەیە کەحکومەتی هەموو میللەتە. بالەهەموو جێگایەکدا خوێندنگایەکی تایبەت بەکوڕ وکچی تێکەڵ بکاتەوە، بۆئەوەی ئەوکەسانەی کەحەز دەکەن کچ وکوڕ بەیەکەوە بخوێنن، منداڵەکانیان بنێرنە ئەوێ و ئەوانیش بۆخۆیان ئازادبن.

٢- ئیحتیمالی دووەم: ڕەنگە وەزارەتی پەروەردەی بەڕێز، وایان بەخەیاڵدا هاتبێ کەئەم دواکەوتنی زانستە لەوڵاتەکەماندا، کەقوتابیەکی پۆلی نۆی بنەڕەتی ئێستا، بەئەندازەی قوتابیەکی سێ ی سەرەتایی جاران نازانێ. لەبەرامبەردا ئەوپێشکەوتنە گەورەی تەکنەلۆجیای جیهان. هی ئەوەیە: کەلێرە خوێندنگای کچان جیاوازە لەکوڕان وئەگەر تێکەڵ بن ئاستی زانستی بەرزدەبێتەوە وڕێژەی دەرچون زیاد دەکات و وەکو وڵاتان پێش دەکەوین!! بەڵام بەڕاستی ئەمەش بەهەڵەچونێکی گەلێ گەورەیە. لەبەرئەوەی هۆکاری پێشکەوتنی وڵاتانی پێشکەوتوو، هی هەوڵ وزانست وزانیاریانە. نەك ڕووتی وتێکەڵی وبەرەڵایی. لەوڵاتێکی وەکو (یابان) دا. ئەومناڵانەی کەبەهۆی چەکی ئەتۆمی ئەمریکی یەوە، ئێستاش بەبێ دەست وقاچ لەدایك دەبن. حکومەت فێری ئەوەیان دەکات، بەقاچ بنوسن وکۆمپیوتەر وئەنتەرنێت بەکاربهێنن. بەداخەوە لێرە، منداڵەکان و هەرزەکاران فێری ئەوە دەکرێن، کەنامەی مەسیج لەڕێ ی تەلەفیزیۆنەوە بنێرێ و بڵێ: من کوڕێکم وحەزم لەکچێکە ببێ بەهاوڕێم!! یابان بەزانست ئوتومبێلی (نیسان) دروست دەکات. ئێمە هەرخەریکی (درۆی) نیسانین!!

هەزار ڕەحمەت لەشاعیری گەورەی پاکستانی، محمد ئیقبال. کەلەشعرێکیدا.





کەبرایەکی شاعیر کردویەتی بەکوردی، فەرمویەتی:

(شەرق) کەلاسای (غەرب)ی کردەوە.
وای زانی گرەوی ژیانی بردەوە.
پێشکەوتنی غەرب، نەعود ونەساز.
نەرەقس وسەمای کچی چەنەباز.
نەجادووی ژن ونەخاڵی ڕووە.
نەلەقاچ ڕووتی وبرینی مووە.
نەئازایەتی ونەبێدینیە.
نەلەبەر سۆز وخۆشەویستی یە.
پێشکەوتنی وان، عیلم وسەنعەتە.
ئەویش بەرهەمی هەوڵ وهیممەتە.
بەختەوەری ژین هەتا ڕۆژی مەرگ
زانست دەی هێنێ، نەك پۆشاك وبەرگ.

وە ئەگەر وەزارەتی پەروەردە بەم بڕیارەشی، هەرچاولێکەری بکات. ئەوا بەدەردی کابرای زوڕناچی دەچێ کەدەگێڕنەوە: لەکۆندا حەمامەکانی ئێران بەزوڕنا لێدران دەکرانەوە. حەمامچیان بۆ ئاگادارکردنەوەی خەڵك لەکرانەوەی حەمام، یەك سەعات پێش بەیانی زوڕنایان لێ دەدا. بەڕێکەوت ڕۆژێك لەیەکێك لەشارەکان زوڕنای حەمام بزربوو، حەمامچی بەگەڕان وسوڕانێکی زۆرەوە. زوڕنایەکی تری بەنرخێکی گران کڕیەوە وکاری خۆی پێ ئەنجامدا. پیاوێکی غەوارە کەتازە هاتبوو بۆ ئەو شارە. ئەوەی دیت، خۆشحاڵ بوو. بەتایبەتی کەبینی لەوێ شتێك بەڕیاڵێك کڕدرابێ بە (١٠) ڕیاڵ بیفرۆشێ. دەست بەجێ گەڕایەوە وبڕیاری دا، ژمارەیەکی زۆر زوڕنا بکڕێ وبۆئەو شوێنەی ببات تاوەکو (دە) بەرامبەر خێربکات. زوڕنایەکی زۆری گەیاندە مەیدانی گەورەی ئەوشارەو واچاوەڕوان بوو کەلەهەوەڵین ساتدا کڕیارەکان لەسەر زوڕناکان بەشەڕبێن وسەروگوێلاکی یەکتری داپلۆسن. بەڵام هەرچەندە چاوەڕوانی کرد، کەسێك نەیگوت زوڕنا بەچەندی! بازرگانێکی دەوڵەمەندی گۆچان بەدەست لەوشوێنەوە تێدەپەڕی. هۆی هێنانی ئەوهەموو زوڕنایەی لەوپیاوە غەوارەیە پرسی. ئەویش بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، بازرگانەکە لەگێلی ونەحمەقی ئەوکابرایە سەرسام

ماو گوتی:

ئاخر تۆ بیرت نەکردۆتەوە کەئەم شارە لەدوو حەمام زیاتری نیە ونەوهەموو زورنایە لێرە نافرۆشرێن؟!! بەڵام بەهەرحاڵ من تەگبیرێکت بۆدەکەم، کەلەماوەی یەك هەفتەدا زورناکانت بۆبفرۆشرێن. پیاوە غەوارەکە لەخۆشیان باوەڕی نەدەکردو گوتی: چ کارێکم بۆدەکەی؟! بازرگان وەڵامی دایەوە: جارێ ئەوکارە پەیوەندی بەتۆوە نی یە. هەرئەوەندە بزانە کەخەڵکی ئێرە لاسایی کەرەوە وبێ هۆشن. منیش خاڵی لاوازی ئەوان بەڤازانجی تۆ دەزانم، ئینجا زورنایەکی بەئامانەت لێ وەرگرت و دایە دەستی شاگردەکەی تابیباتەوە بۆماڵ. بەیانی ئەو پیاوە دەوڵەمەندە لەجیاتی گۆچان زورنای بەدەستەوە گرت ورێگای بازاڕی گرتەبەر، دیمەنی ئەوبازرگانە سەرنجی خەڵکی ڕاکێشاو لەبەرخۆیانەوە گوتیان: حەتمەن هۆی دەوڵەمەندی ئەوپیاوە هەمان ئەوکارەیە. کۆمەڵێك لاساییان کردەوەو غەوغایەك لەوشارەدا پەیدابوو. خەڵکی کەوتنە وێزەی زورنا کڕین وهێندەی نەبرد کەتەواوی زورناکانی فرۆشتن. بازرگانەکە هەواڵی دا بەپیاوە غەوارەکە کەهەرهەموو زورناکانی فرۆشراون پێ ی گوت: هەتا زووە لەم شارە دەرچۆ، ئەینا سبەینێ مۆدێکی تر پەیدا دەبێ!.

بەڕێزان: کەسانێك هەن کەمناڵەکانیان لەخوێندن دێننە دەرەوە وکاسپیان پێ دەکەن. هەندێ جار مناڵەکە خۆی حەزی لەخوێندن نیەو خوا خوایەتی باوك ودایکی پیشەیەکی بۆ بدۆزنەوەو ئەمیش وازلەخوێندن بێنێ. بەڵام ڕۆژێ پەشیمان دەبێتەوە کەپەشیمان بونەوە دادی نادات وهەردەبێ خۆزگە خۆزگەی بێ.

ئەم بەسەرهاتەش بۆ ئەوکەسانە دەگێڕمەوە کەوادەزانن، مناڵەکانیان کاروکەسابەتێك بکەن باشترە لەخوێندن. بەڵام ڕاستی یەکەی تەواو پێچەوانەیە، یەکێك لەگەورە زانایانی ئیسلام، ناوی (قازی ئەبو یوسفە) ئەم زانا گەورە. مناڵ بوو کەباوکی ماڵئاوایی یەکجاری لێکرد ودونیای بەجێهێشت. قازی ئەبویوسف ودایکی جگە لەخەم و پەژارەی ئەوکارەساتە بارودۆخی ژیان ولێپرسراویەتی ماڵیشیان کەوتە ئەستۆ.

دایکی لەپێناوی پەیداکردنی بژێوی ژیانی ڕۆژانەیاندا هەوڵیدا کوڕەکەی فێری پیشەیەك بکات. تا ئاتاجی دەستی کەس نەبن ونەبنە ئەرك بۆسەر شانی





هیچ کەس. بۆئەم مەبەستە، کوڕەکەی ناردەڵیی وەستایەکی بەرگ درووە. تا فێری درومان ببێت و ڕۆژانەش چەند دیرهەمێك پەیدا بکات، بۆ بەڕێوەبردنی ژیان و گوزەرانیان. ئیدی لەو ڕۆژە بەدواوە قازی ئەبو یوسف هەموو بەیانیەك زوو دەچووە دوکانی بەرگ دروەکە وکاری لەگەڵ دەکرد. ئێوارانیش تەنها یەك دیرهەمی شاگردانەی وەردەگرت. ئەویش پارەکەی دەبردەوە بۆدایکی تاخۆراك و پێداویستیەکانی ڕۆژانەیانی پێ بکرێت.

چەند ڕۆژێك قازی ئەبو یوسف چوەلای بەرگ دروەکە، بەڵام قەدەر وابوو ڕێ ی کەوتە مزگەوتێك بینی کۆمەڵێك قوتابی لەدەوری پێشەوا ئەبوحەنیفە کۆبونەتەوەو سەرقاڵی موتالاکردن وخوێندنن. لێیان نزیك بوەوە وکەمێك گوێ ی بۆقسەکانی مامۆستا رادێرا، بەووتەکانی زۆر سەرسام بوو. هەربۆیە لەکۆڕەکەیاندا دانیشت و بڕیاری دا، ئەو ڕۆژە نەچێتەلای بەرگ دروەکە. بۆ ڕۆژی دواتریش بەهەمان شێوە، چوەوە بۆلای پێشەوا ئەبو حەنیفەو ئامادەی وانەکانی بوو. بەرگ دروەکەش ئێوارە چوو بۆماڵی قازی ئەبو یوسف و سکالای نەهاتنی لای دایکی کرد وپێ ی گوت. ئەوە دوو ڕۆژە کوڕەکەت نەهاتووە بۆسەرکار. لەبەرئەوە منیش ڕۆژانەکەی دەبڕم وئیدی چاوەڕوانی کرێ ی کاری کوڕەکەت مەکە، بۆ ڕۆژی دواتر دایکی چوو بەشوێن کوڕەکەیدا تابزانێت بۆکوێ دەچێت. وادوو ڕۆژە نەچۆتە سەرکار، بینی لەکۆڕی قوتابیەکانی پێشەوا ئەبوحەنیفەدا دانیشتوە، بەتوڕەیی یەوە دەستی گرت ومۆڵەتی لەمامۆستا خواست تابیباتە دەرەوە!! پێشەوا ئەبوحەنیفە پێ ی گوت: دادەگیان، من زیرەکیەکی بێ وێنە لەمنداڵەکەتدا بەدی دەکەم. تکایە مۆڵەتی بدە بابخوێنێت. دڵنیابە ڕۆژێك بەسەر کوڕەکەتدا دێت، خواردنی (فالوزەج) دەبێت!! (فالوزەج جۆرێك بوە لەشیرینی، لەڕۆنی فستەق دروست کراوە، لەوزەمانەدا جگە لەخەلیفە کەس لەتوانایدا نەبووە، ئەوجۆرە خواردنە بخوات!!).

دایکی قازی ئەبو یوسف وەڵامی دایەوەو ووتی: مامۆستاگیان تۆ بێناگای لەحاڵی ئێمە تکایە واز لەکوڕەکەم بهێنە. تەنها ئەم کوڕەمان هەیە کەڕۆژانە دیرهەمێکمان بۆپەیدا بکات، (ڕەنگە لەدڵی خۆیدا وتبێتی: ئێمە نانی ووشکمان دەست ناکەوێ، جاکوڕەکەم بەم خوێندنە وای لێ بێ فالوزەج بخوات!!).

بەڵێ بۆ ڕۆژی دواتر ئەبو یوسف دوبارە ڕۆیشتەوە بۆلای پێشەوا ئەبوحەنیفەو

ئەرۆیشت بۆلای بەرگ دروەکە. پێشەوا ئەبوحەنیفە زۆرحەزی دەکرد، قازی ئەبو یوسف بەردەوام بێت لەخوێندن. چونکە قوتابیەکی زۆر ژیر وزیرەك ولێهاتوو بوو. بەداهاتوی زۆرگەش بین بوو. هەربۆیە لێ ی پرسی: کوڕی شیرینم بەرگ دروەکە ڕۆژانە چەند دیرهەمت پێ دەدات؟! قازی ئەبو یوسف ووتی: تەنها یەك دیرهەم! پێشەوا ئەبوحەنیفە ووتی: من هەموو ڕۆژێ سێ دیرهەمت پێ دەدەم تادایکت ڕازی بێت تۆ واز لەکارکردن بهێنیت ودرێژە بەخوێندن بدەیت. پێشەوا ئەبوحەنیفە جگەلەوەی زانایەکی ناودار وبلیمەت بووە، لەهەمان کاتدا بازرگانێکی دەوڵەمەند و بەخشندە بووە. ئیتر دایکیشی بەم جۆرە ڕازی بوو کوڕەکەی لای ئەبوحەنیفە بخوێنێت.. ڕۆژان تێپەڕی وقازی ئەبو یوسف خوێندنی تەواو کردو بووە زانایەکی بەناوبانگی سەردەمی خۆی. لەلایەن خەلیفە هاڕونە ڕەشیدەوە پۆستی قازی پێدرا!!، پاشان لەبەرلێهاتوویی قازی ئەبو یوسف هاڕونە ڕەشید پۆستی (سەرۆکی دادوەرانی) پێ بەخشی!!..
جارێکیان قازی ئەبو یوسف لەگەڵ هاڕونە ڕەشیددا پێکەوە لەسەر خوانێك دانیشتبوون، خواردن گەلێکی نایاب وخۆش لەسەر خوانەکە دانرابوو. یەکێك لەوخواردنانە (فالوزەج) بوو کەبەڕۆنی فستەق دروست کرابوو. قازی ئەبو یوسف کاتێك سەیری فالوزەجەکەی کرد. هۆن هۆن فرمێسك بەچاوەکانی دا هاتەخوارەوە. خەلیفە پرسی: چی ڕویداوە؟ بۆچی دەگریت؟! قازی ئەبو یوسف تەواوی چیرۆکەکەی بۆ هاڕونە ڕەشید گێڕایەوە خەلیفەش ووتی: ڕەحمەتی خوا لەپێشەوا ئەبوحەنیفە بێت، کەبەچاوی عەقڵی سەیری داهاتووی تۆی کردوە. نەك بەچاوی سەری!! (بەڵێ زۆرکەس بەچاوی سەر سەیری کوڕ وکچی هەژاران وبێ دەرەتان دەکات و وادەزانێ هەتاماوە دەبێ هەرئاوا بەهەژاری بژی).
بەڵێ بەڕاستی هەرزانستە پلە وپایەی خاوەنەکەی لەدونیاو قیامەتدا بەرز دەکاتەوە.. پاشان قازی ئەبو یوسف ووتی: ئەگەر ئەوکارەم بکردایە کەدایکم دەیویست، ئەوا ئێستا بەرگ دروویەك دەبوم. بەلام خودا وویستی من ببمە زانایەك و لەگەڵ خەلیفەو ناودارانداا دابنیشم ولەسەر خوانی ئەوان نان بخۆم. جاتۆش ئەی دایکی نازیز، باوکی بەڕێز: تکایە بەچاوی سەرتان سەیری داهاتوی منداڵەکانتان مەکەن. بەڵکو بەچاوی عەقڵتان بۆ داهاتویان بڕوانن. ڕەنگە ئەمڕۆ منداڵەکانت بتوانن چەند دینارێکتان بۆ پەیدا بکەن، بەلام دڵنیابن ئایندەیان وێران دەبێت. لەوانەیە ئەمڕۆ کەپارەی شاگردانەکەی وەردەگرێت





خۆشحاڵ ببێ و پێبکەنێت، بەڵام سەرەنجام دەبێت هەموو تەمەنی نیگەران بێ و فرمێسك بۆ ڕابردووی لەدەست چووی هەڵوەرێنێت..

کەواتە: ئێستا هانی مناڵەکەت بدە لەسەر فێربون وزانست وزانیاری. کەشی خوێندنی بۆ فەراهەم بهێنە. چونکە هەرزانستە ئایندەی مرۆڤەکان گەش وڕوون دەکات ودەبێتە هۆکاری بەختەوەری دونیاو دواڕۆژیان... ماڵ وسامان لەناودەچێت. بەڵام هەرگیز زانست و زانیاری لەناو ناچێت..

سەرچاوەکان


١- قورئانی پیرۆز.
٢- فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ.
٣- مرۆڤو بەهرەکانی ، گۆران قەرەداغی ، ل١١٤، ل٢٣، ل١٢٠.
٤- متمانە بەخۆبوون ، أنور أحمد مصطفی ، ل١٩، ل١٧، ل١٠٠.
٥- ڕازی سەرکەوتنی گەورە پیاوان ، نوسینی: جەعفەری سوبحانی. وەرگێڕانی، هێرش سەنگەسەری ، ل٧٧، ل٢٨، ل٨١، ل٣٠.
٦- سەرکەوتنی بێ سنور، د.إبراهیم فەقێ. و: چیا عبدالله ل٣٠، ل١٥٤.
٧- گۆڤاری بڕیار ، ژ: ٢٧، ئابی (٢٠١٠) ل٢٠.

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبهِ أجْمَعين.

هەرچی سوپاس وستایشە هەرشایانی خوای تاك و تەنهایە. ئەو خوایەی واحیدو ئەحەدە صەمەدو بێ ئیحتیاجە لەگشت مەخلوقات و هەموو موحتاجی کەرەمی ئەون. ئەو خوایەی کەحەکیم و کاربەجێ یە. خەبیرەو هەموو حوکم و فەرمانێکی کالای پڕ بەبالای گەردون و مرۆڤایەتی یە.کەریم و بەخشندەیە. غەفورەو لێخۆشبووە. قەهارە بەرامبەر بەوانەی دەیانەوێ داژیەتی دینەکەی بکەن. (ولي) یەو پاڵپشتە بۆ هەرکەسێ پشتیوانی لەدینەکەی بکات.

لەم کات و شوێنە پیرۆزەدا هەمومان بەدڵ و بەگیان دەڵێین: (لا إلهَ إلا الله، وحْدَهُ لاشَريكَ لَهُ. لَهُ المُلْكَ ولَهُ الحَمْدُ، وهُوْ عَلى كُلِّ شَيءٍ قَدير). وەکو پێغەمبەری خوا ﷺکەهەموو جارێ لەسەرەتای ووتارەکانی دا دەیفەرموو:

(من يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ). هەرکەسێ شوێن ئەم هیدایەتەی ئیسلام و قورئانە بکەوێ، هەرگیزاو هەرگیز گومڕا نابێ. سەری لێ تێك ناچێ، کردە پەشیمان نابێ، نەفرەت لەڕابردووی خۆی ناکات. هەمووکات هەر پێشکوتوەو نوێخوازە. (ومن يُظِلِلْ فَلا هادِيَ لَهُ). هەرکەسێ پشتی لەهیدایەتی خوایی کرد، بەتیشکی ڕۆژ ڕازی نەبوو،حەزی لە فتیلەو چرای دوکەڵاوی بوو. بەقورئان ڕازی نەبوو.حەزی لە مەنهەجی فڕێدراوی ئەملاولابوو، لەئاوی زوڵاڵی ئیسلام خۆی تێراو نەدەکردو بەدوای ئاوی پاشەڕۆدا وێڵ بوو ... ئەوە هەمیشە گومڕایە ... سەرگەردانە ... پەشیمانە ... ئەمڕۆ ئەمەی لەلا باشەو بەیانی ئەڵێ بەکەڵك نایەت نەفرەت لەباوك و باپیرانی و ئەخلاقی ڕەسەنی میللەتەکەی دەکات..... ئەوەندەی لاسایی خەڵك کردۆتەوە ، بەناوی مەدەنیەت و پێشکەوتنەوە، ڕۆیشتنەکەی خۆیشی بیرچۆتەوەو فێری ڕۆیشتنی خەڵکیش نەبوو...دەی خوایەگیان نەمانخەیتە ڕیزی گومڕایانەوە...

هەمووومان لەناخی دڵمانەوە بڕیارمانداوەو بەزمان دەڵێین:

(نَشْهَدُ أنَ مُحَمَّداً عَبْدُاللهِ ورَسُولُهُ). شایەتی ئەدەین، کەپێغەمبەر وپێشەوامان، دڵسۆزو ڕابەرمان، شەفیعی ڕۆژی مەحشەرمان، حەزرەتی محمدی موصطفایەو، بەچاوساغی و ڕابەری ئەو ئەبێ بەکەسی تر ڕازی نابین. خوایەگیان.گەرچی گوناهمان زۆرە. وەکو پێویست نەمانتوانیوە مەدح وستایشی تۆ بکەین ولەخزمەت ئیسلامدا بین. بەڵام ئەوەی کەدڵمان پێ ی خۆشە، بریتی یە لەوەی کەبڕیارێکە داومانە و دەڵێین:





لەنێو دنیادا پەرستراو خودایەك ... لەنێو ملیۆنان ڕێگادا ڕێگایەك.
ئەگەر خەڵکی گشت خۆدانێن بەڕێبەر ... لەلای من هەریەکەو هەرپێشەوایەك.
ئاشکرایە بیروڕای جۆر بەجۆر هەن ... بەڵام هی من بڕوایەکە، بڕوایەك.
خودایە عەزمی من ئاوایە ئەمما ... گونەهبارم دەسا لوتف ونیگایەك.
خوایـەگیان. پەیمان تـازە دەکەینەوە، کـە ڕاگیراوبین لـەخزمەتکردنی دینی ئیسلام، هەتا ئەوکاتەی کە لەقەبرەکەشدا، لەوەڵامی فریشتەدا دەڵێین: (الاسلامُ ديني)
(تەنها ئیسلاممان ڕێ یە ... ڕێیەو لەڕێچکان جوێیە
موژدەی ژینی ئازادی و .... داد وبەختیاری پێ یە)..

ئیمانداران: گەورەترین عیبادەت نوێژە، چونکە تۆ گفتوگۆ لەگەڵ خوا دەکەی،

پیاوچاکێ دەفەرموێ: هەرکەسێ حەزدەکات قسە لەگەڵ خوادا بکات بانوێژ بکات. وە هەرکەسیش حەز دەکات، خوا قسەی لەگەڵ بکات، باقورئان بخوێنێ. گەورەترین ڕوکنی نوێژیش، خوێندنی سورەتی الفاتحة یە تێ یدا، وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (لاصَلاَةَ لِمن لـمْ يقْرَأْ بِفاتِحَةِ الكِتابِ).
بۆچی خوای گەورە لەناو هەموو قورئانداسورەتی فاتحە ئەوەندە گەورەیە، کەواجبە لەهەموو ڕکاتێکدا هەرئەو بخوێندرێ ونەگەر کەسێك هەموو قورئان جگە لە سورەتی فاتحە لەناو نوێژدا بخوێنێ و تەنها سورەتی فاتحە نەخوێنێ، خوای گەورە ئەو نوێژە قبوڵ ناکات!! ئایا بۆچی وا گەورەیە؟! چونکە ڕێبازی ژیانی ئیماندار دیاری دەکات. تۆی موسڵمان، لەشەو و ڕۆژێکدا. تەنها لەنوێژە فەرزەکاندا (١٧) جار داوای ئەوە لەخوا دەکەی کە: ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ ﴾ ئەمە ڕێگای خۆتت دیاری کرد. ئەمجا ئەو مەترسیەی هەتە هی ئەوەیە کەدەترسی بچیتە سەر ڕێگای گومڕایان لەجولەکە وگاوران. بۆیە دەڵێ ی: ﴿ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾ جابەڕاستی ئەم داوا ووەعدو پەیمانە ئەگەر هەر قسەبێ بەکەڵك نایەت. بەڵکو دەبێ کردەوە بێ و بۆسەلماندنیشی هەڵوێستت هەبێ.. دەی بە پشتیوانی خوای گەورە، لەم ووتارەدا باسی موسڵمانی





بەهەڵوێست دەکەین.. (بەهەڵوێست بوون) واتە: مەبدەئی بوون. واتە: دوربوون لەچاولێکەری کوێرانە. واتە: دوربوون لەوەی لەکوێوە بای هات لەوێوە شەن بکەی.

واتە: دووربوون لەفکری (ئاگرە سوورە لەخۆم دوورە) !! بەهەڵوێست بوون مانای ئەوەیە کەفەرمودەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ جێ بەجێ بکەی. کەڕوی کردە ئوممەتەکەی و فەرموی: (لاتَكونُوا إمَعَةً، تَقولُونَ: إنْ أَحْسَنَ النَاسُ أَحْسَنَا، وَإنْ ظَلَمُوا ظَلَمْنا، وَلكِنْ وَطِّنُوا أَنْفُسَكُمْ، إنْ أَحْسَنَ النَاسُ أَنْ تُحْسِنُوا، وَإنْ أَساءُوا فَلا تَظْلِمُوا) رَواهُ الترمذي (٢٠٠٧)، هذا حَديثٌ حَسَنٌ غَريبٌ، وَقالَ مُحَقِّقُ جامِعُ الاصُولِ (٦٩٨/١١) حَديْثٌ حَسَنٌ).

بەڵێ ئیمانداران، پێغمبەری خۆشەویستمان، ڕوومان تێ دەکات و دەفەرموێ: ئیممەعە مەبن. باشە (ئیممەعە) مانای چی یە؟! (إبنُ الاثير) لە — النهاية ج١ ص٦٧)دا دەفەرموێ: (الإمَّعَةُ الَّذي لارَأْيَ لَهُ، فَهُوَ يُتابِعُ كُلَّ أَحَدٍ عَلى رَأْيِهِ)

واتە: ئەوکەسەیە کەهیچ ڕەئیو بۆچونێکی سەربەخۆی خۆی نیە. بەڵکو شوێن ڕەئی و قسەی هەموو کەس دەکەوێ — بەئاوازی هەمووکەس هەڵدەپەڕێ.)...

وە هەندێکی تر لەزانایان دەفەرمون: (الإمَّعَةُ: هُو الَّذي يَقُولُ لِكُلِّ أَحَدٍ أَنا مَعَكَ). ئەوکەسەیە کەبەهەموو کەسێك دەڵێ، من لەگەڵ تۆم. تۆ چی بی منیش ئەوەم!!.. لەفەرهەنگی بەناوبانگی (لسانُ العرَب)دا، دەفەرموێ: ئیبن مەسعود فەرمویەتی: (كُنّا في الجاهِلِيَّةِ نَعُدُّ الامَّعَةُ الَّذي يَتْبَعُ النَّاسَ إلى الطَعامِ من غَيْرِ أَنْ يُدْعَى، وَإنَّ الإمَّعَةُ فيكُمُ اليَوْم، المُحقِبُ النَّاسِ دينَهُ).

واتە: ئێمە لەسەردەمی نەفامی پێش ئیسلامدا. (ئیممەعە)مان بەکەسێك دەگوت کەشوێن خەڵکی دەکەوت بۆنان خواردنی دەعوەت. بەبێ ئەوەی خاوەن ماڵ و دەعوەتەکە بانگهێشتی ئەمی کردبێ. هەرلەخۆیەوە شوێن ئەوخەڵکە دەعوەتکراوە دەکەوت. بۆکوێ بڕۆیشتنایە، ئەمیش دەچوو. بەبێ ئەوەی بزانێ موناسەبەت چی یە. ماڵی کێ یە. چاکە یان خراپە.. بەڵام ئەمڕۆ لەناو ئێوەدا (ئیممەعە) بەوکەسە دەوترێ کەدینەکەی شوێن هەمووکەس بخات. (المُحْقِب) بەمانای (الَّذي يُقَلِّدُ دينَهُ لِكُلِّ أَحَدٍ) دێت.

ئیمانداری بەڕێز: هەرگیز مەڵێ منیش لەگەڵ ئەوهەموو خەڵکە زۆرەم، منیش وەکو ئەو ملیۆنەها کەسە، بەڵکو سەیری ئەوەبکە. ئەو ڕێگاو ڕێبازەی، ئەو پڕۆژەی ئەو ملیۆنەها خەڵکە لەدەوری کۆبونەتەوە باسی چی دەکات

وئامانجیان چی یەو چیان دەوێت.چونکە ئەگەر بۆخراپەو بێ دینی وخراپەکاری وستەمکاری کۆببونەوە. دەبێ تۆ لێیان دوربی.

زاناو پیاو چاکی بەناوبانگ (فوزەیلی کوڕی عیاض) فەرمویەتی: (إِتَّبِعْ طَرِيقَ الهُدي، ولايَضُرُّكَ قِلَّةُ السَالِكِينَ، وإِيَّاكَ وطُرُقَ الضَّلالَةِ، ولاتَغْتَرَّ بِكَثْرَةِ الهالِكِينَ). (لِسانُ العَرَب ج٢ ص٩٨).

بەڵێ ئیماندارانی بەڕێز، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئێوە ئیممەعە مەبن، بەوەی کەبڵێن: ئەگەر خەڵکی چاکی کرد، ئێمەش چاك دەکەین. ئەگەر خەڵکیش ستەمی کرد، ئێمەش ستەم دەکەین. بەڵکو مەبدەئی بن وبڕیاری خۆتان بدەن بەوەی کە: ئەگەر خەڵکی چاکەیان کرد، ئێوەش چاکە بکەن. ئەگەر خراپەیان کرد، ئێوە ستەم مەکەن وچاو لەخراپەیان مەکەن و وەکو ئەوان مەبن..

بەڵێ هەڵوێست نواندن بەرامبەر بەدین وئیمان بەچەند شێوە دەبێت:

١- وازهێنان لەپلە وپایە، پارە وپوڵ، خۆشیەکانی دونیا، وەهەڵبژاردنی دین و ئیمان. لەکاتێکا ئەگەر پلەوپایە وپارە وپوڵەکەت بویستایە، دەبوایە ئیمانەکەت وازلێ بهێنایە! بەیەکەوە دەگەڕێینەوە بۆخزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ چونکە بەباس کردنی پێغەمبەرو صەحابە، بەرەکەت دەبارێ، دڵ و دین لەسینەدا، دەگەشێتەوە.. لەکاتی هیجرەتدا، کۆمەڵێ صەحابە ڕۆیشتن بەلای هۆزی (موزەنی)دا، کوڕێکی لاو کەتەمەنی (١٦) ساڵان بوو. ناوی (عبدُالعزّی) بوو. مناڵ بوو کەباوکی مردبوو. مامی وەکو نازدارترین مناڵ بەخێوی کردبوو، جل و بەرگی جوان، بۆنی خۆش، دووئەسپ (ئەمڕۆ وەکو بڵێ ی دوو ئوتومبێلی هەبووە). جێگای خەوتنی نەرم و تایبەت، خواردنی خۆش. ڕۆژێکیان لەدەشت ئەسپ سواری دەکرد. ئەو صەحابانەی بینی کەبەدزی یەوە هیجرەت دەکەن. قسەی لەگەڵ کردن و سەری سوڕما لەهەڵوێستی مەردانەیان، کە بۆ ئیسلام وازیان لەهەمووشتێ هێناوە، موسڵمان بوو. فەرموی: قورئانم پێ بڵێن. صەحابەکان ووتیان: ناتوانین بمێنینەوە، چونکە بەشوێنمانەوەن ودەمانگرن، بەڵام تانزیك مەدینە لەگەڵمان وەرە، لەڕێگادا قورئانت بۆ دەخوێنینەوە وباسی ئیسلامت بۆدەکەین. نزیکەی (١٥)کلم لەگەڵیان ڕۆیشت و دووسێ سوڕەتی قورئان فێربوو. ئەمجا گەڕایەوە بەرەو ماڵی خۆیان! بەم شێوەیە توشی دوو، سێ دەستە





لەصەحابەکان بوو کەبەرەو مەدینە کۆچیان دەکردو بەویدا تێدەپەڕین!

هەمووجارێ لەگەڵیان دەڕۆیشت تانزیکی مەدینەو قورئان فێردەبوو. پاشان دەگەڕایەوە بەرەو ماڵەوە. بەم شێوەیە ئەم تازەلاوە، دڵی پڕبوو لەخۆشەویستی خوا وپێغەمبەرەکەی وئاینی ئیسلام وهاوەڵیەتی ئەوصەحابانە. کە بەلاشە مرۆڤ بون، بەڵام بەڕەوشت فریشتە بوون... ماوەی (سێ) ساڵ مایەوە، هەرچاوەڕێ بوو ڕۆژێك دابێ مامی و هۆزەکەی موسڵمان ببن. بەڵام ئەوان هیچ بەلای موسڵمان بوندا نەدەچوون و هەرباسیشیان نەدەکرد. ڕۆژێکیان لەگەڵ مامەیدا دانیشت و زۆر بە ئەدەبەوە موسڵمان بونی خۆی ئاشکرا کردو داوای لەمامیشی کرد کەموسڵمان ببێ و ئەم بەختەوەری دونیاو دواڕۆژە بەدەست بهێنێ. وەئەوەشی بەمامی ڕاگەیاند. کەزۆر موشتاقی بینینی پێغەمبەری خوایە ﷺ، وە بەتەمایە بڕوات بۆمەدینە بۆ خزمەتی. جا ئەگەر مامیشی موسڵمان ببێ و بەیەکەوە بچنە خزمەتی. بەڕاستی جێگای خۆشحاڵی دەبێت.. بەڵام مامی هەرکەئەم قسانەی لەبرازا تازەلاوەکەی گوێ لێبوو. وەکو شێتی لێ هات و هاواری کرد: سوێندبێ، ئەگەر شوێن محمدو ئاینەکەی بکەوی. هەرچی ماڵ و سامانە وخستومەتە بەردەستت و بەئارەزوی خۆت لەسەری ڕادەبوێری، لەدەستت دەری دێنم و تەنانەت ئەوجل و بەرگەی بەریشت لەبەر دادەڕنم!! کاتی هەڵوێست نواندنە، ئەی گەنجی تازە پێگەیشتووی ئیماندار، تۆ هەڵوێستت چی یە؟! بەڕاستی وێستگەیەکی سەختە، بەڵام زۆر بوێرانەو دلێرانە فەرموی: (فأنا والله مُتَبِعٌ مُحَمَّداً، وتاركُ عِبادَه الحَجَر، وهذا مابِيدي فُخُذهُ، فَأَخَذ ماأعْطاهُ حَتّى جَرَّدَهُ من إزارهِ).

واتە: دەی منیش سوێند دەخۆم بە (الله) کەشوێن کەوتەی محمدم ﷺ، وەوازم هێناوە لەبەندایەتی بەردوبت، ئەوەش ماڵ و سامانەکەم ، هەموی بگرە ئەی مامە ، مامیشی هەموو شتێکی لێ وەرگرت تەنانەت جل و بەرگەکەشی لەبەرکردەوە!! ئەم گەنجە بەڕووتی چوەلای دایکی و ئەویش دووپارچە (بجاد) ی دایە. وەکو گوێنی بەنی ئەم سەردەمە وابوە، لەخۆی ئاڵاندو بە تەنها بەڕێ کەوت بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆمەدینە، کەگەیشتە مەدینە، کاتی نوێژی بەیانی بوو. دوای تەوابونی نوێژی بەیانی، پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری ئامادەبوانی ناو مزگەوتەکەی کردو ئەم تازەلاوەی هاتە بەرچاو، کەپێشتر نەیبینیبوو، زانی غەریبە، چوە لایەوەو سەلامی لێ کردو فەرموی: تۆ کێ ی؟!



ووتی:

ئەی پێغەمبەی خوا ﷺ ناوم (عبدُالعزّی) یەو موزەنیم ئەوەحالْ و بەسەرهاتمە! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (أَنْتَ عَبْدُالله ذُو البِجادَيْنِ). اللهُ أكبر، لەو دوو مەدالیای ڕێزلێنانە، کەپێغەمبەری خوا ﷺ بەم تازەلاوەی بەخشی، مەدالیای یەکەم، فەرموی: تۆ لەمەودوا ناوت (عبدُالله)یە ئیتر ڕزگارت بوو لە هەموو بەندایەتیەك. جگە لەبەندایەتی بۆخالیقت کە (الله) یە.

مەدالیای دووەم: نازناوی (ذُوالبجادین)ی پێ بەخشی. فەرموی: مادام لەسەر ئیسلامەتی وموسڵمان بوونت ڕووت کراویەوە، ئەوا ئەوگونیەیەی بەرت، کەدوو پارچەیەو لەخۆتەوە ئالاندوە. شانازیە بۆت وبانازناوت بێ. (خاوەن دووگونیەکە) پاشان فەرموی: ئەی عبدُالله: (أَنْزِلْ مِنِّي قَرِيباً) بەردەوام لێم نزیك بە بەڵێ، عبدُالله قورئانی زۆر لەبەرکرد. بەردەوام زیکری خوای دەکردو لەپێغەمبەر ﷺ دوور نەدەکەوتەوە، شەوانەش لەگەڵ هەژارانی (ئەهلی صوفە) دەژیا لەمزگەوت! (سُبْحانَ الله) لەبەر هەڵبژاردنی ئیسلام بەسەر کوفردا. لەدیوەخان و مەجلیسی دەوڵەمەندانەوە، هاتە لانەی غەریبان وشوێنی هەژاران، شانازیشی پێوە دەکرد. کەبەڕاستی ئەمە هەڵوێست نواندنە.. بەڵێ لەخزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ چوو بۆغەزای تەبووك. لەڕێگادا دەستی لەناودەستی پێغەمبەردا بوو ﷺ. فەرموی: تکایەکم هەیە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ. فەرموی: چیت دەوێ، داوابکە بەسەرچاو. عَبْدُالله ی ذُوالبِجادَيْن فەرموی: (أُدْعُ لِي بالشَّهادَةِ). دوعام بۆبکە خوای گەورە شەهیدیم بەنسیب بکات.

پێغەمبەری خوا ﷺ باسکی گوشی و فەرموی: (اللَهُمَّ إِنِّي أُحَرِّمُ دَمَهُ عَلى الكُفّارِ)، خوای پەروەردگار، من داوات لێ دەکەم. کەخوێنی ئەم گەنجە تازەلاوە بەدەستی کافر نەڕژێ!! عبدُالله فەرموی: (لَيْسَ هذا أَرَدْتُ) بەڵام من مەبەستم ئەوە نەبوو ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ. من حەزدەکەم بەدەستی کافر بکوژرێم و لەپێناوی خوای گەورەدا شەهید ببم! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (إِنَّكَ إذا خَرَجْتَ غازِياً، فَأَخَذَتْكَ الحُمَى، فَقَتَلَتْكَ، فَأَنْتَ شَهِيدٌ. أَوْ وقَصَتْكَ دابَّتُكَ فَأَنْتَ شَهِيدٌ).

واتە: ئەگەر تۆ بەنیەتی غەزا لەماڵەوە چویتە دەرەوە، لەڕێگادا توشی گرانەتا بوی و بەوگرانەتایە مردی، ئەوە تۆ شەهیدی.. چونکە بەنیەتی غەزا وشەهیدبون لەماڵەوە هاتویتە دەرەوە!، وە ئەگەر وڵاخی سواریەکەت بتخاتە خوارەوە وبەوە بمری. ئەوە تۆ هەرشەهیدی، چونکە خوای گەورە تەماشای







نیەتی ناو دڵت دەکات. کەبەچ نیەتێك لەبەرخوا لەماڵ هاتویتە دەرەوە، گرنگ ئەوەیە تۆ هەڵوێستت هەبێ، بەڵام گەیشتنە (تەبوك) وپێغەمبەری خواو صەحابەکان چەند ڕۆژێك مانەوە. ئەوەبوو عبدُالله نەخۆش کەوت ولەوێ وەفاتی کرد!..

وە بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین: شەهید بوو. چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ وای فەرموو صەحابی پایەبەرز (عبدُاللەی کوڕی مەسعود) دەفەرموێ:

شەوێکی زۆرساردو سەرمابوو. خەوتبوم. نیوەشەو بوو. گوێم لەدەنگی پاچ و خاکە نازبوو. کەخەڵکانێك خەریکی چاڵ هەڵکەندنێك بوون. کەچوم تەماشام کرد پێغەمبەری خواو أبوبکرو عومەر بوون. پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەستی خۆی قەبری بۆ هەڵکەندو أبوبکرو عومەریش هاوکاریان دەکرد. کاتێ کەقەبرەکە تەواو بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئەی ئەبوبەکروعومەر: (أُدْنيا إِلَيَّ أخاكُما). براکەتانم بۆ شۆڕبکەنە ناوگۆڕەکەوە.

ئەوانیش هەڵیان گرت وخستیانە ناو گۆڕەکەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ باوەشی بۆگرتەوەو لە قەبرەکەیدا رایکێشاو چاوی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و فەرموی:

(اللَّهُمَّ إِنِّي قَدْ أَمْسَيْتُ راضِياً عَنْهُ، فَارْضَ عَنْهُ). خوایەگیان بەڕاستی من لەم گەنجە تازەپێگەیشتوە ڕازیم، خوایەگیان تۆش لێ ی ڕازی بە....

عبدُالله ی کوڕی مەسعود دەفەرموێ: لەوکاتەدا تەمەنی عبدُاللەی ذی البجادَین (٢٣) ساڵ بوو. واتە: بەهەموی (٧) ساڵ بوو موسڵمان ببوو. سێ ساڵ بەنهێنی و چوار ساڵیش لەخزمەتی پێغەمبەردا ﷺ بوو. بەڵام من (١٣) ساڵ لەپێش ئەودا موسڵمان بو بووم، وەتەواوی ئەو (١٣) ساڵە لە پێغەمبەری خوا ﷺ دانەبڕابوم بەڵام لەسەر ئەوقەبرە خۆزگەم خواست وگوتم: (ياليْتَني كُنْتُ صاحِبَ الحُفْرَةِ). ئای خۆزگایە من خاوەنی ئەو گۆڕە بومایەو لەشوێنی (عبدُاللەی ذوُ البجادَین) بومایە!!...

تەماشاکەن موسڵمانان، بەهەڵوێست بوون. چۆن مرۆڤ پێش دەخات. بە (٧) ساڵ لەموسڵمانیەتی ناوابوو بەخۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ، بەهۆی ئەو هەڵوێستە جوامێرانەی کە: هەموو دونیای بە قوربانی دینەکەی دەکرد. دەبا بیربکەینەوە، ئایا ئێمە کەهەمانە (٥٠) ساڵە موسڵمانە. هیچ هەڵوێستێکمان هەبووە بۆ دینەکەمان.

کەواتە: تەمەنی درێژ، بەڵام هەردووبارەی یەك شەو ورۆژ هیچ نیە. بەڵام تەمەنی کەم، بەڵام بە هەڵوێست ژیان، بەنرخ و زۆر دەبێ... ئاگاشت لێ بێ، نەڵێ ی ئاخر ئەوە زەمانی پێغەمبەربووە، نەخێر. مادام تۆ ئیمانداری مادام قورئان و حەدیسەکەو شەرعەکە، هەرهەیە. هەرزەمانی پێغەمبەرە ﷺ. وەقورئان کەباسی حەزرەتی یوسفمان بۆدەگێڕێتەوە، یەکێ لەوانە هەرە گەورەکانی ئەوەیەکە: ئیماندار هەرچەندە لەژینگەی بێ دینی وناوبێ دیناندا بژی، دەبێ ئەوەندە مەبدەئی و بەهەڵوێست بێ، نەك تەئسیری تێ نەکرێ.

بەڵکو تەئسیرو کاریگەریشی هەبێ لەسەر خەڵکی بێ دین، حەزرەتی یوسف لەماڵی عەزیزی میصردایە، جوانترین ئافرەتی لەگەڵە. زولەیخا ڕەمزی جوانی ئافرەتە، ئافرەتەکە بەو هەموو جوانیەوە خۆی داوای خراپەکاری لێ دەکات. کەس لەماڵەوە نی یە، هەموو دەرگاکان داخراون، حەزرەتی یوسف، گەنجێکی غەریبەیەو عەیبەی لێ دیارنی یە، کەچی نەك هەر تەسلیم نابێ بەو داوا خراپەکاریەی زولەیخا، بەڵکو ئامۆژگاری زولەیخاش دەکات و دەفەرموێ: (قال: معاذَ الله). ئاخر خوای گەورە چاوی لێمانە، ئەی ناوقەبرەکە. ئەی قیامەتەکە!! ئەی تاوانی نمەك بەحەرامی؟!!.. بەڵێ بەپاکی لەم ژینگەو لەم ماڵە پیسە دەرچوو. بەڵام لەم ژینگەیە گواسترایەوە بۆ ژینگەیەکی گەلێ بۆگەن تروخراپتر. کەژینگەی ناو سجن وبەندی خانە بوو، لەناو تاوانباران ولەڕێ دەرچوان و ڕێگران و دزان وکافرانی دڵ ڕەق. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دووبارە، کاریگەری هەبوو. نەك کاریگەری بکرێتە سەر. بەردەوام بانگەوازی دەکرد بۆلای خوا، وە بانگەوازەکەشی بەرهەمی هەبوو.



ئیمانداری بەڕێز: توخوا حەیف نیە. کافر بەوبەتاڵی خۆیەوە، کاریگەری لەسەر تۆ هەبێت وتەئسیرت تێ بکات. کەچی تۆی ئیماندار بەوحەقەی خۆتەوە، کەپەیامی خوایە وخوات لەپشتە، تەئسیر وکاریگەرت بۆسەر باطڵ نەبێت.. خوای گەورە خۆی فەرمویەتی: ﴿ ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخۡرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِۗ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ البقرة: ٢٥٧.

ئیمانداران: لەدنیادا، هەروڵاتێك بەشتێك ناسراوەتەوە، بۆنموونە:



یۆنان: به وڵاتی فەیلەسوفان.
هیندستان: وڵاتی حەفتاودوو میللەت.
ئەفریقای باشوور: وڵاتی پەلکەزێڕینە. چونکە ساڵی یەك جار پەلکەزێڕینەی تێدا دەردەکەوێت.
میصر: بەوڵاتی فیرعەونەکان ناسراوە.
سوید: بەوڵاتی بەهەشتی ئەوروپا ناسراوە.
فنلەندا: بەوڵاتی هەزار دەریاچە ناسراوە.
عێراق: جاران بەوڵاتی دوو ڕووبارەکە ناسرابوو. بەڵام عێراق ئەمڕۆ، کە بەداخەوە بەڵایەکەی کوردستانیشی گرتۆتەوە بە:
پارەی علوج، سەیارەی علوج، شەهادەی علوج، مەسئولی علوج، نەجمە وتاجی علوج، ئینسانی علوج (مرۆڤی علوج مەبەستمان لەو ڕاپۆرتنوسانەیە کەدوێنێ ڕاپۆرت نوسی بەعس بوون، ئەمڕۆ ڕاپۆرتنوسی ئەم دەسەڵاتەیە)!.
دەی باهیچ نەبێ، لەناو ئەو هەموو علوجەدا ، ووریای خۆمان بین ، دینەکەمان علوج نەبێ ، چونکە دینداری علوج ئەوەیە: ئەمڕۆ دەیکات، سبەینێ وازی لێ دێنێ. ئەمڕۆ لەچکی بەسەرەوەیە، سبەینێ فڕێ ی دەدات. بەشوێن قسەی خێردا ناگەڕێ لەجومعەی کورتی چەند دەقیقەیی دەگەڕێ. تازوو لەمزگەوت بێتەدەرەوە!!
بەڕێزان: سوپاس بۆخوای گەورە. لوطفی خوا وایە لەگەڵمان، کەئێمەی میللەتی کورد، لەوەتەی ئاینی ئیسلاممان قبوڵ کردوە. موسڵمانی بەحەق بوین، شاعیری گەورەی کورد (شاهۆ) فەرمویەتی:
ناچنە سەردینی مولحید، کورد موسڵمانن هەموو.
خاوەنی ئاینی پاك ودین وئیمانن هەموو.
گەر لەسەد نیوەی بکەونە شوێنی بیری لارو چەوت.
خۆنەوانەی کەی موتیعی حوکمی قورئانن هەموو..
خۆ بەعەبدی خوا دەزانن، ئوممەتی فەخری ئەنام.
موخلیسی پێغەمبەران وئەنبیایانن هەموو.
چاکترینی ئومەتن، ئەمڕۆ لەگەڵ ئیسلامی ڕاس.
موئمینێکی ڕێك وڕاستی، زاتی یەزدانن هەموو...

لەکۆتایی دا، ڕوو لەخوشکانی خاوەن حەیاوحورمەت دەکەین ودەڵێین: بەهەڵوێست بن و ئەو لەچکەو حیجابەی کەلەڕەمەزاندا پۆشیتان لەبەرفەرمانی خوای پەروەردگار بوو. دەی کەڕەمەزان تەواو بوو، خۆ پەروەردگار هەرماوە. ئێوەش بەردەوام بن لەسەر خۆداپۆشین ولەبەرکردنی جل وبەرگی موسڵمانانە.
شاعیر پێتان دەڵێ:

ئەی ئەوانەی بەرگی ڕێزتان کردە بەر
ئێوە ئازادن بەڕاستیش بەختەوەر.
ئێوە جێ ی ڕێزی خودا وپێغەمبەرن.
ئێوە فێرگەی کۆمەڵن، هەق پەروەرن.
ئێوە ڕێبواری ڕێبازێکن کەوا
هەربەتەنها ئەو ڕەوایە، ئەو ڕەوا.
تالەسەر ئەم ڕێ یە بن ڕوو سور دەبن.
قەت نەکەن ئەم ڕێ یە بەردەن، تاهەبن.
خوشکەکانم بەرزە پایە وجێگەتان.
دڕك وداڵ وداوی زۆرە ڕێگەتان..

خوشکینە گوێ بگرن لەخوشکانی خۆ .... ئیسلامە بۆ ئازادی خۆری ئاسۆ.
گوێ مەگرن لەدەهۆڵ وهاش وهووش .... هەڵگرانی بەنێو ئازادی ئەمرۆ

ئیمانداران: جارێکی تر فەرمودەکەی پێغەمبەری سەروەرتان بەبیردێنمەوە کە فەرموی: (لاتكونوا إمعة).خەڵك چی دەکا منیش وەکو ئەو خەڵکە. نەخێر، بەڵکو بە بەرچاو ڕوونیەوە بڕیاربدە، مەبدەئی بە، تەنها ڕەزامەندی خوات بەلاوە گرنگ بێ و بەس. چونکە دڵنیابە:
ئەگەر بۆخوا بژی و بۆئەو بێ بوونت.
بەپێ ی شەرعی خودا بێت هات وچونت.
مسۆگەر بەختەوەر خۆتی کەوابێ.
بـامەرگ و ژینت لـەپێنـاوی خوادابێ.

وە بەدڵنیایشەوە، هەرکەسێ بیەوێ بەشێوەیەك بژی، کەهەموو خەڵکی





بەچاك و خراپەوە لێ ی ڕازی بن. ئەوە دڵنیابە زیانت لێ دەبێ بەژان و هەرگیز هەموو ئەوخەڵکەشت لێ ڕازی نابن، بەداخەوە ئەمڕۆ زۆرکەس هەیە بۆخۆی نازی. بۆ خەڵك دەژی، جل و بەرگی خۆی وکوڕ وکچی، کەلوپەلی ماڵی، نەخشەی خانووی، گرنگ دڵی خۆی نیە. بەڵکو گرنگ ئەوەیە بەلایەوەکە: خەڵك بەدڵی بێ ومۆدی بێ!! کەئەمەش ڕێکورەوان – (الإمعةْ) بوونە، کەپێشەواو پێغەمبەرمان، حەزرەتی محمد ﷺ فەرموی: وامەبن..


**سەرچاوەکان**

١- نَظْرَةُ النَعيم في مَكارِمِ أَخْلاقِ الرَّسُول الكريم ، مجموعَة مِنَ العُلَماء، ج٩، ص٣٩٩٥.
٢- أَصْحاب الرَّسُول ﷺ، محمود المصري، ج٢، ص٥٠٢.
٣- قِصَّةُ الالْتِزام ، محمد حسين يعقوب ، ص٣٦١.
٤- بڵاوکراوەی نوێکار، ژمارە: ٣، لە ١/٢/ ٢٠٠٨، ل٨.
٥- شعرەکانی شاعیر، وەرزێر پشدەری، کە لەکتێبی (گوڵبژێر)، وەرگیراون لە لاپەڕەکانی: ل١٥٦، ل١٥٤، ل١٥٣، ل١٥٥، ل١٧١..

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، والصَّلاةُ والسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ و عَلى ﺁلِهِ وصَحْبِهِ أجْمَعِين.

ئيماندارانی بەڕێز: ئاینی ئیسلام هەموو شتێکی بۆ باس کردوین، کەیەکێ لەلایەنە گرنگەکانی ئیسلام ئابوری یە. بۆ زیاتر ڕون کردنەوەی باسەکەمان دەچینە خزمەت ئیمامی حەسەنی کوڕی ئیمامی عەلی، کچەزاو ڕەیحانە بۆنخۆشەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ. کەپێغەمبەری خوا ﷺ بەحەسەن وحوسەینی برای دەفەرموو: (هُما ريحانتاي مِنَ الدُّنيا) ئەم دوو کوڕە ڕەیحانە بۆنخۆشەکانی منن لەدنیادا. ومدەیفەرموو: (الحَسَنُ والحُسَيْن، سَيِّدا شَبابُ أَهْلِ الجَنَّةِ). حەسەن و حوسەین گەورەی گەنجانی بەهەشتن..

دەی ئیمانداران: بابزانین پێغەمبەری خۆشەویستمان چ وەصیەتێك وئامۆژگاریەك پێشکەش بەم جگەر گۆشەی خۆی دەکات. کەئەوەندەی خۆشدەویست، کاتێ کەلەگەڵ حوسەینی برای لەناو منالاٌندا هاتنەوەو فەرمویان: منالاٌنمان بینی سواری بەچکە حوشتر ببوون. باوکیان سواریان کردبون. ئێمەش بەچکە حوشترمان دەوێت، پێغەمبەری خوا ﷺ لەوکاتەدا هیچ بەچکە حوشتری نەبوو. پارەشی نەبوو بۆیان بکرێت. ئەوەندەشی خۆشدەویستن، بۆئەوەی دڵیان نەشکێ وحەز وئارەزوەکەیان جێ بەجێ ببێ. خۆی بۆخستنەسەر دەست وئەژنۆو فەرموی: وەرنە سەرپشتم بەژوەرەکەیدا دەیسوڕاندنەوە ودەیفەرموو: (نِعْمَ الجَمَلُ جَمَلُكُما، ونِعْمَ العَدْلانِ أَنْتُما). ئای حوشترەکەتان باشترین حوشترە وباشترین سوارچاکیش، ئێوەن!!... جابێگومان کەسێك کەسێکی ئاوا خۆش بوێت، بێگومان بەنرخترین ئامۆژگاری پێشکەش دەکات. دەبا ئێمەش گوێ ی بۆ بگرین.



فەرموی: ئەی حەسەن. ڕۆڵەگیان، (دَعْ مايَريبُكَ إلى مالا يَريبُكَ). رَواهُ التِرْمِذي والنَّسائي، وقالَ التَرمذي، حَديْثٌ صَحيح.

واتە: واز لەوەبێنە کە گومانی تێدایەو بچۆ بۆلای ئەوەی کەهیچ گومانی تێدا نی یە.. زانای بەناوبانگ (إبنُ حَجَر الهَيْتَمى) لەشەرحی ئەم فەرمودەیەدا دەفەرموێ: (هذا الحَديْث قاعِدَةٌ عَظيمَةٌ من قَواعِدِ الدِّينِ، وأَصْلٌ في الورْعِ الَّذي عَلَيْهِ مَدارُ المُتَّقينَ، ومُنجٍ من ظُلَمِ الشُّكوُكِ والَاوْهامِ، المانِعَةِ من نُورِ اليَقينِ)..

بەڵێ (إبنُ حجر) فەرمویەتی: ئەم فەرمودەیە، بناغەیەکی گەورەیە لەبناغەکانی ئاین وەبنەمایە لەوەرع وخواپارێزیدا، کەپیاوچاکان و خواناسان لەسەری دەژین. وە ڕزگارکەرە لەستەمی گومان و دودڵی کەدەبنە ڕێگر لەنوری

یەقین بۆ دڵی ئیماندار..

بەڵێ، ئەمە هەڵوێستی موسڵمانە کەبەکردەوە نیشانی دەدات چۆن خۆپارێزە. چەند نموونەیەك لەهەڵوێستی پیاوچاکان و وەرعیان:

١- (یەزیدی کوڕی زەریع)، کاتێ باوکی مرد ومیراتەکەی دابەشکرا، یەزید (٥٠٠) هەزاری بەرکەوت. کەنزیکەی (٥٠) دەفتەر دۆلاری ئەمڕۆ دەکات! بەڵام وەری نەگرت وڕەتی کردەوە! بۆچی؟! چونکە باوکی یارمەتیدەری کاربەدەستان بوە وکاربەدەستی میری بوە ولەپاشاو دەسەڵاتدارانەوە نزیك بوەو هاوکاری کردون!

٢- (مەسوری کوڕی مەخرەمە) گەنم وجۆ ودانەوێڵەی زۆری کڕی بوو. عەمبارەکانی لێ پڕکردبوون. خەڵکی وایان گومان دەبرد کەساڵێکی ووشك دەبێ، بەڵێ پایزێکی درەنگ بوو، باران لەوەختی (پەڵە) زۆر دواکەوتبوو. دەغل ودان زۆر نرخی بەرزببۆوە، ڕۆژێکیان هەور بەری ئاسمانی گرت وهەموو خەڵکی دڵخۆشبوون و داوایان دەکرد لەخوای گەورە کەبارانیان بۆ ببارێنێ ودەرگای ڕەحمەتیان لێ بکاتەوەو لەووشکە ساڵی وقات و قڕی ڕزگاریان بکات..

بەڵام لەوکاتەدا کەخەڵکی ئاوا دڵخۆش بوون. ئەم (مەسوری کوڕی مەخرەمە) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێ: لەوکاتەدا کەخەڵکی ئاوا دڵیان خۆش بوو. من دڵتەنگیم بەسەردا هات وحەزم نەدەکرد بباری، بۆئەوەی نرخی دانەوێڵە دانەبەزێ! دەفەرموێ: دەست بەجێ بەئاگا هاتمەوە وبەنەفسی خۆمم ووت: (ألا أراني كَرِهْتَ مايَنفَعُ المُسْلِمِينَ). ئەی نەفسی بەدخوو، ئەوە چی یە. دەبینم کەڕقت لەشتێکە کەخێر وبەرەکەت وسودی موسڵمانانی تێدایە! بۆیە بۆئەوەی لەم تاوانەی کەبەدڵیا هاتوە (کەبەخۆشحاڵی وسودمەند بوونی موسڵمانان دڵتەنگ بوە

بۆئەوەی لەم تاوانەی دڵی ڕزگاری ببێ، بڕیار دەدات. کەئەو دانەوێڵەیە کەنرخی زۆربەرزە، بەونرخەی کەکاتی خۆی لەکاتی خەرماناندا پێ ی کڕیوە، بیفرۆشێ بەموسڵمانان و هیچ قازانجێکی لێ نەکات!! بەڵێ مەخزەنی شکاند وگەنمی بەهەرزان، بەنرخی کاتی خەلە وخەرمان بەخەڵکی فرۆشت. کەکەس چاوەڕێ ی ئەوەی نەدەکرد بەونیوە قیمەتە، گەنمی دەست بکەوێ. حەزرەتی عومەری کوڕی خەطاب لێ ی پرسی: ئەوە چۆنیە وابەهەرزان فرۆشتت وهیچ قازانجت نەخستەسەر؟! ئەویش باسەکەی بۆگێڕایەوە. حەزرەتی عومەر



فەرموی: (جَزاكَ اللهُ خَيْراً) دەی خوای گەورە پاداشتت بداتەوە، خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ماڵتەوە، خوای گەورە ئەودڵە پاکەت هەروا بەپاکی بێڵێتەوە وهەرگیز گەرد نەگرێ. بەڵێ دەبێ کاربەدەست ئاوا دەست خۆشی وئافەرین لەحەلاڵ خۆرو دەرون پاك بکات. دەست خۆشی لەبازرگان و دوکانداری هەرزان فرۆش بکات وهانیان بدات وپشتیوانیان لێ بکات، نەك پشتیوانی لەگران فرۆش و فۆرغ کاری بازاڕ بکرێ. بەڵێ ئەم هەڵوێستە نیشانەی ساغی ئیمانە، کەچی بەداخەوە چەند کەس هەیە کەبەردەوام چاوەڕێ ی بیستنی قسەیەکە، جاڕاست بێ یان درۆ، کەبۆنی وەزعێکی نائارامی لێ دێ، هەرخێرا شتەکانی دەشارێتەوە، یان چەند ڤات گرانی دەکات. کەدەکەوێتە قسە وباسی دینداری خۆی دەکات، دەڵێ ی لەم پیاو باشەو حەیفە تائێستا من نەمناسیوە!...

بەڕێزان: پیاوچاکان هەرگیز خراپەیان پێوە نەهاتوەو هەرزوو ئاگادار کراونەتەوە. سەهلی کوڕی عبدُالله، کەیەکێکە لەزانایانی ئیسلام، لەسەردەمی خوێندنی دا، چو بۆ عێراق بۆ زانستی خوێندنی شەرعی لەبەغداد. ژورێکی بەکرێ گرت. ژورێکی قوڕی چوار دیواری تەسك وتەنگ. ڕۆژێکیان کابرایەکی خزمی چوەلای و پێ ی ووت: دەگەڕێمەوە بۆناو خزمان و دەتەوێ نامەیەك، پەیامێکت بۆ بگەیەنم؟! سەهل فەرموی: بەڵێ دەمەوێ نامەیەك بۆدایکم بنوسم. لەگەڵ خۆت بیبەوە، بەڵێ نامەکەی نوسی جامەرەکەبی ئەوسەردەمە زۆری دەویست هەتا ووشك دەبۆوە. بۆیە ناچاربوو هەندێك خۆڵی ووشکی لەخانوەکەی، لەو ژورەی کەبەکرێ ی گرتبوو. لەدیوارەکە کردەوە وبەسەر نامەکەیدا کرد بۆئەوەی ووشك ببێتەوە، ئەوجا پێچایەوە ودایە دەستی خزمەکەی. بۆشەوەکەی سەهل لەخەودا بەخزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دەگات، پێغەمبەری خوا ﷺ پێ ی دەفەرموێ: ئەی سەهل ئەم شیرە پاکە هەڵگرە ومشتێ خۆڵ وگڵی تێبکە وبیان خۆرەوە!! سەهل عەرزی کرد: ئەی خۆشەویست ﷺ چۆن شیر گڵ وخۆڵی تێ بکەی دەخورێتەوە؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئەی تۆش چۆن چاکەکانت تێکەڵ بەخراپە دەکەی، چۆن دەبێ خۆڵی ئەم خانووە کەبەکرێت گرتووە، بەبێ پرسی خاوەنەکەی بیخەیتەسەر کاغەزەکەت. ئەی چی وەڵامی خاوەن خانووەکە دەدەیتەوە لەقیامەتدا؟!!....

ئیمانداران: ئێمە کەوتوینەتە زەمانێکەوە، کاتێ کەئەم بەسەرهاتانە دەبیستین زۆربەلامانەوە سەیرن. وادەزانین چیرۆکی خەیاڵین. هەرچەندە

خەڵکی واریعیشمان (الحَمْدُلِلّه) هێشتا زۆره. بەڵام چونکه کەمن، بەبینینی ئەم ڕووداوانه موعجەب دەبین.

بەڵام ئەم واعیه کەی دروست دەبێ؟ کاتێ دروست دەبێ لەمرۆڤدا، کەلەشته گەورەکاندا خۆی لەحەرام پاراستبێ. ئەمجا خۆی بۆلەشته بچوکەکان دەپارێزرێ و واریع دەبێ. بەڵام تۆ ئەونانەی لەماڵەکەتدا دەیخۆی حەرام بێ، کوا کەچویته باخی کەسێکەوه وەرعت بۆدەکرێ؟! ئەگەر پارەی دەستمایەی دوکانەکەت حەڵاڵ بوو، ئەمجا وەرعت بۆدەکرێ لەکڕین و فرۆشتندا. خۆ ئەگەر خۆشت بەواریع بزانی ئەوه هەرڕیا وبەرچاوی خەڵکه. هەروەکو ئەوبەسەرهاتەی کەدەڵێن: کابرایەکی خەڵکی عێراقی پرسیاری له (عبداللەی کوڕی عومەر) کرد لەبارەی خوێنی مێشولەوه. ئایا نوێژی پێومیه یان نا؟! ئیبن عومەر فەرموی: لەبارەی خوێنی مێشولەوه پرسیارم لێ دەکەن وحوسەینیش دەکوژن؟!

یان جارێکیان، پیاوێك پرسیاری له (بیشری کوڕی حاریث) کرد، دەربارەی پیاوێك کەخێزانی هەیه، هاوسەری ژیانی هەیەو دایکیشی هەیه. لەماڵەوه بەیەکەوه دەژین، بەڵام هاوسەرەکەی هیچ خراپەیەکی لەبواری بیروباوەڕو ڕەوشتدا نیه.

بەڵام لەگەڵ دایکی کوڕەکەدا ناگونجێن و ئەودەڵێ سیرو ئەم دەڵێ پیاز. ئەم دایکه داوا لەکوڕەکەی دەکات کەژنەکەی تەڵاق بدات. ئایا ئەم کوڕه بەقسەی دایکی بکات و ژنەکەی تەڵاق بدات، یان بێ گوێی دایکی بکات و ژنەکەی تەڵاق نەدات؟! بیشر فەرموی: (إنْ كانَ بَرَّ أُمِّه في كُلِ شَيءٍ، ولَمْ يَبْقَ من بِرِّها إلا طَلاقَ زَوْجَتِهِ فَلْيَفْعَل، وإنْ كانَ يَبَرُّها بِطَلاقِ زَوْجَتِهِ ثُمَ يَقُومُ بَعْدَ ذلك إلى أُمِّهِ، فَيَضْرِبَها فَلا يَفْعَل). واته: ئەگەر ئەم کوڕه لەهەموو شتێکی ژیانیا گوێڕایەڵی دایکیەتی و بەبێ ئەو پەنجه ناکات بەناودا. تەنها ئەوەندەی ماوه کەبەقسەی دایکی ژنەکەی تەڵاق بدات. ئەوه بالەمەشیاندا بەقسەی دایکی بکات وژنەکەی تەڵاق بدات. بەڵام ئەگەر بەقسەی دایکی ژنەکەی تەڵاق دا، بەڵام دوای ئەوه گەڕایەوه بۆلای دایکی ودەستی کرد بەقسەپێوتن و لێدانی، ئەوا بالەمەشیاندا بەقسەی دایکی نەکات و ژنەکەی تەڵاق نەدات.

ئیمانداران: ئەومناڵەی کەپارەیەکی زۆر دەدۆزێتەوەو بەشوێن خاوەنەکەیدا دەگەڕێت تابیداتەوه. بەدڵنیاییەوه لەماڵێکدا پەروەردە کراوه کەدەزانێ حەڵاڵ و حەرام چی یه. بەڵام باوکێك لەبەرچاوی مناڵه پاکەکەیدا، باسی ئەومبکات





چۆن قۆلّی خەلّکی بڕی وپاشان پێبکەنیّ، یان بلّیّ: حەلاّلّ وحەرامی چی. گرنگ ئەوەیە پارەت هەبیّ، ئەوە مەگەر خوای گەورە بەڕەحمی خۆی ئەم منالّە ڕزگاربکات. ئەینا ئەویش هەرجەوالّ دڕ دەردەچێت. ئایا ئەمەش چی دروستی دەکات؟ چی وا لەمرۆڤ دەکات کەدووشتی دروست ونادروست حەلاّلّ وحەرام، لەیەکترجیابکاتەوە. دووشتە:

١- حوکم و فەرمانڕەوایی سولّتەو دەسەلاّت، وەکو ئەوروپا، کەکامێرای شاراوەی لەهەموو جێگایەك هەیەو دزی ئاشکرا دەکات. وەکەبەتاوانەوە گیرا، یاسا حوکمی خۆی بەسەردا جیّ بەجیّ دەکات وناپرسیّ کوڕی کیّ یە، دەولّەمەندە یان هەژارە..

٢- هەستکردن بەچاودێری خوایی، بەلێپرسینەوەی قیامەت، بەوەی کە (مثقال ذَرَّة) دەنوسریّ، کەئەمە هۆکاری ئەوەیە هاولاّتی صالّح وپاك بیّ لە ولاّتدا لەولاّتی موسلّماناندا، چونکە لێرە هاولاّتی ترسێکی وای لەدەسەلاّت نی یە کەسزای بدات.. یان هاولاّتی لای ئێمە پارەو ئالّتونی زۆر دەکەوێتە بەردەستی، بەهۆی دۆزینەوەوە. کەچی لەجیاتی بیخوات. خۆی ماندوو دەکات بەشوێنیدا دەگەڕیّ تالەڕێگەی ڕادیۆ ورۆژنامەوە، خاوەنەکەی دەدۆزێتەوە، هەرلەهەمان شارو ولاّت وگەڕەکەشدا، هەمان هاوزمان گیرفانی خەلّك دەبڕیّ. ئایا سڕەکەو نهێنیەکە لەچی دایە؟! تەنها مەسەلە بڕوابوون بەخواو قیامەتە.

کەواتە: هەرکەسیّ ئەیەویّ کۆمەلّگای کوردی ئەمن و ئەمان بیّ وهەمووکەس لەمالّ وسامانی خۆی دلّنیابیّ، باداوا بکات کەئیسلام ببێتە سەرچاوەی دەستوور لەولاّتدا. بالاّوەکانی بنێریّ بۆ مزگەوت. باخۆی لەسەر ئیسلام پەروەردە بکات. با داوا بکات ئەوشوێنانەی بیّ دینیان تێدا دەکریّ دابخرێن.. وەدلّنیاشبن هەرکەسیّ دژایەتی خوا وپێغەمبەری خوا ﷺ وقورئان بکات وبلّیّ: قیامەت و زیندوبونەوە نیەو حیساب و لێپرسینەوەیەك لەگۆڕێدا نی یە. ئەوە دەیەویّ لەناوی لێلّدا ڕاوبکات و دزێکی زۆرزانە. وەکە ناوی لەخۆی ناوە سیاسی و ڕۆشنبیرو لەژێر ئەوناوە بەرزانەدا خۆی حەشارداوە، بۆ ئەوەیەتی کەمەرامەکانی خۆی بێنێتەدی..

وەهەندیّ جار ئەم جۆرە کەسانە بۆئەوەی لەبەرچاوی میللەتدا، خۆیان بەواریع وپاك نیشان بدەن، دزێکی بچکۆلە دەگرن ونەقلّ وفەصلی دەکەن. ئەوەی بەکیلۆ دەدزیّ دەگیریّ. بەلاّم ئەوەی کەبە (تەن) دەدزیّ موکافەئە دەکریّ!! خۆ

بەچاك نیشاندانی ئەوبێ دینانە، وەكو بەسەرهاتی پاشاكەی (مەغریب) وایە كەدەگێرنەوە: پاشای وڵاتی مەغریب بۆ دەرخستنی شان وشكۆو هێزو قوەتی خۆی، ساڵانە ڕۆژێك لەگەڵ سەدان كەس لەدارو دەستەكەی بەجل و بەرگی ئاوریشم وشمشێری ئاڵتون و عەبای زێڕ كفت كراو بەئاڵتون، بەشاردا دەگەڕا. جارێكیان ڕێ ی كەوتەبەردەم ماڵی عالمێكی دینی گەورەی شارەكە، كەبەوە بەناوبانگ بوو، قسەی حەقی لەشوێنی خۆی دا دەكرد.. مامۆستا لەمزگەوتەوە بەرەوماڵ دەڕۆیشتەوە، كەپاشا چاوی بەم زانایە كەوت. ترسی لێ نیشت ولەرزی، بەڵێ، هەموو خەڵك لەپاشا دەترسا. پاشاش لەعالمەكە دەترسا، چونكە عالمەكە بەحەق لەخوا دەترساو لەبەرخاتری ڕەزامەندی خوا، چی حەق بوایە دەیگوت!! پاشا كەمامۆستای بینی. لەوڵاخەكەی دابەزی وچووە بەردەم مامۆستاو سەلامی لێ كردو وویستی پێش ئەوەی ئەوقسەیەكی موستەحەقی پێ بڵێ، ئەم دەست پێشكەری بكات. ووتی: جەنابی مامۆستا، خۆت دەزانی كە وڵاتانی دراوسێمان چاودێریمان دەكەن و وەفد دەنێرن بۆلامان وجاسوسیان لەوڵاتماندا هەیە ئایا ئەگەر بۆسام و هەیبەتی وڵاتەكەمان، ئەم جۆرە ئۆپەراسیۆنانە ڕێك بخەین، تاپاشاكانیان بەهەژارمان نەزانن و بێ حورمەت سەیرمان نەكەن.

ئەگەر ئەم جۆرە شمشێرە ئاڵتونیانە هەڵگرین و ئەم بەرگە ئاوریشمە بپۆشین، ئایا حەڵاڵە یان حەرامە بۆمان؟! مامۆستاكە زەردەخەنەیەكی پڕمانای بۆكرد وتۆزێك تێ ی ڕاما!! پاشا ووتی: قوربان خۆپرسیارەكەم بێ ئەدەبی نەبوو؟! زاناكە فەرموی: بۆیە بەپرسیارەكەت پێكەنیم، چونكە وەكو ئەوسەگەم دێتە بەرچاو كەهەموو لەشی میكرۆب وگلاویە، كەچی كەمیز دەكات قاچەكانی بەشتێكەوە هەڵدەنێ، بەحیسابی خۆی تاوەكو پیس نەبێ!! ئەی پاشا تۆش سەیرێكی حاڵی ئەوخەڵكە بكە، هەزاران كەس بەنەمری و نەژی دەژی، سەدان ماڵ خانووی نی یە. هەزاران نەخۆش بێ دكتۆر ودەرمانە. كاربەدەستەكانت لەبەرتیل وبەرتیل كاری ناوەراستن، كەس وەڵامی هەژارو بێ دەسەڵات ناداتەوە. تازە تۆ لەحەڵاڵ وحەرامی بەرگە ئاوریشمەكەت دەپرسی، تۆ بڕۆ جارێ ئەوانە چاك بكە، ئەمجا لەمانە بپرسە!!..

بەڕێزان: كەسانێكیش هەن، بەهۆی هەڵە حاڵی بونیانەوە لەشەرع وادەزانن خۆپاراستن لەشك وگومان، كەپێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (دَعْ مايُريبُكَ إلى مالا يُريبُكَ) خۆیان توشی وەسوەسە كردوە.





بۆنموونە: دەست نوێژەکەی عەیبی نیەو کەچی وادەزانێ دەست نوێژی شکاوە. بەڵام قاعیدەیەکی شەرعی هەیە کەدەفەرموێ: (اليَقينُ لايَزُولُ بالشَّكِ).

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (إذا وجَدَ أَحَدُكُمْ في بَطْنِهِ شَيْئاً، فَأَشْكَلَ عَلَيْهِ أَخْرَجَ أَمْ لا، فَلا يخرجَنَّ مِنَ المَسْجِدِ حَتّي يَسْمَعَ صَوْتاً أَوْ يَجِدَ رِيحاً). رَواهُ مُسْلِمٌ..

واتە: ئەگەر یەکێك لەئێوە هەستی کرد شتێك لەناو سکیایەتی وهەوایەك هەیە. بەڵام کەوتە گومانەوە کەئایا دەبێ ئەوهەوایە لەسکی هاتبێتە دەرەوە یان نا. ئەوە با لەمزگەوتەکە نەچێتە دەرەوەو دەست نوێژ نەشواتەوە، هەتا گوێ ی لەدەنگێك نەبێ یان بۆنێك نەکات..

ئیمانداران: ئێمە باسی خۆپاراستنمان کرد لەشتە گوماناویەکان، پێویستە باسی ئەوەبکەین کەیەکێ لەوشتانەی کەئەمرۆ موسڵمانان پێویستە هەڵوێستەی لەسەر بکەن، بریتی یە لەمەسەلەی (ڕیبا). کەئەمرۆ چەندین ناو دۆزراوەتەوە، هەریەکەی بەناوێکەوە. بەڵام هەموشی ڕیبایە. جابابزانین ڕیبا چی یە؟! ڕیبا هەرقەرزێکە کەزیادەی بخرێتەسەر، جائەو زیادەیە کەم بێ یان زۆر هەرڕیبایە. کەبەڕاستی ڕیبا یەکێکە لەتاوانە گەورەکان. ڕیبا بەنەصی قورئان حەرامە، خوای گەورە فەرمویەتی: (وأحل الله البيع وحرم الربا).

وە لەئایەتێکی تردا فەرمویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ﴾ البقرة: ٢٧٥.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕیزی حەوت تاوانە گەورە لەناوبەرەکەدا، حیسابی بۆکردوە. کەفەرموی: (إِجْتَنِبُوا السَّبْعَ المُوبِقات ... یەکێ لەوانە: وآكِلَ الرِّبا) رَواهُ البُخاري (٢٧٦٦) ومُسْلِم (٨٩).



ڕیباخۆری ئەوەندە تاوانێکی گەورەیە، پەنابەخوا وەکو شەڕکردن وایە لەگەڵ خواو پێغەمبەری خوادا ﷺ. خوای گەورە فەرمویەتی: (فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ) البقرە: ٢٧٩

ڕیباخۆری ئەوەندە تاوانێکی گەورەیە، نەك هەرڕیبا خۆرەکە. بەڵکو ئاگرەکەی چەند کەسی تریش دەگرێتەوە. (جابری کوڕی عبدالله) دەفەرموێ: (لَعَنَ رَسُولُ اللهِ ﷺ. يَاكِلَ الرِّبا، ومُؤَكِلِهِ، وكاتِبَهُ، وشاهِدَيْهِ، وقالَ: هُمْ سَواءٌ) رَواهُ مُسْلِم (١٥٩٨). وەلەبارەی ئەوکەسانەی کەدەبنە کەفیلی ئەوکەسانەی کەڕیبا وەردەگرن. زانایانی شەرع فەرمویانە: (الكَفالَةُ في قَرْضٍ رِبَوِيٍّ حَرامٌ، والكَفيلُ أَشَدُّ مِنَ الشاهِدِ والكاتِبِ). واتە: کەفالەت لەقەرزی ڕیبەویدا حەرامەوکەفیل تاوانی

زیاتره لەشاهیدو نوسەری عەقدی ڕیبا وەرگرتنەکە!)..

بەڵێ، ڕیبا لەزینا گەورەترە!! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (الرِّبا إِثْنانِ وسَبْعُونَ باباً، أدْناها مِثْلُ إِتيانِ الرَّجُلِ أُمَّهُ). رَواهُ الطَّبَرانِي فِي الاوْسَط.

واته: سووخۆری حەفتاودوو بەشی هەیە. کەمترینیان وەکو ئەوە وایە کەپیاو بچێتە لای دایکی خۆی و زینای لەگەڵ بکات!!

لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت، ئەویش ئەوەیە: باشە بۆچی ڕیبا ئەوەندە تاوانە؟! لەوەڵامدا دەڵێین: لەبەرئەوەی ڕیباو سووخۆری مرۆڤ بەهۆی قەرزاری ونەبونی یەوە دەکات بەکۆیلە. ئەوەتا لەپێش ئیسلامدا، کابرا قەرزی لەدەوڵەمەندێك دەکرد. کاتی خۆی لەبەردەستکورتی و هەژاری بۆی نەدەدرایەوە. خاوەن پارە دەیگوت: قەیچیەکا بڕۆ ساڵێکی تر بۆم بهێنەوە، بەڵام دەبێ ئەوەندەی تری بخەیتەسەر. واته: ئەگەر هەزارە بیکەی بەدوو هەزار، سەرەنجام هەربۆی نەدەدرایەوەو ساڵ بەساڵیش قەرزەکە زۆرتر دەبوو. ئیتر خاوەن پارە، دەهات لەبەرچاوی ژن و منداڵەکەی، کابرای قەرزای قۆڵ بەست دەکردو دەیبرد لەبازاڕی کۆیلە فرشتندا، لەجیاتی پارەکەی دەیفرۆشت وئیتر بۆدواجار لەژن ومنداڵەکەی دادەبڕاو شار بەشارو وڵات بەوڵات دەبراو وەکو ئاژەڵ کڕین و فرۆشتنی پێوە دەکرا!! خۆ ئەگەر کەسەکە خۆشی پیرو بەساڵاچوو بوایەو بەکەڵکی کۆیلایەتی نەهاتایە، ئەوا کچێکی تازەپێگەیشتوی، یان کوڕێکی لەجیاتی دەبردو لەباوەشی دایك وباوك وخوشك و براکانی ڕادەکێشرا وپەت دەخرایە ملی و بۆ دواجار لێیان دادەبڕا، جا کەئیسلام هات ئەم ڕیباو سووخۆریە مەترسیەی لەناوبردو تەنانەت مەجالی نەهێشتەوە کەلەقەرزدا، لەهەزار دینار یەك فلسیشی بچێتەسەر. هەروەکو چۆن نەخۆشی پێویستە لەڤایرۆسێکەوە بنەبڕبکرێت. ڕیباش دەبێ ئاوا لە بچوکترین سودمەندی سەر قەرزەوە بنەبڕ بکرێت بۆ ئەوەی جارێکی تر مرۆڤ نەکرێتەوە بەکۆیلە. ئای ئیسلام چەند گەورەیە. بەڵام بەداخەوە خەڵکی بەناشارەزایی ڕەخنەی لێ دەگرن..

بەڵێ ئیمانداری بەڕێز پێویستە تۆی موسڵمان زۆر ئاگاداربی کەتوشی ڕیباخۆری نەبی، چونکە پێغەمبەری دڵسۆزو ڕابەرمان ﷺ فەرمویەتی: (لَيَأْتِيَنَّ عَلى النّاسِ زَمانٌ، لايَبْقَي منهُمْ أَحَدٌ إِلا أَكَلَ الرِّبا، فَمن لَمْ يَأْكُلْهُ أَصابَهُ من غُبارِهِ). رَواهُ أبُوداود (٣٣٣١) وإبنُ ماجَة (٢٢٧٨).

واته: ڕۆژگارێك بەسەر خەڵکی دا دێت، هیچ کەس نامێنێت کەسووی





نەخواردبێت. ئەوەشی کەنایخوات تۆزو دوکەڵی ڕیبای بەسەردا دێت..

ئەوەتا ئەمڕۆ بەچاوی خۆمان دەبینین کەچۆن بەناوی بانقی فلاَن وفیسارەوە، پارە دەدرێ بەخەڵکی و زیادەی لەسەر وەردەگرێتەوەو ناویشی نابرێ بەڕیبا!!

ئیمانداران: چەند مەسەلەیەکی شەرعی گرنگ هەن، کەپێویستە باسیان بکەین. وەکو:

١- البَيْعُ بالتَّقْسِيط: کڕین و فرۆشتن بەقیست: زانایان فەرمویانە، کڕین وفرۆشتن بەقیست دروستە. بەبێ هیچ خراپیەك. خۆ ئەگەر لەو کڕین و فرۆشتنەدا نرخی فرۆشراوەکە زیادی کرد، بەهۆی ئەوەی کڕیار بە (قیست) پارەکەی دەدا. ئەوە هیچ حەرامیەکی تێدا نی یە. وەکو ئەوەی: کەسێك ئۆتۆمبێلێك دەکڕێت بە (٥٠) گەلا دۆلار بەحازر. بەلاَم ئەگەر پارەکەی تەواو نەبێ و بیەوێ مانگانە پارەکەبدات. ئەوا فرۆشیار بە (٦٠) گەلا پێ ی دەفرۆشێت، ئەوە دروستە. بەمەرجێ کڕیار دیاری بکات کەبەحازرەکە دەیکڕی، یان بەقیستەکە دەیکڕێ. چونکە ئەگەر فرۆشیار ووتی: بە (٥٠)ی حازر و(٦٠)ی قەرز وقیست دەیفرۆشم، کڕیاریش ووتی: باشە والێتم کڕی وئوتومبێلەکەی برد، ئەمە حەرامە، چونکە دیاری نەکرد. بەحازرەکە کڕی، یان بەقەرزو قیستەکە. کەئەمەیە لەشەرعدا نەهی لێکراوە وبە (دوو معامەلە کۆکردنەوە لەیەك معامەلەدا) ناوی براوە!..

وە هەربەهەمان شێوە کەلوپەلی ناوماڵ وەکو سەلاجەو تەلەفزیۆن و ڕاخەری ناوماڵ. دروستە بەقەرزو قیسط لەدوکاندار وکۆمپانیا بکڕدرێ وفرۆشیاریش لەنرخی فرۆشتنی حازر زیاتری بخاتەسەر. بەلاَم بەمەرجێ ئەو زیادەیە لەسنوری خۆی نەچێتەدەرەوەو چاودێری برایەتی ئیمانی بکرێ و بۆ هەردوولا بەرژەوەندی تێدابێ، بۆکڕیار بەوەی کەپارەکەی بە (قیست) دەدات وئەوەندە قورسی ناکەوێتە سەر، بۆ فرۆشیاریش، لەبەرئەوەی پارەکەی ماوەیەك دەگیرێ و پچڕ پچڕ دەستی دەکەوێتەوە، هەندێ زیادەی بخاتەسەر هیچ گرفتێکی نیە.

وە ئەمە ڕیبا نیە، چونکە پارەنیە بەپارەو زیادەی لەسەر وەربگیرێ، بەڵکو پارەیە لەجیاتی کەلوپەل و زیادەی قیست لەسەری حەرام نیە.

٢- نابێ قەرز سودت پێ بگەیەنێ. (قاعیدەیەکی شەرعی هەیە کەدەفەرموێ: (كُلُّ قَرْضٍ جَرَّ نَفْعاً فَهُوَ رِباً). هەرقەرزێك سوود ڕابکێشێ ئەوە ڕیبایە. چونکە دەبێ قەرز تەنها بۆ ڕەزامەندی خودابێت. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: لەمیعراجدا بینیم لەسەر دەرگای بەهەشت نوسرا بوو. (الحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثالِها،





والقَرْضُ بِثَمانِيَةَ عَشَر) چاكە یەك بە دە پاداشتی هەیەو قەرز یەك بەهەژدە پاداشتی لای خوای گەورە هەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: كەئەوەم بینی، لەجوبریلم پرسی: بۆچی ئاوا قەرز خێری زیاترە لەوەی كەپارەكە ببەخشی و وەری نەگریتەوە؟! فەرموی: چونكە جاری واهەیە ئەوەی داوای صەدەقە و خێرت لێ دەكات، زۆر موحتاج نیە، بەڵام قەرزار هەتا هیچ مەجالی بمێنێ قەرز ناكات.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (مَامن مُسْلِمٍ يَقْرِضُ قَرْضاً مَرَّتَيْنِ إلا كانَ كَصَدَقَتِها مَرَّةً) رَواهُ إبنُ ماجَّة، وقالَ الالْباني حَديْثٌ حَسَنٌ.

واتە: هەرموسڵمانێك دووجار قەرز بدات بەموسڵمانێك ودەستی بگرێ لەسەری بوەستێ هەتاوەكو دەیبێ ودەیداتەوە، ئەوە وەكو ئەوە وایە جارێكیان تەواوی پارەكەی بەخێر وخێرات بەخشیبێ وخوای گەورە ئاوا پاداشتی بۆ دەنوسێ.. وەلەقەرزیشدا، خاوەن پارە نابێ هیچ پارەیەكی زیادە وەربگرێتەوە. بەڵكو تەنها پاداشتی قەرز ئەمەیە كە بپێغەمبەری خوا ﷺ دیاری كردوە وفەرمویەتی: (إنَّما جَزاءُ السلفِ، الحَمْدُ والأداءُ) رَواهُ النَّسائي، وقالَ الالْبانيُّ حَسَنٌ.

واتە: بەڕاستی پاداشتی قەرز ئەوەیە كەقەرزار، سوپاسی خاوەن پارە بكات و دوعای خێری بۆبكات و لەكاتی دیاری كراوی خۆیدا، قەرزەكەبداتەوەو دەستی دەستی پێ نەكات و وای لێ نەكات كەنەتوانێ جارێكی تر قەرز بدات بەكەس.

جا ئیماندارانی بەڕێز: لێرەدا دەبێ موسڵمانان زۆر بەئاگابن لەوەی كەئەگەر خاوەن پارە، مەرجێكی لەسەر قەرزارەكە دانا، كاتێ قەرزەكەی دایە. ئەوە ئەو مەرجە دەبێتە ڕیباو سوخۆری، هەرچەندە بەناو هیچ پارەی زیادیشی وەرنەگرتۆتەوە!

بۆزیاتر ڕونكردنەوە، سەرنجی ئەم نمونەیە بدەن: كەسێك دارتاشەو پێویستی بەبڕێك پارە هەیە، دەچێتەلای پارە دارێك و داوای قەرزی لێ دەكات. خاوەن پارە دەڵێ بەسەرچاو پارەكەت دەدەمێ بەقەرزو چیم داوێتیە هەر ئەوەم بدەوەو هیچ سووی ناخەمەسەر بەڵام بەومەرجە پارەكەت دەدەمێ، كەتاقمێ قەنەفەی جوانم بە بەلاش بۆ دروست بكەی. تەنها پارەی كەلوپەلەكەت دەدەمێ ودەبێ حەق دەستی خۆتم لێ وەرنەگری.

یاخود: بەرگ درویەك. پارەی لەكەسێك وەرگرت بەقەرز، ئەوە ئەگەر خاوەن پارە ووتی: من هەروا بەخێر وپیاوەتی ئەو قەرزەت دەدەمێ، بەبێ ڕیباوسوو.



بەلاَم بەو مەرجەی قوماشێکت بۆ دەنێرم، بۆم بدوری و حەق دەستم لێ وەرنەگری.

یاخود: پارەی دا بەبۆیاغ چیەك ومەرجی ئەوەی لەسەردانا، کەخانومکەی بۆ بۆیاغ بکات و پارەی حەق دەستی لێ نەسەنێ. ئەمە هەموو ئەم مەرجانە، کەبەهۆی قەرزەکەوە سوود بەخاوەن پارەکە دەگەیەنن و ئەگەر لەبەرخاتری قەرزەکە نەبوایە دارتاشەکە، یان خەیات و بۆیاغ چیەکە (یان هەرخاوەن پیشەیەکی تر) ئامادە نەبوو، یەك سەعات ئیشی بەلاشی بۆ بکات، ئەوە ئەوسود پێ گەیاندنە ڕێگایەکە لەو ڕێگایانەی کەقەرزەکە سودی بەخاوەنەکەی گەیاندوە. (فَصارَ فيهِ شائِبَةٌ من شَوائِبِ الرِّبا). ئەوە بەڕاستی بۆن ودوکەڵی سووخۆری لەگەڵ تێکەلاَو بوە. وەبەڕاستی چاك وایە، ئەگەر قەرزت لای کەسێك بوو. هیچ مەرجێکیشت لەسەر دانەنابوو بەلاَم کارێکی بۆکردی لەوماوەیەدا کەقەرزەکەی لایە. یان دوای دانەوەی قەرزەکە ئیشی بۆکردی. تۆی خاوەن پارە، کرێ ی تەواوی خۆی بەبێ کەم وکورتی بدەیتێ، هەرچەندە بشڵێ باعایدی خۆم بێ، یان کەمترت لێ وەردەگرم لەخەڵکی، تۆ قبوڵی مەکە. چونکە لەوانەیە چاوبەرەژێری قەرزاریەکەبێ وهەردەچێتە ئەوباسەوە، کەقەرزەکەت سودی ڕاکێشاوە!..

دەگێڕنەوە: یەکێ لەپیاوچاکان. لەگەڵ برادەرێکیدا، لەکاتی گەرمادا لادەدەن لەسێبەری دوکانێکدا دادەنیشن. دوایی پیاوباشەکە دەفەرموێ: ئەرێ ئەمە دوکانی کێ یە؟! ووتی: دوکانی فلاَن کەسە، هەرخێرا هەستا وفەرموی: بابڕۆین! کابرا عەرزی کرد قوربان بۆچی بڕۆین؟ بۆ وا بەپەلەو لەم گەرمایەدا؟! خۆبەردەم دوکانی کەسمان نەگرتووە!! پیاوباشەکە فەرموی: ئاخر من قەرزم لای ئەو دوکاندارەیە، دەترسم بێت ولەبەرئەو قەرزە شەرم بیگرێ دوکانەکەی بکاتەوە!! یان هەرسود وەرگرتن لەسێبەری دوکانەکەی بۆنی ڕیبای لێ دێ!...

بەلاَم: ئەگەر کەسێك شتێکی لەکەسێك قەرز کرد، دوایی بەڕەزامەندی خۆی باشتری دایەوە.

یان هەدیەو دیاریەکی بۆخاوەن پارەکە کڕی، بەبێ ئەوەی خاوەن پارەکە، هیچ مەرجێکی دانابێ، یان چاوەڕێ ی هیچ بکات، ئەوە دروستەو بۆ قەرزارەکە کارێکی جوانە. لەصەحیحی (مسلم)دا هاتوە دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا ﷺ حوشترێکی کەم تەمەنی لەکەسێك قەرز کرد. بۆبەرژەوەندی موسڵمانان. پاشان

کۆمەڵە حوشترێك هاتە بەردەستی پێغەمبەری خواوە ﷺ. پێغەمبەری خوا ﷺ بەصەحابەیەکی فەرموو: هەستە برۆ حوشترێکی یەك ساڵە لەناوئەو حوشترانە بدۆزەرەوە وبیدەوە بەفلان کەس لەجیاتی قەرزەکەی. صەحابەکە رۆیشتە ناوحوشترەکان وپاشان هاتەوەو ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ حوشتری یەك ساڵەیان تێدانی یە وهەمووی حوشتری بەتەمنتر وچاکترن. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (إعطهُ إياهُ، فَإنَّ من خَيْرِ النَاسِ أَحْسَنُهُمْ قَضاءً). فەرموی: قەیچیەکا، برۆ ئەوحوشترە گەورەی لەجیاتی قەرزەکەی بدەوە، چونکە باشترینی خەڵکی ئەوانەن کەبەجوانترین شێوە قەرز دەدەنەوە. لەصەحیحی بوخاریشدا هاتوەکە: جابری کوڕی عبدُالله، دەفەرموێ: لەسەفەرێکدا چوار دینارم بەقەرزدا بەپێغەمبەری خوا ﷺ (فَلَمّا قَدِمْنا المَدينَةَ، قالَ الرَّسُول ﷺ: يابِلال، اقْضِهِ وزِدْهُ، فَأَعْطاهُ أَرْبَعَةَ دنانير وزادَهُ قيراطاً).. واتە: جاکاتێ لەخزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتینەوە بۆ مەدینە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئەی بیلال، قەرزەکەی جابر بدەوەو شتێ زیادیشی بۆبخەرە سەر، جابر دەفەرموێ: بیلالیش چوار دینارەکەی دامەوەو قیراتێکیشی زیاد دامێ...

تێبینیەکی گرنگ: ئەگەر کەسێك دۆلارێکی لەکەسێك قەرز کرد. چاك وایە هەر دۆلاری بداتەوە، خۆئەگەر دیناری لەجیاتی دایەوە، ئەوە نرخی دۆلاری لەرۆژی قەرزەکەدا (کاتێ قەرزەکەی وەرگرتوە چەند بوە) هەرئەوەندەی دەداتەوە. نەك نرخی دۆلار لەو رۆژەدا کەقەرزەکەی تێدا دەداتەوە. چونکە دۆلار بەرامبەر دینار بەردەوام لەبەرزبونەوەو نزم بونەوەدایە.



کەواتە: ئەگەر کەسێك (١٠٠) دۆلاری بەقەرز دابەکەسێك، وە ووتی: پارەی دینارم بدەوە دوای ماوەیەکی دیاری کراو. ئەوە ئەگەر وەختی قەرز وەرگرتنەکە (١٠٠) دۆلارەکە بایی (١٠٠) هەزار بوو، دوای ماوەکە، کەقەرزەکەی دایەوە، نرخی (١٠٠) دۆلارەکە بوو بە (١٢٠) هەزار، ئەوا قەرزارەکە، تەنها (١٠٠) هەزار دەداتەوە، نەك (١٢٠) هەزاری وەختی دانەوەی قەرزەکە.

٣- مەسەلەیەکی شەرعی تر: فرۆشتنی ئاڵتون بەقیست، ئەمە حەرامەو یەك پارچە ریبایە. چونکە دینارو دۆلار لەحوکمی زێردان. دەی زێڕ بەزێڕ دەبێ لەیەك مەجلیسدا بێ وحازربێ ودەست بەدەست بێ.

چەند ئافرەت ئاڵتونی بەقەرز بردوە وپاشان پارەکەی پێ نەدراوە،



کەوویستویەتی ئاڵتونەکە بفرۆشێتەوە، بۆی نەفرۆشاوەتەوە. چونکە نرخی زۆر شکاوە (وە بەردەوام ئاڵتون لەفرۆشتنەوەدا زەرەر دەکات. چونکە حەق دەستی زەرەنگەری لێ دادەشکێ) بەدەگمەن وایە خێربکات و قازانج بکات. ئەویش بەهۆی بەرزبونەوەی نرخی ئاڵتون لەجیهاندا.

کەواتە: کەشەرع مەنعی کردوە ئاڵتون بەقەرز وقیست ببرێ، لەبەرژەوەندی مرۆڤەکاندایە. بەتایبەت ئافرەتان. کەواتە تاوەکو پارەکەت حازر نەبێ ئاڵتون مەکڕە وخۆت مەخەرە ژێر قەرزێکەوە کەپێت نەدرێتەوەو توشی گوناهی گەورەی ڕیبا خۆری مەبە...

خوای پەروەردگار بەرەکەت بخاتە کار وکەسابەتمانەوەو لەڕیباخۆری بمانپارێزێ.

ٱللَّهُمَّ ءَامِينَ

سەرچاوەکان


١- **قورئانی پیرۆز.**

٢- الوافي في شَرْحِ الأَرْبَعِينَ النَوَوِيَّة، د.مصطفى البُغا، د.محى الدين مستو، **ص٨٥.**

٣- **ناميلكەی: نەخۆشيەكانی دلان** ، د.عُمَر عَبْدُالكافی ، وەرگێرانی: عَبْدُ الجَليل ، **ل٢٦.**

٤- الفِقْهُ الشَّرعي المُيَسَّر ، محمد علي الصَابُوني ، **ج٥ ، ص١٦٦، ص١٠٤، ص١٧٢، ص١٧٠.**

٥- يَسْأَلُونَكَ ، د.حسام الدِّين عَفَانَة، **ج١، ص٣٤٢، ص٣٢٧، ص٣٣٧، ص٣٤١.**

٦- الترغيب والتَّرهيب ، لِلْحافِظ المنذري ، **ص٣٦٩، فەرمودەی ژمارە: ٢٧٥١.**

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجْمَعين.

ئیمانداران: ماڵ و سامان لەئیسلامدا گرنگەو ئیسلام نەهی نەكردوە لەكۆكردنەوەی ماڵ و سامان، بەرمەرجێ لەحەڵاڵ دابێ وحەرام نەبێ. ئەو ماڵ و سامانەی هی كەسێكی ترنەبێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٖ مِّنكُمۡۚ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا ﴾ النساء: ٢٩.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، ماڵ وسامانی یەكتر بەناحەق و بەبێ بەرامبەر مەخۆن لەنێوان خۆتاندا، مەگەر بازرگانیەك بێت و لەسەر ڕەزامەندی هەموو لایەكتان بێت. خۆتان مەكوژن ویەكتر بەناحەق مەكوژن، كاتێك بێزاری و بێتاقەتی ڕووتان تێ دەكات، یان توشی زیانێك دەبن. بەڕاستی خوا میهرەبانە پێتان.

ئیمانداران: حەرام لەماڵ وساماندا دووجۆرە:

١- حەرامێك هەمووكەس دەزانێ خراپەو تاوانەو بەچاوی سووك سەیر دەكرێ، وەكو: دز، گیرفان بڕ، ڕێگر، كەحوكمیان لەئیسلامدا دەست بڕین بۆ دزو هەڵواسین و دەست و قاچ بڕین بۆ ڕێگری سەر ڕێگاوبان. كەهەم خەڵكیان دەكوشت و هەم ماڵەكەیان دەبرد.

٢- جۆری دوەم لەحەرام خۆر، كەسانێكن بەحیساب كارو كاسبی دەكەن، بەئاشكرا دزی ناكەن. خۆیان بە بەڕێز دەزانن لەناو خەڵكا هەندێ كات لەلایەن حكومەت و خەڵكەوە، ڕێزی زۆریشیان لێ دەگیرێ. پلەوپایەشیان هەیە. خەڵكی دەست خۆشی و ماڵ ئاوایشیان لێ دەكات.

پێیان دەوترێت دەستت خۆش ولەشت ساغ بێ، مەگەر دەگمەن ئەینا سزا نادرێن. خەڵكی بەدزیان ناناسێ، هاتوچۆیان دەكرێ ومتمانەیان پێ دەكرێ وصوڵح بۆ دزو پیاوخراپ دەكەن!! بەڵام لەلای خوا وبەحوكمی شەرع خۆیان گەورەترین دزو ناپاك و حەرام خۆرن، دزێكی فەنان و بەتەجرەبەن.

بەڕێزان: ئەم جۆرە حەرامانەی كەباسیان دەكەین، مەگەر كەسێك خوای گەورە ڕەحمی پێ بكات، بەهۆی ئەوەی كەكەسێكی بەقەناعەت و خۆپارێزە، ئەینا زۆركەس توشی دەبێ، هەروەكو پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ فەرمویەتی (يَأْتِي عَلَى النَاسِ زَمانٌ، لايُبالي المَرْءُ ما أَخَذ، أَمِنَ الحَلالِ أَمْ مِنَ الحَرامِ) رَواهُ البُخاري (٢٠٥٩).

واتە: سەردەمانێك بەسەر خەڵكی دا دێت، مرۆڤ گوێ ناداتە ئەوەی كە

ئەوەی دەستی دەکەویٚ لەحەلاڵە یان لەحەرامە. گرنگ ئەوەیە پارەی دەست بکەویٚ ئیتر حەلاڵە یان حەرامە، هەرحیسابیشی بۆناکات.

ئیمانداران: دەفەرمون بابەیەکەوە سەرنجێکی ئەم جۆرە حەرامانە بدەین. بۆ ئەوەی ئەگەر خوانەکردە، توشیان بوبین هەرئێستا تەوبەی لیٚ بکەین و وازی لیٚ بێنین. وە ئەگەر لێشی بەدورین سوپاسی خوابکەین و بەئاگابین تووشی نەبین.

١- هەرپارەیەك، هەرماڵ و خواردنێك. لەڕێگەی زوڵم و ستەمەوە بەدەستی بێنی حەرامە. وەکو ئەوەی کەسێك دەسەلاتدارەو پارەیەك، ئوتومبێلێك داگیر دەکات یان لەکاتی شەڕ وئاژاوەی وڵاتدا، فەرهودی دام و دەزگای حکومی، یان ماڵان دەکات. بەداخەوە چەندین ماڵ هەیە. ئێستاش شتی فەرهودی دائیرەو ماڵانی کەرکوکی تێدایە وخۆشی بەحەرام خۆر نازانیٚ، جێگای داخە میللەتی کورد. هێزی (R.R) ڕواوە ڕووتی تێدا دروست ببیٚ و شانازیشی پێوە بکات!!

یاخود: خۆی نەیدزیوەو فەرهودی نەکردوە، بەلام دەزانیٚ ئەمە دزراوەو فەرهودەو دەیفرۆشنەوە. ئەم دەچیٚ بەپارەی حەلاڵی خۆی دەیکڕیٚ. ئەوا ئەم کڕیارەش هەرشەریکی حەرام خۆرەکەیە وحەرام خۆرە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (من اشْتَرى سَرِقَةً، وهُوَ يَعْلَمُ أَنَّها سَرِقَةٌ فَقَدْ إِشْتَرَكَ فِي عارِها وإِثْمِها) رَواهُ البَيْهَقي في شعب الايمان.

واتە: هەرکەسیٚ شتێکی دزراو بکڕیٚ. وەبشزانیٚ کەئەوشتە ماڵی دزراویە ئەوا ئەو کڕیارە هاوبەش وشەریکە لەحەیاچون و ئابڕو چونی دزداو وە لەگوناهو خراپەی دزەکەدا ... واتە: ئەگەر ڕۆژیٚ خاوەنی ئەم شتە دزراوە بەدەستی ئەم کەسەوە، یان لەماڵی دا، ئەم کەلوپەلە دزراوەی خۆی دۆزی یەوە. ئەوە بۆی هەیە ئابڕوی ئەم کەسە ببا ولیٚ ی بکا بەهەلاو شتەکەی لیٚ بسەنێتەوە. وەئەوکەسەش بۆی نیە بەرگری لەخۆی بکات وبڵیٚ: خۆمن ئەم دزیوە، من بەپارەی حەلاڵی خۆم کڕیومە، نەخێر چونکە زانیویەتی ماڵی دزراوە وکڕیویەتی. لەگەڵ دزەکەدا هیچ جیاوازیان نیە!...

٢- غەش کردن لەو شتەی کە دەیفرۆشی، هی وایە بەحیسابی خۆی ڕەنج دەداو ماندو دەبیٚ کاسپی دەکات. سەرما وگەرما بەخەسار نادات، کەچی لەهەموو دزێك کەلەلای خەڵك ڕیسوایە، پیسترەو ماڵەکەی حەرام ترە!! بۆچی؟!چونکە غەش دەکات. جا ئەم غەشەش دوو جۆرە:







أ. مادده فرۆشراوەکە بێ عەیبە، بەڵام کەبۆ کڕیاری دەکێشێ، سووك بۆی دەکێشێ، کەکاتێکیش شت لەخەڵکی دەکڕێ، بەگران بۆخۆی دەکێشێ. ئەمانە، ئەوەندە تاوانەکەیان گەورەیە، یەك سوڕەتی گەورەی قورئان کە (٣٦) ئایەتە، بەناوی ئەوکەسانەوە ناونراوە. سوڕەتی (المطففين) تەرازوو بازان کەچی دز تەنهایەك سورەتی قورئان باسی سزاکەی دەکات. بۆچی؟!

چونکە دز خۆی لێ دەپارێزرێ ودزی تەنها لەیەك ماڵ دەکات. یان لەچەند ماڵێك دزی دەکات. بەڵام ئەم تەرازوو بازانە کەس لەدەستی خیانەتکارانەی ڕزگاری نابێ. قورئان دەفەرموێ: ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ۝١ الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ ۝٢ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ ۝٣ أَلَا يَظُنُّ أُولَٰئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ ۝٤ لِيَوْمٍ عَظِيمٍ ۝٥ يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ۝٦﴾ المطففين: ١ - ٦

ب. ئەم جۆرە غەشەیان لەتەرازوو بازەکە زۆر پیسترە، چونکە تەرازوو باز ئەوەی پێت دەفرۆشێ باشەو دەخورێ و بەکاردێ، تەنها کەمی داویتێ لەحەقی خۆت. بەڵام ئەوەی ئەم غەشکارەیان، دەبێ هەمووی فڕێ بدەی.

وەکو: ئەوکەسەی کە لەبازاڕدا، شتی زۆرجوان، گۆشتی جوان، میوەی جوان و سەرنج ڕاکێش نیشانی کڕیار دەدات. کەچی کەدەیبەیتەوەماڵەوە، ئەوەنیە کەتۆ کڕیوتەو بەچاوی خۆت بینیوتە.

یاخود: شیری ئاژەڵی خۆماڵی یەو ئاوی تێکراوە!، بەنزین و نەوتە وئاوی تێکراوە. ئەم جۆرە کەسانە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (من غَشَّنا فَلَيْسَ مِنَا، والمَكْرُ والخداعُ فِي النّارِ) حَديثٌ صَحيح، رَواهُ الطَّبَراني - صَحيح الجامع (٦٤٠٨).

واتە: ئەوەی غەشمان لێ بکات لەئێمە نییە. فرت وفێڵ وخەڵەتاندن لەناوئاگردایە، واتە: هەرکەس غەش وفرت و فێڵ و خەڵەتاندن وچاوبەستەکی لەموسڵمانان بکات، ئەوە جێگای ئاگری دۆزەخ دەبێت!..

هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوهوڕەیرە، ڕۆژێکیان بەلای کەسێکدا ڕۆیشت کەئاوی دەکردە شیرەوە، ئەبوهوڕەیرە فەرموی: (كَيْفَ بِكَ إذا قيلَ لَكَ يَوْمَ القِيامَةِ، خَلِّصِ الماءَ مِنَ اللَّبَنِ). ئای حاڵت چۆن دەبێ، کاتێ لەڕۆژی قیامەتدا پێت دەوترێ ئەوئاوە لەوشیرە جیابکەوە. یان دەبێ جیای بکەیتەوە، یان دەبێ بچیتە دۆزەخ! باشە لەوکاتەدا وەڵامت چی دەبێ، کەبێگومان تازە شیرو ئاوەکەت بۆ لەیەکتر جیانابێتەوە!!

ئێمەش بەوکەسانە دەڵێین: کەئاو دەکەنە ناوسوتەمەنیەوەو سۆپای ماڵە

هەژارێك پڵیتەی ڕەق دەبێ و کارناکات بەهۆی نەوتە تەزویرەکەی تۆوە. وە بەسەرما ماڵ و مناڵی دائەنیشن! وە ئوتومبێلەکە پەکی دەکەوێ بەهۆی بەنزینە پڕ لەئاوەکەی تۆوە. ئایا کەڕۆژی قیامەت لەنێوان چونە دۆزەخ و لەنێوان ئەوەی کەئەو ئاوە لەونەوتەو بەنزینە جیابکەیتەوە، کەتازە سوتاوەو نەماوە، چی دەکەی؟! هەرئێستا تەوبە بکەو دەست لەوکارە قێزەونە هەڵگرە وخۆت موستەحەقی دۆزەخ مەکە، خۆ ئەگەر لەم دنیا لەدەست یاسا ڕزگارت بوو. دڵنیابە لەقیامەتدا لەسزای پەروەردگار ڕزگارت نابێ. وەچ کارەساتێکت بەسەردێ. کاتێ کەپێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: تۆ لەئوممەتی من نی وتکات بۆ ناکەم، چونکە لەدنیادا غەشت لەموسڵمانان کرد.

بەداخەوە جاری واهەیە، کەسێك جووتیارە، یەك ساڵ ڕەنجی داوە، کەچی ئەوهەموو ڕەنج وماندووبونەی خۆی وماڵ ومناڵی، حەرام دەکات لەپێناوی چەند کیلۆیەکدا.

بۆ نموونە: لەشەبەکەیەك پیازدا. دوو کیلۆی ڕزیوو خراپ دەکاتە ناوەوەی ودەرەوەی بەپیازی گەورە وبەرچاو دەڕازێنێتەوە. لەپێناوی دوو کیلۆدا، (١٥) کیلۆی حەڵاڵی خۆی حەرام دەکات! یاخود دانەوێڵە، گەنم وجۆ ونۆك ونیسك دەفرۆشێ، کەچی هەندێ بن خەرمان وپیسی تێکەڵ دەکات. ئەو هەموو خەرمانە پاکە حەڵاڵە بەوتۆزە پیسی یە حەرام دەکات!!..

٣- بەدەست هێنانی پارەوماڵ و سامان لەڕێگەی ئەو معامەلەو کڕین وفرۆشتنەوە کەشتی خەڵکی بشکێنێ و بێ نرخی بکەی و شتی خۆشت بەجوان و چاك و بێ وێنە بخەیتە بەرچاو، قورئان دەفەرموێ: (ولاتَبْخَسُوا النّاسَ أَشْياءَهُمْ). وەکو زۆرێك لەجامبازی مەڕومالاّت ونوسینگەی فرۆشتنی خانوو زەوی، کەکاتێ شت لەخەڵکی دەکڕن، وای بێ نرخ دەکەن کە گوایە هیچ ناکات و بازاڕی نیەو نافرۆشرێ.

کاتێکیش هەرهەمان شت بەخەڵکی دەفرۆشن، ئەوەندەی پیاهەڵئەدەن، کەکڕیار وائەزانێ ئەمە لای ئەم نەبێ دەست ناکەوێ، کەبەڕاستی ئەمەش دەست بڕینە. بابزانین خواناسان چۆن خۆیان لەهەرشتێك پاراستوە کەمەدح و پیاهەڵدان بێ بۆشتەکەی خۆیان، دەگێڕنەوە: یونسی کوڕی عەبید، جل و بەرگی دەفرۆشت. ڕۆژێکیان بەشاگردەکەی ووت: ئەو قوماش وجل وبەرگانە لەسەر ئەوپارچە قوماشە هەڵڕێژە، خەڵکیش لەدەوری کۆببونەوە بزانن ئایا چی جوان





وتازەی تێدایە، کاتێ کە (باڵەکە) دەکاتەوە. شتی جوانی تێدا ئەبێ، یونسی کوڕی عەبید دەڵێ: صلاوەت لەسەر پێغەمبەرﷺ.. یەکسەر بەئاگادێتەوەو بەشاگردەکەی دەڵێ: بیپێچەوە نایفرۆشم! دەڵێن: بۆچی؟! دەڵێ: چونکە دەترسم کڕیارەکان ئەو صلاوەت لێدانەم بەمەدح و پیاهەڵدانی قوماشەکە تێبگەن!..

لەلای خۆشمان فرۆشیارەکان هاوار دەکەن (ماشاءالله). ئاوابی باخ بۆ بەرهەمەت.. یان وەرە گوڵی لەخۆی داوە. بۆئەوەی سەرنجی کڕیار ڕابکێشن، پیاوباشان خۆیان لەمەش پاراستووە!..

٤- إحتكار: کەبریتی یە لەهەڵگرتنی خواردەمەنی وپێداویستیەکانی ژیانی مرۆڤ بۆکاتی گرانی کە ئەوکاتەی خەڵکی پێ ی ئاتاج دەبن، بەنرخێکی گران پێیان بفرۆشێتەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (من احْتَكَرَ طَعاماً فَهُوَ خاطئ). رَواهُ مُسْلِم (١٦٠٥).

هەرکەسێ خواردن وپێداویستی ژیانی خەڵك بشارێتەوە، تاڵەکاتی گرانی دا پێیان بفرۆشێتەوە، ئەوە بەهەڵەدا چووە.

٥- فرسەت هێنان لەپێداویستی خەڵك: دەزانێ کڕیار بچێتە هەرشوێنێ، ئەوشتەی دەست ناکەوێ وهەردەبێ بێتەلای ئەم، بۆیە فرسەتی لێ دێنێ ونرخەکەی زیاد دەکات، کڕیاریش ناچارە هەردەبێ بیکڕێ، بۆیە لێشی دەکڕێ و ماڵ ئاوایشی لێ دەکات. ئەمە حەرامەو هەرچەند فرۆشیار کاسبکارە بەناو، بەڵام لەناوەڕۆکدا حەرام خۆرێکی فرسەت هێنە.

٦- وەصڵی شت کڕین بۆ کۆمپانیاو فەرمانگەو ڕێکخراوەکان: کاتێ ئەوکەسەی کەئەمینداری شت کڕینە بەدوکاندارەکە دەڵێ: وەصڵەکەم بە بەتاڵی بدەیە، یان دایمەخە، بۆئەوەی لێ ی زیاد بکات، یان شتێك بایی (١٠٠٠) دینارە، ئەو (١٥٠٠) دیناری لەسەر دەنوسێ. دەشڵێ: خۆماڵی حکومەتە!! بێ ئاگا لەوەی کەماڵی حکومەت حەرامترە. یان دەڵێ ئاخر خۆئەو ڕێکخراوە هی موسڵمانان نیە، ئەوە ئەمریکی یە. ئیسرائیلیە. مەسیحیە، بەڵام خۆموسڵمان حەرامە غەش لەجولەکە و گاور وهەموو مرۆڤێك بکات. پێغەمبەری خوا ﷺ کەفەرموی: (من غَشَّنا فَلَيْسَ مِنّا) هەرکەس غەش بکات لەئێمە نی یە. نافەرموێ: غەش لەموسڵمانان بکات. بەڵکو دەفەرموێ: غەش لەهەرکەسێك بکات. وە ئەو کەسانەی کەلەگەڵ ئەوکۆمپانیا بیانیانە کاردەکەن دەبێ ئاگاداری ئەوەبن کەغەش کردن و وەصڵ تەزویرکردن و زیاد نوسین دووجار غەش وخیانەتە. چونکە:

١. ئەوسیقە ومتمانەی بەتۆیە وبەئەمینت دەزانێ، کەچی تۆ خیانەتی لێ دەکەی.

٢. دینە پاك وبێگەردەکەی ئیسلام ڕەش وناشیرین دەکەی. کاتێ کەئاشکرا دەبی و خیانەتەکانت دەردەکەوێ. ئەو ناموسڵمانانە، بەهۆی غەشی تۆوە، وادەزانن هەموو موسڵمانان ئاوان.. وە هەروەها پێویستە ئەوەش بڵێین کە: هەردوکانداریك وەصڵی بەتاڵ یان دانەخراو بداتە هەرکەسێك، ئەوا شەریکی تاوان وخیانەتەکەیەتی.

٧- هەرپارە وسامان وکەلوپەلێك بەبێ ڕەنج بەدەستی بێنیّ، وەکو ڕیباخۆری، یان قومارکردن، یان یانصیب، قوماری مۆدێرن (کەلەڕێگەی مۆبایلەوە نامەیەکت بۆدێ ودەڵێ: نامەیەك بنێرەو سەیارەیەك وەربگرە..!! یان — ئەوەندە هەزار دۆلارەت بۆ دەردەچێ.. خۆئەمە ئەگەر ئوتومبێلەکەشت بۆ دەرچوو، هەرحەرامە. وەئەوەی نامەکەشی ناردووە پارەکەشی ڕۆیشتووە وحەرامیشی کردوە!..

لێرەدا شەیتان زۆرجار فێڵ لەخەڵکی دەکات و دەڵێ: ئەوەنیە بەچاوی خۆت بینیت سەیارەکە بۆ هەژارێك دەرچوو. فرۆشتیان وخانویەکیان پێ کڕی! ئایا ئەمە بۆ حەرامە؟! لەوەلامدا دەڵێین: ئاخر ئەوکەسەی کەبەشداری ئەو یانصیبەی کردوە لەبەرخاتری ئەوهەژارە بەشداری نەکردوە، بەڵکو بەتەماحی ئەوەی بۆخۆی دەرچێ ناردویەتی. خۆئەگەر ئەوکەسانە ئەوەندە هەژار دۆستن. باسندوقێکی خێری دابنێن وبیدەن بەهەژارێك بزانە فلسێك دەدەن!! ئەمجا دەیان خەڵك توشی خەم ومەراق و بەخت ڕەشی ودەروون ئاڵۆزی دەبن!!.

٨- کەسێك دوکاندارە، کاسپی دەکات، هەوڵ دەدات بەڵام ئەوەی ئەیفرۆشێ حەرامە، وەکو عەرەق فرۆشی، سیدی خراپ فرۆشی، یان دوکانی بلیارد، یان خواردنی بەسەرچوو فرۆشتن، یاخود ئەو دوکاندارانەی کەجل و بەرگی سفورو تەندورەی کورتی ئافرەتان و سترێچ و پانتۆڵی ئافرەتان دەفرۆشن، ئەوە حەرامە. یان خەیاتەو مەکسی قۆڵ کورت بۆ ئافرەتان دەدورێ، کەبێگومان بەومەکسیە قۆڵ کورتەوە پیاوی نامەحرەم دەیبینێ. یان ئەوبەرگ دورانەی کەجل و بەرگی کوردی ئافرەتان دەدورن، کەکراسەکە ئەوەندە تەنکە جلی ژێرەوەی هەمووی دیارە، وەژێرکراسەکەی ئەوەندە کورت دەدورێ، کەقۆڵی نیەو بنباڵی ئافرەتەکە دیارە. واتە: بەناو پۆشتەی بەڵام لەڕاستی دا ڕووتە. ئەوە ئەو بەرگ دورە، هەرچەندە پیشەکەی پیرۆزەوحەڵاڵە، بەڵام ئەم جۆرە جل وبەرگە







ناشەرعیە دورینەی حەرامە و پارەکەشی حەرامە!..

وە هەر دوکانێك جل وبەرگ و کەلوپەلی خراپی تێدا فرۆشرا، ئەوکرێ ی دوکانەش حەرامەو هیچ فەرقی نیە لەگەڵ حەرام فرۆشەکە.

٩- پارەوەرگرتن لەسەر ئەوکارانەی کە شەرع نەهی لێ کردون: وەکو پارەی ئەو قورئان خوێندنەی کەلەتەعزیەدا دەخوێندرێ. کەمعامەلەو سەودای لەسەر دەکرێ. وە بەبێ پارە ئامادەنیە یەك حەرف بخوێنێ.

یان پارەی فاڵچی و نوشتەی ڕەش و سپی و ترش وشیرین نوسین. ژن ڕەش دەکەن لەبەرچاوی مێرد. مێرد ڕەش ئەکەن لەبەرچاوی ژن. کەکاسپی کردن وپارە پەیداکردنەکەیان بازرگانی کردنە لەسەر ئاشوب و فیتنە نانەوە لەناوخێزاندا!

ئەوانە حەرام خۆرن. با ئایەتی قورئانیش بنوسێ، مادام بەپارەو معامەلە دەینوسێ و نوشتەی شەرعی و ناشەرعی لەیەك جیاناکاتەوەو بازرگانی بەدین و قورئانەوە دەکات. هەر حەرامخۆرەو لەڕیزی دەست بڕان و خراپەکاراندایە..

زانای گەورە، موفەسیری قورئان (ئیبن کەثیر) لەتەفسیری ئایەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡأَحۡبَارِ وَٱلرُّهۡبَانِ لَيَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡبَٰطِلِ ﴾التوبة: ٣٤. دا دەفەرموێ: ئەو قەشەو ڕاهیبانە دونیایان دەخوارد بەناوی دینەوە، بۆ دین نەدەژیان بەدین دەژیان. هەروەکو کەئەحباری جولەکەکان لەسەر خەلکی سەردەمی جاهیلی خۆیان کردبوە کەڵەگاو خاوەن ڕێزو دەبوایە وەکو واجبی سەرشانی ئەو خەڵکە پیتاك و خەراج هەدیەو دیاریان بۆ ببردنایە. وە باج و سەرانەیان لەسەر موڵك و مەڕوماڵاتیان دادەنان و دەبوایە خەڵکی بەدەستی خۆیان ڕەنجی ساڵانەی خۆیان بۆ ئەو کەسانە ببردایە!! جاکە ئیسلام هات ئەمەی لابردو فەرموی: نابێ ئەم قورئان و ئیسلامە پاکە بکرێ بەوەسیلەی کاسپی و خۆپێ ژیاندن.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (من تَعَلَّمَ عِلْماً مِمّا يَبْتَغي بِهِ وجْهَ اللهِ تَعالى لايَتَعَلَّمُهُ إلا ليُصيبَ بِهِ عَرَضاً مِنَ الدُّنيا، لَمْ يَجِدْ عَرْفَ الجَنَّةِ يَوْمَ القِيامَةِ - يَعْني ريحَها -) رَواهُ أَبُوداود (٣١٧٩) وصَحَّحَهُ الالْباني في صَحيح أَبي داود.

واتە: هەرکەسێك زانستێك فێرببێ لەو زانستانەی کە دەبێ تەنها لە پێناوی ڕەزامەندی خوادا بخوێندرێ. ئەم کەسە تەنها بۆئەوەی بەشێکی لەدونیا پێ بپچڕێ (هیچ ڕەزامەندی خوای لەدڵدا نەبێ) ئەوا لەڕۆژی قیامەتدا بۆنی

بەهەشت ناکات.

١٠- کەسی واهەیە بەهۆی یاساوە (قانونەوە) حەرامێك بۆلای خۆی ڕادەکێشێ.

بۆ نموونە: کەسێك کێشەیەکی لەگەڵ کەسێکدا هەیە، کەدەچنە بەردەم دادوەر ئەم دەمی بازە، لەبلەبانە، شارەزای قسەکردنە، دەمی لوسە، دەتوانێ سپیت لێ بکات بەڕەش، ڕەشت لێ بکات بەسپی، ئەو تەرەفەی بەرامبەریشی دەم مردوە، نازانێ چۆن دیفاع لەخۆی بکات. لەبەرئەوەی (فَقْرُ الجَيْب)ی هەیە، پارێزەری بۆ ناگیرێ تادیفاع لەحەقەکەی و مافە ڕەواکەی بکات. لەم کاتەدا حاکم بەم دەم لوسە دەخەڵەتێ و دەڵێ حەق بەتۆیە! پێت سەیرنەبێ کەدەڵێین: حاکم دەخەڵەتێ! بەڵێ حاکم دەخەڵەتێ. چونکە حاکم دیوی ڕووکەشی شتەکان دەبینێ وگوێ بیستی قسەی هەردوولا دەبێ. بەڵام کە خاوەن ماف نەیتوانی باسی حەقەکەی خۆی بکات، ئیتر حاکمیش سەری لێ تیك دەچێ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: جاری واهەیە دووکەس لەئێوە دێن بۆ لام لەسەر کێشەیەك. بەڵام یەکیان دەم هەراشترەو باشتری لێ دەزانێ و ئەوی تریان ناتوانێ بەرگری لەمافی خۆی بکات و سەرەنجام من لەسەر قسەی خۆیان بڕیار دەدەم و لەوانەیە حەق بدەم بەوکەسەیان کەباش دیفاع لەخۆی دەکات ودەم مردووەکە، بەهۆی لێ نەزانینیەوە وابزانم خاوەن ماف نیە. بەڵام بزانن ئاگاداربن حوکمی حاکم حەرام حەڵاڵ ناکات!

بەڕێزان: لەم سەردەمەو زەمانەی ئێمەدا، ئەم حەرام خۆری یە هەیە.

بۆ نموونە: کەسێك بەئیزن و ڕەزامەندی تەواوی دڵ و دەرونی خۆی، خانوویەك یان زەویەکی بەکەسێك فرۆشتوە، کاتێ ئەم زەویەکەی یان خانوەکەی فرۆشتوە. زەوی و خانوو ئاوا بەنرخ نەبوە. بازاڕی گەرم نەبوە، وەسیقەو متمانە لەنێوانیاندا هەبووە، بۆیە باسی گۆڕینی تاپۆ لەسەر فرۆشیارەوە بۆسەر کڕیار نەکراوە. ئێستا کەئەو زەوی یە یان خانوە دوای چەند ساڵێك بەنرخ بووە، بازاڕی گەرم بوە، کڕیار داوا لە فرۆشیار دەکات کەتاپۆکەی بخاتەسەر کەسی فرۆشیار تەنها لەبەرئەوەی کە تاپۆکە بە ناوی ئەوەوەیە، داوای پارەیەکی باش دەکات و دەڵێ ئەگەر بێتوو ئەوەندە پارەم نەدەنێ تاپۆکە ناخەمە سەرکڕیار.. ئەوا ئەو پارەیە زۆرو کەمی حەرامە، ئەوە ئەگەر کڕیار پارەکەشت بداتێ چونکە فرسەتت لێ هێناوە هەرحەرامەو بەزۆر لێت سەندووە، ئەمە لێرەدا هەرچەندە یاسا پشتیوانی ئەوکەسە دەکات کەتاپۆکەی بە ناوەوەیە، بەڵام خۆ







بەشەرعماڵی خاوەن تاپۆ نەماوەو بۆتە موڵکی موشتەری. هەر چەندە کڕیار کەمتەرخەمی کردوە لەوەدا کەدەست بەجێ تاپۆکەی نەخستۆتە سەرخۆی. بەڵام ئەم کەمتەرخەمیە نابێتە هۆی ئەوەی کەداوای پارە لەکڕیار بکرێت تەنها لەبەرگۆڕینی تاپۆیەك لەکەسێکەوە بۆکەسێکی تر! جا بۆ ئەوەی موسڵمانان لەم جۆرە حەرامانەدا خۆیان بەدوربگرن. چارەسەر ئەوەیەکە: هەرچی کڕین و فرۆشتنێکتان کرد، ئیللا بچنە لای حاکم و تا تاپۆ نەیەتە گیرفانتەوە، پارەی خۆت مەدە بەکەس. وە بەو فرسەت تاڵەبانەش دەڵێین: وەرە خۆت بخەرە شوێنی کڕیار، بزانە چەندت پێ ناخۆشە. کەئاوا بەناحەق پارەت لێ بسێنن.

پشتیوان بەخوای گەورە لەووتاری داهاتودا، ئەم بابەتە تەواو دەکەین (إن شاء الله).

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾

ٱللَّهُمَّ ءَامِينَ



سەرچاوەکان


١- قورئانی پیرۆز.

٢- الترغيب والترهيب ، الحافظ المُنذري ، ص٣٤٧، فەرموودەی ژمارە: ٢٥٧٦.

٣- صَحيح قِصَص الرَّسُول ﷺ ، سَعد يوسف أبوعَزيز ، ج٣ ص٩٥.

٤- مَوْسُوعَة نَظْرَة النَّعيم ، مجموعَةٌ مِنَ العُلَماءَ ، ج١٠ ، ص٤٥٥٠.




الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمِين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعين.

ئيمانداران: لەووتاری ڕابردودا باسی هەندێ لەو کەسابەتانەمان کرد کەلەشەریعەتی ئیسلامدا بەحەرام دانراون، بەپشتیوانی خوای تاك و تەنیا لەم ووتارەشدا باسی هەندێکی تر لەو حەرامانە دەکەین، بەئومێدی ئەوەی کەموسڵمانان خۆی لێ بپارێزن و ئەوەش کەتائێستا ئەنجامی داوە وازی لێ بێنێ و تەوبە بکات.

١- پاسەوانی و حیمایەکردنی بەرپرسی عەرەق خۆرو داوێن پیس:

خودی چەکداری حکومەت وەکو ئاسایش و پۆلیس و پێشمەرگە، کەبەرگری لە وڵات بکات و دیفاع لەمافی مەزڵوم بکات و نەهێڵێ بێکەس ستەمی لێ بکرێ و دزی بکرێ و ئاژاوە هەبێ، کارێکی پیرۆزە. بەمەرجێ عیبادەتی خوای گەورەی لەگەڵدا بکەی. بەڵام بوون بەحیمایەو پاسەوانی پیاو کوژێکی موتەکەبیری عەرەق خۆر، کەلەژورەوە خەریکی بەدڕەوشتی بێ و دوربێ لەهەموو ئاستێکی بەرپرسیاریەتی. ئەوە پاسەوانی کردنی ئەو جۆرە کەسانە حەرامەو معاش و موچەکەشی کەوەری دەگرێ حەرامە.

٢- دەوام نەکردنی دائیرەو خۆ دزینەوە لەدەوام، جاهەردەوامێك بێ و لەهەرپلەیەکدا بێ. بەداخەوە بەسەدان کەس لەم وڵاتەدا، تەنها معاش وەردەگرێ. جایان هەر دەوام ناکات و هیچ فەرمانگەیەکی بۆدەوام کردن نەبینیوە، یان بەکەمی دەوام دەکات، یاخود درەنگ دێ بۆ دەوام، یان بەر لەوادەی تەواو بوونی دەوامی ڕەسمی دائیرەکە بەجێ دێڵێ و دەڕواتەوە بۆ ماڵەوە. لەتوێژینەوەیەکی نایابی زانکۆی سلێمانی دا، دەرکەوتبوو کەلەڕیزی موچە خۆرانی هەرێمی کوردستاندا، (بێ کاری بێ دەمامك = ٤٪ - ٦٪) بێ کاری دەمامکدار — واتە هەرچی دەوام بێ نایکات، بەڵام ناوێکی بۆ دۆزراوەتەوە، وەکو: ناوازەیی، حیزبایەتی، تەفەڕوغ و فرۆفێڵی تر، کەئەمانە پێشیان دەڵێن: بن دیوار (٤٦٪)ی موچە خۆری بن دیوار هەیە لەهەرێمی کوردستاندا.. کەبەڕاستی ئەمانە هەمووی حەرام خۆرن و دزێکی تەعین کراون، دزن و هەویەو پێناسی فەرمانگەیەکیان لەگیرفاندایە!! هۆکاری ئەم جۆرە حەرام خۆریەش بەم شێوەیە تەشەنەی سەندوە کە لەدوای ڕاپەڕینەوە بەڕاستی زیادی کردوە، بۆ دوو شت دەگەڕێتەوە:

١- بەرپرسان، لەبەڕێوبەری فەرمانگەیەکی حکومیەوە، بۆ خۆی سەعات (٩) دێ بۆ دەوام و پێش (١٢) دەڕواتەوە. ئیتر مۆزەف و کارمەندو کارگوزارەکانیش

چاو لەو دەکەن و لەفرسەتێك دەگەڕێن کەڕۆژێك کەمتر دەوام بکەن، بابەڕێوبەر بۆ خۆی یەك دەقیقە لەدەوام دوانەکەوێ و دەقیقەیەك دوای دەوامی ڕەسمی فەرمانگەکەی بەجێ بهێڵێ. ئیتر بزانە کارمەند دەتوانێ خۆی بدزێتەوە لەدەوام؟! بێگومان نەخێر.

٢- بەدەیان کەس لەفەرمانگەکاندا دامەزراون موچە وەکو ئەو کەسانە وەردەگرن، کەڕۆژێك ئامادەنەبون (غائب) یان نەبوە، سەری مانگ و مانگ موچەکەی وەردەگرێ و لەولاوەش ئەندامی حیزبێکەو لەوێش موچەی چاکی هەیە، ئایا ئەمە ڕەوادان نیە بەگەندەڵی؟!

بەڵام: سوپاس بۆ خوای گەورە لەسایەی ئیمان و ئیسلام دا و پەروەردەی مزگەوت، کەسانێك هەن کەبەزەڕە خۆیان نەك لەحەرام، لەهەموو شتێکی گوماناویش دەپارێزن، مامۆستای بەڕێز هەیە، مامۆستای ئامادەییە، سێ ڕۆژ لەپرسەی کەسێکی نزیکی دا بەژداری کردوە، بەپێی یاسای پەروەردە لەقوتابخانەکەی خۆی بۆی کراوە بەمۆڵەت (إجازە) ، بەڵام سەری مانگ کەموچەکەی وەرگرتووە، ئامادە نەبووە موچەی ئەو سێ ڕۆژە وەربگرێ کەنەهاتوە بۆ دەوام و ڕەتی کردۆتەوە.

٣- جۆرێکی تر لەحەرام خۆری: وەرگرتنی خواردنی بایەعی کەسی مردوو، کەبەڕاستی ئەو کەسەی کەمردوە. پێویستە کەس و کاری یەکسەر فەرمانگەی خۆراکی لێ ئاگادار بکەن بۆ ئەوەی بەشەخۆراکی ئەو کەسە کەلەژیاندا نەماوە ببڕن.

٤- بەدەست هێنانی پارەو ماددەیەك، لەڕێگەی نوسینی دائیرەیەکەوە بەغەش و فێڵ:

بۆ نموونە: فەرمانگەی کشتوکاڵ – عەلەفی نوسیوە بۆ ئاژەڵ، کەسی واهەیە تەنها یەك مانگای هەیە، چوە لەسەر گوندێك کەماڵیشی لەوێ نیە، عەلەفی (٤٠) مانگای وەرگرتووەو پاشان فرۆشتویەتیەوە!! ئەمە حەرامەو ئەو مۆزەفەش کەزانیویەتی ئەمە ناڕاستەو لەبەردۆستایەتی و گلەیی نەهاتنەسەر بۆی نوسیوە. ئەویش شەریکی تاوانی ئەو حەرام خۆری یەیە.. بەداخەوە زۆرجار ئەو کەسانە خۆیان بەپیاوباش نیشان دەدەن و شانازی بەوەوە دەکەن کەشوکر لەسەر دەستی خۆیان دەژین و بەرهەمی پاکی ئاژەڵەکانیان دەخۆن، بەڵام بێئاگا لەوەی





کەماست و گۆشت و هەموو بەرهەمی ئەو مانگا و مەڕو بزنەی ئەو عەلەفەی خواردوە (کەبەدرۆو غەش وەری گرتووە) حەرامە! (تَحْسَبُونَهُ هَيِّناً وهُوَ عِنْدَاللهِ عَظيم).

یان کەسی واهەیە ئاژەڵدارە. بەڵام بۆن و بەرامەی پیسی بەسەر خەڵکا دەکات و ژیانی لێ تاڵ کردوون. یان زبڵ و پاشەڕۆی ئاژەڵەکانی دەکاتە مەنهۆڵی ئاوەڕۆوە و دەبێتە هۆی گیرانی ئاوەڕۆی گەڕەکێك و ئازاردانی ئەو هەموو خەڵکە!

یاخود ئاژەڵداری واهەیە، کەمانگاکەی شەو و ڕۆژ بەرەڵاکردوەو خۆی بەحەوشەی ماڵاندا دەکا یان دەچێتە گەنم و کشتوکاڵی خەڵکی یەوە! تەماشاکەن ئەم کەسە بەڕواڵەت حەڵاڵ خۆرە، کەلەسەر ئاژەڵ دەژی، بەڵام بەهۆی ئەو کردەوە ناشایستانەیەوە حەرام خۆرێکی زەق و ئاشکرایە.. حەڵاڵ خۆری وەکو مام میرزای باوکی سەعید نەوڕەسی دەبێت، کەکاتێ مانگاکەی دەبرد بۆ لەوەڕگا، لەماڵەوە تورەکەیەکی دەکردە دەمی تادەگەیشتە لەوەڕگا.

وە لەو سەریشەوە کەدەیهێنایەوە بۆ ماڵەوە. تورەکەکەی دەکردەوە بەدەمیدا، بۆچی؟ بۆ ئەوەی کەنەوەکا لێی بێئاگابێ و لەڕێگادا دەم ببات بۆ زرعات و کشتوکاڵی خەڵك و حەرام بێتەلاشەیەوەو سەرەنجام شیرو بەرهەمەکەی حەرام بێ و خێزانەکەشی کەبەرهەمی ئەم مانگایە دەخۆن، توشی حەرام خۆری ببن! خۆزگایە ئاژەڵدارەکان ئاوا ڕەچاوی حەڵاڵ و حەرامیان بەوردی بکردایە.

٥- کەسێك خاوەن پیشەکەیە، جاهەرپیشەیەك بێ، لەوەستای بینایەکەوە، تادارتاشێك، ئاسنگەرێك، فیتەرێك، یان کرێکارێك، ئەگەر وابەدڵسۆزی ئەو ئیشەی نەکرد وەکو بۆماڵی خۆی بکات، ئاوا بۆ ئەوکەسەشی بکات کەبەپارە کاری بۆدەکات. وەدرێغی تێداکرد وئیهمالی کرد، ئەمە ئەم کەسە هەرچەندە ڕەنجی داوە، کاری کردوە، عەرەقی ڕشتوە، بەرهەمی پێشکەش کردوە. هەرحەرام خۆرە بەئەندازەی ئەوەندەی کەمتەرخەمی کردوەو دڵسۆزی نەنواندوە، بەئەندازەی ئەوە پارەکەی حەرام بووە!! وەئەم ڕەفتارەشی بەڵگەیە لەسەر لاوازی ئیمانی خاوەنەکەی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (لايُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لاخيهِ مايُحِبُّ لِنَفْسِهِ). رَواهُ البُخاريُ (١٣) ومُسْلِمْ (٤٥).

٦- هەرشتێ بە لەڕوودامان (غصبُ الحياء) دەستت کەوتبێ حەرامە، هەرشتێ

داوات کردبێ وکابرا لەشەرمان بڵێ: باپێشکەشت بێ وتۆش یەکسەر بڵێ ی سوپاس و هەڵی بگری ئەوە حەرامە. کەواتە: ئەمڕۆ وێر لەمەطعم ولەناو ئوتومبێل دا حەرامە. چونکە زۆرکەس لەڕوودادەمێنێ کەدۆستێك، خزمێکی توشی دەبێ لەمەطعەمێکدا، یان لەناو پاص وقەمەرەیەکدا. کەئەمیش وەکو ئەوان نان دەخوا یان نەفەرە، پارەی هەمویان دەدات، ئەمە بەڕاستی حەرامە ونابێ کەس قبوڵی بکات کەسی تر پارەی بۆبدات. وەچاك وایە. خاوەن چێشتخانەکە، وەدوکاندارەکان، وە شۆفێری خەتەکانی گواستنەوەی نەفەر، قبوڵ نەکەن کەس پارەی کەس بدات. بۆئەوەی خەڵکی لەم حەرامە بەدووربن. گوێ بگرن پێغەمبەری خوا ﷺ بەئاگامان دێنێتەوە ودامان دەچڵەکێنێ، دەفەرموێ: (لایَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ یَأْخُذَ عَصا أَخِیهِ بِغَیْرِ طیبِ نَفْسٍ منهُ، قالَ: ذلك لِشِدَّةِ ماحَرَّمَ اللهُ من مالِ المُسْلِمِ عَلى المُسْلِمِ) رَواهُ إبنُ حَبّان فِي صَحیحِهِ (١١٦٦).

واتە: ڕەوانیە بۆ موسڵمانان کەگۆچانی، داردەستی براکەی بەدەستەوە بگرێ (ئەمڕۆ تەسبیحەکەی یان مۆبایلەکەی لێ وەربگرێ ولەدەستیەوە بدات وکاتی پێ بەرێتەسەر) بەبێ ئەوەی کەدڵنیابێ کەخاوەنەکەی چەندی پێ خۆشە لەناخی دڵەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەمەش لەبەر ئەوەهەموو توندیەی کەخوای گەورە لەحەرام بونی ماڵی موسڵمان لەسەر موسڵمان نواندویەتی. جائەگەر دەست لێدان و بەدەستەوە گرتنی دروست نەبێ، ئەی ئەگەر بیخاتە گیرفانیەوە بیبات، یان بڵێ بەڕاستی جوانە وخاوەنەکەشی لەڕوودابمێنێ وبڵێ: پێشکەشت بێ، یەکسەر بڵێ سوپاس وبیخاتە گیرفانیەوە. ئەبێ ئەمە چ حەرامێکی گەورەبێ!..



٧- هەدیە ودیاری وەرگرتنی بەرپرس و مۆزەفی فەرمانگەکانی حکومەت، لەهاوڵاتیەك کەئیشی دەکەوێتەلای. جائێستا ئیشەکەت پێ بێ، یان لەمەودوا ئیشی پێ ببێ وەپێشتر هەرگیز ڕۆژێ لەڕۆژان هەدیە ودیاری بۆ نەبردوە، کەسەکە دیاریەکە دەبات دەزانێ ئیشەکەی ناڕوات، یان کارەکەی نایاسایی یەو بۆ ڕایی کردنی ئیشەکەی و بەیاسا کردنی نایاساییەکەی. بەناوی دیاریەوە شتێ ئەدات بەبەرپرسەکە یان مۆزەفەکە. ئەمە دیاری وهەدیە نیە وبەرتیلە وحەرامە. سەرنجی ئەم فەرمودەیە بدەن: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی نارد بۆکۆکردنەوەی زەکات، ئەم پیاوە ناوی (إبنُ اللتبیه) بوو، جاکاتێ ئەو پیاوە ڕۆیشت وئاژەڵەکانی زەکاتی کۆکردەوەو هێنایەوە بۆخزمەت پێغەمبەری خوا



ﷺ، وەباسی کرد کەئەوەو ئەوەیەو هی فلاّن وفلاّنە.

وە ووتی: (هذا لَكُمْ وهذا أُهْدِيَ لِي) ئەمە بۆ ئێوە و بیخەنە (بَيْتُ المال) ەوە وەئەوانەشی هی خۆمە وخەڵکەکە کەچوم بۆلایان بەدیاری دایان بەخۆم! پێغەمبەری خوا ﷺ کەئەمەی بیست چوە سەرمینبەرو سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کردو پاشان فەرمووی: (مابالُ عامِلٍ أبْعَثُهُ، فَيَقوُلُ: هذا لَكُمْ وهذا أُهْدِيَ لِي!، أفَلا قَعَدَ فِي بَيْتِ أَبْيهِ أوْ بَيْتِ أُمِّهِ حَتَّى يَنْظُرَ، أَيُهْدَي إلَيْهِ أَمْ لا؟!) رَواهُ البُخاري (٧١٩٣) ومُسْلِم (١٨٣٢).

واتە: ئەمە چیە کەکەسانێك، کەئێمە دەیانکەین بەفەرمانبەر ودەیاننێرین بۆ کۆکردنەوەی زەکات. کەچی کەدێتەوە دەڵێ: ئەمە بۆئێوە – موسڵمانان وئەمەش بەدیاری دراوە بەخۆم! باشە ئەوکەسانە بۆ بیرناکەنەوە، ئایا ئەگەر لەماڵی باوکی یان لەماڵی دایکی دابنیشێ، ئایا هیچ کەس دیاری بۆدەبات یان نا؟! بێ گومان هیچ کەس لەدەرگای نادات. لەبەر ئەوە ئەوەی پێ ی دراوە بەناوی دیاریەوە، ئەوە بەهۆی ئەو لێپرسراویەتیەوە بوە وپێ ی حەرامە ودەبێ بیخاتەوە خەزێنەی موسڵمانانەوە..

٨- یەکێکی تر لەحەرامەکان، بریتی یە لە: قاچاغچیەتی، چونکە بەردەوام ئەوکەسە خۆی وماڵ وسامانەکەی لەمەترسیدایە وئەوەی بەچەند ساڵ پەیدای کردوە، نزیکە لەگیرانێکدا هەموی لەدەست بدات وکەسایەتیشی لەکەداربێ. کەواتە: قاچاغچیەتی وەکو قوماركردن وایە وحەرامە.

٩- ئەوخانوو زەوی وزارو کەلوپەلانەی کەلەدوای مردنی کەسێك بەجێ ماون ویەکێ لەمیراتگرەکان دەستی بەسەردا گرتوون وبەشی ئەوانی تری لەخوشك وبراکانی نادات، ئەوە بەڕاستی ئەوخانوو زەوی وکەلوپەلە، وە ئەو بەرهەمەی لێ ی دەست دەکەوێ، هەموی حەرامە!.

بەڵێ ئیمانداران: ئەمە چەند حەرامێك بوون کەئەمڕۆ لەناو کۆمەڵدا هەن وبەداخەوە زۆرکەس خۆی لێ گێل دەکات، ئەینا بەخوا پرسی شەرع وماموٚستای ئاینی ناوێ، دڵی خۆت، ویژدان وهەستی خۆت (ئەگەر نەمردبێ) پێت دەڵێ حەلاڵە یان حەرامە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (الحَلالُ بَيِّنٌ والحَرامُ بَيِّنٌ) حەلاڵ ڕوون وئاشکرا دیارەو حەرامیش بەهەمان شێوە.. بۆ ئەو شتانەی کە لە

گوماندای ئایا حەڵاڵە یان حەرامە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (إِسْتَفْتِ قَلْبَكَ، البِرُّ ماإطْمَأَنَّتْ إِلَيهِ النَفسُ، واطْمَأَنَّ إِلَيْهِ القَلْبُ، والاثْمُ ماحاكَ في النَّفْسِ وتَرَدَّدَ في الصَّدْرِ، وإِنْ أَفْتاكَ الناسُ وأَفْتُوكَ). أَخرجه أَحمد والدّارَمي بِإِسْنادٍ حَسَنٍ.

بەڵێ، لەدڵی خۆت پرسە، باشترین مامۆستا ورێنیشاندەرتە کەئایا حەڵاڵە یان حەرامە. پێغەمبەری دڵسۆزمان تەرازویەکی داوەتە دەستمان کەبەهۆیەوە حەڵاڵ و حەرام لەیەك جیادەکەینەوە. ئەویش ئەوەیە: (الاثْمُ ماحاكَ في صَدْرِكَ وكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النّاسُ).

گوناهو تاوان و بێ شەرعی، ماڵی حەرام ئەوە نیشانەکەیەتی کە:

١- لەدڵ و سینەی خۆتدا هەست بە نائارامی دەکەی. دانیمەن قەلەق و نائارامی، جاران پێش ئەوەی ئەوحەرامەت بێتە ماڵەوە وانەبووی ئێستا نارامی دڵ ودەرونت لێ هەڵگیراوە.

٢- وەحەزیش ناکەی کەخەڵکی بەوە بزانن کەتۆ ئەوپارەیە، ئەوکەلوپەلەت دەست کەوتووە، حەزدەکەی نهێنی بێ و کەس پێ ی نەزانێ و ئەگەر خەڵکی پێیان زانی پێ ی تەریق دەبیتەوە.

بەڵێ، مادام دڵ بۆگەن نەبوبێ و نەرزیبێ و نەگەنیبێ ونەمردبێ، بۆت جیادەکاتەوە کامە حەڵاڵەو کامە حەرامە. بەڵام دڵی موسڵمان، دڵی ئیماندار، دڵی زیندوو، دڵی ساغ، چۆن ئەگەر مرۆڤ تەندروستبێ ونەخۆش نەبێ، بەتامی دەمی تاڵ و شیرین لەیەك جیادەکاتەوە.بەڵام کەنەخۆش کەوت، هەنگوین لەدەمیا تاڵ دەبێ، دڵی ساغ و دڵی نەخۆشیش بۆلێك کردنەوەی حەڵاڵ وحەرام هەرئاوان.

دەی باناگامان لەخۆمان بێ، مەردی مەیدانی دەوێ، کەمرۆڤ لەناو ئەوهەموو حەرامەدا، خۆی بەسەلامەتی ڕزگار بکات. ئەمڕۆ وای لێ هاتووە، هەرچەندە حەرامەکە ناخۆی، کەچی لە هەرچوارلاوە دەورت دەدات.

بۆ نموونە: کەسێك لە(بیتاقەی یانسیب)دا، شتێکی بۆ دەرچوو. شیرینی بەسەر هاوکارو هاوڕێکانیدا دەبەخشێتەوە. ئاخر خۆ ئەو شیرینیەش حەرامە! ووریانەبی تووشی دەبی، دەبێ بەحەزمرەوە بڕۆی. هەروەکو کەکاتێ لە ئەبوهورەیرەیان پرسی: تەقوا چی یە؟! لەوەڵامی پرسیارەکەدا فەرمووی: ئایا هەرگیز بەڕێگای دڕکاویدا، کەدڕك و چقڵ و چاڵی هەبێ ڕۆیشتوی؟! پرسیارکار



ووتی: بەڵێ. فەرمووی: لەوکاتەدا چیت کردوە؟ ووتی: خۆم هەڵکردوەو بەوریایی و بێ پارێز هەنگاوم ناوە. فەرمووی: (ذاكَ التَّقْوى) دەی ئەمە تەقوایە.

ئیمانداران: ئەمڕۆ لەژێر دەیان ناوو ناونیشاندا، حەرام دەخورێ و بڵاودەکرێتەوە. وای لێ هاتووە دەرگای حەڵاڵەکان دادەخرێ، بۆئەوەی حەرام خۆرەکان دیارنەبن، بۆئەوەی ئاماژە بۆ دزەکان وئیشە دزیەکان نەکرێ. وای لێ هاتووە خەریکە موحارەبەی حەڵاڵ خۆرەکان دەکرێ، دەردەکرێن، پێش ناخرێن، بەگێل دەزانرێن، چونکە ئابڕوی دزەکان دەبەن!.

جائاگات لەخۆت بێ، پێش هەمووکەس بەزەییت بەخۆتدابێتەوە، ئەو ماڵەی بەحەرام پەیدای دەکەی وخۆتی بۆ شەرمەزار دەکەی، هەروابزانە بەجێت هێشت، چونکە هەموو شتێکی هاتوو هەرچەندە دووربێ، هەرنزیکە خۆ مردن هەرزۆر نزیکە دوایی قەبرێکی تاریك بێ پارە، بەدەستی خاڵی، بەڵام خۆزگە هەربەجێهێشتن بوایە فلس، بەفلس حیسابت لەگەڵ دەکرێ. چۆنت پەیدا کردو لەچیدا خەرجت کرد. لەناو قەبرو دوای قەبرەوە. هەمووی خاڵی پشکنینە، بەمسقاڵە زەڕە حەرام ئاشکرا دەکات.

چۆن ئەم جیهازانەی ئەمڕۆ بەزەڕە (TNT) ئاشکرادەکەن وهەرکەلێ ی نزیك بۆوە هاواری لێ بەرزدەبێتەوە... دەی بەخوا پارەی حەرام لە (TNT) خراپترەو لوغمەو بەخۆت و ماڵ و منالّتا دەتەقێتەوە ئەمڕۆنا سبەی، تەوقیت کراوەو کەکاتی خۆی هات، حەڵاڵەکەشت لەگەڵ خۆی دەبات. دەی چەند دەتوانی خۆتی لێ بپارێزە. خۆت نەخەڵەتێنی بەوەی بڵێ ی کەهەمبوو، حەرامیش بێ خێروخێراتی لێ دەکەم و خوای گەورە لێم خۆش دەبێ، نەخێر، ماڵی کەس بەکەس حەڵاڵ نابێ وخوای گەورە پاکەو ماڵی پاکو حەڵاڵ نەبێ وەری ناگرێ. (إنَّ اللهَ طَيِّبٌ لايَقْبَلُ إلاطَيِّباً).

تۆ موکەلەف نی بەوەی ماڵی خەڵك ئاوەدان بکەی. بەڵام ماڵی قیامەتت بڕوخێنی، خەڵکی تێربکەی بەڵام تۆ کێم و زوخاوی دۆزەخیەکان خواردن و خواردنەوەت بێ، ژن وکچت بەپارە حەرامەکەی تۆ بازنی ئاڵتونی لەدەستابێ وخۆی پێوە بابدات. تۆش کەدەچیتە حزوری خوای گەورە هەموو ئەو ماڵە

حەرامە بۆت ببێ بەمارو هارو لەگەردنت بئاڵێ وخوای گەورە بفەرموێ:
﴿ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ثُمَّ الْجَحِيمَ صَلُّوهُ ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَاسْلُكُوهُ ﴾الحاقة: ٣٠-٣٢.

بۆچی خوای پەروەردگار ئاوای لێ دەکرێ؟! (إِنَّهُ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ) دەی نیشانەی ئیمان بەخوا ئەوەیە، بەگوێ ی خوا بکەی، ئەوەی حەرامی کردوە نەیخۆی. ئەگینا خۆبەقسەی بێ کردەوە هەمووکەس پیاوی چاکە!.. لەپێناوی ماڵ ومناڵ و میوانتدا کە لەقەصرو قصورە پڕکارەباو چەند قاتەکەتدا خۆش بژین، قەبرەکەت تاریك مەکە، مەبە بەچرا ڕووناکیەکەی بۆ دەوروبەرە، بەڵام ژێرخۆی تاریکستانە!.

ئومێدەوارم ئەم ووتارە بەئاگامان بهێنێتەوە، هەرحەرام خۆریەکمان لەمانە تێدایە وازی لێ بێنین. (إن شاءالله)، ئەم باسانە بەرهەمی هەبوەو دەشیبێ، ئێمە ووتاری هەینی بۆکات بەڕێ کردن ناخوێنینەوە.

بەڵکو دوای بەجێ هێنانی فەرزی جومعە وداواکاریمان لەخوا، کە بەگەورەیی خۆی لێمان قبوڵ بکات، پاشان ئامانجمان ئەوەیە: خۆمان وخەڵکەکەمان خوامان لێ ڕازی بێ ودونیامان بەختەوەرو بەهەشت جێگامان بێ وبرای یەکتری بین ودڕك وداڵ نەخەینەسەر ڕێگای یەکترو دڵی یەکتر شاد بکەین و پڕ ژانی نەکەین.

سوپاس بۆ خوا بەرهەمی ئەم ووتاری مینبەرانەیە، کەهەواڵێکی موژدە بەخشتان پێ ڕادەگەیەنم، کەگەورەیی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی دەردەخات ونابوتی و قەزەمی ناحەزانی دەسەلمێنێ. ئەویش ئەوەیە: لەبەرواری (٢٠/١٠/٢٠٠٨) دا، پێلاوێکی کالەی صینی. کەوتە بازاڕی سلێمانیەوەو لەژێرەکەی نووسرا بوو (محمد) پەنا بەخوای گەورە، بەلام ناوی (محمد) ﷺ هەرگیز نزم نابێ، چونکە بەڵێنی خوایە ﴿ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ﴾ بەڵێ کە ئەم دەنگ و باسە بڵاو بۆوە، مامۆستایانی مینبەرو میحراب، لەگەڵێ مزگەوت باسیان کردو ئیدانەی توندیان کرد. بەڵام بەندە ئەوەندەی پێ دڵتەنگ بووم دڵم نەهات دڵی ئێوەی خۆشەویستانی محمدی ﷺ پێ ناڕەحەت بکەم.



بەڵام ئەمڕۆ کەباسم کرد، هەواڵێکی جێگای دڵخۆشیم لابوو. ئەویش ئەوەیە: ئەو کەسەی کە ئەوجۆرە پێلاوە کالەی بۆهاتووە، کە ڕێژەیەکی یەکجار زۆرەو لەدوبەیەوە بۆی هاتووە. کوڕێکی گەنجەکە لەقۆندەرە بۆیاخ کردن و عەلاگە



فرۆشیەوە، وردە وردە دەوڵەمەندبوەو ئێستا بازرگانی دەوڵەتی دەکات کاتێ کەئەم دەنگ و باسە بڵاودەبێتەوەو ئەم گەنجە کەئاگای لەهیچ نیە ئەوەی ماویەتی نایفرۆشێ و ئەوەشی فرۆشتویەتی بۆی دەهێننەوە. زۆر بەناڕازی یەوە پەیوەندی دەکات بەوکۆمپانیایەی کەلەدوبەیەوە ئەوکالەو پێڵاوانەی ناردوەو ئەم جەریمە گەورەی ئەنجام داوە. ئەوانیش پێ ی دەڵێن، هەمویمان بۆ بنێرەوە وکرێ ی ناردن و هێنانەوەی لەئەستۆی خۆمان و هەموو پارەکەت بەتەواوەتی بۆ دەگێڕینەوە، بەڵام با ئەم مەسەلەیە بەبێ دەنگی کۆتایی پێ بێت!

ئێمە زەرەر ناکەین وکەسانی تر هەیە. بازرگانی تر هەیە بۆ ئەو وڵاتانەی دەبات کەموسڵمانی لێ نیە. یان زۆر کەمەو لەوێ صەرفی دەکەین:

بەڵام لێرەدا هەڵوێستی ئیماندار دێتە مەیدان. ئەم گەنجە کەبەشی هەرەزۆری پارەکەی ئائەوەندەیە کەبەو کالەیەی داوەو ئەو پارەیەی کەزۆر لەلای شیرینە، بەڵام (محمد المصطفى)ی لەلا شیرینترە، خۆشەویسترە، پارە دەست دەکەوێتەوە، بەڵام کە پێغەمبەری خوای لێ عاجز بوو، دەستی ناکەوێتەوە بۆیە مامۆستایانی ئاینی بانگ دەکات ودەڵێ: ئێوە بەشاهیدبن هەموو پێڵاوەکانم کۆکردۆتەوە. ناینێرمەوە بۆ دوبەی و قبوڵی ئەوە ناکەم نەك هەرلای ئێمەی کورد، لەهیچ جێگایەکی ئەم جیهانە سوکایەتی بەناوی بەرزی سەردارو سەروەرمان، نوری چاومان، شەفیعی مەحشەرمان محمد ﷺ بکرێ. وابڕیارم دا دەست لەهەموو پارەکانم هەڵدەگرم و لەدەرەوەی شار بەئامادەبونی ئێوەو چەند کامێرایەك، تەواوی ئەو پێڵاوە کالانە لەناودەبەم ودەیانسوتێنم!!

بەڵێ ئەم گەنجە خواناسە هەموو پێڵاوەکان بەچەند ئوتومبێل دەباتە دەرەوەی شار و بەئامادەبونی مامۆستایانی بەڕێزی مزگەوت، دەیانسوتێنێ، مامۆستایانی ئامادەبووی سوتاندنەکە فەرمویان: کوڕە گەنجە بازرگانەکە لەوکاتەدا دڵی پڕبوو، چەند دڵۆپ فرمێسك بەچاویدا هاتەخوارەوە، مامۆستایان وایانزانی خەمی پارەکەیەتی. دڵخۆشیان دایەوە، بەڵام ئەو فەرمووی: بەخوا خەمی پارەم نیە. مەبەستم بوایە دەستم دەکەوتەوەو زۆریش مەمنونم بوون، بەڵام بەخوا بۆیە غەمبارم و دڵم پڕە، خەمی ئەوەمە تۆ بڵێ ی محمد المصطفى ﷺ. لێم عاجز نەبێ و لەقیامەتا ڕووم هەڵبێ کە بچمە خزمەتی

و داوای شەفاعەت و ئاوی حەوزی کەوسەری لێ بکەم. لەکاتێکا بەهۆی منەوە، ئەم دەنگ و باسە هەژێنەرە، خەمهێنەرە، دڵی عاشقانی حەزرەتی محمدی ئازارداوە!.

ئەینا خۆم و باوك و دایکم وخێزان و منالم و هەموو کەسم و هەموو سەروەت و سامانەکەم بەقوربانی ناوی (محمد) بێ ﷺ. ئێمەش دەڵێین:

خوای گەورە ئێمەش و ئەویش بخاتە ڕیزی خزمەتکارانی پێغەمبەری خوا ﷺ وە لەقیامەتا بەر شەفاعەتی بکەوین وخوای گەورە نموونەی ئەو بازرگانە بەهەڵوێستە دلێرو بوێرە زیاد بکات.

اَللّٰهُمَّ آمِين

سەرچاوەکان 





الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبهِ أجْمَعين.

ئیمانداران؛ پشتیوان بەخوای تاك و تەنها ووتاری ئەمرۆمان، وەكو تەواوكەری ووتارەكانی ڕابردوو هەر باسی بابەتی ئابوری یە. باسی ئابووری موسڵمانە دەكەین. كەتیایدا حەڵاڵ و حەرام باس دەكرێ. ئەو حەڵاڵ و حەرامەی كە: (قِوامُ الإسْلامِ، ودَليلُ الإيمانِ، وميزانُ الصِّدْقِ عِنْدَ الواحِدِ الدَّيان)، كۆڵەكەكانی ئیسلامەتیە، بەڵگەی ئیمانە، تەرازووی ڕاستگۆیی یە لەلای خوای تاكو تەنهای پاداشت دەرەوە.

بەڵێ ئیمانداری و خواناسی ئەگەر هەر بەقسەبێ و كرداری لەگەڵ نەبێ هیچە، كارو كردەوەش ئەوەیە كە ئەوەی خوا فەرمویەتی بیكەی و ئەوەی فەرمویەتی مەیكەو دورە پەرێزبە خۆتی لێ بەدوور بگری و نەیكەی. ئەمەش كاتێ لەمرۆڤدا دێتە دی كە دڵی پڕ بێ لەخۆشەویستی خوای پەروەردگارو پێغەمبەری سەروەرو سالاڕ، چونكە كەسێ بڵێ خواو پێغەمبەرم خۆش دەوێ، بەڵام بێ فەرمانیان بكات، ئەوە ئەو قسەیەی درۆ و دووڕوییە.

قورئانی پیرۆز كەباسی دۆستان و نزیكانی خوای پەروەردگارمان بۆ دەكات، دوو صیفەتیان بۆ باس دەكات: (ئیمان بەخوا + تەقوا). وەكو دەفەرموێ: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ﴾ يونس: ٦٢ - ٦٣.

بەڕێزان: ووترا بەیەكێ لە عارفان و خواناسان، ئایا وەلی و دۆستی خوا ئەو كەسەیە كەبەسەر ئاودا دەڕوات و ئاوەكە هەڵی نالوشێ و وەكو بەسەر جادەدا بڕوات ئاوا بەسەر ئاوەكەدا دەڕوات؟ فەرموی: نەخێر. ووترا: ئەی وەلی كەسێكە كە بەبێ باڵ بەهەوادا دەفڕێ و لەم شاخ دەڕوات بۆ ئەو شاخ، بەبێ هیچ وەسیلەیەك و ئامێرێك؟! فەرموی: نەخێر. ئەمجا فەرمووی: وەرن باپێتان بڵێم كەوەلی و خواناس و پیاو چاكی بەحەق كێ یە! (الوَليُّ كُلُّ الوَلي، الَّذي تَجِدُهُ عِنْدَ الحَلالِ وَالحَرامِ) وەلی ڕاستەقینە ئەو كەسەیە كە لەئاستی حەڵاڵ و حەرامدا بەهەڵوێستەو، ئەگەر حەڵاڵ بوو دەیخوات و وەری دەگرێ و پەیدای دەكات. ئەگەر حەرامیش بوو، تەنها لەبەر فەرمانی خوا وازی لێ دێنێ و دەستی بۆ نابات و خۆی لێ دەپارێزێ.

وەدەبێ یەقینیشمان هەبێ كەئەو شەرعەی كەحەڵاڵ و حەرامی دیاری كردوە، ئەو شەریعەتە. هەموی دادپەروەریە، هەموی لەبەرژەوەندی مرۆڤدایە، هەمووی لە ئەوپەڕی كاربەجێ یدایە. چونكە لەلایەن دروستكەری مرۆڤەوە كە





(الله) یەهاتووە. (وَلا يَنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِير).

ئیمانداران: بەڕاستی ئاینی ئیسلام دەیەوێ کەسایەتی مرۆڤ بنیات بنێ. مرۆڤی موسڵمان بەکەسایەتی بەرزو بڵندو ڕەفتارو ئاکاری مەردانەو جوامێرانەی لەناو خەڵکانی تردا دیاربێ و خەڵکی ئاماژەی بۆ بکەن، جا شەخصیەت و کەسایەتی مرۆڤیش کاتێ پارێزراوەکە حەڵاڵ و حەرام بزانێ و بناسێ، چونکە ئەو کات مافی خۆی وەردەگرێ و دەست بۆ مافی خەڵکی تر نابات.

ئێستاش بەوویستی خوای پەروەردگار چەند بنەمایەکی شەرع بۆ حەڵاڵ و حەرام باس دەکەین:

١- الاصْلُ فِي الاشْياءِ الاباحَة: بنچینەی هەموو شتەکان لەسەر حەڵاڵیەتە واتە: ئەوەی کەخوای گەورە دروستی کردوە بۆ خزمەتی مرۆڤەو بۆی حەڵاڵ کردووە. مەگەر دەلیل و بەڵگەیەك لەقورئان و فەرمودەی پێغەمبەردا ﷺ هەبێ لەسەر حەرام بونی. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ الجاثية: ١٣.

(سبحان الله)، خوای گەورە باسی (ڕام کردن و) ژێربار خستنی کردوە، جا سەرنج بدەن هەموو ئەوانەی کەحەڵاڵن زۆر بەئاسانی بەدەستەوە دێن.

بۆ نموونە: لەمعامەلەو کڕین و فرۆشتندا، ئەوەی حەڵاڵەو شەرعیە بەهەموو کەس دەکرێ، هەرچەندە فەقیر حاڵیش بێ، بەڵام ئەوەی حەرامە وەکو: دزی و غەش و تەزویرو خیانەت چونکە خوای گەورە پێ ی ڕازی نی یە و موسەخەری نەکردوە، بەهەموو کەس ناکرێ.

یان لەبواری خواردن و خواردنەوەدا. تەماشاکەن، ئەوەی گۆشتی دەخورێ و خوای گەورە حەڵاڵی کردوە، بزانە چۆن بۆ مرۆڤی موسەخەر و ڕام کردوە. ئەو ئاژەڵ و باڵندەی کە حەڵاڵەو گۆشتی دەخورێ. بەئاسانی ڕادەگیرێ، بەخێو دەکرێ، پاشان بەئاسانی سەر دەبڕدرێ. بەئاسانی لەکێو و بیاباندا ڕاودەکرێ! وەکو مەڕ و بزن و مانگاو ئاسك و حەیوانە کێوی و مریشك و کەڵەشێرو ..... هتد.

بەڵام ئەوەی حەرامە، ئەوەی کەخوای گەورە خواردنی قەدەغەکردوە، موسەخەری نەکردووە بۆ مرۆڤ. بەئاسانی دەستە مۆ نابێ، نایەتە ژێر چەقۆی سەربڕین، وەکو: سەگ ، شێر ، پڵنگ ، هەڵۆ ، داڵ ، قەلەڕەش. بزانە ئەمانەو هاوشێوەکانیان چۆن دووری لەمرۆڤ دەکەن و مرۆڤ بەئاسانی ناتوانێ دەستی

بیانگاتێ و سەریان ببڕێ و گۆشتیان بخوات. وەپاشانیش ئەوەی کەخوای گەورە حەڵاڵی کردوە. تەماشاکە چەند بەئاسانی دەکولێ. بەڵام ئەوەی کەخوای گەورە حەرامی کردوە، زۆر بەناڕەحەت دەکولێ و ئەگەر کولاش هێشتا هەر پڕە لەمیکرۆبی زیان بەخش و کوشندە بۆ مرۆڤ. تەنانەت خوای گەورە کولاندنەکەشی بۆ مرۆڤ موسەخەر نەکردوە.

بەڵێ ئیمانداران: لەشەرعدا بازنەی حەرام کراوەکان بەرتەسك بۆتەوە، هەموو ئەوەی کەخوای گەورە لەسەر بەندەکانی حەرام کردوون. مرۆڤ بەئاسانی دەتوانێ بیانژمێرێ. وەلەچەند لاپەڕەیەکدا دەنوسرێنەوە. بەڵکو ئەگەر کورتی بکەیەوە هەموو حەرام کراوەکان لەچەند دێڕێکدا دەنوسرێنەوە.

بەڵام بازنەی حەڵاڵ زۆر فراوانە کەئەگەر هەموو ئەو شتانەی کەخوای گەورە بۆ مرۆڤی حەڵاڵ کردون بیانژمێرین بەدڵنیاییەوە ناتوانین بیانژمێرین. وە زۆرێکیان هەر ناومان نەبیستون و نەمانبینیون وەئەگەر هەموو ئەو شتانەی کەخوای گەورە بۆی حەڵاڵ کردوین بیانژمێرین. ئەوە هەرگیز ناتوانین و بەچەندین کتێب نانوسرێنەوە، پێغەمبەری خۆشەویستمان دەفەرموێ: (ماأَحَلَّ اللهُ فِي كِتابِهِ فَهُوَ حَلال، وَماحَرَّمَ فَهُوَ حرام، وَماسَكَتَ عَنْهُ، فَأَقْبَلُوا مِنَ اللهِ عافِيَتَهُ، فَإِنَّ اللهَ لَمْ يَكُنْ لِيَنْسِى شَيْئاً – وَتَلا قوله تعالى: وَما كانَ رَبُّكَ نَسِيّاً) حديْثُ حَسَنُ، أخرجه الحاكم وَأورده الهَيْثَمي فِي صجمع الزَّوائِد.

واتە: ئەوەی کەخوای گەورە لەقورئانەکەیدا حەڵاڵی کردوە بۆتان، ئەوە حەڵاڵە، وەئەوەی حەرامی کردوە. ئەوە حەرامە. وەئەوەی لێی بێدەنگ بووە ئەوە عەفوو چاو پۆشی لێ کراوە. دەی ئەوەی خوای گەورە چاو پۆشی لێ کردوەو حەرامی نەکردوە. ئێوەش بەحەڵاڵی وەری بگرن، چونکە بەڕاستی خوای گەورە هیچ شتێکی لەبیرنەچووە. پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە کەخوای گەورە فەرمویەتی: (وَماكانَ رَبُّكَ نَسِيّاً)

٢- التَحليل وَالتُّحريم من حَقِّ اللهِ تَعالى وَحْدَهُ: حەڵاڵ و حەرام کردنی هەرشتێك تەنها مافی خوای گەورەیەو بەس، بۆیە هەرکەسێك حەرامێك کەخوای گەورە بەحەرامی داناوە. حەڵاڵی بکات، یان بەپێچەوانەوە شتێك کەخوای گەورە حەڵاڵی کردووە. ئەم حەرامی بکات، ئەوە (پەنا بەخوا)دەست درێژی کردۆتە سەر مافی پەروەردگاریەتی خوای گەورە لەدانانی یاساو تەشریع بۆ بەندەکانی. وەهەرکەسێك بەقسەی ئەم بێ دینە ڕازی بێت و شوێنی بکەوێ و پشتگیری لێ

بكات، ئەوە پەنا بەخوا، ئەو كەسەی كردووە بەهاوبەشی خوای گەورە. وەپێی دەبێ بەموشریك.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَـٰٓؤُا۟ شَرَعُوا۟ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴾ الشورى: ٢١.

بەڵێ، سەلەفی ساڵحی ئەم ئوممەتە. ئەگەر پرسیاریان لێ بكرایە دەربارەی شتێك كەحەرامە، وەنەیانتوانیایە ئایەت و حەدیس و بەڵگەی قەطعی لەسەر حەرام بونی بێنن، یەكسەر ووشەی، حەڵاڵە یان حەرامەیان بەكارنەدەهێنا. بەڵكو وەكو ئیمام ئەحمەدی كوڕی حەنبەل دەیفەرموو: (أكْرهُهُ ، لا يُعْجِبُني ، لا أحِبُهُ ، لا أستَحْسِنُهُ) واتە: حەزم پێی نیە، سەرنجم ڕاناكێشێ، خۆشم لێی نایە، بەجوان نایەتە بەرچاوم — ئەم ووشانەی بەكاردێنا، نەك یەكسەر بفەرموێ. ئەوە حەرامە، بەڵام ئایا دەزانن ئیمام ئەحمەد چەندە زانا بووە؟!

ئیمام ئەحمەد خاوەنی موسنەدی ئیمام ئەحمەدە كەناوازەیە لەحەدیسدا. بەپێی صەحابەكان كە فەرموودەیان گێڕاوەتەوە دابەشی كردووە. ئەوە ڕیوایەتەكانی أبوبەكرە، ئەوە هی عومەرە، ئەوە هی عوسمانە، ..... هتد.

باسی (٧٠٠) پیاو و(١٠٠) ژنی صەحابەی تێدایە. دوای تەواوبونی ئەم كتێبە نزیكەی (٥٠٠٠) پێنج هەزار كەس لەفێرخوازانی زانستە شەرعیەكان ئامادەی بوون و قەڵەم و كاغەزیان بەدەستەوە گرتووەو شتیان لێ نوسیوەتەوە!!

ئیمام ئەحمەد (٥) حەجی كردووە. سێ حەجیان لەبەغداوە بەپێ چۆتە مەككە!! لەچوار حەجیاندا بەردەوام خەریكی كۆكردنەوەی فەرمودەكانی پێغەمبەربووە ﷺ كەچی بەداخەوە، هی واهەیە ئێستا (فلْ) و (فلْ) لەشەرعدا لەیەك جیاناكاتەوە كەچی فەتوای حەڵاڵ و حەرام بوون بۆ خەڵكی دەدات. هەیە نوێژ ناكات كەچی بەناوی شەرعەوە قسە دەكات. لەبەرئەوە با ئاگاداری خۆمان بین.

٣- تَحْليلُ الحَرامِ، وَتَحْريمُ الحَلالِ من أكبَرِ الكَبائِرِ: حەڵاڵ كردنی حەرام و حەرام كردنی حەڵاڵ لەگوناهە هەرە گەورەكانە، لەموقابیلی شیرك دایە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی خوای گەورە فەرمویەتی: (إِنِّي خَلَقْتُ عِبادي حُنَفاءَ، وَأَتَتْهُمْ الشَّياطينُ فَاجْتالَتْهُمْ عَنْ دينِهِمْ، وَحَرَّمَتْ عَلَيْهِمْ ماأَحْلَلْتُ لَهُمْ، وَأَمَرَتْهُمْ أنْ يُشْرِكُوا بِي مالَمْ أنْزَلْ بِهِ سُلْطاناً) رَواهُ مُسْلِم.

واتە: خوای گەورە فەرمویەتی: من بەندەكانم هەموو بەپاكی و لەسەر

یەکتا پەرستی دروست کردون، پاشان شەیتان دێتە لایان و فریویان دەدات و لەدینەکەیان دوریان دەخاتەوەو دەیانخزێنێ و لەرێگای راست لایان دەدا. ئەوەیان لەلا حەرام و قێزەون دەکات کەمن بۆم حەلاڵ کردون. وەفەرمانیان پێ دەکات کەهاوبەشم بۆ بڕیار بدەن کەخوا فەرمان پێ نەکردوە.

ئەوەتا خوای پەروەردگار نیکاحی شەرعی بۆ مرۆڤ حەلاڵ کردوە. کەچی شەیتان ئەم نیکاحە شەرعیەو ئەم هاوسەرگیرییە جوانەی لەبەرچاوی خەڵکانێك ناشرین کردوەو حەزیان لەبەدڕەوشتی و زیناو داوێن پیسیە. یان شەیتان داوای خێرو بەرەکەت و منداڵ بوون و ئاوات هاتنەدیان لەقەبرو گۆڕی خواناسان و پیاو باشان لەبەر چاو شیرین و شەرعی دەکات. کەئەمە شیرکەو خوای گەورە شتی ئاوای لەدینەکەیدا باس نەکردوە، کەچی شەیتان لێیان دەکات بەدین و خواناسی.

٤- الحَلالُ طَيِّبٌ، وَالحَرامُ خَبيثٌ: حەلاڵ پاکەو خاوێنە، حەرامیش پیسە. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ ﴾ الاعراف: ١٥٧.

بەڵێ: تۆی موسڵمان ئەوەی خوای گەورە فەرموی مەیخۆ، یەکسەر وازی لێ بێنە بزانە زەرەر دەکەی؟! نەخێر، بەڵکو تەواوی بەقازانجی خۆت تەواو دەبێ.

بۆ نموونە: خوای گەورە گۆشتی مردارەوە بوی حەرام کردوە. باشەو حەیوانەی کەمردار بۆتەوە زۆر گران بەهاش بێ و زۆر گۆشتەکەی قەڵەو و جوانیش بێ، مادام سەرنەبڕدرا فرێی بدەو تەنها سوود لەپێستەکەی ببینە، باشە بۆچی گۆشتی ئەو ئاژەڵە مردارەوە بووە حەرامە؟!

زانایان دەڵێن: چونکە لەسوڕی بچوکی خوێندا کەخوێن دەچێ بۆ سیەکان و بۆ گورچیلە. خوێنێکی پیسە. وەخوێنی پڕ لە ($CO_2$) پیسەو دەگەڕێتەوە بۆ دڵ، جا لەملدا خوێن هێنەرو خوێن بەر هەیە دەبێ ئەو خوێن هێنەرو خوێن بەرە ببڕدرێن تاوەکو هەرچی خوێنی پیسە، لەو گۆشتە بچێتە دەرەوە!! بەم شێوەیە بێ دینەکان سەرەڕای بێ ئیمانیان هەتا بڵێی نەزانن بەزانستی تازەو پیس خۆرن. ئیمانداریش هەرچەند نەخوێندەوار بێ، بە بەرەکەتی شەرعی ئیسلام زاناو پێشکەوتوو پاك خۆرە...

٥- فِي الحَلالِ مايُغْني عَنِ الحَرام: خوای گەورە ئەوەندەی حەلاڵ بە بەندەکانی بەخشیوە کەپێویستیان بەحەرام نەبێ. خوای گەورە هەرشتێکی حەرام کردبێ





ئیللا دەرگایەکی تر یان چەند دەرگای تری بۆ ئەو پێویستیە کردۆتەوە، وەخوای گەورە هەر غەریزەیەکی لەمرۆڤدا دروست کردبێ (وەکو غەریزەی حەز لەخواردن ، خۆشەویستی پارە ، حەزی ئارەزووی جنسی) ئەوا خوای گەورە دەرگای پاکوخاوێنی بۆ تێرکردنی ئەو غەریزەیە کردۆتەوە،

بۆ نموونە: کەدەفەرموێ زینا حەرامە ئەوا زەواجی حەلاڵی داناوە، کەڕیبای حەرام کردوە، کڕین و فرۆشتن و زەکات و قەرزو سەلەم و ڕەهنی شەرعی داناوە. کەگۆشتی بەرازی حەرام کردووە، هەزارەها گۆشتی حەلاڵی داناوە. کەعەرەقی حەرام کردوە، سەدان جۆر خواردنەوەی حەلاڵی بۆ داناوین. ئاوریشمی بۆ پیاو حەرام کردوە. سەدان جۆر قوماشی جوانی بۆ حەلاڵ کردوە.

بەڵام ئەگەر ئەم دەرگا حەلاڵانە بەسەر ڕووی خەڵکا دادەخرێن و ناچار بەحەرام خۆری دەکرێن، ئەوە شەرعی خوا حاکم نیەو خەڵکی لەئیسلامەکە باش تێنەگەیشتون. ئەگینا: (الحَلالُ يُغْني عَنِ الحَرامِ، أَيُّما غِناءٍ).

وە پێویستە موسڵمان یەقینی هەبێ کەئەوەی خوای گەورە دروستی کردوە و دەفەرموێ: مەیخۆ و لەسەرت حەرامە، ئەوە بزانە ئەو حەرام کراوە. جگە لە خواردنی سودی تری بۆ مرۆڤ هەیەو بێ حیکمەت دروست نەکراوە. ئیتر موسڵمان نابێت وەکو بێ دینەکان بڵێ ئەم حەلاڵ و حەرامە چییە؟! نابێ بڵێ ی: ئەگەر خوای گەورە شتێکی دروست کردوە. ئەی بۆچی حەرامی کردوە؟! ئەم قسە بێ بنەمایانە قسەی بێ ئیمانەکانە کەوەکو بێ ئیمانن بەخواو بەقیامەت و بە حەلاڵ و حەرام، هەتا بڵێ ی بێ ئاگاشن لەزانست و زانیاری، چونکە: مەرج نیە هەرچی خوای گەورە دروستی کردبێ هەر بۆ خواردن بێ. نمونەیەك: پێشتر دەوترا، باشە مارو دوپشك کەناخورێ، ئەی بۆ خوا دروستی کردوە؟!

ئێستا زانستی پزیشکی دەڵێ: لەژەهری مارو دووپشك دا، عیلاج و چارەسەری چەندین نەخۆشی مرۆڤ هەیە. جاخوای گەورە لەبەر مەصڵەحەت و سوودی تۆ دروستی کردوە. کەعیلاج و چارەسەر لەمارو دوپشك وەربگری. نەك بیخۆی!

یاخود: چەندین باڵندەی وەکو هەڵۆ و داڵ و کونەپەپوو، هەموو ئەوانەی گۆشت خۆرو دەنووك قولاپین. خوای گەورە خواردنی گۆشتەکەیانی حەرام کردوە! بۆچی؟! چونکە:

١. ماسولکەکانی لاشەیان (گۆشتەکەیان)، بەهۆی هەڵمەت بردن و ماندووبونی زۆریانەوە، زۆر توندەو گەدەی مرۆڤ زۆر زۆر بەناڕەحەتی هەندێکی بۆ هەزم

دەكرێت.

٢. ئەم باڵندانە، ژینگە پارێزن و ئاژەڵی مردارەوەبوو لەناو دەبەن و ناهێڵن بۆگەن ببێ. ئەوەتا: كوندەپەپوو ساڵی (٥٠٠) مشك و جرج لەناو دەبات و زەویە كشتوكاڵیەكان دەپارێزێ. وەهەر كەروێشكێكی كێوی كەنەخۆش كەوت. ئەو كوندەپەپووە كە لەئاسمانەوە سەیری كرد دەزانێ نەخۆشەو دای دێتێ و دەیخوات بۆ ئەوەی نەخۆشیەكە لەرێی ئەو كەروێشكە نەخۆشەوە بڵاونەبێتەوە.

كەواتە: كەخوای گەورە دروستی كردوە بۆئەوەیە خزمەتت بكات لەرێگەی پاراستنی ژینگەوە، نەك گۆشتەكەی بخۆی. یان: ماسی وا هەیە. بەقەدەر پەنجەگەورەی مرۆڤەو هەرگیز لەوە گەورەتر نابێ، دەی ئەمە كەبۆ خواردن نابێ، خوای گەورە بێ حیكمەت دروستی نەكردووە . بەڵكو دەورێكی ئەوەندە كاریگەری هەیە كەبەمرۆڤ و بەحوت و نەهەنگ و بەماسی گەورە ناكرێ. ئەویش ئەوەیە: پیسی ناو ئاو لەناو كەلێنە بەردو ناوقەوزەی چڕدا كەنەمرۆڤ و نەهیچ ماسیەك دەتوانێ پاكی بكاتەوە، ئەم ماسیە بچكۆلە پاكی دەكاتەوە: چونكە بەهۆی بچوكیەوە دەگاتە هەموو كون و كەلەبەرێك و ناهێڵێ ئاوەكە بۆگەن ببێ ئاخود مێشە ڕەشكە، كەچەند مرۆڤ ئازار دەدات، بەڵام لەڕوانگەی زانستی یەوە دەورو كاریگەرییەكی یەكجار گەورەی هەیە.

ئەویش بریتیە لەخواردنی پاشماوەو پیسی وشی كردنەوەیان. كەئەگەر ئاوا بمێننەوە چەندین نەخۆشی بڵاودەكەنەوە، وەهەروەها مێشە ڕەشكە ئاگاداری مرۆڤ دەكاتەوە كەزیاتر ئاگات لەژینگەی دەوروبەرت بێ و زیاتر گرنگی بەپاك و خاوێنی بدە. چونكە پیس و پۆخڵی بۆیە ئەوەندە مێشت لێ كۆبۆتەوە، بەم شێوەیە تێدەگەین كەئەوەی خوای گەورە دروستی كردوەو حەرامی كردوە كەمرۆڤ بیخوات هەمووی لەجێگای خۆیدایەو ئەگەر مرۆڤ بەفەرمانی پەروەردگاری نەكات و بیانخوات و حەڵاڵ و حەرام نەزانێ. هەم تەندروستی خۆی لەناودەبات، هەم ژینگەكەشی.

٦- ماأدَّي إلى حَرامٍ فَهُوَ حَرام: هەرشتێ ببێتە هۆی توشبون بەحەرامێك، ئەویش حەرامە كاتێ خوای گەورە زینای حەرام كردوە. هەموو پێشەكیەكانی زیناشی حەرام كردوە، وەكو خۆڕوتكردنەوەی ئافرەت بەشێوازی سەردەمی نەفامی، وەكو ژوانی كوڕو كچی نامەحرەم، وە تێكەڵاوی بێ سنوور، وە وێنەی وروژێنەری ئابڕوبەر، وە دەرخستنی شەرمگا. وە گۆرانی نابەجێ وسوكایەتی







کردن بەجەستەی ئافرەت. کەواتە: ئەی گەنجی بەڕێز: کاتێ کەخوای گەورە هەموو ئەمانەی حەرام کردوە لەبەرخاتری تۆیە. تانەکەویتە زیناوە کەبۆگەنە وکەسایەتی وشەخصیەتت لەدەست دەدەی. بەڵام ئەگەر ئەمانەی حەرام نەکردایەو ڕاستەوخۆ زینایەکەی حەرام بکردایە، بڕوابکەن کەس خۆی بۆ نەدەپارێزرا لەزینا.. بەڵام بێ دینەکە دەڵێ: ڕاستە زینا خراپەو هۆکاری سەرەکی ئایدزە. بەڵام دێ پێشەکیەکانی زینای حەڵاڵ کردوەو ڕەواجی پێداوەو بانگەشەی بۆ کردوە. کەواتە: چارەسەر هەر لای شەریعەتەکەی خوای پەروەردگارە ومرۆڤ هەربەوە سەرفراز دەبێ یاخود کاتێ کەئیسلام دەفەرموێ عەرەق حەرامە، هاتووە (١٠) دەرگای لەبەردەمدا داخستوە. چونکە ئەمانە هەرچەندە سەرەتا عەرەق خۆرنین وبۆ پارە وبژێوی ژیانیان کاردەکەن.

بەڵام سەرەنجام توشی عەرەق خۆری دەبن. بۆیە لەباسی عەرەق خواردنەوەدا نەفرەت لە (١٠) کەس کراوە. دڵنیاشبە هەموی لەبەر بەرژەوەندی ئەو کەسانەیە، ئەینا پێغەمبەری خوا ﷺ نەعلەتی لەکەس نەکردوە. لێرەدا ئەوەندەی پەرۆشی بوە کەتوشی ئەو ڕێگا هەڵدێرەماڵوێرانکەرە، پارە لەناوبەرە، دین لەناوبەرە، خێزان هەڵوەشێنە، لاشە دارزێنە، نەبێ. هاواری لێ کردوە. کەئاگاداربە توش نەبی ولێ ی نزیك مەبەوە. خۆ لەمەسەلەی عەرەق خواردنەوەدا، لەم دەکەسەی نەفرەتیان لێ کراوە، تەنها هەر یەك کەسیان خواردویانەتەوە. ئەوانی تر وەکو کارو کەسابەت کردویانە، بەڵام چونکە ئاخری فێری دەبن، لەئێستەوە حوکمی عەرەق خۆریان هەیە. خۆ ئەگەر فێری عەرەق خواردنەوەش نەبن.

بەم تێکەڵاوی ڕۆژانەو دەست لێدان وئامادەکردن وهێنان وبردن وبارکردن و فرۆشتنیەوە. ئەو کەسە وای لێ دێ حەرامێکی قەطعی بەلاوە ئاسایی دەبێ!! کەئەمەش لەعەرەق خواردنەوەکە خراپترە بۆسەر عەقیدەو ئیمان. ئەمەش لەو ڕوانگەیەوە کەئەگەر کەسێك ڕۆژی بەرمیلێ عەرەق بخواتەوە،

بەڵام خۆی بەگوناهبار بزانێ ودان بنێ بەگوناهو هەڵەو سەرپێچی خۆیدا وخۆی بەخەجاڵەت باری قاپی پەروەردگاری بزانێ، ئەم کەسە بەم عەرەق خۆریە کافر نابێ و لەئیسلام ناچێتە دەرەوە، بەڵام کەسێك کەلەژیانی خۆیدا. نەك هەر عەرەقی نەخواردبێتەوە. دەستی لەشوشەکەشی نەدابێ، بەڵام بڵێ: عەرەق خواردنەوە شتێکی ئاسایی یەو ئازادی شەخصیەو کاسپی یەو حەرامی چی! بەمە کافر دەبێ ...

ئەمەش فەرمودەکەی پێغەمبەری خوایە ﷺ کەئەنەسی کوڕی مالیک دەفەرموێ: (لَعَنَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي الخَمْرِ عَشْرَةً: عاصِرَها، ومُعْتَصِرَها، وشارِبَها، والمَحْمولَةَ إلَيْهِ، وساقِيَها، وبائِعَها، وآكِلَ ثَمَنِها، والمُشْتَرِيَ لَها، والمُشْتَرِي لَهُ) رَواهُ إبْنُ ماجَة (٣٣٨١) والترمذي (١٢٩٥).

٧- التَّحايل عَلى الحَرامِ حَرامٌ: فێڵ کردن و بروبیانوو هێنانەوە بۆ ئەوەی ڕێگا بۆ حەرامێك خۆش بکرێ. حەرامە. بەکوردی خۆمان، فێڵە شەرعی لەدیندا نی یە. جا لەو فێڵە شەرعیانە، ناونانی شتێکی حەرام بەغەیری ناوی خۆی بەمەبەستی ئەوەی لەبەرچاو ئاوا بەحەرام وقورسی تەماشا نەکرێ. وەکو: بەعەرەق بوترێ: مەشروباتی ڕوحی! یاخود: (تَغييرُ صُوْرَتِهِ مَعَ بَقاءِ حَقيقَتِهِ). گۆڕینی وێنەکەی لەگەڵ مانەوەی ڕوی ڕاستەقینەکەی. وەکو: بیتاقەی یانصیب وتیروپشکی ناو مۆبایل و تەلەفزیۆنەکان. کەهەر قومارەکەی جارانە. ئەومندە هەیە وێنەکەیان گۆڕیوە. مێزو وەرەقەکەی لێ لاچووە. بەڵام ئەصڵەکەی کەقومارە هەر ماوەتەوە.

یان هەر ڕیبا خۆریەکەی جارانەو ناویان لێناوە بانقی (....)، کەبەئاشکرا پارە بەڕیبا دەدات. بەڵام لەڕێ ی سیستمی بانقی وکۆمپانیاوە. دەی خۆشتێکی بەڵگە نەویستە گۆڕینی ناو هیچ لەمەسەلەکە ناگۆڕێ، کاتێ کەناوەڕۆك هەروەکو خۆی بێ.

ئیمانداران: بناغەیەکی تری شەرعی گرنگ کەپێویستە موسڵمانان ئاگایان لێ ی بێ ئەمەیە: (حەرام بەفێڵ کردن حەڵاڵ نابێ وفێڵ لەشەرع ناکرێ) دەقی شەرعەکە دەفەرموێ: (فَمن باعَ سِلْعَةً دَيْناً لِسِتَّةِ أَشْهُرٍ بِمِئَةٍ، ثُمَّ إشْتَراها نَقْداً بِثَمانينَ، وَادَّعَى أَنَّ هذا بَيْعٌ وَشِراءٌ، نُجيبُهُ: بِأَنَّهُ لاعِبْرَةَ بِصُورَةِ البَيْعِ وَالشِّراءِ، إنَّهُ أَقْرَضَ ثَمانينَ لِيَسْتَرِدَّها مِئَة، وَهذا هُوَ الرِّبا بِعَيْنِهِ).

واتە: ئەگەر کەسێك شتێکی فرۆشت بەکەسێك. بەقەرز پێ ی فرۆشت، کەلەماوەی شەش مانگدا کڕیار پارەکەی بداتێ ونرخی فرۆشراوەکە (١٠٠) دینار بوو. پاشان کەمعامەلەکەیان تەواو بوو. هەر لەهەمان شوێندا فرۆشیار، ئەو شتەی خۆی لەکڕیار کڕیەوە بە (٨٠) دینار، ئەمە معامەلەو کڕین وفرۆشتنە، ئەوە وەڵامی دەدەینەوە بەوەی کەهیچ ئیعتبارێ نیە بۆ ئەوەی کەبەوێنەو شکڵ ئەمە کڕین وفرۆشتنە، بەڵکو ئەمە هەرئەوەیە کەهەشتا دیناری قەرز کردوە، بەو مەرجەی دوای شەش مانگ (١٠٠) دیناری بداتەوە. کەئەمەش هەر خۆی ڕیبایەو ئەم فرت وفێڵە هیچ لەناوەڕۆکەکەی ناگۆڕێ!



٨- النِّيَةُ الحَسَنَة، لاتَسُوغُ الحَرام: نيەتی چاك حەرام حەلاڵ ناكات. بەڵێ، نيەتی پاك لەئيسلامدا زۆ پيرۆزە. هەربەنيەتی جوان وچاكە كەكارە موباح وعادەتيەكانی ژيان دەبن بەتاعەت وعيبادەت، نان خواردن بەنيەتی چالاك بون بۆ تاعەت وخواپەرستی، ئەو نان خواردنە بەعيبادەت حيسابە....كەسێك بەرۆژ پێش نوێژی نيوەرۆ هەندێ بخەوێ – كەپێ ی دەوترێ – قەيلولە – بۆيە ئەم سەرخەوە بەرۆژ بشكێنێ بۆئەوەی يارمەتی دەری بێ بۆ شەونوێژ. ئەو قەيلولەيەشی وەكو شەونوێژەكە بەعيبادەت بۆ حيسابە. تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ سەرجێ يی شەرعی نێوان ژن ومێردی بەصەدەقەو خێر داناوە. كەفەرمويەتی: (وَفِي بضع أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ) رَواهُ مَسْلِم.

ئەمە پيرۆزی نيەتی پاك وجوان. بەڵام حەرام شتێكی ترە حەرام هەر حەرامە باهەرچەندە نيەتەكەی بكەرەكەشی خێربێ. وە ئامانجەكەشی جوان بێ، چونكە بناغەيەكی شەرعيە: (لا يَرْضَى الإسْلامُ أَبَداً أَنْ يُتَّخَذَ الحَرامُ وَسيلَةً إِلى غايَةٍ مَحْمُودَة).

بۆ نموونە: كەسێك پارەو سامانێكی زۆر بەرِيبا خۆری كۆبكاتەوە، يان بەداگيركردنی ماڵی خەڵكی پارە سەريەك بنێ وپاشان بێ بەوپارە حەرامە مزگەوتێك دروست بكات يان پرۆژەيەكی خەيری بنيات بنێ، ئەوە ئەو پرۆژە خێريەی هيچ تكايەكی بۆ ناكات ونيەتەكەی دەورێكی نيە. چونكە خوا پاكە وپاك نەبێ وەری ناگرێ. وە لەئيسلامدا تۆ موكەلەف نی بەوەی كە: ماڵی قيامەتی خۆت وێران بكەی بۆ ئاوەدان كردنەوەی ماڵی دونيای خەڵكی.

٩- الحَرامُ حَرامٌ عَلى الجَميع: لەشەريعەتی ئيسلاميدا، ئەوەی بۆ سەرۆكی دەوڵەت حەڵاڵە، بۆ نزمترين پلەی هاوڵاتيش حەڵاڵە. ئەوەی بۆ كرێكارێك حەرامە، بۆ گەورەترين دەسەڵاتداريش حەرامە. بەڵام بەداخەوە ئەمرۆ ياسا وەكو تۆڕی ماسی گر، تەنها تاوانباری بچوك دەگرێ وحوت ونەهەنگ وقرش نەك هەر پێوە نابێ، تۆڕەكەش قووت دەدات. ئەمرۆ دەسەڵاتداری گەورە ئەوەی كەبەخەڵكی دەڵێ: ناكرێ و ناياسايی يە، بۆخۆی دەيكات وياساكەش هەڵدەلوشێ. لەئيسلامدا ئەگەر كەسێك تەواوی تەمەنی خۆی لەشەو نوێژی شەوان وغەزای رۆژدا بەسەربربدبێ. ديرهەمێكی حەرامی بۆ حەلاڵ نابێ، هەروەكو بۆ غەيرە دينەكە بەحەرامی دادەنێ. بۆ ئەم تێكۆشەرو پياوچاكەش هەر بەحەرامی دەزانێ.







بەڵام لەیاسای مرۆڤدا دەڵێ: ئاخر فلان کەس ئەگەر ئەو زەویەش داگیر بکات قەیناکات، چونکە خەباتی زۆرەو لەپێناوی ڕزگاری ئەم میللەتەدا خەباتی کردووە!!

پێغەمبەری خوا ﷺ مەترسی ئەمەی خستوینەتە بەرچاو کەفەرموی: (إنَّما هَلَكَ الَّذينَ من قَبْلِكُمْ، أَنَّهُمْ كانُوا إِذا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّريفُ تَرَكوُهُ، وَإِذا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعيفُ أَقامُوا عَلَيْهِ الحَدَّ، وَأَيْمُ اللهِ، لَوْأَنَّ فاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَها) رَواهُ البُخاريُّ (٦٧٨٨) وَمُسْلِم (١٦٨٨).

واتە: بەڕاستی هۆکاری ڕاستەقینەی بەهیلاك چون ولەناوچونی ئەوانەی پێش ئێوە ئەوە بوو کە: ئەگەر کەسێکی ناودار وشکۆدار وخاوەن کەس، دزی بکردایە وازیان لێ دەهێنا وبۆیان پەردە پۆش دەکرد. وە ئەگەر کەسێکی لاواز وبێ دەسەڵاتیش دزی بکردایە، ئەوا حەدیان لێ دەدا ودەستیان دەبڕی وچاوپۆشی لێ نەدەکرا.

بەڵام سوێند بەخوای گەورە ئەگەر فاتمە ی کچی محمد دزی بکات. بەدەستی خۆم دەستی دەبڕم!.

بەڵێ هەرکاتێ یاسا تەنها بەسەر خەڵکی فەقیرو بێ کەس وبێ دەستدا، جێ بەجێ کراو خەڵکی دەسەڵاتدار ودەوڵەمەندی نەگرتەوە. ئەوە نیشانەی لەناوچون بەهیلاك چونی ئەو گەلە وئەو وڵاتەو ئەو دەسەڵاتەیەو هەرگیز نابێ بەهیچ وسەربەخۆ نابێ.

١٠- بنەمای شەرعی بۆ کاسبی حەڵاڵ ئەوەیە، کەدوو مەرجی تێدا بێتەجێ:

أ. ڕێگای پەیداکردنی مەشروع وحەڵاڵ بێ. بەڕیبا ودزی وخیانەت وغەش پەیدانەکرێ.

ب. ئەو کار وکاسبیەت زەرەر نەگەیەنێ بەکەسێکی تر. یان بەرژەوەندی گشتی.

بۆ نموونە: کەسێك بەپارەی حەڵاڵی خۆی چوو پارکێکی لەکابەدەستێك کڕی کەموڵکی گشتی یە وئەم بەهۆی پۆستەکەیەوە تەصەڕوفی پێوە دەکات. ئەوە حەرامە و داگیرکاریە، چونکە ئەو پارکە موڵکی هەموو خەڵکی یە و بەهۆی ئەم کڕینەوە گەنج ولاوان و مناڵان بێ بەش دەبن لەیاری وخۆشی وحەسانەوەی حەڵاڵ.

یاخود کەسێك لەناو ژێرزەمینەکەی ماڵی خۆیدا، کاری ئاسنگەری دەکرد،







بۆنی لەحیم وتەق وهوڕی ئاسن وچەکوشی دەچوو بەسەر دەر ودراوسێ و ڕێبوارانی ڕێگادا، ئەمە هەرچەندە کاسبیەکەشی حەڵاڵە کەئاسنگەری یە. بەڵام چونکە ئازاری خەڵکی داوە هەر حەرامە.

نمونەیەکی تر: کەسێك خەریکی دیراسەو لێکۆڵینەوەی قورئان وفەرمودەکانی پێغەمبەر بو ﷺ بەکۆمپیوتەر زانستی شەرعی دەنوسی. بەڵام چونکە کارەبای نیشتمانی نەبوو. هات لەحەوشەی ماڵەکەی خۆیدا موەلیدەیەکی هەڵکرد، کەدەنگی ئەوەندە بەرز وبەهێز بوو دراوسێکانی هەراسان کردبوو. لەبەر ئەو دەنگە ناخۆشە، بەو بێ کارەبایی یە نەیاندەتوانی بێنە حوشەی خۆیانەوە. ئەوە ئەوکارە حەرامە. باکەسەکە کارەکەشی پیرۆزبێ کەخەریك بوونە بەزانستی شەرعیەوە، چونکە ئازاری خەڵکی داوە!

یاخود ئەو کەسانەی کەدوکانی (cd) فرۆشتنیان لەناو بازاڕدا هەیە، بەڵام گۆرانیەك دەخاتەسەر تەسجیلی دوو موکەبەرەو تەواوی دەنگەکەی دەکاتەوە. هەموو دراوسێ دوکانەکانی وخەڵکی بازاڕەکەی ئیزعاج کردوە. ئەمە هەرچەندە بەڕواڵەت کاسپی دەکات بەڵام حەرامە. چونکە ئازاری کەسانی تری داوە. خۆ ئەگەر ئەو شریتەی کە ئەم لەدوکانەکەیدا هەڵی دەکات ودەنگی بەسەر خەڵکا بڵاودەکاتەوە، ئەگەر قورئانی پیرۆزیش بێ، هەر حەرامە. چونکە ئەمە ناو بازاڕەو تۆ مافی ئەوەت نیە بەزۆر قورئان بخەیتە گوێ ی خەڵکی یەوە!!

نمونەیەکی تر: کەسێك ئۆتۆمبێلی گەورەی باری هەیە. گەڵابەو ترێلەی هەیە. ئەمە کارێکی بەسودەو حەڵاڵە، بەڵام بەومەرجەی کەبەیانی لەمەبانگدانا لەگەڕەکەکەیدا ئیشی پێ نەکات وئەو خەڵکەی لەو ناوەن بەدەنگی گەورەی گەڵابەکەی ئازار نەدات.

ئەگەر یەکێ بڵێ: باشە خۆ خەڵکی هەر هەڵدەستن بۆ نوێژ، ئیتر بۆچی ئازارە بۆیان؟! لەوەڵامدا دەڵێین: ئەگەر هەڵدەستن بۆ نوێژ، خۆ واجب نیە لەجیاتی دەنگی هێمنی بەیانیان کەمرۆڤ مێشکی تێ ی دا ئاسودە دەبێ وهەوایەکی پاك هەڵدەمژێ، ئەم دەنگی گەلابەو بۆنی دوکەڵی ئۆتۆمبێل هەڵبمژێ!!

پاشان لەوگەڕەکەدا، دەیان ئافرەتی تێدایە کەلەسەریان پێویست نیە بەوبەیانیە زووە لەخەو هەڵسن، بەهۆی سوڕی مانگانە ومناڵ بونەوە، ئەی ئەو هەموو مناڵەی کەنوێژی لەسەر فەرز نیە. ئەی ئەو هەموو نەخۆشەی کەڕەنگە لەوساتەدا ئازارەکەی تۆزێ سووك بووبێ وچاوی چوبێتە خەوو پێویستی

بەوەیە دەنگی بەرز نەبیستێ!

یاخود بەگەڵابەکەی کەلەبەر دەرگا ڕای گرتووە، لایەکی جادەکەی گرتوە. کەمولکی گشتیە. جاری واهەیە بەدوو گەڵابە، کەلەمبەراوبەری جادە ڕای دەگرن، مەجالی ئۆتۆمبێلێك نادەن کەبەناویدا بڕوات! ئەمە هەرچەندە پیشەیەکی حەڵاڵە، بەڵام چونکە بەم شێوەیە بۆتە مایەی ئازار بۆ خەڵکی، کەسابەتەکەی حەرام دەبێت!

ئەی باشە ئەم کەسانە چی بکەن؟! پێویستە حکومەت شوێنیان بۆ دابین بکات لەدەرەوەی شار، گەراجی تایبەت بەئۆتۆمبێلی بارهەڵگر هەبێ. کەنەهێنرێتە ناوماڵانەوە. ئەگەر حکومەت کەمتەرخەم بوو. ئەو کارەی نەکرد. پێویستە خاوەن گەڵابەو تڕێلەو ئۆتۆمبێلەکانی بارهەڵگر، هەمویان کۆببنەوەو شوێنێك، گەراجێك بۆخۆیان دابین بکەن وئەو ناڕەحەتیە لەخەڵکی دوربخەنەوە، ئەگەر ئەمەشیان بۆ نەگونجا، ئەوە پێویستە گەردنی خۆیان بەدراوسێکانیان ئازاد بکەن و منەتباریان بن...

بەڵێ ئیماندارانی بەڕێز: بەڕاستی ئەم بابەتی حەڵاڵ وحەرامە زۆر پێویستە ئاگاداری بین. چونکە مرۆڤ کەکەوتە ناو حەرام خواردنەوە، ئیتر شەیتان هیچ ئیشی تری پێی نامێنێ و بەسە بۆ تیاچوونی.

بۆیە خوای گەورە ئاگادارمان دەکاتەوە ودەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُوا۟ مِمَّا فِى ٱلْأَرْضِ حَلَـٰلًا طَيِّبًا وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ البقرة: ١٦٨.

واتە: ئەی خەڵکینە، لەڕزق وڕۆزی حەڵاڵ وپاکی زەوی بخۆن (توخنی قەدەغە کراوەکان مەکەون) وشوێن هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، چونکە بێگومان ئەو دوژمنێکی ئاشکراتانە.. بەڵێ لەگەڵ ڕزق و ڕۆزی حەلالدا. باسی شەیتان و پیلانەکانی وهەنگاوەکانی هاتووە، چونکە شەیتان کەزانی مرۆڤ خەریکی کەسایەتی حەڵاڵە. هەوڵ دەدات بەهەر شێوەیەك بێت توشی حەرام خۆری بکات. جاهەنگاو بەهەنگاو توشی دەکات..

بەڵێ ئیمانداران: ئەگەر حەرام نەخۆشی ودەرد بێ، ئەوا نانی حەڵاڵ وپارەی حەڵاڵ دەرمانە، ئیمامی شافیعی فەرمویەتی: (لَوْ أَعْلَمُ رَغِيفاً من حَلالٍ، لَداوَيْتُ بِهِ أَرْبَعينَ مَريضاً).

واتە: ئەگەر کولێرەیەکی حەڵاڵم دەست بکەوێ، کەهیچ حەرامێکی تێکەلاو نەبوبێ، ئەوا چارەسەرو دەرمانی چل نەخۆشی پێ دەکەم! لەکۆتایی دا، لەخوای





گەورە دەپاڕێینەوە ودەڵێین: (اللَّهُمَّ اغْنِنا بِحَلالِكَ عَنْ حَرامِك)
اَللَّهُمَّ آمِينَ



## سەرچاوەکان




١- قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ .
٢- دَعْوَةٌ لِلْتَعايُش ، عمر وخالد ، ص٣٣٧ ، ص٣٣٩.
٣- خُلُقُ المُسْلِمِ في القُرْآن الكريم ، محمد متولى الشَّعراوى ، ص٣٨٩، ص٣٨٦.
٤- الخُطَب المنبَرِيَّة ، محمد متولى الشَّعراوى ، ص٣٦٥.






الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمِين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجْمَعين.

ئیمانداران: لەئاینی ئیسلامدا، حەزکردن بەبونی پارە وسامان و دەوڵەمەند بوون، خراپ نیەو مایەی کەم دینی نیە. چونکە مرۆڤ بەسروشتی خۆی خوای گەورە بۆ ئەوەی توانای ئاوەدانکردنەوەی زەوی پێبدات، پارەو ماڵ و سامان و زێڕ وزیووی لەلاشیرین وخۆشەویست کردووە، مادام مرۆڤە ئاسایی یەکە حەز لەماڵ وسامان نەکات. چونکە ئاژەڵ پارەی ناوێ.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ناوی ماڵ وپارە وسامانی ناوبردوە بەخێر.. وەکو دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلۡخَيۡرِ لَشَدِيدٌ ﴾ العاديات: ٨.

یاخود دەفەرموێ: ﴿ كُتِبَ عَلَيۡكُمۡ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ إِن تَرَكَ خَيۡرًا ٱلۡوَصِيَّةُ لِلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَ بِٱلۡمَعۡرُوفِۖ حَقًّا عَلَى ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾ البقرة: ١٨٠.

موفەسیری گەورەی قورئان ئیمامی قورطوبی لەتەفسیرەکەیدا: ج٢ ص٢٤٢ دەفەرموێ: کەخوای گەورە دەفەرموێ: (خَيْراً)، الخَيْرُ هُنا المالُ من غَيْرِ خِلافٍ..

وە پێغەمبەری خوا ﷺ لەفەرمودەیەکی درێژدا، کەباسی جۆرەکانی مرۆڤ دەکات و بوخاری ومسلم گێڕاویانەتەوە دەفەرموێ: دونیا بۆ چوار جۆر مرۆڤە:

یەکەمیان: (عَبْدٌ رَزَقَهُ اللهُ مالا وَعِلْماً فَهُوَ يَتَّقِي فيهِ رَبَّهُ، وَيَصِلُ فيهِ رَحِمَهُ، وَيَعْلَمُ لِلّهِ فيهِ حَقّاً، فَهذا بِأَفْضَلِ المَنازِلِ)..

بەندەیەکە، خوای گەورە ماڵ وسامانی زۆر پێ بەخشیوە، وە زانیاریشی پێ بەخشیوە (لێرەدا زانیاری مەبەست پێ ی ئیمان وخواناسی یە. زانستی ئەوەی کەیەقینی هەیە ئەم ماڵ وسامانە هی ئازایەتی ولێهاتویی وشان وشەوکەتی خۆی نیە، بەڵکو هی خوای گەورەیەو وەکو خەڵات وبەخشش داویەتیە دەستی ئەم و پێ ی تاقی دەکرێتەوە). جائەم کەسەش بەم ماڵ وسامانەی بەردەستی خوای خۆی پێ دەپەرستێ. نوێژ دەکات، ڕۆژوو دەگرێ، زەکات وصەدەقە لەماڵەکەی دەردەکات، حەجی ماڵی خوا دەکات، مزگەوت دروست دەکات، خزمەتی مناڵی بێ باوك وبێ دەرەتانی پێ دەکات، وە خزمەتی ئیسلامی پێ دەکات. لەکوێ ئیسلام پێویستی بەماڵ وسامانی ئەم بێت. ئەم خاوەن ماڵ نیە. وە هەروەها بەو ماڵ وسامانەی سیلەی ڕەحم جێ بەجێ دەکات وسەردانی خزم وخۆشی دەکات وهاوکاری دەستباریان لەگەڵ دەگرێ وپشتیان تێ ناکا.

وە دەزانێ کەئەم ماڵ وسامانە حەقی خوای گەورەی تێدایە و خوای گەورە بەشی هەژاران و نەداران و قەرزاران و ئەو چین و توێژانەی کە خوای گەورە لە ئایەتی زەکاتدا ناوی هێناون، لەماڵی ئەمدا هەیەو ئەم ماڵە هەمووی هی خۆی

نیە ، بەم شێوەیە ئەم بەندەیە بەهۆی ئەم ماڵ و سامانەوە هاوکات لەگەڵ ئەو ئیمان و خواناسیەدا لەبەرزترین و باشترین پلەو پایەدایە.

کەواتە: مرۆڤ بەهۆی ماڵ و سامانەوە، ئەگەر بەهی خوای بزانێ و شوکری خوای لەسەر بکاو بەقسەی خواو شەرعی خوا بەدەستی بێنێ و بەگوێرەی ئەو مەنهەجەی کە خوای گەورە بۆی دیاری کردوە . خەرجی بکات . ئەوە خۆشبەختی دونیا و سەرفرازی قیامەت دەبێت. وەلەدنیادا. ئەم دەوڵەمەندانە چونکە گوێڕایەڵی شەرعن ،لای هەموو خەڵکی بەرێزن. بەڵام دەوڵەمەندی و سەروەت و سامانێك کە مرۆڤ بەهی خوای نەزانێ (نعوذُ بالله) شوکری خوای لەسەر نەکاو بەحەرام پەیدا بکرێ و لەحەرامدا سەرف بکرێ، دەتکات بە خراپترین کەس. وە کو لەهەمان فەرمودەدا کەپێشر باسمان کرد، کە لە (بوخاری و مسلم)دا هاتووە ، پێغەمبەری خوا ﷺ کە باسی جۆرەکانی مرۆڤی کردووە ، فەرمووی: بەشی دووەم کە سانێکن: (وَعَبْدٌ رَزَقَهُ الله مالا وَلَمْ يَرزُقْهُ عِلْماً، يَخْبَطُ فِي مالِهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ، وَ لايَتَّقي فيه رَبَّهُ ، وَلا يَصلُ فيهِ رَحِمَهُ، وَ لايَعلَمُ لله فيِه حَقّاً، فَهذا بأَخْبَثَ المَنازِلِ).

جۆری دووەم: بەندەیەکە خوای گەورە ماڵ و سامانی پێ بەخشیوە، بەڵام زانستی پێ نەبەخشیوە، (زانستی دینی. کە خواناسی و دینداری یە. کەبوونی حەڵاڵ و حەرامە، ئەمەی نیە دەوڵەمەندی بێ دینە). بەبێ گوێدانە شەرع و سنوورەکانی شەرع ئەملاولا بە ماڵ و سامانەکەی دەکات. خوای پێ لەخۆی ڕازی ناکات، بەڵکو بەو ماڵ و سامانەی ئەوەی خوا نەهی لێ کردووە ئەوە دەکات. لە ڕۆژی جومعەدا لەجیاتی چوونە مزگەوت و نوێژو ووتاری جومعە ، ئا لەو کاتەدا دەچێت بۆ عارەق خواردنەوەو ڕەقس و سەما. نوێژ ناکات. ڕۆژو و ناگرێ لەگەڵ ئەوەدا ئەو هەموو ماڵ و سامانەی لەبەردەستایە.

دەتوانێ تەواوی مانگی ڕەمەزان لەشوێنی فێنك و خۆشدا ، بەڕۆژوو بێ، نەك وەکو ئەو خەڵکە زۆرە کرێکاریش بکات و بەڕۆژووش بێت، وە حەجی ماڵی خوا ناکات لەگەڵ ئەو هەموو دەوڵەمەندیەدا، وە هەروەها بەو ماڵ و سامانەی سیلەی ڕەحم جێ بەجێ ناکات، خزمە هەژارەکانی هەر ناناسێ. دەیان دەعوەت و مەسرەفی زۆر بۆ بێ دین و خەڵکی خراپ دەکات، کەچی خزمەکەی خۆی، براکەی ، خوشکەکەی، مام و خاڵ و پورەکەی. خەڵکی خێریان پێ دەکات. ئەم پشتیان تێدەکات و حەز بە بینینیان ناکات و ڕۆژێ لەڕۆژان دەرگای ماڵیان





ناکاتەوە. وە هەروەها نازانێ و خۆی گێل دەکات لەوەی کە حەقی خوای گەورە بۆ هەژاران و نەداران لەماڵەکەیدا هەبێ. هەرنازانێ زەکات چی یە. خێرو خێرات چی یە. مافی هەژار چی یە. جا ئەم کەسە. بەهۆی ئەو سەروەت و سامانەوە. کە خواناسی لەگەڵ نی یە لەخراپترین جێگاو مەنزڵدایە ..

جا بەڕاستی ئەم جۆرە دەوڵەمەندانە چونکە خوا ڕقی لێیانە، لای خوای گەورە سوك و چروکن. هەموو کەسێکی ئیماندار و خاوەن هەڵوێست و دلێر و بوێریش ڕقی لێیانە و ڕێزیان ناگرێ و بەچاوی سووك سەیر دەکرێن.

کەواتە: ئەگەر بەگوێی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بکەی لەکارو کەسابەت و ماڵ و ساماندا لەو بازنەدا هەڵسوڕێی کە خوای گەورە بۆی دیاری کردوی و نەچیتە ئەو دیوو هێڵی دیاری کراوەوە کە حەرامەکانن، وەبەگوێرەی شەرعی خواش خەرجی بکەی، ئەوە لەدنیادا بەهۆی ئەو ماڵ و سامانەوە ژیانێکی خۆش و دڵخۆشانە بەسەر دەبەی و دەشبیتە مایەی دڵخۆشکردنی دەیان کەسی تر. خۆشت سوودمەند دەبی و کەسانێکیش بەهۆی تۆوە سودمەند دەبن، لەقیامەتیشدا لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدانا، حەشر دەکرێی ، وەکو لەفەرمودەی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتووە.

بەڵێ ئیمانداران: بەداخەوە هەندێ کەس بەهۆی باش حاڵی نەبوون لە ئیسلامەوە وە تێنەگەیشتن لەئیسلام و شارەزا نەبوونی لەژیانی چاکان و پاکانی خواناس، وا دەزانن کە پارە پیسەو دنیا بۆ کافران باشەو موسوڵمانان هەر بەهەژاری ژیاون و ئەوانەی دەوڵەمەندی گەورەو سەرمایەداری ناوداربوون لەدنیادا هەر کافران بوون، بەڵام بێ ئاگا لەوەی کە خوا دەفەرموێ: ئەی مرۆڤ تۆ بۆ تاقیکردنەوە لەم دونیایەدای و ماڵی ئەبەدیت قیامەتەو ، دونیا تەنها ڕێگایەکەو پێیدا دەڕۆی، خوا دەفەرموێ: مەبە بەعەبدی دونیاو قیامەتت بیر نەچێتەوە، بەڵام خۆ خوای گەورە نەیفەرموە: با دونیا وێران بێ با هەموو ژیانت هەژاری و نەداری بێ، نەخێر (واسْتَعْمَرَكُمْ فيها) تۆ دەبێ دونیاو سەر زەوی ئاوەدان بکەیەوە، ئایا کە دونیا هۆڵی تاقیکردنەوەیە. باشە هۆڵی تاقیکردنەوە هۆڵێکی پاك و خاوێن و بۆن خۆش و ڕازاوەو جوان بێ باشە، یان هۆڵێکی کاول و پیس و بۆگەن و ناشرین بێ؟!

بێ گومان هەرچەندە خوێندکار تەنها یەك دوو سەعات لەو هۆڵەدا دەمێنێتەوە. بەڵام بەهۆڵی یەکەمیان نەبێ ڕازی نابێ و خۆی دەپارێزێ لەوەی

لەهۆڵی دووەمدا تاقیکردنەوە بکات، ئایا ئەگەر بەڕێگایەکدا بڕۆی ، ئەگەر ڕێگاکە بەگوڵ و گوڵزار ڕازابێتەوە. بۆنی گوڵ و ڕەیحانەت بچێ بەلوتداو دیمەنی دارو درەختی سەوزو جوان و سەرنج ڕاکێش بێتە بەردیدەت. ئەمە باشترە یان ڕێگاکە پڕبێ لە دڕك و داڵ و بۆنی زێراب و پیسی و بۆگەنی بچێ بەلوتتدا؟! بێگومان ڕێگەی یەکەمیان مایەی هەڵبژاردن و پەسەندکردنە .. دەی بەهەمان شێوە، ئەگەر دونیا مەڕمەڕیش بێ مەفەڕیش نەبێ ، هۆڵی تاقی کردنەوش بێ، ئەوە خوای گەورە دەفەرموێ: بەجوانی و پوختی و بۆنخۆشی ئاوەدانی بکەنەوە. چونکە تۆی موسوڵمان ئیشت ئاوەدان کردنەوەی سەرزەویە.

بەڵێ بەڕێزان: بەدرێژایی مێژوو ئەوەی کە دینی ناشرین کردووە، بەهۆی ناشرینی و ناتێگەیشتنی خۆیەوە لەدینی حەق کە ئیسلامە. دوو چین و تاقم و دەستەن:

١- چین و تاقمێکن کە بە حیساب دیندارن. نوێژو ڕۆژوش دەکەن، بەڵام هەر پارە و سامان کۆدەکەنەوە،هەتا پیرتر دەبن، بەتەماحتر دەبن، هەردەڵێ: نیمەو هەر چروکەو هەر بەخیلە بەکوردی (پیسکەی تەڕپیرە). هەر پارە کۆدەکاتەوە. بێ ئەوەی لەشەرع بپرسێ چۆنی کۆبکاتەوەو چۆنی خەرج بکات، سەرنجی قورئان بدەن، بەوردە کارییە بێ وێنەکەی خۆیەوە چۆن لەیەك ئایەتدا دووجۆر هەڵوێستمان بەرامبەر بەماڵ و سامان نیشان دەدات.دەفەرموێ:
﴿ ٱلَّذِى جَمَعَ مَالًا وَعَدَّدَهُۥ يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخْلَدَهُۥ ﴾
بەشی یەکەم کە: مَالًا وَعَدَّدَهُۥ.. ڕەوایە و مافی هەموو موسوڵمانێکە پارەو سامان کۆبکاتەوە و بژمێرێ و سەرمایەداربێ. ئەی چی خراپە؟! بەشی دووەمی خراپەکە: يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخْلَدَهُۥ .. وابزانێ و لای بوبێ بەیەقین کە بەهۆی ئەم پارانەوە بەردەوام هەر لەژیاندا دەبێ و نامرێ، چونکە پارەی هەیە.

هەر دەسەڵاتدار دەبێ و هەر دەبێ خەڵکی بە مێروولە ببینێ و خۆی بەفیل، خۆی لەئاسمان ببینێ و خەڵکی لە ڕێسمان: بەم شێوەیە هەر کۆی دەکاتەوە و کەس سوود لەو ماڵ و سامانەی نابینێ، مەگەر بۆ بەرژەوەندیی دونیایی خۆی مێز بۆ عەرەق خۆر و پیاوکوژ بڕازێنێتەوە! جاری وا هەیە مەولودیش دەکات، بەڵام هەر بۆ ئەو بێ دینانەیە و بۆ ڕیا بازیە و لەپەنای دیندا دەعوەت بۆ







خەڵکی دەکات .

خەڵکە دەوڵەمەندی پارە پەرستی وەکو خۆی، بێ ئەوەی هەژارێك ، نەدارێك لەماڵەکەی بخوات، ئەو هەموو سامانەی لەبەر دەستدا بوو، کەچی ڕۆژێك لەڕۆژان خزمەتێکی بەم ئیسلامە نەکرد . خزمەتی بەهاودینەکەی خۆی نەکرد. یارمەتی دراوسێ و هاولاتیەکی خۆی نەدا، کەچی لەولاوە، مەسیحیە و لەوسەری دونیاوە دێت دەرمانخانە دەکاتەوە و بە بەلاش دەرمان دەدات بە موسوڵمانان و لەگەڵیشیا ئینجیلێکی تەحریف کراو دابەش دەکات! یارمەتی خوێندکارێکی سەرەتایی دەدات . لەگەڵ جانتاکەدا، ئینجیلێکیشی دەداتێ! کەچی ئەم جۆرە موسوڵمانەی لای خۆمان مەگەر کە مرد و میراتگرەکانی لەسەر میراتەکەی شەڕیان ببێ ، بزانرێ چی هەیە. جا کەسانێك ئاوا بونە عەبد و بەندەی پارە و سامان، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی : (تعسَ عبدُ الدِّينار)، هەی عەمری نەمێنێ بەندەی دینار!

جا سەرنج بدەن. پێغەمبەری خوا ﷺ نەیفەرموو دینار عەمری نەمێنێ، دینار خراپە، نەخێر . ئەو کەسە خراپە کە خۆی کردووە بەبەندەی دینار، لەجیاتی ئەوەی پارە بکات بە خزمەتکاری دین و ژینی خۆی، خۆی کردووە بەخزمەتکای پارەکانی و ئەم بەقوربانیان دەبێت! ئەم جڵەوی بەدەست پارەومیە و لەکوێ پارەی لێ بێ سەری بۆ دادەنەوێنێ. ئیتر ئەگەر ئیمانەکەشی لەسەر دابنێ! بۆیە لە دیدی ئیسلامەوە، دینار و دۆلارو ئاڵتون و زیو، خراپ نیە. ئەوەی خۆی دەکاتە عەبد و بەندەی پارە و سامان هیچە و پوچە. بێ خێرە. پڕ شەڕە!

٢- چینێکی تریش هەر لەناو موسوڵمانانندا بەناوی زوهد و دونیا نەویستی یەوە، تەزبیحێك و سیواکێك و ڕیشێك و جل و بەرگێکی چڵکنی هەڵگرتووە و لەبەر کردووە و واتێ گەیشتووە کە: نەوت و ئاڵتون و ئەتۆم و چونە فەزا و ناو دەریاو ژێر زەوی ئەوە هەر بۆ کافر باشەو ئەوە پیسەو ئیشی موسوڵمان نیە! بەداخەوە ئێمەی موسوڵمان بەهۆی دورکەوتنەوەمانەوە لە دوو کانیاوە سازگارەکەی ئیسلام کە قورئان و سوننەتە یان هەژار و دواکەوتوین ! یان حەرامخۆرین ! کەممان هەیە دەوڵەمەندێکی پاکی حەڵاڵ پەیدا کەر و حەڵاڵ سەرف کەر بین!

بەڵێ ئیمانداران: لەبواری دارایی و ئابووریدا ، بەدرێژایی مێژوو . هەتا موسوڵمانان لە ئیسلام دوور نەکەوتبوونەوە و نەبونە پاشکۆ و کلیلی بێ دینان و خوا نەناسان، موسوڵمانان بەردەوام دەوڵەمەندتر بوون لەکافران. تەماشای قورئان بکەن کە ئەو قورئانە هەموو شتێکی بۆ ئێمە باسکردووە، باسی دەسەڵاتدار و دەوڵەمەندمان بۆ دەکات. یەکیان پێغەمبەرێکی خوا بووە. یەکیان پاشایەکی خواناس بووە، قورئان باسی حەزرەتی سولەیمان پێغەمبەر و (ذُو القَرْنَيْن) پاشامان بۆ دەکات. ئەوەتا حەزرەتی سولەیمان لەگەڵ ئەوەدا کە پێغەمبەری خواش بووە و دینی خوای بەمرۆڤایەتی ڕاگەیاندووە لەگەڵ ئەوەشدا دەسەڵاتدارێکی زۆر بێ وێنە بووە. حەزرەتی سولەیمان سەربازەکانی نەك هەر بەتەنها مرۆڤ بوون، بەڵکو: پەری و جنۆکەش لەخزمەتیدا بوون. زمانی هەموو باڵندەیەکی دەزانی . زمانی هەموو جۆرە مێروله و زیندەوەرێکی دەزانی و خوای گەورە فێری کردبوو. بەهۆی (با) وە. فەرشەکەی کە وەکو فڕۆکەی ئێستا دەوری بینیوە، بەئاسماندا گەشتی دەکرد و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دەگەڕا، هەرچی خەزێنەی ئەم دونیایە هەبوو لەبەردەستیدا بوو، جا نەك بەتەنها خەزێنەی سەر زەوی ، بەڵکو گەوهەر و لوئلوئی هەموو ژێر دەریاکانیشیان بۆ دەهێنا و بۆ دەردەهێنا ، لەلایەن جنۆکەکانەوە لەلایەن هێزی ژێر دەریاییەوە!، بەسەدان کۆشك و تەلاری بێ وێنە و قەلای پتەوی دروست کردبوو.

کە چی نەك زوڵمی لەمرۆڤێك. بەڵکو زوڵمی لە مێرولەیەکیش نەکرد، ﴿ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا ﴾ النمل: ١٩.

کەچی بەم هەموو هێزە ماددی و سەربازیەوە نەك هەر تەکەبوری لێ نەدا. بەڵکو بەمل کەچی یەوە فەرموی: (هذا من فَضْلِ رَبِّي). ئەمە هەمووی هی خوایە. هەمووی تاقیکردنەوەی خوایە، تا تاقیم بکاتەوە. ئایا بەندەیەکی سوپاس گوزار دەبم یان نا !...

وە هەروەها (ذُو القرْنين) ئەو پاشاو سەرکردە دەست ڕۆشتووەی کە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای سەر زەوی گرت. ئەوەندە بەدەسەڵات بوو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای گرت. هەرچی گەلی چەوساوەی سەر زەویە ڕزگاری کرد و فێری ژیانی مەدەنی کرد. مرۆڤایەتی لە ستەمی (يأجوج ومأجوج) پاراست و لە مێژوودا سەدی دروست کرد. سەد و بەربەستێکی ئاوا کە تائێستا دروست نەکراوە، کەچی دەیفەرموو: ئەمە هەمووی هیی خوایەو خەڵاتی خوایە و (فإذا جاءَ وعْدُ رَبِّي جَعَلَهُ دَكَّاءَ وكانَ







وعْدُ رَبِّي حَقاً) لەبەرامبەر ئەم دووانەدا. خوای گەورە لەکافران و خوا نەناسان باسی قارون و فیرعەونمان بۆ دەکات. قارونی سەرمایەدار . لەچاو سامانداری حەزرەتی سولەیماندا هەرهیچی نەبوو. ئەگەر چی کلیلی خەزێنەکانی بەچەند مرۆڤی پاڵەوانی بەهێز هەڵنەدەگیران، بەڵام هێشتا سەروەت و پارەی بەشێکی سەر زەوی لەبەردەست بوو. بەڵام حەزرەتی سولەیمان هەموو سەروەت و سامانی سەرزەوی و ژێر زەوی و ژێر دەریاکانی لەبەردەستا بوو! کەچی قارون چونکە دینی نەبوو. هەر زوو لەخۆی بایی بوو. وە وتی: ﴿إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓ﴾ القصص: ٧٨.

ئەم ماڵ و سامانە هیی ئازایەتی و مەردایەتی خۆمە، هیی ئەوەیە من دەزانم پارە لە پارە دروست بکەم. بەم شێوەیە گاڵتەی بە فەقیر و هەژار دەهات، بۆیە نەك هەرکەس سودی لەسامانەکەی نەبینی، بۆ خۆشی سودی لێ نەبینی و خۆشی لەگەڵ سامانەکەیدا تێدا چوو!

یاخود فیرعەون لەچاو (ذُو القرنين)دا هیچ دەسەڵاتی نەبووە چونکە فیرعەون سنوری دەسەڵاتی تەنها بەسەر میصر و ڕووباری نیل دا بوو، کاتێ کە شانازی بە دەسەڵاتەکەیەوە دەکرد و پێ ی بوغرا بوو، دەیگوت: ﴿أَلَيۡسَ لِي مُلۡكُ مِصۡرَ وَهَٰذِهِ ٱلۡأَنۡهَٰرُ تَجۡرِي مِن تَحۡتِيٓۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ﴾ الزخرف: ٥١.

بەڵێ فیرعەون سنوری دەسەڵاتەکەی ، تەنها وڵاتی میصر بوو. نەك کیشوەرێك، نەك هەموو سەرزەوی، وە تەنها بەشێکی ڕووباری نیلی بەدەستەوە بوو. نەك هەموو دەریا و زەریاکان و بەرهەمی ناوەویان! کەچی سەرەنجام بەو تۆزە دەسەڵاتەی نەتەوەی بەنی ئیسرائیلی قڕ تێخست و منداڵی ساوای نەهێشت و ژیانی لێ کردن بەژان، سەر ئەنجام خۆیشی و شوێنکەوتوانیشی هەر بەئاوی ئەو نیلە فەوتان کە شانازی پێوە دەکرا!.

بەڵێ بەردەوام ئەهلی ئیمان و ئیسلام لەڕووی ئابووریەوە ، پشکی شێریان بەرکەوتووە. ئەوەتا لەناو صەحابەکانی پێغەمبەردا ﷺ .. کەلەسەر زمانی پێغەمبەری خواوە ﷺ(١٠) ) کەسیان موژدەی بەهەشتیان پێ درابوو. کەپێیان دەوترێ: (العشرَة المبشرَة) لەناو ئەو (١٠) صەحابەدا ، سیانیان زۆر دەوڵەمەند بوون. حەزرەتی : (ابوبکری صدیق و عثمانی کوڕی عەففان و عبدالرحمن ی کوڕی عەوف). ئەم هاوەڵانەی پێغەمبەر ﷺ زۆر لەبازرگانە کافرەکان

دەوڵەمەنتر بوون. بەلاّم دەوڵەمەندێکی خزمەتگوزار بە موسوڵمانان. بۆ نموونە:

١- حەزرەتی ئەبوبکری صدیق، کە ئیمانەکەی هاوتای نیوەی ئیمانی هەموو ئوممەتە ئایەتی قورئانی باسی دەکات و دەفەرموێ : ﴿ وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلْأَتْقَى ٱلَّذِى يُؤْتِى مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِ ٱلْأَعْلَىٰ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ ﴾ الليل: ١٧ - ٢١.

ئیمامی (إبنُ الجوزی) دەفەرموێ: هەموو لێکۆڵەرەوانی قورئان کۆ دەنگن لەسەر ئەوەی کە ئەم ئایەتانە لەشەئنی ئەبوبکری صدیق دا هاتوونەتە خوارەوە، کە ماناکەی بەکوردی ئەمەیە: جا خواناسان و پارێزکاران. لەو سزاو ئاگرو ناخۆشیە دور دەخرێنەوە، ئەو جۆرە کەسەی کە ماڵ و سامانی دەبەخشێت ، بەوە دڵ و دەرونی خۆی خاوێن ڕادەگرێت. لەکاتێکدا کە کەس چاکەیەکی وای بەسەریەوە نیە کە پاداشت بدرێتەوە چونکە تەنها مەبەستی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی پەروەردگاری بەرزو بڵندە. سوێند بەخوا ڕازی و خۆشنوود دەبێت پێی.

بەڵێ ئیمامی ئەبوبەکر لەدەوڵەمەندترین کەسەکانی مەککە بوو. بازرگانێکی بەناوبانگ بوو. بەلاّم سەروەت و سامانەکەی بەقوربانی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی کرد.

٢- دووەم کەس لەعەشەرەی موبەشەرە کەپێغەمبەری خوا ﷺ هەرلەدنیادا موژدەی پێ بەخشی ومردن وچونە بەهەشتی یەکە، وە لەگەڵ ئەو هەموو ئیمانە گەورەدا، لەدەوڵەمەندترین بازرگانەکان بوو. ئیمامی عوسمانی کوڕی عەفان بوو. ئەم ئیمامی عوسمانە یەکێ بوو لەهەرە دەوڵەمەندەکان. بەلاّم نەك هەربەو دەوڵەمەندیەی بوغڕانەبوو بەڵکو بەو ماڵ وسامانە زۆرەی — بەلاّم حەلاّڵەی — دووجار بەهەشتی لەخوا کڕی. ئەمەش وەعد وبەڵێنی پێغەمبەری خوایە ﷺ بۆ ئیمامی عثمان. کەجارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ کەباسی کەم ئاوی وناڕەحەتی موسڵمانانی بیستەوە، کەبەڕاستی شاری مەدینە زۆربەی بیرەکانی ووشکی کردبوو. پێویستی بەبیری ئاوی قوڵ وتازە هەبوو. کەئەمەش پێویستی بەبیرهەڵکەنی زۆر لێهاتوو هەبوو، کەلەدەرەوەی مەدینەوە بەپارەیەکی زۆر بیهێنن. بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (من حفرَ رُومةَ فلهُ الجنة) هەرکەسێ ئەو بیرە هەڵکەنێ و موسڵمانان ڕزگار بکات لەبێ ئاوی،





ئەوا بەهەشتی بۆهەیە.

ئیمامی عثمان لەسەر خەرجی خۆی بیرەکەی لێداو موسڵمانان لەبێ ئاوی رزگاریان بوو وە بەهەشتی بەدەست هێنا. جارێکی تریش کەسوپای موسڵمانان بەرەو غەزای رۆمەکان بەرێ دەکەوتن، بەڵام بەهۆی هەژاری ونەداری یەوە، زۆر لەصەحابەکان وڵاخی سواریان نەبوو، شمشێر وتیر وکەوانیان نەبوو. ماڵ ومناڵیان لەماڵەوە هیچی نەبوو. لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (من جَهَّزَ جَيْشَ العُسْرَةِ فَلَهُ الجَنَّة). هەرکەسێ ئەم سوپایە چەکدار بکاو پێویستیەکانی دابین بکات، لەم دەستتەنگی و نارەحەتیەدا. ئەوە بەهەشتی بۆ هەیە. ئیمامی عثمان بەتەنها چوەژێری وتەواوی مەصرەفی سوپاکەی گرتە ئەستۆی خۆی. ئەو هەموو وڵاخ وچەك و خۆراکە، کەبەهەزاران دۆلاری ئەمرۆ دەکات. وە جاری واهەبووە ئیمامی عوسمان باری (١٠٠٠) حوشتری کەلوپەل وخۆراك بەخشیوە. کەبەپارەی ئەمرۆ بایەی (١٠) دەفتەر دۆلار زیاتر بووە!.

٣- دەوڵەمەندی ناوداری سێ یەم، کەیەکێکە لە (دە) موژدەپێدراوەکەی بەهەشت (عبدالرَّحمن ی کوڕی عەوفە). کەلەشاری مەدینە زۆر مەردانە بەپشتیوانی خوای گەورە دەستی کرد بەکڕین وفرۆشتن وبەهۆی تەوەکولی راستەقینەی لەسەر خواو پاشان چاو لەدەست نەبونی هیچ کەس ورازی بون بەقازانجی کەم، خوای گەورە بەرەکەتی خستە رزق ورۆزیەوە وبۆخۆی دەفەرموێ: ئەگەر بەردم بکڕیایە وبفرۆشتایە وەکو ئاڵتونی خەڵکی خێری دەکرد! ئەم هاوەڵە بەڕێزەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە دەوڵەمەند بوو، کەبەیەك جار، لەیەك رۆژدا باری (٧٠٠) حوشتری کرد بەخێر. لەجارێکی تردا تەنها لەیەك رۆژدا (٤٠٫٠٠٠) دیناری ئاڵتون، کەدەکاتە نزیکەی (٤٠٠) دەفتەر دۆلاری ئەمرۆ کرد بەخێرو صەدەقە ودابەشی کرد بەسەر هەژاراندا! هەرکەس پێویستی بەقەرز ببوایە، وەکو بچێ لەپارەی خۆی هەڵبگرێ، ئاوا دەچوو پارەی لەعبدالرحمن ی کوڕی عەوف وەردەگرت و پاشان کەپێویستیەکەی جێ بەجێ دەبوو، بۆی دەبردەوە.

بەم شێوەیە وەکو بانقێك بەبێ هیچ سود وریبایەك (قَرْضاً حَسَناً) لەبەردەستی موسڵماناندا بوو. کەس بۆ قەرزدانەوە و توشی منەت باری کەسیش نەدەبوو. کەواتە: ماڵ وسامان وپارە ئەگەر لەژێر دەستی ئیمانداردابێ دەبێتە خێرو

بەرەکەت بۆ هەمووکەس. هەم بۆخۆی هەم بۆ دەوروبەری دەبێتە ڕووناکی.

بەڵام ئەگەر کەسێك، لەدین وخواناسی تێ نەگەیشتبوو، وە بڕوای بەقیامەت وحەڵاڵ و حەرام نەبوو، ئەوە هەرئەوەندەی پارەی کەوتە ژێر دەست، ئیتر دەبێتە میکرۆب و وڵات بۆگەن دەکاو میللەت دەچەوسێنێتەوە. یەکێ لەسەرکردەکانی پارتێکی دەست ڕۆیشتوی هەرێمی کوردستان. لەچاوپێکەوتنێکی دا لەگەڵ، گۆڤارێکی کوردی دا، کەلێیان پرسی بوو: باشە بۆچی ئێوە کەلەشاخ بوون، ساڵەو ساڵ پێنج دینارتان وەردەگرت ولەماڵی خەڵکی گوندەکان نانتان دەخوارد. کەچی خۆشەویستی ناوخەڵك بون، کەچی ئێستا کەدەوڵەمەند وفەرمانڕەوای وڵاتن، ئاوا خۆشەویستی ناو خەڵکی نەماون وبگرە زۆرجار خەڵکی خۆپێشاندانتان لەدژ دەکات وداوای لابردنتان دەکات؟! ئەو لێپرسراوە لەوەڵامدا وتبوی وبەڕاستی وەڵامێکی بەویژدانانە و ڕاستگۆیانەی دابۆوە کەوتبوی: گرفتی هەرە گەورەی ئێمە ئەوەبوو، کەلەڕوی بیروباوەڕەوە شتێك بەناوی حەڵاڵ و حەرام گرنگی پێ نەدەدرا. وە پاشانیش ئێمە کە لەشاخەوە هاتینەوە ناوشار، برسی بوین. هیچمان نەمابوو. جاکاتێ لەجیاتی گوێدرێژ مۆنیکامان بینی. لەجیاتی ساوەر، دەستمان کرد بەقەل و ماسی خواردن. لەجیاتی ئافرەتی لادێ، کەلەژێر ڕەنج و ماندوبون وخەباتدا دەستی قڵیشابوو. پرچی ئاڵۆزکا بوو. چوینە ناو فەرمانگەو زانکۆکان وکچی شاریمان بینی کەزیاتر گرنگی بەئارایشت وخۆڕازاندنەوە دەدات. ئیتر برسیانە تێ کەوتین و زۆربەمان ئەو ناوە پیرۆزو پاکەی پێشمەرگەمان لەدەست داو بوین بەدزو داوێن پیس و گەندەڵ و هێزی (R.R) ڕاوەڕووت!!!



بەڕاستی قسەیەکی زۆر جوان و وەڵامێکی زۆر بەجێ یە. هەرکەس بڕوابون بەچاودێری خوایی وکێشانەو پێوانەی قیامەت وحەڵاڵ وحەرامی نەزانی.. ئاوا خۆی لەئاستی ماڵ وسامانداا ناگرێ وبەچۆکدا دێ، بۆیە بەڕاستی پێویستە حکومەت هانی پۆلیس وئاسایش و پێشمەرگە دڵسۆزو بەڕێزەکان بدات کەهاتوچۆی مزگەوت بکەن وبەشداری خوتبەی جومعەو ونوێژی جەماعەت بکەن، بەپێ ی بۆکران وگونجان. بۆئەوەی وانەی ئیمانداری وچاودێری خوایی وجیاکردنەوەی حەڵاڵ و حەرام لەیەکتر بخوێنن. خۆ ئەگەر یەکێ بڵێ: ئەوە یاسا ئەوکارە دەکات وقانونیش هێڵی سوری هەیە و ڕێگری دەکات کەمرۆڤ دەست درێژی بکاتە سەرماڵ ومافی کەسانی تر؟! لەوەڵامدا دەڵێین: خۆ زۆر



بەرپرس ودەسەڵاتدار کەخۆی جێ بەجێکاری یاساو قانون بوو، دزی دەکردو فەرهودی فەرمانگەی حوکمی دەکرد!

بۆیە ئیمان و عەقیدە لەسەروی یاساوە دەتوانێ بەچاودێری ناوناخی مرۆڤ. لەوکاتەدا کەیاسا دەستی پێ ناگات وحکومەت چاوی لێ ی نیە. ئەم چاودێریە ناوخۆییە، دەستی دەگرێ وئاراستەی مرۆڤ دەگۆڕێ لەخراپەوە بەرەو چاکەی دەبات.

ئیمانداران: بەدرێژایی مێژوی کۆن ونوێ، بیری مرۆڤ کەدوربووە لەپەیامی خوا، دوو دیدو تێڕوانین وئاراستەی هەبووە بەرامبەر ماڵ وسامان وبواری دارایی وئابوری..

١- بیری ئیشتراکی، کەلەکۆندا کەبیری موزدەکی بووەو لەم سەردەمەشدا ناوی نرا (کۆمۆنیستی) کەرەتی موڵکایەتی تاکە کەس دەکاتەوەو دەڵێ: دەبێ هەموو کەس کاربکاو بەرهەم بێنێ وکەس بێکار دانەنیشێ، پاشان بەرهەمەکەو پارەکە بچێتە گیرفانی حکومەتەوە وحکومەتیش بەیەکسانی دابەشی بکاتەوە بەسەر هاولاتیاندا و هەموو وەکو یەك بژین وبخۆن. ئەوەبوو لەڕوسیا (یەکیەتی سۆڤیەتی جاران) هیچ کەس دینارێکی، دۆلارێکی لەگیرفاندا نەبوو، بەیانیان کەلەخەو هەڵدەستان، هەرچی خۆراکێ بێ لەماڵیاندا نەبوو. حکومەت بەپێ ی سەرخێزان شیر ونانی بەیانی بۆ دابین دەکردن. بۆ نانی نیوەڕۆش بەهەمان شێوە!! وە خانوو هەموی موڵکی حکومەت بوو. کەس تاپۆی خانووی خۆی نەبوو!

سەرەنجام ئەم فکرە بلۆکی سۆسیالیستی لەولاتانی کوباو یەکیەتی سۆڤیەتی جاران لێك هەڵوەشاند ولەدین ودونیای کردن وهەژاری خستن ولەبواری تەکنەلۆجیای سەردەمیشدا دواکەوتن. ئەوەبوو بلۆکی ڕۆژهەلات چۆکی دادا بەرامبەر ڕۆژئاواو سەرنجام یەکیەتی سۆڤیەت هەڵوەشا. دوای ئەو هەموو خوێن ڕێژی وپێشێلکاریەی بەرامبەر مافی مرۆڤ کردی بۆ چەسپاندنی بیری کۆمۆنیستی!...

٢- بیری سەرمایەداری: کەسەرمایەداری لەسەر دوو بنەمای کێبڕکێ ی کۆنترۆڵ کردن – دەست بەسەردا گرتن و – کێ برکێ ی ناتەواو کەپەیوەست

نیە بەهیچ بەهایەکی مرۆڤایەتیەوە، جگە لەبەدەست هێنانی قازانج نەبێت. ئەم بیری سەرمایەداری یە وای کردوە کەئەمڕۆ (٢٠٪)ی جیهان بەرهەمی ڕەنجی (٨٠٪)ی هەموو جیهان دەخوات! بەڵام ئیسلام وەکو شیر وایە، کەچۆن شیری پاکوپوخت لەنێوان خوێن وپیسیەوە دێتەدەر. ئیسلامیش لەنێوان پیسی وخوێنی سەرمایەداری وئیشتراکی هاتۆتە دەرو وەکو شیر لەگەڵ فیترەتی مرۆڤدا دەگونجێ. کەمرۆڤ حەزی لەوەیە خۆی خاوەنی ماڵ بێ و بەرهەمی کار وماندوبونی خۆی بخاتە گیرفانی خۆیەوە و ئیسلام ئەمەی بەمرۆڤ بەخشیوەو ئەو حەقەی پێ داوە. بەڵام مەرجێکی بۆ داناوە کەنابێ زەرەر لەبەرژەوەندی گشتی بدات. وە ئەو ماف وبەشانەی کەخوای گەورە لەماڵ و سامانی ساماندارو دەوڵەمەندانەدا داینادوە بەشی هەژار ونەدارانە وەکو دەکات بیداتە هەژاران

بەم شێوەیە ئێستا بەچاوی خۆمان واخەریکە هەرەسی بیری سەرمایەداریش دەبینین. کەچۆن بانقەکان بەهۆی ڕیبا خۆری یەوە هەرەس دەهێنن! وە مرۆڤایەتی جارێکی تر پێویستی بەوەیە بگەڕێتەوە بۆ ئیسلام لەبواری ئابوری ولەهەموو بوارەکانی ژیان دا. چونکە ئیسلام کالایەکە پڕ بەباڵای مرۆڤە وهەرئەوەی لەگەڵ دەگونجێ وهیچی تر.

﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴿٨﴾ ﴾

ٱللَّهُمَّ آمِين



سەرچاوەکان


١- تەفسیری ئاسان ، بورهان محمد أمين.

٢- موسوعَة الأخْلاق الإسْلامِيَّة ، سَعْد يوسف أبوعَزيز ، ج١، ص٤٥٨.

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجْمَعين.

ئیمانداران و خواناسانی بەڕێز : (جەژنی قوربانتان پیرۆز بێت) .ئیمانداران: ئەمڕۆ کە جەژنی قوربانە. پێشی دەوترێ جەژنی حاجیەکان. چونکە دوێنێ لە ڕۆژی عەرەفەدا. حاجیەکان بوون بەحاجی. هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (الحَجُّ عَرَفَة) هەرکەس لە ڕۆژی عەرەفەدا لە لەعەرەفات نەبێ. حەجی لێ قبوڵ نابێ. ئای چ جەژن و شادیەکە، کە ڕوکنێکی دینەکەت تەواو ببێ، چ خۆشیەکە و چۆن جەژن و شادی دەوێ. کە بەحەج کردن خوای گەورە مرۆڤ لەهەموو گوناهەکانی ڕابردووی پاك دەکاتەوە. بەمەرجێ بە پارەی حەڵاڵ چوبێتە حەج و لە ماناو مەبەستی حەج تێگەیشتبێ و حەقی موسوڵمانان و خزم و کەس و کار وماڵ و منالی لەسەر نەمابێ. وە کە لەحەجیش گەڕایەوە پارێزگاری لەحەجەکەی بکات بەڕەوشتە بەرزو باڵاکان خۆی بڕازێنێتەوە و ببێتە مرۆڤێکی نوێ ﴿ خَلۡقًا ءَاخَرَ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِينَ ﴾ المؤمنون: ١٤ .

کەواتە: لەئیسلامدا جەژن لەدوای بەدەست هێنانی دەستکەوتێکی گەورەیە. جەژنی ڕەمەزان، دوای بەڕۆژوبوون و تەراویح و خواپەرستی مانگی ڕەمەزان دەکرێ و سوپاسی خوا دەکرێ و شادمانی دەردەبڕدرێ لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە هیدایەتی ئیماندارانی دا، کە بەجوانی لەخزمەت ئەو فەرزە پیرۆزەدا بن کە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانە. جەژنی قوربانیش دوای حەج کردن دێت. بەڵام بێ دینان کە جەژن و ئاهەنگ دەگێڕن، خۆشیان نازانن بۆ چ مەبەستێکە، ئایا چیان بەدەست هێناوە؟ بەڵام سوپاس بۆ خوای گەورەو درودو صەلاوات بۆ سەر پێغەمبەری نازدار کە ئێمەی موسوڵمان هەموو کارێکمان لەسەر بەرچاو ڕوونیە. الحَمْدُ لِلَّهِ عَلى الإيمانِ وَ الإسْلام.

بەڕێزان: بۆ ئێمە کە نەچوینەتە حەج ، جەژنی قوربان عیبادەتێکی گەورەو سەنگینی تێدایە کە قوربانی سەربڕینە. قوربانی کردن لای پێشەوا (ئەبو حەنیفە) و پێشەوا (مالك) واجبە، جارێك قوربانی هەر سەربڕێ. بەبەڵگە و دەلیلی ئایەتی: ﴿ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنۡحَرۡ ﴾.وە بە فەرمودەی: (من وَجَدَ سَعَةً، فَلَمْ يُضَحِّ، فَلا يَقْرَبَنَّ مُصَلانا).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی : هەرکەسێ توانای کڕینی حەیوانی قوربانی هەبێ، بەڵام بەئەنقەست قوربانی سەر نەبڕێ. بانزیکی شوێنی جەژنمان نەکەوێ و لەگەڵمان بەشداری نوێژی جەژنی قوربان نەکات!!



قوربانی کردن لای پێشەوامان (شافیعی) سوننەتێکی زۆر گەورەیە و هەرکەسێ قەرزار نەبێ و زەکاتی دابێ و نانی ڕۆژانی جەژنی هەبێ، حەق وایە قوربانی سەرببڕێ.

ئیمانداران: قوربانی کردن، واچاکە و پەسەندە ، کە هەموو ساڵێك ئەنجام بدرێ. نەك وەکو هەندێ کەس وا حاڵی بوون کەلەتەمەندا یەکجار بەسە! نەخێر. ئەگەر هەتبوو. هەموو ساڵێك لەچەژنی قورباندا حەیوانێکی قوربانی سەر ببڕە . لەوڵاتانی وەکو (ئەندەنوسیا و مالیزیا)، لەگەڵ دروستکردنی خانوەکانیاندا ، شوێنی سەربڕینی حەیوانی قوربانی دیاری کراوە. کە بەڕاستی نیشانەی ماڵە موسوڵمانە و خۆزگە لێرەش ئەوە بکرایە.

بەڕێزان: لە حیکمەتەکانی قوربانی کردن (والله أعْلَم) ئەمانە هەندێکیانن:

١- لەلایەنی دونیاییەوە. لەناوخۆی موسوڵماناندا. چ جموجوڵێکی گەورە لەبازاڕی ئاژەڵ فرۆشیدا پەیدا دەبێ و چەندین کەس وەکو خاوەن ئاژەڵ. وەکو جامبازی حەیوانات. وەکو قەصاب، سودمەندێکی زۆر باش دەبن لەچەژنی قورباندا.

وە قوربانی هانی ئەو کەسانە دەدات کە ئیشی ئاژەڵداری دەکەن. کە بەرهەمی جوان پێشکەش بە هاوڵاتیان بکەن، ئەوەتا کۆمەڵێك وەصفی بۆ حەیوانی قوربانی داناوە. کە هەمووی بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئاژەڵداری موسوڵمان دەبێ جوانترین و پوخت ترین و ساغ ترین، ئاژەڵ بەخێو بکات و بینێرێتە بازاڕ.

٢- بەهۆی سەربڕینی حەیوانی قوربانیەوە. موسوڵمانان ڕێژەیەکی زۆرباش لەگۆشتی نایاب و تایبەت دەخۆن. چونکە باشترین حەیوان کراوەتە قوربانی . کە هەرچی نەخۆشی و کەم وکوڕی هەیە تێ یدا نیە. کە ئەمەش گەورەیی جەژنی موسوڵمانان دەردەخات. کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (أيّامُ عيد، أيامُ أكْلٍ وَ شُرْبٍ وَذِكْر الله عَزَّ وَجَلَّ)، ڕۆژانی جەژن ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەی حەڵاڵن و یاد و زیکری خوای گەورەیان تێدا دەکرێ. کەواتە: دینەکەمان دینی دونیا و قیامەتە. هەم ڕۆح و ناخمان تێردەکات. هەم گەدە و گیرفانمان پڕدەکات.

٣- ئەو ماڵەی کە حەیوانی قوربانی تێدا سەردەبڕدرێ، چەند دڵیان خۆش دەبێ و چۆن دەرونیان ئاسودە دەبێ. کاتێ کە کە ئەو خێزانە بەدەوری ئەو

ئاژەڵەدا کۆدەبنەوە و پاشان دوای سەربڕین خۆیان بەکۆمەڵ لێی دەخۆن و گۆشت دەنێرن بۆ دراوسێ و هاوماڵەکانیان. بڕوا بکەن زۆر نەخۆشی دەرونی و نەفسی هەیە بەم قوربانی کردن و لە دەوری یەکتر کۆبونەوە و گۆشت دابەش کردنە نامێنێ و زۆر زۆر کاریگەری باشتری هەیە لەسەردانی دکتۆری دەروونی و بەکارهێنانی چارەسەری دەرمانی.

٤- لەچەژنی قوربان و قوربانی کردندا ، گەورەیی ئیسلاممان زیاتر بۆ دەردەکەوێ . ئەو ئیسلامە کە فێرمان دەکات ببەخشین، هەم خۆمان تێربکەین هەم خەڵکیش تێرو تەسەل بکەین . خۆمان لە خۆشیدا دەبین و بەقوربانی بەخشینەوەش دڵی خەڵکی تریش خۆش دەکەین .

نەك وەکو سەری ساڵی مەسیحیەکان و ئەوانی تر کە بەگۆرانی گوتن و ڕەقس و سەما و عەرەق خۆری و بێ هۆشی و سەرخۆشی و یاری ئاگری، ماڵی خۆیان و خەڵکیش وێران دەکەن. ئەو هەموو ملیۆنەها دۆلارە لەشتی بەلاش و عەقڵ لابەردا خەرج دەکەن، جابا خەڵکی بەبەرچاو ڕونیەوە بڕیار بدەن کە ئایا: موسوڵمانان پێشکەوتون. یان بێ دین و لادەرەکان لەدینی حەق؟! ...

٥- چەژنی قوربان و قوربانی کردن پێمان دەڵێ کە: حەیوان و ئاژەڵ بکەن بە قوربانی و یەکتری پێ دڵخۆش بکەن. بەڵام یەکتری مەکەن بەقوربانی بۆ بەرژەوەندی دونیایی خۆتان. لە ئەمڕۆداو لەکۆنیشدا، بێ دینان، هەزاران مرۆڤ دەکەن بەقوربانی لەپێناوی حەزێکی خۆیاندا. لەپێناوی بڕیارێکی سیاسی هەڵەی دیکتاتۆریانەی خۆیاندا. قوربانی سەربڕین پێت دەڵێ: ئیسلام هەموو شتێ دەکا بەقوربانی مرۆڤ، بەڵام مرۆڤ ناکا بەقوربانی هیچ شتێکی ماددی مادیگەرایی دونیایی.

هەروەها قوربانی کردن پێمان دەڵێ دەبێ ڕەچاوی مافی ئاژەڵیش بکەین نابێ بەبێ یاسا دەست بکەین بە ئاژەڵ سەربڕین، ئەوەتا شەریعەتی ئیسلامی، جۆری ئاژەڵی گونجاو بۆ قوربانی دیاری کردووە. کە نابێ پەلەوەر بکرێ بەقوربانی. وەتەمەنەکەی دیاری کردووە. نابێ لەوە کەمتر بکرێتە قوربانی. وە سیفاتی ئاژەڵەکەی دیاری کردوە و هەمووی لە چوارچێوەی بڕیارەکانی شەریعەتی ئیسلامی دەربارەی ئاژەڵی قوربانی تۆمار کردووە. کە ئەمەش فێری ئەوەمان دەکات. موسوڵمان نابێ بەئارەزوی خۆی بەبێ گەڕانەوە بۆ یاسای تایبەتمەند، هەرلەخۆیەوە پەلاماری ئاژەڵ و گیانداران بدات و لەناویان ببات





چونکە ئەوەش زەرەر لەژیان و ژینگە دەدات.

ئەمانەی باسمان کردن چەند حیکمەتێکی قوربانی کردن بوون لەلایەنە دونیاییەکەیەوە لەناو خۆی موسوڵمانانندا، بەڵام حیکمەتی قوربانی سەربڕین لەلایەنی نێو دەوڵەتی و جیهانیەوە.

بریتیە لەوەی کە: ئەگەر هەرچی حەیوانی قوربانیە ببرێتە شوێنی نوێژی جەژن، کەلە شەرعدا پێی دەوترێ (مصلی) و سەرببڕدرێن و ئەو هەموو خەڵکە بەژن و پیاوەوە. بەگەورە و بچوکەوە، هاوار بکەن : (الله أكبر ، الله أكبرُ، لاإله إلا الله وَالله أكْبَرُ ولله الحَمْدُ) ئای چ عەزەمەتێکی ئەم ئیسلامەتیە دەردەکەوێ، کە کاتی خۆی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (حَتَّى تَعْلَمَ اليَهودُ أَنَ فِي دينِنا فُسْحَةٌ). بایەهود بزانن کە لەدینەکەماندا کرانەوە و شادی و خۆشی دەربڕین هەیە و ئیسلام دژی گۆشەگیری و دڵتەنگی و خەمۆکی و قرپۆکیە.

بەڕێزان: باسەرنجی قورئان بدەین و بزانین چەند بەگەورە و گرنگیەوە باسی حەیوانی قوربانی دەکات، کاتێ کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْبُدْنَ جَعَلْنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ فَٱذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا صَوَآفَّ فَإِذَا وَجَبَتْ جُنُوبُهَا فَكُلُوا۟ مِنْهَا وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْقَانِعَ وَٱلْمُعْتَرَّ كَذَٰلِكَ سَخَّرْنَٰهَا لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ الحج: ٣٦.

واتە: ئێمە سەربڕینی قوربانیە دابەستەکانمان بڕیار داوە کە هەندێك بن لەدروشمەکانی خوا، کە لەکاتی حەج و جەژنی قورباندا ئەنجام دەدرێت. بێگومان خێروبێری زۆری تێدایە بۆتان، بازاڕی کڕن و فرۆشتن دەجوڵێنێت و هەژاران تێر دەبن لەگۆشت، پاداشتی زۆربۆ قیامەتیش مسۆگەر دەکات و .... هتد. دەناوی خوا ببەن لەکاتی سەربڕینیدا بڵێن: (بِسم الله ، ألله أكبر). کاتێك ئامادە کراون و ڕیز کراون بۆ سەربڕین ، جا کاتێك کەسەر بڕان و گیانیان تێدا نەماو پاك کران و پارچە پارچە کران ، لێیان بخۆن و بەشی هەژاران و سواڵکەرانی لێ بدەن. ئابەو شێوەیە ئێمە ماڵاتمان بۆ ئێوە ڕامهێناوە، بۆ ئەوەی سوپاسی خوا بکەن ..

بەڵێ ئیمانداران، بەڕاستی ئەم ئایەتە کە باسی حەیوانی قوربانی دەکات ، بەچەندین شێوەو شێوازی سەرنج ڕاکێش، دامان دەچڵەکێنێ و بە ئاگامان دێنێتەوە و لەگەورەیی قوربانی کردن زیاتر تێ دەگەین.

ئەوەتا ئەم ووشە بەپێزو بەڕێزانە بەکار دێنێ، (من شَعائِرِ اللهِ، لَكُمْ فيها خَيْرٌ، فَكُلُوا منها، سَخَّرْناها لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُوْنَ). هەربۆیە لەقوربانی کردندا، هەر تەنها

مەبەست گۆشت بەشینەوە نیە. بۆیە لەشەرعدا دەفەرموێ: ئەگەر کەسێك بایی حەیوانێکی قوربانی پارەی داناو چوو بەوپارەیە گۆشتی لای قەصابێك کڕی ودابەشی کرد بەسەر هەژاراندا، ئەوە بۆی بەقوربانی حیساب نی یە!!

وە لەشەرعدا دەفەرموێ: قوربانی سەربڕین وسەربڕینی حەیوانی حەوتەم، خێری زۆر زیاترە لەوەی کەکەسێك پارەی حەیوانەکە بکات بەخێر وبیداتە دەستی هەژاران!. دەی خۆ ئاشکرایە ڕەنگە فەقیرو هەژار لەگۆشتەکەی سودمەند تربێ کەلای قەصاب دەکڕدرێ. چونکە گۆشتی پوختە دەداتە کڕیار وبایی ئەو حەیوانەی قوربانی، گۆشتی بازاڕ بکڕدرێ ڕەنگە بایی دوو حەیوان گۆشتی پێ بکڕدرێ وفەقیر وهەژاری زۆرتر سودی لێ ببینن، چونکە پێست و موو سەرو قاچ و وورگ و ڕیخۆڵەی لەگەڵ نیە.

بەڵام خوای گەورە ئەمە بەقوربانی وەرناگرێ، چونکە وتمان: قوربانی لەدابەش کردنی گۆشت بەسەر هەژاراندا گەورەترەو مانا ومەبەست لێ ی زیاترە، خوای گەورە خۆی فەرموی: (من شعائر اللهِ)، وە لەحاڵەتی دوەمدا، ڕەنگە پارە بەخشینەوەکە سودی هەژاری زیاتر تێدابێ، بەڵام چونکە قوربانی لەوەش گەورەترە، بەپارە بەخشینەوەکە خێری قوربانیەکەت بۆ نانوسرێ. چونکە قوبانی سەربڕین بۆخۆی کارێکی تایبەتەو شەعیرەیەکی ئیسلامەو گەورەترە لەخێرو خێراتی تر! هەروەکو ئیمامی نەوەوی لە (المجموع) ج٨ ص٤٢٥ و (إبنُ قدامة) لە — المغنی ج١٣ ص٣٦١ باسیان کردوە...

خێرو چاکە لەتای تەرازوی خۆماندا دەبینین (إن شاء الله) بەهۆی حەیوانی قوبانی سەربڕینەوە، کەپێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (ماعَمِلَ آدَمِيٌّ من عَمَلٍ يَوْمَ النَّحْرِ أَحَبَّ إلى اللهِ من إهْراقِ الدَّمِ، وَإِنَّهُ لَتأْتِي يَوْمَ القِيامَةِ بِقُرُوْنِها، وَأَشْعارِها، وَأَظْلافِها، وَإِنَّ الدَّمَ لَيَقَعُ مِنَ اللهِ بِمَكانٍ قَبْلَ أَنْ يَقَعَ مَنَ الارْضِ، فَطيبُوا بِها نَفْساً). رَواهُ إبنُ ماجَّة والترمِذي.

واتە: هیچ کردەوەیەکی ئادەمیزاد بەئەندازەی ئەوە لەلای خودا خۆشەویست وپەسەند نیە کەلەڕۆژەکانی جەژنی قورباندا، قوربانی بکات، لەڕۆژی قیامەتدا ئەو قوربانی یە بەخۆی وبەشاخ وبەموو وبەسمیەوە دێ ودادەنرێ لەناو تای خێری تەرازوی خێر وشەڕی قوربانیکەردا. وە بەرلەوە کەخوێنەکەی بکەوێتە سەرزەوی خودا گیرای دەکا. کەوابوو، ئێوەش بەدڵێکی پاك و بێگەردەوە بیکەن.

قوربانی سەربڕین ئەوەندە گەورەیە، سوننەتە هەموو ئەوانەی لەو شوێنەن





زۆر بەویقارەوە بوەستن، چونکە جێ بەجێکردنی عیبادەتێکی گەورەیە. وە سونەتە ئەگەر ئەو کەسەی قوربانی دەکات، خۆی سەری نەدەبڕی، لەلای قەسابەکەوە بوەستێ لەکاتی سەربڕینی حەیوانی قوربانیەکەدا. هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی بەفاتمە ی کچی، بەفاتمە ی خۆشەویستی، کاتێ کەفاتمە خان وویستی قوربانی بکات، فەرموی: (يافاطِمَةُ قُومي إلى أُضحِيَتِكِ فَاشْهَدِيها، فَإِنَّ لَكِ بِكُلِّ قَطْرَةٍ، تَقْطُرُ من دَمِها، أَنْ يُغْفَرَ لَكِ ماسَلَفَ من ذُنُوبِكِ، قالَتْ فاطِمَة: يارَسُولَ اللهِ: أَلَنا خاصَّةً أَهْلَ البَيْتِ، أَوْلَنا وَلِلْمُسْلِمِينَ؟ قالَ: بَلْ لَنا وَلِلْمُسْلِمِينَ). رَواهُ البَزار.

واتە: ئەی فاتمە ، هەستە بڕۆ بۆلای حەیوانی قوربانیەکەت، لەکاتی سەربڕینیدا لەلایەوە بوەستەو ئامادەبە. چونکە بەهەر دڵۆپە خوێنێك، کەلێ ی دێتە دەرەوە ولێ ی دەچۆڕێتەوە، خوای گەورە لەگوناهی ڕابردوت خۆش دەبێت. فاتمە فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئەوە هەر تایبەتە بەئێمە کەئال وبەیتی پێغەمبەرین. یان بۆ ئێمەش و سەرجەم موسڵمانانیشە؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: بۆ ئێمەش و سەرجەم موسڵمانانیشە.

وە چاك وایە ئەو کەسەی کەقوربانی دەکات، خۆی بەدەستی خۆی سەری ببڕێ. ئەگەر خۆی بۆی سەرنەدەبڕدرا. چونکە لێ ی نەدەزانی، یان توانای نەبوو. ئەوە باکەسێك بکات بەوەکیلی خۆی بۆ سەربڕینی قوربانیەکەی.

بەڵام دەبێ ئاگاداربێ ئەوکەسە نوێژ پاك وخواناس بێ. جا ئەگەر بۆی دەرکەوت، ئەو کەسەی حەیوانەکەی بۆسەر بڕیوە، نوێژنەکەر بووە، ئەوە زانایانی شەرع دەفەرمون: (إسْتَحَبَّ لَهُ الإعادَة، لِلْخِلاف في حِلِّ ذَكاتِهِ). چاك وایە سەرلەنوێ قوربانیەکی تربکەیتەوە. چونکە زانایان جیاوازیان هەیە لەسەرئەوەی کەئایا دەستکوژی نوێژنەکەر حەڵاڵە یان حەرامە. کەزۆربەیان لەسەر ئەوەن دەستکوژی نوێژنەکەر حەرامەو نابێ بخورێ. جا لەبەرئەوە ئەگەر موسڵمانێکی نوێژنەکەر هەبوو، کەدەیزانی حەیوان بەجوانی سەرببڕێ، وە جولەکەیەك وگاورێکی قەصابیش هەبون. ئەوە ئەگەر خۆت حەیوانی قوربانیەکەت بۆسەر نەدەبڕدرا. بەنوێژنەکەرە بەناو موسڵمانەکەی سەرمەبڕە!! بەڵکو بەگاور وجولەکەکەی سەرببڕە، چونکە دەستکوژی ئەوان بۆ موسڵمان حەڵاڵە بەتێکڕای زانایانی شەرع. وەکو لەقورئاندا بەڕوونی باسی کردووە!..

ئیمانداران: پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەستی خۆی قوربانی سەربڕیوە. ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرموێ: (ضَحَّى النَبِيُّ ﷺ بِكَبْشَينِ أَمْلَحَيْنَ أَقْرَنَيْنِ ذَبَحَهُما بِيَدِهِ، وَسَمَّى



وَكَبَّرَ، وَوَضَعَ رِجْلَهُ عَلى صفاحِها) - مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ - بُخاري (٥٥٥٨) وَمُسْلِم (١٩٦٦)

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ، دوو بەرانی شاخداری کرد بەقوربانی، بەدەستی خۆی سەری بڕین، وە ناوی خوای هێناو ئەڵلاهو ئەکبەری کرد وفەرموی:(بسم اللهِ واللهُ أكبر) — وە قاچی دانا لەسەر لاملیان وە لەسەر لای چەپ پاڵی خستن وبەدەستی چەپی سەری گرتن وبەدەستی ڕاستی چەقۆکەی گرت، ئنجا سەری بڕین.

وە قوربانی کردن ئەوەندە گەورەیە کەپێغەمبەری دڵسۆزمان — کە — (حَريصٌ عَلَيْكُمْ بالْمُؤمنينَ رؤوفٌ رَحيم)، نەیویستوە هیچ کەس لەئوممەتەکەی لەخێری قوربانی کردن بێبەش ببێ. بۆیە بەدەستی خۆی قوربانی سەربڕیوە وناوی هەموو ئوممەتەکەی لێ هێناوە.

هەروەکو لەم فەرمودەیەدا هاتوە کەدایکی ئیمانداران، خاتوو عائیشە بۆمـان دەگێڕێتەوە ودەفەرموێ: پێغەمـبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد، بەرانێکی شاخداریان بۆهێنا، کەبیکات بەقوربانی هەرچوار پەلی، دەموو چاوو ژێرسکی بەرانەکە بۆرە تووکێکی ڕەشباو بوو. فەرموی: ئەی عائیشە، کێردەکە بێنە. بەهەسانێ، بە بەردێ تیژی بکە. منیش فەرمانەکەیم بەجێ هێناو وام کرد. ئینجا کێردەکەی هەڵگرت و بەرانەکەی پاڵ خست وسەری بڕی ولەکاتی سەربڕینەکەیدا، فەرمووی: (بِإسْمِ اللهِ، اللّهُمَّ تَقَبَّلْ من مُحَمَّدٍ وآلِ مُحَمَّدٍ ومن أُمَّةِ مُحَمَّدٍ) بەناوی خوای گەورە. ئەی خوایە، ئەی پەروەردگارم، ئەم قوربانیە قەبووڵ بکە لەموحەممەد خۆی ولەکەس وکاری موحەممەد و لەئوممەتی محمد، ئیتر لەسەر ئەم شێوەیە بەرانەکەی کرد بەقوربانی. — ئەم فەرمودەیە پێشەوا — مسلم — ڕیوایەتی کردوە.

ئیمانداران: مەڕ وبزن بۆ یەك کەس دەکرێ بەقوریانی، بەڵام ڕەشە وڵاخ بۆ حەوت کەس دەکرێ بەقوربانی. بەڵام ئەگەر خێزانێك یەك ئاژەڵیان بۆ دەکرِدرا. وەکو مەڕێك یان بزنێك. ئەوە باناوی هەمویانی لێ بهێنن و بۆ هەمویان دەبێ، الحمدلله لەفەزڵ وکەرەمی خوا. وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: هەرکەسێ دەیەوێ قوربانی بکا. کەمانگی نوێی قوربان هەڵهات، ئیتر بانەموو لەخۆی بکاتەوەو نەنینۆکی بکا، هەتا قوربانیەکەی سەردەبڕێت..
ئەم فەرمودەیە پێشەوا (مُسْلِم) ڕیوایەتی کردوە بەژمارەی (١٩٧٧)

خواردن لەگۆشتی قوربانی بۆ ئەوکەسەی کەقوربانیەکەی کردوە.





بەڕێزان: قوربانی لەڕووی شەرعەوە دوو جۆرە: قوربانی نەزر وقوربانی سوننەت. جاقوربانی نەزر ئەوەیە کەسێك. حەیوانێك کەبۆ قوربانی دەشێت، دیاری بکاو بڵێ: نەزربێ لەسەرم کەئەم حەیوانە بکەم بەقوربانی. وە بەتەواوی لەمانای (نەزر)کردن گەیشتبێ. ئەوە ئەم جۆرە قوربانی یە، نابێ خاوەن قوربانیەکە ودایك وباوکی وژن ومناڵی لێ ی بخۆن. واللهُ أعلم: وەکو تەمێ کردنێك کەبۆچی بەوشێوەیە قوربانی نەزر دەکات ولەسەرخۆی وئەوانەی نەفەقەیان لەسەری واجبە، حەرامی دەکات. لەکاتێکا پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لەنەزرکردن وبەخێری کەسی بەخیلی داناوە وە خوای گەورە ئەمری بەوە نەکردوە، کەقوربانی نەزر بکەین. یان بفەرموێ قوربانی نەزر خێری زیاترە! جا کەواتە ئەگەر کەسێ قوربانیەکەی نەزر کرد، ئەوە خۆی قورسایی وگرانی خستۆتە سەرخۆی ودەبێ باجەکەشی بدات. کەئەوەیە نابێ خۆی وماڵ وخێزانی لەقوربانیەکە بخۆن. بەڵام زۆر پێویستە ئەوە بۆ موسڵمانانی کورد زوبانی خۆمان بەجوانی ڕوون بکەینەوە. کەئەگەر کەسێك حەیوانێکی لەماڵەوە هەبوو. گۆلکێك، مەڕێك، بزنێك، وە ویستی دیاری بکات بۆ قوربانی. ئایا هەربەوەندەی کەووتی: ئەم حەیوانە دەکەین بەقوربانی ومەیفرۆشن وسەری مەبڕن، تاوەختێ جەژنی قوربان دێ. ئایا بەمە دەبێتە نەزر ولێ ی حەرام دەبێ؟!

لەوەڵامدا دەڵێین: ئاسانترین ڕێگە بۆئەوەی کەئەو دیاری کردنی حەیوانە ودەست نیشان کردنی و ناولێهێنانی بۆ قوربانی. قوربانیەکە نەکات بەنەزر ئەوەیە کە: لەوکاتەدا کەحەیوانەکە دیاری دەکەی وئاماژەی پێ دەکەی. بڵێ ی: إن شاءالله. ئەگەر ویستی خوای گەورەی لەسەربێ وبەنسیب بێ، ئەم حەیوانە دەکەم بەقوربانی. ئەوە بەو ووتنی: (إن شاءالله)یە، لەقوربانی نەزر دەردەچێ، هەروەکو لە (الفقهُ الإسلامي وأدلتهُ)دا باسی کردوە.



جۆری دووەمی قوربانی، قوربانی سوننەتە، کەباسی نەزرکردنی لێ نەکراوەو (إن شاءالله)ی لێ ووتراوە. ئەم جۆرە قوربانی یە، وا باشەو واسوننەتە کەحەیوانەکە بکات بە (سێ) بەشەوە (٣/١)ی بۆخۆی وماڵ ومناڵی بخوات لەڕۆژانی جەژندا، ٣/١ی ببەخشێ بەجیران وخزم ودۆستانی، جا دەوڵەمەندبن یان فەقیر، بەشی هەموویان بدات (بەڵام ئەگەر قوربانیەکە نەزر بوو، دەبێ هەربدرێ بەهەژاران، وە نابێ بۆخۆی لێ ی بخوات وماڵ ومناڵی ودایك وباوکی

لێ ی بخۆن ونابێ هیچیشی لێ هەڵبگرێ. وە نابێ بدرێ بەدەوڵەمەندەکان). بەپێ ی نزیکیان لەقاپیماڵەکەیەوە وبەئەندازەی زۆرو کەمی خێزان بۆیان بنێرێ. وە (٣/١)ی لێ پاشەکەوت بکات بۆ ڕۆژانی دوای جەژن. واتە: دەتوانێ (٣/١)ی حەیوانەکە بخاتە موجەمیدەو سەلاجەوە ودواتر بیخوات! وە دیارە ئەگەر زۆرتریشی لێ ببەخشێ وکەمتر بۆخۆی بگێڕێتەوە باشترە، بەتایبەت ئەمە بەپێ ی بارودۆخ دەگۆڕێ، ئەگەر وەختەکەو ساڵەکە گرانی ونەبوونی بوو. ئەوە کەمێکی لێ بگێڕیەوە وزۆری ببەخشی. یان ئەو گەڕەکە وئەو گوندە وئەو شارەی کەحەیوانەکەی تێدا دەکرێ بەقوربانی. ئەگەر دەوڵەمەند بوون، ئەوە بەوشێوەی باسمان کرد، بابیکات بە (سێ) بەشەوە و(٣/١)ی دابەش بکات. بەڵام ئەگەر خەڵکەکە دەست کورت وهەژار ونەدار بوون. ئەوە بەڕاستی واباشە بەشی هەرەزۆری ببەخشێ وبەشی کەمی بۆخۆی وخێزانی بگێڕێتەوە. هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەچاوی بارودۆخی ئەوکاتەی کردوە کەقوربانیەکەی تێدا کراوە. هەروەکو لەصەحیحی (مسلم) ژمارەی فەرمودە: (١٩٧٠)دا هاتوە کە: ئیبن عومەر دەفەرموێ: (لا يَأْكُلْ أَحَدٌ من لَحْمِ أُضْحِيَتِهِ فَوْقَ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ). واتە: باهیچ کەس لەسێ ڕۆژ زیاتر لەگۆشتی قوربانی خۆی نەخوات..

بەڵام ساڵی دوای ئەوە، صەحابەکان عەرزی پێغەمبەری خوایان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمساڵیش وەك پار بکەینەوە؟ فەرموی: (كُلُوا، وَأَطْعِمُوا، وَادَّخِرُوا فَإِنَّ ذلك العام، كانَ بالنّاسِ جَهْدٌ، فَأَرَدْتُ أَنْ تُعينُوا فيها) - رَواهُ البُخاري وَمُسْلِم -

واتە: نەء ، ئەمساڵ وامەکەن، بەڵکو هەم خۆشتان لێ ی بخۆن وهەم بەشی خەڵکی تریشی لێ بدەن وهەم پاشەکەوتیشی لێ بخەن، ساڵی پار بۆیە وام گوت چونکە پار ساڵەکەی نەهاتی بوو. خەڵکەکە پەرۆش بوون وحاڵیان پەرێشان بوو، ویستم کەئێوەش یاریدەیان بدەن ودەست گیرۆیی خەڵك بکەن. وە پرسیارکرا لەدایکی ئیمانداران، خاتوو عائیشە، ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی دەکرد لەوەی کەلەگۆشتی قوربانی بخورێ. لەلایەن ئەوکەسەوە کەقوربانیەکەی کردوە؟

عائیشە فەرموی: نەخێر، بەڵام چونکە خەڵکی هەژار بوون ولەبەرهەژاری کەم کەس قوربانی بۆدەکرا، پێغەمبەری خوا ﷺ وای پێ خۆش بوو. کەگۆشتی زۆر بدرێ بەوماڵانەی کەقوربانیان بۆ نەکراوە. ئەمجا خاتوو عائیشە فەرموی: (وَلَقَدْكُنّا نَرْفَعُ الكِراعَ - أَي كَتْفَ الشّاةِ - فَنَأْكُلُهُ بَعْدَ عَشْرَةِ أَيّامٍ) - أخرجه الترمذي رَقم:



(١٥١١).

واته: ئێمه لەماڵی پێغەمبەردا ﷺ حەیوانی قوربانیمان سەردەبڕی ودەستێکی حەیوانەکەمان هەڵدەگرت و پاشی (دە) ڕۆژ لەجەژنی قوربان دەمانخوارد..

وە ئەگەر کەسێك قوربانی کرد، بەڵام لەبواری ئابوری دا هەژار بوو، یان ژیانێکی مام ناوەندی هەبوو ئەوە لەکتێبی شەرعی – (الفِقْهُ الشَّرْعي المُيَسَّر)دا. کەدانراوی – شێخ محمد علی الصابونی) دەفەرموێ: ئەگەر کەسێك هەژار یان مام ناوەند لەژیاندا – نەزۆر هەژارو نەباش دەوڵەمەند – قوربانی کرد. مەڕێکی کردە قوربانی. ئەوە هیچ خراپەیەکی لەسەر نی یە، ئەگەر هیچی لێ نەبەخشێ وهەموی بۆماڵ و منالەکەی خۆی بگێڕێتەوە، بۆئەوەی بەتەواوی تێرگۆشت بن وهەم ڕۆژانی جەژن و هەم ماوەیەکی زۆریش دوای جەژن هەر لێ ی بخۆن. چونکە مەبەست لەقوربانی کردن، ڕشتنی خوێنی قوربانی یە وبەجێ هێنانی ئەو دروشمە گەورەی ئیسلامە، بەمەبەستی نزیك بونەوە لەخواو بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە. وە بەخشینی بەشێك لەگۆشتی حەیوانی قوربانی، سونەتەو واجب نی یە. ئەمەش زانایانی شەرع فتوایان لەسەرداوە. شەرعناسان فەرموویانە: (يُستَحَبُّ لِمن كانَ فَقيراً، أنْ يتركها كُلَّها لِعَيالِهِ، تَوْسِعَةً عَلَيْهِم). واللهُ تَعالى أَعْلَمُ.

واتە: واباشە وسوننەتە بۆ ئەوکەسەی کەهەژارەو حەیوانێك دەکات بەقوربانی کەهەموی بۆ خێزانەکەی – ژن ومنالەکانی – بگێڕێتەوە وهیچی لێ نەبەخشێ، بۆئەوەی بەتەواوی تێرو تەسەل بن و لەخۆشی دا جەژن و ڕۆژانی دوای جەژن بەسەربەرن.

وە دروستە بەشێك لەگۆشتی قوربانی سوننەت، وەکو هەدیە ودیاری بنێردرێ بۆ خزم وکەس وکار بەتایبەت کەسە نزیکەکان، وەکو خوشك وبرا ومام وخاڵ وپور، وە دۆست وبرادەران وهاوپیشەکانی ژیانی ڕۆژانەی. باماڵیشیان دوربێ، تەنانەت ئەگەر لەشار وگوندێکی تریش بێ. چونکە بەمە خۆشەویستی زیاتر نوێ دەبێتەوە.

لەکۆتایی دا: ئەم چەند خاڵەتان دەخەمە بەرچاو:

١- بانیەتتان زۆر خاوێن وپاك بێ لەکاتی قوربانی سەربڕینەکەداو خالیص بۆ ڕەزامەندی خوابێ ودڵ ودەرون و قسەو گوفتارتان دوربێ لەهەموو جۆرە ڕیا ومنەت کردن وخۆپێوە هەڵکێشان وباس کردنی ئەوەی چۆن حەیوانێکی

گەورەتان سەربڕیوە و چۆن فەقیر وهەژارتان تێرکردوە وبۆکێتان ناردوە. چونکە ئەمە لەخێری قوربانیەکە کەم دەکاتەوە یان هەرنایهێڵێ ومرۆڤ لەجیاتی خێری پێ بگات، گوناهبار دەبێت! ئەوەتا خوای گەورە لەقورئاندا لەباسی قوربانی دا دەفەرموێ: ﴿ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ ﴾ الحج: ٣٧.

واتە: دڵنیابن هەرگیز گۆشت وخوێنی ئەو حەیوانانەی کەبۆ قوربانی سەریان دەبڕن بەخوا ناگات. بەڵکو تەقوا وپارێزگاری ئێوە بەو دەگات وحیسابی بۆ دەکات وخوای گەورە سەیری نیەتی ناودڵتان وخاوێنی مەبەستتان لەو حەیوانی قوربانیە دەکات. لەبەرئەوەی ئەو کەسانەی کەقوربانی دەکەن، دڵتان تەواو خاوێن بکەنەوە لەڕیا وبەرچاوی خەڵکی وباس کردنی چۆنیەتی قوربانیەکەت.

٢- دەبێ موسڵمانان بەئاگابن، کەوەختی قوربانی سەربڕین لەدوای نوێژی جەژنی قوربانەوە دەست پێ دەکات وهەرکەس لەشەوی جەژندا، یان دوای نوێژی بەیانی، پێش نوێژی جەژن، حەیوانی قوربانیەکەی سەرببڕێ. ئەوە بەصەدەقەو خێر حیسابەو بەقوربانی حیساب ناکرێ.

ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (من ذَبَحَ قَبْلَ الصَّلاةِ، فَإِنَّما ذَبَحَ لِنَفْسِهِ، وَمن ذبح بَعْدَ الصَّلاةِ فَقَدْ تَمَّ نُسُكَهُ وَأَصابَ سُنَة المُسْلمينَ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ - رَواهُ البُخاري (٥٥٤٦) وَمُسْلِم (١٩٦٢).

واتە: هەرکەسێك پێش نوێژی جەژنی قوربان، حەیوان سەرببڕێ، ئەوە بۆخۆی سەری بڕیوەو گۆشتێکە پێشکەش بەماڵ ومناڵی خۆی کردوە. وە ئەوەی کەلەدوای نوێژی جەژن سەری بڕی، ئەوە قوربانیەکەی تەواوە وسوننەت وڕێبازی موسڵمانانی پێکاوە.

٣- لەم ڕۆژی جەژنی قوربانەدا، بەدڵ جەژنە پیرۆزە لەیەك بکەن، تەوقەی گەرم بکەن. دڵتان پاك بکەنەوە لەڕق وقین وحەسودی و بەخیلی بەرامبەر یەکتر، لەیەکتری ببورن. لاپەڕەیەکی سپی هەڵدەنەوە. بەمەش دەبنە چاکترین کەس. هەروەکو پرسیاریان لەپێغەمبەری خوا ﷺ کرد. کێ چاکترین کەسە؟! فەرموی:(كُلُّ مَخْمُومِ القَلْبِ، صَدُوقِ اللِّسانِ).

صەحابەکان فەرمویان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە زانیمان (صَدُوقُ اللّسان). مانای زمانی ڕاستگۆیە، کەزمان ودڵ یەك بێ، نەك بەزمان ڕووبەڕوو مەدحی کەسێك بکەی. پاشان پاشملە زەمی بکەی..



بەڵام ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستت لە (مَخْمُومُ القَلْب) چی یە؟ فەرموی: (هُوَ التَقِيِّ النَقِيِّ، لاإِثْمَ فيهِ وَلاَبَغْيَ، وَلاغِلَّ وَلاحَسَدَ). فەرموی: ئەو دڵە پاکە بێ گەردە صافەیە. کە نەبەتاوان وخۆبەزل زانین ڕەش بوە، نەڕق وحەسوودی تێدایە..

٤- ئامۆژگاری ماڵ ومناڵتان بکەن کەخۆیان بپارێزن لەبێ شەرعی گەورەی (تەوقەکردنی ژنان وپیاوانی نامەحرەم). وەکو تەوقەکردن لەگەڵ براژن، لەگەڵ ژن خوشك، وە هەرئافرەتێك ڕۆژێ لەڕۆژان بگونجێ لێت مارە بکرێ وپێت شیا بۆ هاوسەری، نامەحرەمە وحەرامە تەوقەی لەگەڵ بکرێ.

٥- ئامۆژگاری مناڵەکانتان بکەن، کەبەجوانی و ڕێکوپێکی وهێمنی یەوە، بۆ جەژنە پیرۆزە بگەڕێن و خۆیان بپارێزن. لەبەکارهێنانی تەقەمەنی و یاری ئاگرین و جگەرەکێشان و ئازاردانی هاوڕێکانیان. دووبارە جەژنی هەموولایەکتان پیرۆزبێ و هەموو کاتێکتان جەژن بێ.

سەرچاوەکان

**١- تەفسیری ئاسان، بورهان محمد أمین.**

٢- يَسْأَلُونَكَ ، د.حسام الدين عَفَّانَة ، ج٢ ص١١٦، ص٣٥٤، ص٣٥٦، ص٣٤٧.

٣- تاجُ الاصُول ، نوسینی: منصُور علي ناصِف ، وەرگێڕانی مامۆستا: نوری فارس حمەخان ب٤ ل٣٩، ل٣٧، ل٤١.

٤- الفِقْهُ الإسْلامي وَأَدِلَّتُهُ ، د.وَهْبَة الزُحَيلي ، ج٤، ص٢٧٠٧.

٥- الفِقْه الشَّرْعي المُيَسَّر ، الشَّيْخ محمد عَلى الصَابوني ، ج٨ ،ص٤١.

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجْمَعين.

ئیمانداران: حەرام ئەو شتەیە کەهەر لەناوەکەیەوە بێزراوە، تەنانەت ئەوکەسەش کەموسڵمان نەبێ وبڕوای بەپاداشت وسزای خواییش نەبێ. هەر دەزانێ کەحەرام شتێکی قێزەونەو نەفرەت لێکراوەو مرۆڤ ئەگەر فیترەتی نەشێوابێ، دەزانێ کەحەرام خۆری مرۆڤ خەجاڵەت دەکات ولەسەربەرزی ناو کۆمەڵ دوری دەخاتەوە. بەڵام لەگەڵ زانینی ئەم حەقیقەتەشدا ئایا بۆچی مرۆڤ حەرام دەخوات؟!

بەکورتی ئاماژە بە چەند هۆکارێك دەکەین کەپاڵ بەمرۆڤەوە دەنێن بۆ حەرام خۆری:

١- شەیتان، شەیتان بەردەوام هانی مرۆڤ دەدات لەسەر حەرام خۆری ئەویش لەرێگەی ئەوەوە کەمرۆڤ دەترسێنێ بەهەژاری وهەژارکەوتن. کەدێتە بنکڵێشەی مرۆڤەوەو پێ ی دەڵێ: ئەم حەرامەت بۆ ڕێ کەوتوە، لەدەستی مەدە. هەموو ڕۆژێ دەستت ناکەوێ ومرە خۆت دەوڵەمەند بکە. ئەینا کەهەژار کەوتی چی دەکەی. کێ یارمەتیت دەدات؟! بەڵێ مرۆڤیش زۆر لەهەژاری دەترسێ، وە حەزی لەدەوڵەمەندیە. بۆیە شەیتان لەم دەرگایەوە بۆی دێت ودەیترسێنێ.

خوای گەورە دەفەرموێ: (الشَّيْطانُ يَعِدُكُمُ الفَقْرَ).. بەڵام خۆ ئاشکرایە شەیتان کەدوژمنی بێ گومان وئاشکرای مرۆڤە، هەرچی بەمرۆڤ ونەوەی ئادەمی بڵێ هەر لەسەر زەرەریەتی وهەرکەس گوێڕایەڵی شەیتان بێ، پەشیمانی بەشیەتی.

٢- نەفسی خۆت. کەبەڕاستی نەفسی خراپەکاری مرۆڤ، هانی مرۆڤ دەدات کەحەرام بخوات، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ یوسف: ٥٣ بەڵێ نەفسی بەدخوو، هانی خاوەنەکەی دەدات کەحەرام بخوات و فەرقی حەڵاڵ و حەرام نەکات.

٣- سێ یەم شت کەپاڵ بەمرۆڤەوە دەنێت بۆ حەرام خۆری، واقیعی کۆمەڵگای چاولێکەرو هاوڕێ وهاوکاریانەو لەگەڵیان دەژی. زۆر کاریگەری هەیە لەسەر مرۆڤ. بەڵێ، ئەم سیانە پاڵ بەمرۆڤەوە دەنێن بۆ حەرام خۆری بۆ ئەم مەبەستانە:

١. دەوڵەمەند بوون، یەکەم ئامانج لەحەرام خواردن دەوڵەمەند بوونە. شەیتان ونەفس دەیهێنێتە بەرچاوت کەچۆن چەندین کەس بەحەرام دەوڵەمەند بوون. دەی تۆش چاویان لێ بکە. بەڵام بێئاگا لەوەی کە ڕۆژێ دێ حەڵاڵەکەی

خۆشی پێوە دەڕوات. حەرام وەکو ئەو دڵۆپە ژەهرە وایە کەدەکرێتە ناو قاپێ هەنگوینی پاڵەفتەوە. چۆن ئەو دڵۆپە ژەهرە تەواوی هەنگوینەکە ژەهراوی دەکات وبەکەڵکی خواردن نامێنێ. حەرامیش هەرچەند کەمیش بێ، ئاوا حەڵاڵ وپاکەکە لەناو دەبات. جا هەندێ جار ئەوکەسەی کەحەرام دەخوات چونکە کەسێکی دورلەدینە، خوای گەورە ماوەیەك مۆڵەتی پێ دەدات، تابەتەواوی دەوڵەمەند دەبێ. ئەمجا سەربەرەوخواری دەکاتەوە. بۆئەوەی ئازار وخەفەتی زۆرتر بخوات. چونکە تاماڵە فەوتاوەکەی زۆرتر بێ، خەفەت وحەسرەتی زۆرتر دەچێتە دڵیەوە. کەوتنەخوارەوە تالەشوێنی بەرزترەوە بێ، بەئازارترە ومەترسی لەناوچونی یەگجاری زیاترە.

کەواتە: کەبێ دین حەرام خۆری پێوە دێت وهیچی لێ نایەت، ئەوە خوای گەورە مۆڵەتی داوەتێ وسەرەنجام دوای ماوەیەك کتوپڕ دەیگرێ! بەڵام ئەگەر کەسێك لەدیندار وخواناسی بەحەق بێ، ئەگەر توشی حەرام خۆری بوو، کاتێ ماڵی حەرام هاتە گیرفان وکاسە وقاسەیەوە. ئەوا: یان دەستبەجێ حەڵاڵەکەی خۆشی پێوە دەفەوتێ ویەکسەر بەوئاگادێتەوە وە تەوبە دەکات وبەخۆی دەزانێ کەئەمە بەرهەمی ئەو حەرام خۆری یە بوو.

وەکو ئەم بەسەرهاتە کەلەساڵانی نەوەتەکاندا لەکوردستانی خۆمان لەشاری سلێمانی ڕووی داوە وپیاوێکی دیندار وخۆی بۆمان دەگێڕێتەوەکە: لەکاتی گرانیە گەورەکەدا، کەخەڵکی هەموو کەلوپەلی ناوماڵیان فرۆشت بۆچەند کیلۆ گەنم وئاردێك. بۆ تێرکردنی مناڵەکانیان بۆ ژەمێك. زۆرکەس جل وبەرگی خۆی، تاگەیشتە خانووی خۆی فرۆشت، تەنها بۆ نانی ووشکی ئالەوساتانەدا. ئەم پیاوە دەڵێ: لەگەڵ خێزانەکەم چوینە بازاڕ وزۆر دەمێك بوو برنجمان نەخواردبوو. بەتەمابوین دوو سێ کیلۆ برنج بکڕین. لەوکاتەدا کەسێك هاواری دەکرد وەرە پارە دەگۆڕینەوە (دە بەدوانزە). کەئەوەبوو لەدوای ڕاپەڕینەوە جیاوازی نێوان پارەی وردە وکاغەز پەیدابوو. واتە: دینارو نیو دیناری ئاسنی سویسری کەمتری دەکرد لەپارەی دە دیناری وپێنج دیناری کاغەز، هەربۆیە ئەگەر (١٠) دیناری کاغەزت بدایە، (١٢) دیناری ئاسنیان ئەدایتێ، کەئەمەش لەڕوی شەرعەوە حەرامە. بەڵێ، کاتێ گوێم لە (١٠ بە ١٢) بوو. بەخێزانەکەمم ووت: ئافرەت خۆ ئێمە هەرشت دەکڕین. ئیتر بۆچی (١٢) بە (١٠) نەکەین ودوو دیناری بەلاشمان دەست بکەوێ خێزانم سەرەتا ناڕازی بوو بەم حەرام خواردنە.





بەڵام کەمن هەر سور بوم، ناچار وازی لێ هێنام وئەوەندەی پێ ووتم: بەوخوایە، ئەم کارە خێری پێوە نابێت! بەڵێ پارەی کاغەزمان بەناسن گۆڕیەوە وبەحیساب پارەکەمان زیادی کردو سەرەنجام لەلای عەرەبانەیەك (سێ) کیلۆ برنجمان کڕی بە (٢١) دینار. کردمانە ناو عەلاگەیەکی ئەستوری پتەوەوە، کەهەموو کات بۆ برنج کڕین بەکارمان دەهێنا، هیچ ترسی دڕان وتەقینی نەبوو. بەڵێ بەبازاڕدا دەگەڕاین. چوینەتە بەردەم (بەلەدیەکە)، لەوکاتەدا هەستم بەوەکرد ئەو دەستەی کەعەلاگە برنجەکەم پێ هەڵگرتوە، سوك بووە! کەئاوڕم دایەوە وەکو ئەوەی بەچەقۆیەکی تیژ بیبڕی لەم سەر بۆ ئەوسەر دڕا وهەڵتەقی، بەبێ ئەوەی یەك عارەبانە یان یەك کەس لێمان نزیك بوبێ. تابەکاری ئەوانی بزانین، بەڵێ برنج ڕژایە ناو ئەو قوڕ ولیتە ڕەشەوە وبەکەڵکی ئەوە نەما یەك دەنکی لێ هەڵبگرینەوە! بەم شێوەیە بەچاوی خۆم بینیم کەبەهۆی (دوو) دیناری حەرامەوە، هەر لەوساتەدا زەرەری (٢١) دینارم لێ کەوت!! بەڵێ مرۆڤی دینارو حەڵاڵ خۆر ئاوا حەرامی پێوە نایەت و هەرزوو بەئاگادێتەوەو تەوبە دەکات. یاخود: مرۆڤی حەڵاڵ خۆرو خواناس، کاتێ حەرام تێکەڵی ماڵەکەی بوو. بەئاشکرا هەست دەکات کەبەرەکەت لەڕزق ورۆزیەکەیدا نەماوە. هەرچەندە بەحەرام زۆریشی کردوە، کەچی خۆشی نازانێ لەچیدا صەرفی دەکات. هەرئاوا دەکات تەواو دەبێ. لەزەتی جاران لەخواردنەکە ناکات. دڵی ناڕەحەتە، لاشەی نەخۆشە. هەموو ئەم نیشانانە بەئاشکرا هەست پێ دەکات.

دەگێڕنەوە: پیاوێکی شەربەت فرۆش لەشاری سلێمانی دا دەچێتە خزمەت کاك ئەحمەدی شێخ وعەرزی دەکات: قوربان شەربەتی مێوژ دروست دەکەم ونەیفرۆشم، زۆر پاکە، زۆر چاکە. زۆر خەست وبێ غەشە، ئاوی بەئەندازەی پێویست تێ دەکەم. بەڵام بازاڕم کەمە لەچاو دراوسێ دوکانێکما کەئەو بەپێچەوانەی منەوەیە، ئاوی زۆری تێ دەکات پاك وخاوێنی ناپارێزێ. دەست بەدەست نوێژ نیە. بەڵام بازاڕی لەمن گەرمترە. سەرفیاتی زۆرترە، قازانجی زۆرتریش دەکات. کاك ئەحمەدی شێخ دەفەرموێ: جانیازت چی یە؟ کابرای کاسب دەڵێ: قوربان هاتوم تامنیش وەکو ئەوی لێ بکەم، تابازاڕم گەرم ببێت، جەنابی شێخ دەفەموێ: نەکەی وای لێ بکەی کەم و پوخت ونەخت بژی چاکترە لەوە، ئاکامی باش نابێت، پەشیمان دەبیتەوە!، بەڵام کابرای شەربەت فرۆش دەڕوات ولەدراوسێ دوکانەکەی خراپتر دەکات. ئاوی زۆر دەکاتە شەربەتەکەوە،

مێوژی ڕزیو وخراپ تێکەڵی مێوژەکەی دەکات.. لەدروستکردندا گوێ ناداتە پاکی وپیسی. کەچی ئەمیش بازاڕی گەرم دەبێ و سەرفیاتی زۆر دەبێ!!.. پاش مانگێ زیاتر کابرا سەردانی کاك ئەحمەدی شێخ دەکاتەوە ولێ ی دەپرسێ: ئێستا کار وکەسابەتت چۆنە؟! لەوەڵامدا شەربەت فرۆش دەڵێ: زۆر باشە، بازاڕم زۆر گەرمە. پارەی باشم دەست دەکەوێت، لەدراوسێ دوکانەکەم بازاڕم گەرمترە. کاك ئەحمەدی شێخ دەفەرموێ: توخوا ڕاست پێم بڵێ: ئەی پارەکەی چۆنە، لەچیدا خەرجی دەکەی؟! کابرا دەڵێ: وەڵلاهی پارەی باشم دەست دەکەوێ. بەڵام خۆشم نازانم لەچیدا صەرفی دەکەم، بەرەکەتی نیە.

پارەکە زۆرە بەڵام جێگە ناگرێت، بەپێچەوانەی جارانەوە. جاران پارەی کەم، بەڵام بەرەکەتی زۆر، پارەی کەم. بەڵام لەش ساغی خۆم وماڵ ومناڵم. پارەی کەم بەڵام قەناعەت ومورتاحی!! کاك ئەحمەد دەفەرموێ: ئەوە ئاکامی تێکەڵ بونی حەرامە بەکەسابەتەکەت. خێرا تەوبە بکە. هەرلەوێدا شەربەت فرۆشەکە تەوبە دەکات وبڕیار دەدات هەروەکو جاران بەپوختی وبێ غەش کارەکەی ئەنجام بدات.

بەڵێ بەڕێزان: ئەگەر حەرامت پێوە نەهات وبێ بەرکەت بوو. ئەوە نیشانەی ئەوەیە کەخوای گەورە خۆشی دەوێیت و زوو ئاگادارت دەکاتەوە، کەفریای خۆت بکەوی و واز لەحەرام خۆری بێنی. ئەمە وەکو نمونەی نەخۆشێك وایە، کە ئەگەر زوو نیشانەکانی دەرکەون بۆ نەخۆشەکە قازانجەو زوو فریای خۆی دەکەوێ وچارەسەری خۆی دەکات. بەڵام ئەگەر کەسێك هەرحەرامی خوارد وهیچی لێ نەهات، بەڵکو هەرورگی پێ زلتر بوو، گیرفانی ئەستورتر بوو هەردەوڵەمەندتر بوو. ئەوە نیشانەی ئەوەیە کەئەو کەسە کەم دینە وخوا خۆشی ناوێ و ڕێك وەکو ئەو نەخۆشە وایە. کەلاشەی پڕبووە لەڤایرۆس ومیکرۆب کەچی هەست بەهیچ ئازارێك ناکات. هەتا لەکتوپڕدا تەواوی لاشەی دادەڕزێ و دەیکوژێ وهیچ چارەسەرێ فریای ناکەوێ!..

٢. بۆیە خەڵکی حەرام دەخۆن بۆئەوەی وورگ وگەدەی پێ گەورە وپڕ بکەن. بۆئەوەی بەردەوام سفرەیان ڕازاوەبێ وپارویان چەوربێ. شەیتان ونەفسی ئەمارە بالسوء بۆی دەڕازێنێتەوە ولەبەرچاوی چەور وشیرینی دەکات. بەڵام بێئاگا لەوەی کەڕۆژێك دێ ئەگەدە دەمێنێ ونەخاوەنی گەدەکە. زۆربەی هەرە زۆری ئەو حەرام خۆرانە، هەر لەدنیادا گەدەیان لەیەك هەڵوەشاوە. هەموو







لاشەیان نەخۆشە، پەستانی خوێنیان هەیە. دوانزە گرێیان برینداره، شەکرەیانە. لەزەت لەو نان وسفرە ڕازاوە ناکەن. نەك هەر لەزەتی لێ ناکەن بەڵکو بۆشیان بوە بەداخ ومەراق، چونکە ناتوانن دەستی بۆببەن ولێ ی بخۆن، ئەو هەموو خواردنە بەلەزەت وخۆشە کەبەحەرام پێکیانەوە نا، وائێستا خەڵکانێکی تر لەسەری تێر دەخۆن وپێ دەکەنن ولەزەتی لێ وەردەگرن و ئەمیش تەنها تەماشاکردنێکی پڕ لەداخ وحەسرەت ومەراقی بۆ دەمێنێتەوە!

بەڵام: زۆربەی هەرە زۆری ئەوانەی کەهەژارن وکەنانیان حەڵاڵە وسفرەیان کەمی لەسەرەوتانانیان هەیە دروێان نیەو تادۆیان هەیە نانیان نیە. لەپێناوی کاروکەسابەتی حەڵاڵدا زستان وهاوین نا ناسن لەشیان ساغە. هەیانە لەهەموو تەمەنی دا دکتۆری نەبینیوە. ئەو نان وئاوە حەڵاڵەی بۆی بۆتە شیفای دڵ ودەرونی. وە ئەو حەڵاڵ خۆرانە، ئەو نان وپێخۆرە سادە وهەرزانە ئەوەندە بەلەزەت دەخوات، هیچ دەوڵەمەندێکی حەرام خۆر لەباشترین وچەورترین خۆراك ئەو لەزەتەی نەبینیوە، توخوا بەڕێزان ئەو نان ودۆیەی کەسەپانێکی دەست قڵیشاوی بەرسوری هەتاو دوای دروێنە دەیخوارد، چەندەها جار لەقەل خواردنی ڕاقی ترین چێشتخانە بەناوبانگەکان، کەدەوڵەمەندە حەرام خۆرەکان نانی لێ دەخۆن، بەلەزەت و بەتام و چێژتر نیە؟!

بەڵێ لەزەت و تامی خواردن لەوەدا نی یە چەند جۆرە خواردن و چەند گرانبەهایەو چەند چەورو بەتامە. بەڵکو لەوەدایە کەبەبێ ترس بیخۆی و حەب و دەرمانی لەپێش و دواوە نەخۆی. ئەمجا لەقیامەتیشدا ئەو لاشەیەی کەبەحەرام پەروەردە کراوەو قەڵەو کراوە وگۆشت وبەزی پێ لەسەریەك داناوە. ئەبێ بەئاگری جەهەنەم ئەو گۆشت و لاشەیە بتوێتەوە. ئەمەش فەرمودەی سەروەرمانە ﷺ کەفەرموی: (كُلُّ جَسَدٍ نَبَتَ من سُحْتٍ فَالنَارُ أَوْلَي بِهِ). رَواهُ مُسْلِم.

٣. بۆیە مرۆڤ حەرام دەخوات چونکە شەیتان هانی دەدات وپێ ی دەڵێ: لەبەرخاتری منداڵەکانت. بۆئەوەی موحتاج و ناتاج نەبن، ئەو حەرامە بخۆ و لەدەستی مەدە. بامنداڵەکانی تۆش وەکو منداڵی ئەو خەڵکە پۆشتە وپەرداخ بن. با خانووی خۆت هەبێ و منداڵەکانت کرێ چی نەبن. باژنەکەت بەدەوڵەمەندیەکەت دڵخۆش بێ و ڕێزت لێ بگرێ.

بەڵام: دڵنیابن ئەو منداڵەی کەبەحەرام تێری بکەی وپەروەردەی بکەی منداڵ نابێ بۆت کە (قرّة أعين) بێ، سۆمای چاوت بێ و ڕۆشنی دڵت بێ، بەڵکو

لێت دەبێتە مارو هارو نارەسەن دەبێ و سالار نابێ و لاسار دەبێ. ئەو هەموو پارە حەرامەی بۆ جێ دێڵی، کەچی لەجیاتی خێرو خێراتت بۆ بکات، گاڵتەی بەو عەقڵەت دێ کەحەرامت بۆئەو کۆکردەوە.. تەماشابکەن منالی زۆربەی هەرەزۆری بەرپرس ودەوڵەمەندە حەرام خۆرەکان، ڕێز بۆ باوك ودایکیان دانانێن وتوشی دەیان گیروگرفت و چەرمەسەریان دەکەن. ئەوەی کەخێرو خێرات وحەج وقوربانی بۆ باوك ودایکی کۆچ کردوی دەکات، هەرکوڕە هەژارە، کەباوکی بەکرێکاری و بەپارەی حەلاڵ پێ ی گەیاندوە. ئێستاش ئەولادەکەی هەرهەژارە بەلام ئامادەیە لەدەمی خۆی بگرێتەوەو بیکات بەخێرو صەدەقە بۆ باوك ودایکی. هەرئەو هاوسەرەت کەدەتەوێ بەهۆی دەوڵەمەند بونەوە بەحەرام خۆشی بوێ ی وڕێزت بگرێ ودڵی خۆش بکەی. نابێ بەشەریکی ڕاستەقینەی ژیان. نەبێ بەژانی ژیان. لای هەموو لایەك ئاشکرایە ئەو ژنەی کەسەردەمانی پێشوو، ئەگەر ساڵەو ساڵ کراسێکی بۆبکرایە. چەند پینە بەجل و بەرگیەوە بوو. جەژناو جەژن برنج وگۆشت لەماڵدا بخورایە. لەکەلاوە وکەپردا دەژیان. مێردەکەی بەکرێکاری وجوتیاری وسەپانی وجۆلایی بەخێوی دەکرد. بۆخۆشی سێ چوار پینە بەلاشان و شرواڵەکەیەوە بوو. چۆغەو شرواڵەکەی هەریەکەی لەڕەنگێ بوو. کەچی ئەم ژن ومێردە هەژارە. نەدارە. بێ پارە، بێ ماڵە، ئەوپەڕی حورمەت و ڕێز لەنێوانیاندا هەبوو. ژن لەخۆشەویستی مێردەکەیدا، لەگەڵ جێ بەجێ کردنی ئیشی ماڵەوەدا، پەلاماری ئیشی دەرەوەشی دەداو دەستباری مێردەکەی دەکرد. پیاویش لەگەڵ ئەو هەموو ماندوبوونەی جەستەو هیلاکیە زۆرەدا، ئێوارە بەڕووی خۆش ودەم بەخەندەو ئامێز گرتنەوە بۆمناڵە وردەکانی ئەگەڕایەوە بۆ ماڵ و ژنەکەی خۆی بەهەموو ئافرەتانی دونیا نەدەگۆڕیەوە.

بەیەکەوە دەژیان ودەبونە پیرەژن وپیرەپیاوو خاوەنی چەند کوڕو کچ وبووك ونەوە، کەچی خۆشەویستی نێوانیان هێندە بەهێز بوو دەتگوت تازە بوك و زاوان و(مودة ورَحمة) یان لێ دەباری. بەخوا ئەمە هەمووی بەرهەمی حەلاڵ خۆری بوو. کەچی ئەمڕۆ زۆربەی هەرەزۆری ئەو خێزانانەی کەئاژاوەیان هەیە. کەلەهیچیان کەم نی یە. خۆشترین خانوو. خۆشترین خواردن. جوانترین و بۆنخۆشترین پۆشاك دەپۆشن، کەچی هێشتا تازە بوك و زاوان ومناڵیان نەبووە. لەیەکتر دەکەونە تەقەو تەلاق!!

هەمووشی سەبەبەکەی بێ شەرعیە. حەرام خۆری یە. ئەو پارەی ئەو





زەواجەی پێ کراوە حەرامە، ئەو هەموو حەفلەو شایی وجل وبەرگ وئاڵتونەی دەکرێ. بۆ فەخرو شانازی پێوەکردنەو بۆ خۆڕادانە بەسەر فەقیرو هەژاراندا!!

هەربۆیە ئەوژنە دەبێ بەزان، خۆ کەیەك دوو منالْ لەدایك بوو، ئیتر بەتەواوی لەیەکتر دادەبڕێن ونەگەر لەماڵێکیشدا بەیەکەوە بن هەروەکو بێگانە وان بۆیەکتر!.

یاخود شەیتان هانی مرۆڤ دەدات ودەڵێ: حەرام کۆبکەرەوە باخانووی باشت هەبێ، زۆری میوانت گەورەبێ، کەمیوانێکت هات شەرمەزار نەبی، بتوانی بەجوانی خزمەتی بکەی، ئەگەر لەسەر ئەم حەلاڵ خۆریەت بەردەوام بی، تادەمری خاوەن خانوی خۆت نابی ورۆژێ لەڕۆژان میوانێکت بەسەربەرزی بۆ بەڕێ ناکرێت..

بەلام دڵنیابە: هەرمیوانێك لەزوری حەرامدا پێشوازی لێ بکرێ وبەپاروی حەرام تێربکرێ و بەپارەی حەرام خزمەت بکرێ. هەرئەو میوانە کەلەماڵەکەت ڕۆیشتە دەرەوە،لەچەندین شوێن زەمت دەکات لەجیاتی مەدحت بکات. لەسەر سفرەکەشت نالێ (الحمدلله) نالێ بەزیادبێ وماڵت ئاوابێ. ئەمەش فەرمودەی سەروەر و سالارمانە ﷺ کەدەفەرموێ: (من طَلَبَ مَحامِدَ النّاسِ بِمَعاصي اللهِ، عادَ حامِدُهُ لَهُ ذامًّا) رَواهُ البَزار.

واتە: هەرکەسێ بەشوێن ئەوەدا بگەڕێ، کەمەدح وستایشی خەڵکی بۆخۆی مسۆگەر بکات، وە لەوپێناوەداخوا لەخۆی بڕەنجێنێ و سەرپێچی فەرمانی خوا بکات. خوای گەورە ئەو کەسانەی کەئەم بەتەما بوو. لەناو خەڵکا سوپاسی بکەن وپیاهەڵبدەن و باسی چاکە وسەخاوەت ومەردایەتی بکەن. بەپێچەوانەوە دەبنە زەمکاری ودەبنە مایەی نابرووبردنی ولەهەموو جێگایەك زەمی دەکەن وباسی بەخیلی وچروکی وبێ دەرکی دەکەن! وە لەفەرمودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (من أَرْضَى اللهَ بِسَخَطِ النّاسِ كَفاهُ اللهُ، وَمن أَسْخَطَ اللهَ بِرِضا النّاسِ، وَكَلَهُ اللهُ إِلى النّاسِ) رَواهُ إِبْنُ حَبّان في صَحيحِهِ (٢٧٧).

بەڕێزان: شەیتان لەڕێگایەکی ترەوە هانت دەدا بۆ حەرام خواردن، ئەویش بەوەی کە: پێت دەڵێ بەم حەلاڵە کەمەی کەدەستت دەکەوێ هەرگیز دەوڵەمەند نابی و کەدەوڵەمەندیش نەبوی، لەناو خزم وکەس وکاروخەڵکدا هەربەسوك سەیر دەکرێ ی و ئەگەر شێر بەگوێ بگری. نەدار سووکە لەبەرچاوان، ناخرێتە

ناو ڕیزی پیاوان، کەس هەژاری بێ پیاو نیە. بەڵام هەرکێ خاوەن زێڕە، خاوەن زۆرە، ئەگەر پیسە، ئەگەر ڕەشە، ئەگەر بۆرە، لەبەرچاوان زل و زۆرە، دەراوی دەمی ناخۆش بێ، دەم پیس بێ، جنێو فرۆش بێ، دەڵێن پیاوێکی زۆرزانە، لفت خۆش گفت ڕەوانە، قسەی جوانە، کاری جوانە، شارەزای شارەزایانە)...

بەڵام: ئاگات لێ بێ شەیتان بەم هاندانەش نەتخەڵەتێنێ. چونکە ئەم سوربونەت لەسەر دەوڵەمەندبوونی حەرام بۆ ناوو ناوبانگ و قەدرو حورمەت ، دینەکەت لەناودەبات،کەسایەتیت لەکەدار دەکات. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (ما ذِئْبانِ جائِعانِ،أُرْسَلا في غَنَمٍ بِأَفْسَدَ لَها من حِرْصِ المَرْءِ عَلى المالِ وَالشرَفِ لِدينِهِ) صَحَّحُ الالباني في صَحيح الترمذي.

واتە: کاتێ دووگورگی هاروبرسی دەکەونە ناو ڕانەمەڕێکی بێ شوانەوە. چۆن ئەو ڕانە مەڕە پەرت دەکەن و هەمووی وورگ دەدڕن و مل دەشکێنن و بێ کەڵکی دەکەن. هێشتا کاری ئەو دووگورگە هارە برسیە، ناگاتە خراپە و زیانی سوربونی مرۆڤ لەسەر بەدەست هێنانی ماڵ و سامان و ناوو ناوبانگ، بۆ سەر دین و ئیمانەکەی!!.

کەواتە: لەبەر خاتری مناڵ و ژن، میوان، پلەو پایەو ناوبانگ، مەدحی خەڵکی حەرام خۆر مەبە، چونکە هەر ئەومناڵەی کەتۆ خۆتی بۆ گوناهباردەکەی، لێت دەبێ بەمارو هارو گەردنت دەگەزێ. بۆ ڕازیکردنی دڵی خانمەکەت حەرام مەخۆ. چونکە هەر ئەو خانمە دەبێ بەژەهری ژیانت لەجیاتی ببێ بەشەریکی ژیانت، هەر ئەو خزم و ناسیاو ومیوانەی، لەبەر خوا نەهاتۆتە سەردانت و بەرژەوەندی دونیای هێناویەتە ماڵت، وەتۆش بۆ سەمعەی خۆت بەحەرام تێرت کرد، لەجیاتی ماڵ ئاوایی زەمت دەکاو بەزمانی دەتگەزێ.ئیتر مەڵێ نمەکم سوێرە، نمەك حەرام سوێری دەکات، ئەینا موسڵمانێك کەلەبەرخاتری خوا تۆی خۆش بوێت و بێتە سەردانت. تۆش هەر لەبەر خاتری ئەمری خوا خزمەتی بکەی. ئەگەر نانی جۆی بەبێ پێخۆر بدەیتێ لەگەڵ پەرداخێ ئاو، ئەوە هەتا ماوە مەدحت دەکات و چاکەتی لەبەرچاوە. خوای گەورە دڵی پڕ دەکات لەخۆشەویستی تۆو زمانی ڕادێنێ لەسەر مەدح کردنت. ئەو پیاوانەی کەئێستاش مەدحی پیاوەتی سەخاوەتیان دەکرێ. کەهی وایان هەیە (٥٠) ساڵە مردووە. بەخوا سادەترین نانیان داوەتە میوان، بەڵام هەم نانەکەی بەحەڵاڵی پەیداکردووە، هەم بۆ ناوو شۆڕەت نانی نەبەخشیوە و میوانداری خەڵکی







نەکردووە، تەنها لەبەر خوا خەڵکی خۆش ویستووەو تەنها لەبەر خاتری خواش خزمەتی خەڵکی کردوە. شیعاریان ئەمە بووە: ﴿ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَآءً وَلَا شُكُورًا ﴾الانسان: ٩

خوای گەورەش خۆشەویستی کردوەو ڕێزداری کردوە لەناو دڵ و بەر چاوی خەڵکی دا. تەنانەت ئەوەی نەشی بینیوەو نانی ماڵیشی نەخواردووە، خۆشی دەوێ و باسی مەردایەتی و چاکەو پیاوەتی دەکات.

بەخوا کەسیشمان گومانمان لەوەدانی یە کە ئەم ژیانی دونیایە کاتی یەو کەچویتە قەبرەوە هەموو ئەوانەی لەپێناویدا حەرامت خواردوە. بەجێت دێڵن و بەتەنها لەقەبردا دەمێنیتەوە ئەوەی لەگەڵتا دەمێنێتەوە. تەنها و تەنها کاروکردەوەی خۆتە. کەهاودەمتە.

بەڵام بەداخەوە بەهۆی ئیمان کزی و زیاد لەپێویست باوەش کردن بەدنیادا. وەخەڵەتان بەخوتخوتەی شەیتان و شەیتان ڕەوشتان، زۆربەی هەرە زۆری گرنگی دانمان، (٪٩٥)ی هەوڵمان بۆ ئەو کەسانەیە. بۆ ڕەزامەندی دڵی ئەوانەیە. کەتەنها تاسەر گۆڕەکەمان لەگەڵمان دێن و ئیتر دەگەڕێنەوە و پاش ماوەیەك لەیادمان دەکەن، وە (٪٥)ی بگرە کەمتریش هەوڵ بۆ ئەوە دەدەین کە لەگەڵمان دێتە قەبرەکەوە و مەصیرو چارەنوسمان پێوەی بەندە، ئەو موستەقبەل و ئایندەیەی کەبۆتە ویردی سەر زمانی خەڵکی. کاتێ حەرام دەخوات. هەر دەڵێ بۆمستەقبەلی خۆم و ماڵ و منداڵمە. ئەو ماڵ و منداڵەی. ئەو خزم و کەس و برادەرە خۆشەویستەی کەزۆرت خزمەت کردن.



بەڵام بەخوا هیچ کامیان ئامادەنین یەك سەعات لەناو قەبرەکەدا لەگەڵت بمێننەوە. بگرە لەسەر قەبرەکەش دوای خەڵکەکە لەگەڵت بمێننەوە!! بەڵام مەصیر و موستەقبەلی ڕاستەقینە قەبرەکەیە، مەحشەرە. سەر پردی صیراطە، بەهەشتە، کەئەمە چارەنوسی تۆیە.

زانایان نموونەیەکی زۆر جوانیان هێناوەتەوە کەبەڕاستی ئامۆژگاری لێ وەردەگیرێ.

کە فەرمویانە: مرۆڤ چوار هاوڕێی هەیە:

١- هاوڕێیەکی لەڕولاواز، کەئەم هیچ خزمەتی ئەم هاوڕێیەی نەدەکردو ئیشی وای پێ دەکرد کەزۆر پێی عاجز دەبوو، جارجار نەبێ ئەم هاوڕێیەی خۆی بیرنەدەکەوتەوە.



٢- برادەرێك بوو: هاوڕێیەك بوو: ئەم ڕێزی دەگرت و لەکاتی هەموو ناخۆشی و تەنگانەیەکدا ڕووی تێدەکرد و ئەمیش لەکاتە قورس و ناخۆشەکاندا بەدەنگیەوە دەچوو.

٣- هاوڕێیەك بوو: ئەم زۆر ڕێزی لێ دەگرت و بەردەوام چاوی لەسەری بوو ئاگاداری دەکرد و دەترسا لەوەی بچێ بۆلای کەسێکی تر.

٤- هاوڕێیەکی بوو: زۆر بەنەرم و نیانی قسەی لەگەڵدا دەکرد و کام خواردن خۆش و کام بەرگ جوانە پێشکەشی دەکرد...جا ئەم پیاوە کەئەم چوار هاوڕێیەی هەبوو. کاتێ وەختی مردنی نزیك بۆوە. بەخۆی گوت: من چواربرادەرم هەیە. تۆ بڵێی بەتەنها جێم بێڵن؟! سەرەتا چوو بۆلای برادەری چوارەم، کەلەهەموویان زیاتر خزمەتی دەکرد. وتی: هاوڕێکەم وامن دونیا بەجێ دێڵم و دەمرم. من و تۆ هاوڕێی گیانی بە گیانی یەکتری بوین، ئایا چۆن لەدنیادا هاوڕێم بوی و خزمەتی باشم کردی. ئایا کەمردیشم لەگەڵم دێ ی و جێم ناهێڵی؟! هاوڕێکەی لەوەڵامدا ووتی:

ئەوە ڕێگەی من نیە و بەڕۆح دەرچونت هاوڕێیەتی من و تۆ تەواو!! کابرا دڵی شکاو ئاخێکی هەڵکێشاو چوو بۆلای برادەری سێیەم. بەهەمان شێوە بەئەویشی ڕاگەیاند، کەدونیا بەجێ دێڵێ و حەزدەکات دائیمە هاوڕێ ی بێ و بۆسەفەری دوای مردنیش لێی جیا نەبێتەوە. بەڵام ئەویش لەوەڵامدا ووتی. من کێ زیندووبێ لەگەڵ ئەوەم و کەمردی دەستم دەخەمە دەستی کەسێکی ترەوە..کابرا ئەویشی بەغەمگینەوە بەجێ هێشت و چوو بۆلای برادەری دووەمی و داواکاریەکەی بەویش ڕاگەیاند. ئەم هاوڕێیەشی ئەوەندەی ووت: پەرۆشمی،بەمردنت غەمبارم. بەڵام مەگەر تاسەر گۆڕەکە لەگەڵت بێم و دوعای بەخێرت بۆبکەم. هیچ توانای ترم نییە.

کابرا تەنها برادەری یەکمی مابوو. کەلەژیانی دونیادا هیچ ڕێزی لێ نەدەگرت و خزمەتی نەدەکرد بەڵام بەناچاری و بەتەریقیەوە چوو بۆلای هاوڕێکەی و سەیری کرد زۆر لاوازە بێتاقەتە. وەك ئەوەی توشی بەدخۆراکی بوبێ.بەڵام ئەم هاوڕێیەیان زۆر دلێرانە و مەردانە جوابی دایەوە و ووتی: غەمبارمەبە، من لێت جیانابمەوەو لەگەڵت دێم. کابرای بازرگان زۆر غەمباربوو، ووتی: دەبوایە گرنگی زیاترم بە تۆبدایە لەناو هەموو هاوڕێکانمدا، کاتێك کە دەسەڵات و توانام هەبوو!





حا ئەم هاوڕێ و دۆستانەی مرۆڤ ئەمانەن:

هاوڕێی چوارەم: لاشەمانە، کە بەردەوام خزمەتی دەکەین و هەوڵ دەدەین جوان و ڕازاوە بێ، کەچی سودمان پێ ناگەیەنێ بۆ دوای مردنمان و تا قەڵەوتر بێ، کرم زیاتر لێی دەدات.

هاوڕێی سێ یەم: پلەو پایە و دەسەڵات و سامانی دونیایە، کە بەڕۆح دەرچونت خۆی دەخاتە دەستی کەسێکی ترەوە. هەروەکو لەدەستی کەسانی ترەوە هاتە دەستی تۆوە.

هاوڕێی دووەم: خێزان و منداڵ و خزم و هاوڕێکانمانن، کە تەنها تاسەر لێواری گۆڕەکە دێن و دەگەڕێنەوە بەرەو ماڵ.

هاوڕێی یەکەمیش: ڕۆحمانە کە زۆر پشت گوێمان خستووە و بەگوناە و تاوان ئازارمان داوە.

کەواتە: با تاوەکو لەژیاندایین  هەر شتە و بەئەندازەی خۆی گرنگی پێ بدەین کە هەموو کات لەگەڵمانەو بەمردن لێمان جیانابێتەوە ...

٤- هۆکارێکی تر بۆ حەرام خۆری ئەوەیە کە شەیتان هانت دەدا و پێت دەڵێ: تۆ حەرام بخۆ ، تاوەکو دەوڵەمەند دەبی، جا کە دەوڵەمەند بووی، خواپەرستیت باشتر پێ دەکرێ. حەجت پێ دەکرێ. قوربانیت پێ دەکرێ.

بەڵام بەحەڵاڵ دەوڵەمەند نابی بەئاسانی و ئەو هەموو خێرو خێراتەت لەدەست دەچێ. بەڵام بۆ ڕەتکردنەوەی ئەم بەلایەش دەبێ موسوڵمانی بەحەق بەرچاو ڕوون بێ و بزانێ کە هەر خێرێك بەماڵی حەرام بیکەی خوای گەورە قبوڵی ناکات.



چونکە مەرجی سەرەکی قبوڵ بونی خێرو خێرات لای خوای گەور نیەتی پاك و خاوێن و دڵی پڕ لە ئیخلاص و دوور لە ڕیا . بریتیە لەوەی کە ماڵەکە حەڵاڵ بێ ، ماڵی خۆت بێ. مافی کەسی پێوە نەبێ. بەحەڵاڵی پەیدات کردبێ.

ئیمانداران: ئێمە ئێستا لەمانگی پیرۆزی (ذي الحجة)داین. مانگی حەج کردن. کە لەم چەند ڕۆژەدا حەج دەکرێ و حاجیەکانمان ئێستا لەدەوری کەعبەی پیرۆزن . وە لەم مانگەدا قوربانی دەکرێ. ئەو شەعیرە گەورمیەی ئیسلام . بۆیە لە کوردەواریدا پێی دەڵێین: مانگی قوربان. بەڵام بۆیە باسی حەج و قوربانیمان نەکرد، چونکە:

١. ساڵانی ڕابردوو باسمان کردووە.

**٢. ئەم باسی حەلاڵ و حەرامە زۆر گرنگە و ، تۆی موسوڵمان جارێ لەمەدا خۆت ساغ بکەوە، ئەمجا حەج بکە و قوربانی بکە و (إن شاءالله) خوا لێت قبوڵ دەکات.**

**شێخ سەهلی توستەری کە لەساڵی (٢٨٣) ی کۆچی دا وەفاتی کردووە، واتە سەردەمی زێرینی ئیسلام. سەردەمێك حەرام بەدەگمەن دەخورا. ئالەو کاتەدا فەرموویەتی:** (وَ اللهِ لَتَرْكُ دِرْهَمٍ من حَرامٍ، خَيْرٌ من ثَمانينَ حَجَّةٍ بَعْدَ حَجَّةِ الاسلامِ). **واتە: سوێند بەخوای گەورە، وازهێنان لەیەك دیرهەمی حەرام چاکتر و باشترە لە هەشتا حەجی سوننەت لەدوای حەجی فەرزەوە. واتە: ئەگەر یەك دیرهەمی حەرام واز لێبێنم و لەبەر خوا نەیخۆم . ئەوەم پێ خۆشترە و گەورەترە چاکترە و دڵم پێی ئاسودە ترە لەوەی کە هەشتا حەجی سوننەت بکەم. کە هەشتا ساڵ لەسەر یەك بچم بۆ حەجی سوننەت!! کەئەمە لەقاڵبی موستەحیلاتە. هێشتا تەرکی حەرامەکەی پێ خۆشترە.**

**بەڕێزان: بەسە بۆ بەڵای حەرام خۆری ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەفەرمویەتی:** (إنَّ اللهَ طَيِّبٌ لايَقْبَلُ إلا طَيِّباً، وَإِنَّ اللهَ أَمَرَ المُؤمِنينَ بِما أَمَرَبِهِ المُرْسَلينَ، فَقالَ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُوا۟ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعْمَلُوا۟ صَٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴾ المؤمنون: ٥١ .. وَقالَ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ ﴾ البَقَرة: ١٧٢.

ثُمَّ ذَكَرَ الرَّجُلَ يُطيلُ السَّفَرَ، أَشْعَثَ أَغْبَرَ، يَمُدُّ يَدَيْهِ إلى السَّماءِ: يارَبِّ، يارَبِّ، وَمَطْعَمُهُ حَرامٌ. وَمَشْرَبُهُ حَرامٌ، وَمَلْبَسُهُ حَرامٌ، وَغُذِيَ بالْحَرامِ، فَأَ نَّى يُسْتَجابُ لِذلك). رَواهُ مُسْلِم (١٠١٥).

**واتە: خوای گەورە پاك و خاوێن و بێگەردە و پاك و خاوێن نەبێ قبوڵی ناکات. وەبەڕاستی خوای گەورە فەرمانی بەئیمانداران کردووە. هەر بەو شتەی کەفەرمانی بە پێغەمبەران پێ کردووە. خوای گەورە بەپێغەمبەرانی فەرمووە: (ئەی گرۆی پێغەمبەران، بخۆن لەڕزق و ڕۆزیە چاك و پاکەکان، کارو کردەوەی چاکیش ئەنجام بدەن، بەڕاستی من زانام بەهەموو ئەو کارو کردەوانەی کەدەیکەن.**

**وەخوای گەورە بە ئیماندارانیش دەفەرموێ: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بخۆن لەو ڕزق و ڕۆزیە چاك و باشانەی کەپێمان بەخشیون).**

**پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کەسێکی کرد، کەلەسەفەرێکی دورو درێژدایە دورکەوتۆتەوە لەماڵ و مناڵ و کەس و کارو نیشتیمانی و غەریبە، ماندوو تەپ و تۆزاویە، دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرز دەکاتەوەو دەڵێ: پەروەردگارە،**





پەروەردگارە، خوایە گیان خوایە گیان، لەخوا دەپاڕێتەوەو دوعا دەکات و داوا دەکات — بەڵام ئەوەی دەیخوات حەرامە، ئەوەی دەیخواتەوە حەرامە، ئەوەی دەیپۆشێ حەرامە، لاشەی بەحەرام پەروەردە بووە ئایا چۆن وەڵامی ئەو حەرام خۆرە دەدرێتەوە؟!!..

(هۆیەکانی حەرام خۆری)

ئەوەی کەوا لەمرۆڤ دەکات حەرام بخوات، ئەمانەن:

١. کەسەکە خۆی ئیمانی بەقیامەت لاوازەو نەفسەکەی لەجۆری (امارة بالسوء) و دونیای بەلاوە هەمووهیواو مەبەستێکە. دونیا وویست نیە، بەڵکو دونیا پەرستە.

٢. ژن ومناڵ هانی دەدەن بۆ حەرام خۆری، ئەوەندە بەگوێ ی دا دەخوێنن کە:

ئاها فلان کەس چۆن دەوڵەمەند بوو، چۆن لەپڕا خانوی خۆی کرد، ئوتومبێلی تازەی کڕی، ئێمەش بەم حەڵاڵ خۆریەی تۆ نابینین بەهیچ، ئەوەتا خەڵکی لەهەموو لایەکەوە هەر کۆ...وەو گوێ ناداتە حەڵاڵ وحەرام. ئایا منداڵەکانی ئێمە چیان لەخەڵکی کەمترە، ئەم ژنە کەئاوا هانی مێردەکەی دەدات بۆ حەرام خۆری وسەرەنجام توشی حەرام خۆری دەکات. ئەو ژنەش وەکو مێردەکەی گوناهبارە، چونکە ئەو مێردەکەی هاندا بۆ حەرام خۆری، ئەوکەسەش ژن بێ یان پیاو کەئەم ژنەی ئەم ماڵەی هانداوە بۆ حەرام خۆری، جا ڕاستەوخۆ هانی دابێ، یان ناڕاستەوخۆ هانی دابێ بۆ حەرامخۆری وەکو ئەوەی کەبەژنی ئەم ماڵەی ووتوە کە: ئەوە هەر لەم خانوە کۆنەدا دەژین؟! ئەوە ئۆتۆمبێلەکەتان نەگۆڕیوە؟! ئەی ئەوە فلان شت وفلان کەلوپەلتان چۆن نەکڕیوە؟! یان ئەوە چۆن ئەو جل وبەرگە کۆنە لەبەر منداڵەکانتدایە؟! چونکە خۆی دەوڵەمەندە، جا بەحەڵاڵ بێ یان بەحەرام هەیەتی، ئاخر ئەم نیەتی. دەست کورتە، موچەکەی هەرئەوەیە ئەمری ونەژی پێ ی گوزەران دەکات. بەم شێوەیە ئەم کەسەی کەهانی خێزانی ئەم پیاوە هەژارە دەدات بۆئەوەی مێردەکەی ناچاری حەرام خۆری و پەلاماردانی پارە و ماڵی حەرام بدات. ئەویش دەبێتە شەریکی ئەم حەرام خۆری یە! کەواتە: حەرام خواردن وەکو پەتای نەخۆشی وایە. یەك لەیەکی دەگرێتەوە.

کەواتە: موسڵمانی بەڕێز، بەتایبەتی خوشکانی بەڕێز، چویتە هەرماڵێکەوە

حەقی ژیانی ئەو ماڵ و خێزانەت نەبێ و سەرنجی شتەکانی مەدەو ئەگەر کۆن وخراپ بوون ڕەخنەی لێ مەگرە، بەڵکو هانی بدە کەدڵخۆش بێ بەو ماڵ وحاڵەی کەبەحەلاڵی پەیدای کردووە وهیوای لەش ساغی ودووربون لەبەلاو موصیبەتی بۆ بخوازە. دڵنیابە ئەو خاوەن ماڵە زۆر لەتۆ باشتر دەزانێ شتی باش هەیەو بازاڕ پڕە لەشتی جوان و تازەو بەنرخ، بەڵام ئەم گیرفانی خاڵی یەو کاتێ ئامادەییت تێدانیە یارمەتی بدەی و دەست گیرۆیی بکەی، ئەگەر پێ ی بڵێ ی ئەوە ونەوە هەیە، وەکو گاڵتەی پێ بکەی وایە. چونکە وادەگەیەنێ کەخۆی عەقڵی پێ ناشکێ و لەدنیا بێ خەبەرە.

خوشکی بەڕێزم: تۆش گوێ لەقسەی کەس مەگرەو بەقەدەر بەرەکەت پێ ڕاکێشەو قەدرو حورمەتی مێردەکەت و ئاسودەیی و تەبایی ناو ماڵ و منداڵەکەت، هەموو سەروەت و سامانی دونیا دێنێ. لەخوای گەورە ومیهرەبان دەپاڕێمەوە کەدونیاو قیامەتی ئێمەو سەرجەم موسڵمانان پڕ بکات لەچاکەوخۆشی

﴿ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾

ٱللَّهُمَّ ءَامِينَ



سەرچاوەکان


١- تەفسیری ئاسان ، بورهان محمد أمین.
٢- ئەسرینەکانی سەدەی بیستەم ، ئاوات أبوبکر ئەحمەد، ل١٤٠، ل٣٧٣.
٣- المِسْكُ وَالوَرْدُ وَالعَنْبَر في خُطَبْ المنبَر ، د.أحمد فَريد ، ص٥٥٣.
٤- الترغيب والتَّرهيب ، الحافِظ المنذِري. فەرمودەی ژمارە: ٣٣٢٩.
٥- گۆڤاری بڕیار ، ژمارە:٦ ل٢٧، تشرینی دووەمی ، ٢٠٠٨.
٦- نَظَراتٌ في الاسْلام . د.محمد راتب النابْلُسي ، ص٣٠٤.




الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجْمَعين.

ئیمانداران: لەووتارەکانی ڕابردودا باسی حەرام خۆریمان کرد، کەچی بەسەر مرۆڤدا دێنێ و وەباسی ئەوەشمان کرد کەچی وا لەمرۆڤ دەکات کەتوشی حەرام خۆری ببێ، بەپشتیوانی خوای گەورە لەم ووتارەشدا باسی ئەوە دەکەین، چی بکەین بۆ ئەوەی لەحەرام خۆری بەدوربین؟ لەوەڵامدا دەڵێین: بۆئەوەی لەحەرام خۆری بەدووربین پێویستە ئەم خالانە بەکردەوە جێ بەجێ بکەین، کەهەندێکی بەخۆمان دەگرێ و هەندێکیشی پەیوەستە بەدەوروبەر وحکومەتەوە.

خاڵی یەکەم: کە پەیوەندی بەناخی خۆمانەوە هەیەو پێویستە لەخۆماندا جێ بەجێی بکەین بریتی یە لە (قەناعەت). کەبەکورتی قەناعەت ڕازی بونی دڵە بەو ماڵ و ڕزق و ڕۆزیەی کەخوای گەورە بۆ بەندەی خۆی دیاری کردوە، قەناعەتیش بەم شێوەیە فێری دەبین کەپێغەمبەری خوا ﷺ بۆی دیاری کردوین، کەلەمەیدانی کردەوەدا جێ بەجێ ی بکەین. وەکو فەرمویەتی: (أُنْظُرُوا إلى من أسْفَلَ منكُم، وَلاتَنْظُرُوا إلى من هُوَ فَوْقَكُم، فَهُوَ أجْدَرُ أنْ لاتَزْدَرُوا نِعْمَةَ اللهِ). رَواهُ البُخاري (٦٤٩٠) وَمُسْلِم (٢٩٦٣). واتە: بەردەوام تەماشای ئەو کەسانە بکەن کەلەخوار خۆتانەوەن. وە سەیری ئەو کەسانە مەکەن کەلەبواری دەسەڵات ودارایی دا لەسەرو خۆتانەوەن. کەئەوە واتان لێ دەکات کەئەوەی خوای گەورە بەئێوەی بەخشیوە بەکەم وبەخراپ نەیەتە بەرچاوتان و قەناعەت لەدڵ و دەرونتان هەڵنەگیرێ وتوشی ناشکوری وچاوتێبڕین لەماڵی خەڵکی نەبن. بەڵێ ئاسودەیی دڵ ودەرون بەقەناعەتەوەیە. جا سەیری ئەو کەسە بکە کەلەئاستی خوار تۆوەیە.

کاتێ ئۆتۆمبێلت نیە وناچاری ماوەیەکی زۆر بەپێ هاتوچۆ بکەی وبڕۆی. سەیری ئەو کەسە بکە کەهەردوو قاچی نیەو لەسەر عارەبانەیە! ئیتر خۆت زۆر پێ دەوڵەمەند دەبێ و ئەمجا لەناخی دڵەوە سوپاسی خوا دەکەی کەتۆ بەقاچی خۆت دەڕۆی وئەمجا نرخی خەڵاتی قاچەکانت دەزانی.

بەڵام ئەگەر سەیری ئەو کەسە بکەی کەئوتۆمبێلێکی دوا مۆدێلی لەژێردایەو بەلاتا تێ دەپەڕێ وتۆش بەپێ دەڕۆی. ئەوە ئەوکات قەناعەتت لێ هەڵدەگیرێ ونرخی ڕاستەقینەی دوو قاچەکەی خۆتت بیردەچێتەوە کەلەهەموو سامان وسەیارەی دونیا بەنرخترە. کە ڕەنگە لەواقیعدا ئەو کەسەی لەسەر سوکانی





ئۆتۆمبێله تازەکەیە، هەردوو قاچی نەبێ، یان فەقەراتی هەبێ ولەبەر بێ هێزی قاچەکانی وئازاری پشت و ئەژنۆی نەتوانێ بەپێ بڕوات، ڕەنگە وزۆریش گونجاوە کەئەویش کەلەجامی ئۆتۆمبێلەکەیەوە سەیری تۆ دەکات کەبەقاچت دەڕۆی وقیت وقنج وبەهەڵمەتی، خۆزگەت پێ بخوازێ. لەبەرئەوە فەرمودەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ جێ بەجێ بکە بۆئەوەی قەناعەتت بۆ دروست ببێ..
وە بەهەمان شێوە، ئەگەر هەژاری ولەخانویەکی کۆنی گڵدا دەژی، سەیری ئەو کەسە مەکە کەلەخانویەکی چەند قاتی بەرزدایە. بەڵکو سەیری ئەو کەسە بکە لەخانویەکی خراپتر لەوەی تۆدایەو کرێ چیشە، ئەوکات سوپاسی خوا دەکەی کەچانیە تۆ خانوەکە هی خۆتە وکرێچی کەس نی. وە ئەگەر کرێچی و سوپاس بۆ خوا بەسەربەرزی کرێیەکەت بۆ دەدرێ، سەیری ئەو کەسە بکە کەکرێچی یەو نازانێ چۆن کرێیەکەی بدات. ئەوکات قەناعەتت بۆ دروست دەبێ و کەقەناعەتیشت بۆ دروست بوو. دەوڵەمەند دەبی، دەبی بەدەوڵەمەندی ڕاستەقینە.

هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (لَيْسَ الغِنَى عَنْ كَثْرَةِ العَرَضِ - متاع الدُّنيا - وَلكنَّ الغِنَى غِنَى النَّفْسِ) رَواهُ البُخاري (٦٤٤٦) وَمُسْلِم (١٠٥١).
واتە: دەوڵەمەندی بەزۆری سامان وماڵی دونیا نیە. بەڵکو دەوڵەمەندی ڕاستەقینە دەوڵەمەندی دڵ ودەرون وبەرچاو تێریە.
ڕەحمەتی خوا لەپێشەوامان. ئیمامی شافیعی کەفەرمویەتی:
رَأَيْتُ القَناعَةَ رَأْسُ الغِنَى .... فَصِرْتُ بِأَذْيا لِها مُتَمَسِّكٌ.
فَلا ذا يَــراني عَلى بــابِهِ ..... وَلا ذا يَــراني بِهِ منهِمكٌ.
فَصِــرْتُ غَنِيّاً بِلادِرْهَمٍ ..... أَمُرُّ عَلى النّــاسِ شِبْهَ المَلِكِ.
ئیمانداران، هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ حەزرەتی ئەبو هورەیرە بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو صەحابەکاندا دانیشتبوو، فەرموی: (من يَأْخُذُ مِنّي هذهِ الكَلِماتِ، فَيَعْمَلَ بِهِنَّ، أَوْ يُعَلِّمَ من يَعْمَلُ بِهِنَّ؟).
واتە: چ کەسێك ئامادەیی تێدایە کەئەم چەند ووشەیەم لێ وەربگرێ وپاشان کاریان پێ بکاو بەکردەوە لەژیانیدا جێبەجێیان بکات. یان فێری کەسێکیان بکات کەئەو کەسە بەکردەوە جێ بەجێیان بکات وکاریان پێ بکات!..

جا سەرنج بدەن ئیمانداران. پێغەمبەری خوا ﷺ لەفەرمودەکەیدا فەرموی: کێ ئەم چەند ووشەیەم لێ وەردەگرێ وکاریان پێ دەکات. نەی فەرموو: (من يَسْمَعُ مِنّي) کێ ئەم چەند ووشەیەم لێ دەبیستێ! چونکە ئەم دوو دەستەواژەیە، جیاوازیان زۆرە.. هەموو کەس دەبیستێ، بەڵام ئەوەی بەدڵ ووشەکان وەردەگرێ وبەکردەوە جێبەجێیان دەکات زۆر کەمە.

حەزرەتی ئەبو هورەیرە دەفەرموێ: ووتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ئەو ووشە زێڕینانەت لێ وەردەگرم، ئیمانداری بەڕێز ئایا تۆش ئامادەی بچیتە خزمەتی پێغەمبەری خواو ﷺ بڵێ ی منیش کەئوممەتی تۆم، ئامادەم ئەم چەند ووشە کورت و بەنرخانە وەربگرم وبەکردەوە جێ بەجێیان بکەم وکاریان پێ بکەم؟! ئەگەر ئامادەی دەی بزانە ووشەکان چین؟ ئەبو هورەیرە دەفەرموێ: (فَأَخَذَ بِيَدي، وَعَدَّ خَمْساً) دەستی گرتم و پێنج شتی ژمارد.. اللهُ أكبر لەو بەختەوەریە. کەدەستێك پێغەمبەری خوا بیگرێ.

دەتۆی ئیمانداریش دەست بخەرە ناو دەستیەوە. خوایە گیان. ئەوەمان پێ ببەخشی کەدەستمان بخەینە ناو دەستی حەزرەتی رَسولُ الله وە ﷺ. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی:

١. إتَّقِ المَحارِمَ تَكُنْ أَعْبَدَ النَاسِ: خۆپارێزبە لەحەرامکراوەکان، دەبی بەخواپەرستترین کەس.

٢. وَارْضَ بِما قَسَمَ اللهُ لَكَ تَكُنْ أغْنَى النّاسِ: ڕازی بە بەوەی کەخوای گەورە بۆی دیاری کردوی، دەبی بەدەوڵەمەنترین کەس.

٣. وَأَحْسِنْ إلى جارِكَ تَكُنْ مُؤمِناً: چاکە کاربە لەگەڵ دراوسێ کەت، دەبی بەئیماندار.

٤. وَأَحِبْ لِلْنَاسِ ماتُحِبُّ لِنَفْسِكَ تَكُنْ مُسْلِماً: پێت خۆش بێ بۆ خەڵکی لەخێر وچاکە کەتوشیان ببێ، لەوەی کەبۆخۆتت پێ خۆشە، دەبی بەموسڵمانێکی ڕاستەقینە.

٥. وَلا تكثِرِ الضَّحِكَ، فَإِنَّ كَثْرَةَ الضَّحِكِ تُميتُ القَلْبَ: زۆر پێمەکەنە چونکە پێکەنینی زۆر ولەڕادەبەدەر دڵ دەمرێنێ — وە نیشانەی ئەوەیە کەئەم کەسە خەم لەهیچ داماوو هەژار ودەردەدار وگرفتارێ ناخوات وبەئازاری کەس ئێشی پێ ناگات. ئەم فەرمودەیە: (حَديثٌ حَسَنٌ - صَحيح سُنَن الترمذي - ١٨٧٦).

بەڵێ بەڕێزان: مرۆڤ بەقەناعەت دەبێ بەخاوەنی خۆی. ئەگەر حەزت لەشتێکەو پارەکەت نیە، نەفسی خۆت بگرەو داوا مەکە بەقەرز بیبەی و پاشان







لەترسی خاوەن قەرز خۆت بشاریتەوەو تەلەفۆن دابخەی و ڕێگا بگۆڕی. ئەمڕۆ بێ قەناعەتی وای لەو خەڵکە کردوە کەپارەشی نیە، کەچی شت لەم دوکان و لەو دوکان بەقەرز وەردەگرێ و پاشان قەرزەکەی پێ نادرێتەوەو سەرەنجام بەقەرز کوێر دەناسرێ وبەسوك سەیر دەکرێ.

چەند کەسمان بینی، خانوی کردوە لەسەر نەخشەی نوێ وبەدیکۆراتی گران بەهاوە. بەڵام کەچۆتە خانوەکەوە، لەجیاتی پیرۆزبایی، هەر ڕۆژە وهەرشەوەی یەکێ بەردەرگای پێ دەگرێ بۆ قەرز، دەی باشە ئەگەر لەخانویەکی کۆنی قوڕدا بژی، بەڵام کەس دەرگات نەکاتەوە بۆ داواکردنی قەرزو قسەی ناخۆشت لەڕونەداو خۆت خاوەنی خۆت بی، باشترنیە؟! چونکە کەقەرزار بوی ونەت بوو بیدەیتەوە وەکو کۆیلەت لێ دێ و خەڵکی دەبنە خاوەنت. جا کەخۆت قەناعەتت نەبێ ونەفسی خۆت لەسەرت نەوەستێ، چ گلەییەك لەخەڵکی دەکەی کەلەسەرت ناوەستێ وداوای قەرزەکەی و پارەی کەلوپەلەکەی دەکاتەوە؟!

زاناو پیاوباش (أبوحازم) بەلای قەصابێك دا ڕۆیشت، قەصابەکە ووتی: جەنابی مامۆستا گۆشتێکی زۆر جوان وناسکم لایە. حەزت پێ ی نیە؟! فەرموی: حەزم لێ یەتی بەڵام پارەم پێ نیە! قەصابەکە ووتی: أنا أنظرُكَ. قوربان من لەسەرت دەوەستم وگۆشتەکە ببە وکەی پارەت بوو ئەوکات بمدەیە. ئەبوحازم فەرموی: (نَفْسی أَحْسَن نَظرَةً لِي منكَ) نەفسی خۆم جوانترە کەلەسەرم بوەستێ!!

جوانڕۆیی شاعیر فەرمویەتی:

بەسەربەست بژیت، باشە لەدونیا.\
نەك خۆت فێربکەیت لەدرۆ وڕیا.\
بێ شێو بخەویت لەوە چاکترە.\
هەر دەعوەتێ بوو، خۆت بکەی پیا ..

ئیمانداران: زانای گەورە وبەڕێز، (شێخ محمد الغزالی) دەفەرموێ: هەندێ کەس بەهەڵە لەدینی ئیسلام حاڵی بوەو وادەزانێ قەناعەت، یەعنی: القعود والفتور دانیشتن وتەمەڵی وکاسپی نەکردن و سەرەنجام دواکەوتن. بەڵام بەپێچەوانەوە قەناعەت پێچەوانەی هەوڵدان بۆ دەوڵەمەند بوونی حەڵاڵ نیە.

ئەگەر سەیری ژیانی پێغەمبەران بکەین لەقورئاندا دەبینین:

١- حەزرەتی سولەیمان، داوا لەخوای گەورە دەكات موڵك ودەسەڵاتێكی وای بداتێ كەنەیدابێ بەكەسی تر. دەفەرموێ: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَهَبْ لِى مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِى لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِىٓ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴿٣٥﴾ ﴾ ص:٣٥.

واتە: سولەیمان فەرموی: پەروەردگارا لێم خۆش ببە ودەسەڵاتێكم پێ ببەخشە كەدەستت نەدات بۆ كەسی تر لەدوای خۆم. چونكە بەڕاستی تۆ بەخشێنەری.

سەرنج بدەن. فەرموی: إِنَّكَ أَنْتَ الوَهَّاب. نەیفەرموو: إِنَّكَ أَنْتَ الرَّزاق. چونكە ڕزق و ڕۆزی بەپێ ی پێویستی ژیان. ئەگەر مرۆڤ لەبیریشی بچێ داوای بكات خوای گەورە هەرپێ ی دەبەخشێ ودەیدات بەهەموو بەندەو هەموو دروستكراوەكانی. بەڵام لەوە زیاترو دەوڵەمەندبون وئەوەی حەزرەتی سولەیمان داوای كرد، ئەوە هەدیە ودیاری – الوَهَّاب. ئالێرەدا خوای گەورە نەیفەرموو: ئەی سولەیمان ئەوە تۆ بۆچی قەناعەتت نیە وبۆچی داوای ئاوا دەكەی. نەخێر، بەڵكو خوای گەورە دەفەرموێ:

ئێمە نزاو پاڕانەوەكەمان گیرا كردو (با) مان بۆ ڕامهێنا، كەبەفەرمانی ئەو بەنەرمی هاتوچۆ بكات. بۆهەر شوێنێك وویستی. هەروەها شەیتانەكانیشمان كردە خزمەتگوزاری، لەهەموو جۆرە بیناسازێك ومەلەوانێكی ژێر دەریا، هەندێكی تریش بەكۆت و زنجیر بەسترابونەوە تانەتوانن خراپەكاری ئەنجام بدەن.



ئەمجا خوای گەورە بەسولەیمانی فەرموو: ﴿ هَٰذَا عَطَآؤُنَا فَٱمْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٩﴾ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴾ ص: ٣٩-٤٠

واتە: ئەمە بەخششی ئێمەیە بۆتۆ ئەی سولەیمان تۆش دەبەخشیت، یان نابەخشیت، لێپرسینەوەت نیەو خۆت سەربەستی. بێگومان سولەیمان لەلای ئێمە پلەی زۆر نزیكی هەیەو پاشەڕۆژوو ئایندەیەكی جوانی هەیە لای ئێمە...

لێرەدا خوای گەورە ئەو هەموەی بەحەزرەتی سولەیمان بەخشی و چونكە بەردەوام سوپاسی خوای لەسەر دەكردو لەچاكە و ئاوەدانی دا بەكاری دێناو خراپە وكاولكاری پێ نەدەكرد خوای گەورە، ستایشی دەكات و دەفەرموێ: لەلای ئێمە پلەی زۆر نزیكی هەیە.



٢- حەزرەتی یوسف، کاتێ کەلەگرتوخانە (سجن) بەربوو، دوای ئەو هەموو ساڵە زۆرە، کەبەناحەق گیرابوو. کە بەربونی وهەڵمژینی هەوای ئازادی ودەرکەوتنی پاکیەتی وبێ تاوانی بۆ هەموو کەس، ئەمەی بەس بوو. کەچی بەپاشای گوت:﴿ قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ﴾ یوسف: ٥٥.

واتە: ئەی پاشا پێم باشە بمکەیت بەلێپرسراو بەسەر گەنجینەکان وسامانی سەرزەوی ئەم وڵاتی میصرەدا. بەڕاستی من پارێزەرێکی زانام، لەخۆم ڕادەبینم کەشت بپارێزم و زاناشم کەچۆن دەیپارێزم. ئالێرەدا خوای گەورە نەیفەرموو: ئەی یوسف بۆ قەناعەت ناکەی و دەسەڵاتت بۆچی یە. تۆ کەلەناو بیر دەرهێنرای ولەسجن ئازادکرای و لەبوختان بەری کرای. ئیتر بۆچی قەناعەت ناکەی وداوای زیاتر دەکەی. نەخێر، خوای گەورە وەڵامی داواکەی دایەوەو هەر لەسورەتی یوسف ئایەتی (٥٦)دا دەفەرموێ: خوای گەورە دەفەرموێت:

ئابەو شێوەیە دەسەڵاتمان دا بەیوسف وجێگیرو پایەدارمان کرد لەخاکی میسردا، هەر پلەو پایەیەکی دەویست لەو وڵاتەدا دەستی دەکەوت وبۆی ساز دەبوو..

کەواتە: ئەگەر گەنجێکی موسڵمان، دەست پاك و ئەمین، خوێندەوارو خاوەن شەهادەو پسپۆڕی. لەوڵاتدا، لەشارو شارۆچکەیەك هەبوو. نابێ بەناوی زوهدو قەناعەتەوە بڵێ حەزم لێ نیە تەعین ببم بەکاربەدەست و یان ئەگەر پلەیەکی خوارەوەی هەبوو. مەجالی بۆ دەرەخسا بەرز ببێتەوە بۆ پۆستێکی باڵا. کەدەیتوانی خزمەت بکات وگەندەڵی وگەندەڵکاران لاببات.

ئەمە لەئیسلامدا ڕەوا نی یە وبەڵکو دروست ئەوەیە کەوەکو حەزرەتی یوسف هەوڵی بەدەست هێنانی پلەو پایەی شیاوو شایستە بدات ومیللەتێك ڕزگار بکات لەفات و قڕی ویاسای هەندێ پڕ وهەندێ قڕ. ئەوە نەبونی کەسی ئەمین وشارەزایە لەشوێنی پێویستدا. کەمەیدانی چۆڵ کردوە بۆ کەسی گەندەڵ وناشایستە کەبگاتە ئەو شوێنانە وزوڵم وستەم لەمیللەت بکات.

ئیمانداران: پێغەمبەری خوا ﷺ نمونەیەکی ڕاستەقینەمان بۆ باس دەکات، کەبەڕاستی لەوە دڵنیاترین کەبەچاوی خۆمان بینیبێتمان. کەخۆشەویستمان ﷺ باسی حەزرەتی (ئەیوب) پێغەمبەرمان بۆ دەگێڕێتەوە، کەدوای ئەوەی

خوای گەورە لەنەخۆشیەکەی شیفای داو چاك بۆوە، ڕۆژێکیان کەجل وبەرگی دانابوو. بەڕووتی خۆی دەشت. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (فَوَقَعَ عَلَيْهِ جَرادٌ من ذَهَبْ) کوللەی ئاڵتونی بەسەردا دەباری!! (سُبْحانَ الله) ئاڵتونی لەئاسماندا بەسەردا دەباری. ئاڵتونەکان لەسەرشێوەی کولله بوون! (فطارَتْ واحدَةٌ) یەکێ لەکولله ئاڵتونیەکان، کەکەوتە بەردەم حەزرەتی ئەیوب. فڕی!! (فَجَرَى خَلْفَها فَقالَ اللهُ لَهُ: يا أَيُّوب أَلَمْ أَكُنْ أَغْنَيْتُكَ عَنْ هذا؟!)

حەزرەتی ئەیوب بەشوێن کوللەکەدا ڕۆیشت بۆئەوەی بیگرێتەوە ولەدەستی دەرنەچێ! خوای گەورە فەرمووی: (يا أَيُّوب، أَلَمْ أَكُنْ أَغْنَيْتُكَ عَنْ هذا؟!) ئەی ئەیوب. ئایا ئەوەندەمان ئاڵتون بەسەردا نەباراندوی وکەبێ نیازو بێ ئاتاجت بکات لەوەی کەبەشوێن یەك کوللەی ئاڵتوندا بڕۆی وهەڵپەی گرتنەوەی ئەویش بکەی؟!

حەزرەتی ئەیوب فەرموی: (بَلَى وَلكِنْ لاغِنَى لِي عَنْ بَرَكَتِكَ) بەڵێ، ئەی پەروەردگارم. ئەوەندەت بەسەردا باراندوم کەموحتاج نەبم بەودانەیان. بەڵام ئەوەندە هەیە، هەرگیز من بێئیحتیاج نیم لەبەرەکەتی تۆ.

ئەمە بەرەکەتی تۆیە کەئاڵتونم لەسەر شێوەی کولله بەسەردا دەبارێنی. ئیتر چۆن بەشوێن دانەیەکیشدا ڕاناکەم! ئەم فەرمودەیە (پێشەوا بوخاری) ڕیوایەتی کردوە.

بەڵێ موسڵمان بۆی هەیە بەدوای تەنها یەك دینارو دۆلاردا بڕوات وهەوڵی بەدەست هێنانی بدات بازۆریشی هەبێ، مادام بەحەلاڵی پەیدای دەکەی، پێچەوانە نیە لەگەڵ قەناعەت بون. وە ئەگەر سەیری سیرەی پڕ بەرەکەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەین لەگەڵ هاوەڵانیدا، دەبینین ڕۆژێك لەڕۆژان بەعوسمانی کوڕی عەففان وعبدالرَّحمن ی کوڕی عەوفی نەفەرمووە دەئیتر بەسە هیچی تر کاسپی مەکەن و قەناعەتتان هەبێ و ئەو هەموو سەروەت وسامانەتان هەیە، ئیتر لەماڵەوە دانیشن وهەربخۆن وبخەون. نەخێر وای پێ نەفەرمون، بەڵکو هانی دەدان کەزیاتر دەوڵەمەند بن و زیاتر کەسابەت و بازرگانی حەڵاڵ بکەن و بەو دەوڵەمەندیەیان خزمەت بکەن، بیری ئاو لێ بدەن. پارە بەقەرز بدەن بەخەڵك. زەماوەند بۆ گەنجانی بێ هاوسەر ئامادە بکەن. وڵاتی موسڵمانان بپارێزن وسوپا ئامادە بکەن.



وە لەسەر ئەو هەموو دەوڵەمەندیەیانەوە موژدەی بەهەشتی پێ دەدان، وە هەردوكیان لە (١٠) كەسە موژدە پێدراوەكەی بەهەشت بوون، ئەو (دە) كەسەی كەپێغەمبەری خوا ﷺ موژدەی دانێ كەرِوح دەرچون وبەهەشتیان یەكەو بەدڵنیاییەوە ئەهلی بەهەشتن!!

وە هەروەها: حەزرەتی (عومەری كوڕی خەتاب) فەقیهو موجتەهیدی ئیسلام، كاتێ كەكۆمەڵە كەسێكی بینی وا لەمزگەوتا دانیشتون وكاتی نوێژی فەرزیش نیە وزۆری ماوە بۆ كاتی بانگ. فەرمووی: ئەوە چی دەكەن لێرەو بۆ نارۆن بۆخۆتان كاسپی یەك بكەن؟! ووتیان: ئەی ئەمیری ئیمانداران: هەندێ پارە ونان وپێخۆرمان هەیەو قەناعەتمان پێ كردوەو هەروەختێ ئەوە تەواو بوو. دڵنیاین كەخوای گەورە پەكمان ناخات وسەری بێ ڕۆزی لەژێر خاكدایە وقەناعەت خەزێنەیە! حەزرەتی عومەر ئافەرینی لێ نەكردن ونەیفەرموو، ئای كەبەقەناعەتن و چەند تەوەكولیان لەسەر خوا بەهێزە. بەڵكو فەرمووی: ئەگەر هەرئێستا نەچنە دەرەوەلەمزگەوت و پەلاماری كار وكەسابەت نەدەن لەبازاڕدا، هەموو لاشەتان بەم قەمچیە دەشكێنم! ئێوە تەوەكولتان لەسەر خوانی یە. ئەوەی ئێوە تەواكولە، ئایا نازانن كەقەناعەت یانی كاسپی كردن وهەوڵدان وگەڕان بەسەر زەوی خوادا بۆ ڕزق و ڕۆزی خودا. پاشان شوكرانەكردنی خوا لەسەرئەوەی پێ ی بەخشیوی وچاو لەماڵی خەڵكی نەبڕی و حەسود وبەخیل نەبی. نەك وابزانن كەقەناعەت ئەوەیە ئەوەی هەتە بیخۆ، ئەمجا خوای گەورەش لەئاسمانەوە زێڕ وزیووت بۆ ببارێنێ. چونكە سوننەتی خوا وانیە وخوای گەورە لەقورئاندا فەرمویەتی: ﴿ فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦ ﴾ الملك: ١٥. ئەبێ مەشی بكەی و بڕۆی بەسەر زەویدا، ئەمجاش خوای گەورە ڕزق وڕۆزی سەر ئەو زەویەت دەداتێ. بەلام كەسێ ﴿ فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا ﴾ی نەكرد باچاوەڕێ ی ﴿ وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦ ﴾ نەكات. بەڕاستی ئەمە تێگەیشتنە لەئیسلام ولەقورئان.

بەڵێ بەڕێزان: قەناعەتی شەرعی ئەوەیە كەهەوڵ و تێكۆشانی تەواوی خۆت بدەی پاشان ئەگەر كەمت دەست كەوت، یان زەرەرت كرد. خۆت بەخەم ومەراقەوە نەكوژی. بەڵكو چاوت هەرلەقاپی ڕەحمەتی خوای گەورەبێ و

نەڕوانیتە ماڵی ئەم و ئەو و بڵێ ی فلاّن کەسیش هەر لەگەڵ من کاسپی دەکرد. کەچی ئەو چۆن دەوڵەمەند بوو. چۆن من هیچم بەهیچ نەکرد. نەخێر ئەمە نەڵێ ی ومادام هەوڵی خۆت خستۆتەکارو تەمەڵیت نەکردوە. ئیتر ئەوەی خوای گەورە پێ ی بەخشی. هەرئەوە باشەو ئەمە قەناعەتە. بەلاّم ئەگەر کەسێك بەئەنقەست لێ ی دانیشت وهیچ کارو کەسابەتێکی نەکرد هەتا هەژارونەدار کەوت. ئەمجا خەڵکی بەچاوی سوك سەیریان دەکرد. ئەوە ئەم بەناو قەناعەتە (جريمة خلقية). تاوانێکی ئەخلاقیە کەمرۆڤ بەرامبەر خۆی دەیکات چونکە خۆی بۆتە مایەی ئەوەی بەهەژاری بژی وخەڵکی بەچاوی سوك سەیری بکەن. ئەم کەسە تاوانکارە بەرامبەر بەکەسایەتی و ژیانی خۆی..

وە ئەگەر هاتوو کەسێك پارەو سامانێکی هەبوو. بەلاّم سستی کرد لەبەکارهێنانی دا لەپرۆژەی بەرهەم هێنداو بەم شێوەیە پارەکەی هەموی خواردو لەناوبردو کارێکی نەکرد بەپشتیوانی خوای گەورە، لەڕێگەی معامەلەو کاری حەلاّڵەوە پارەکانی بخاتە گەڕ ودواڕۆژی خۆی وماڵ ومناڵی پێ دابین بکات. ئەم کەسە ئەگەر ئەمەی بەناوی قەناعەتەوە کرد. ئەوە قەناعەت نیە وستەم کردنە لەووشەی پیرۆزی قەناعەت بەڵکو ئەمە ناودەبرێ بە (جريمة إجتماعية). تاوانێکی کۆمەلایەتی. چونکە هەرستەمی لەخۆی نەکرد. ستەمی لەدواڕۆژی مناڵەکانیشی کرد. کەبەدەست کورتی وهەژاری دەژین. سەرەڕای ئەو هەموو پارە وئەو هەموو دەرفەتی بەرهەم هێنانە.



یاخود ئەگەر کەسێك، باش خۆی دەناسی کەخاوەن زانست و پسپۆڕیە لەبوارێکدا، وە ئەمین و دەست پاك و لەخوا ترسە، بەلاّم لەپلەیەکی بچوکدایە. یان هەرتەعین نەبوە، لەهیچ فەرمانگەیەکی حکومی دا دانەمەزراوە. ئەگەر ئەم کەسە ووتی: من قەناعەتم هەیە بەم پلە بچوکەی خۆم. یان قەناعەتم هەیە بەوەی تەماتە وسەوزە ومیوە لەبازاڕدا لەسەر عەرەبانە بفرۆشم وخۆم دانامەزرێنم لەفەرمانگەی میریدا وموچەی حکومەتم ناوی. ئەوە ناشیرین کردنی ووشەی قەناعەتە. چونکە کاتێ تۆی دەستپاك ولەخواترس وشارەزای ئەوبوارە نەچوی. مەجال بۆ خوانەناس وخائین ونەشارەزایەك دەڕەخسێ کەئەو شوێنە پێویستە بگرێ وموسڵمانان بچەوسێنێتەوەو بەبێ بەرتیل کارنەکات.

ئەگەر تۆ پارەت هەبوو، بەلاّم بەناوی قەناعەتەوە بەدیار دوکانێکی بچکۆلەوە دانیشتی نەچوی بازرگانی دەوڵەتی بکەی وشت لەدەرەوە هاوردەبکەی، لەکاتێکا



سیقە ومتمانەت بەبوونی چاودێری خوا لەسەرت هەبوو، دڵنیابوی کەحەرام ناخۆی وشتی تەزویر وخراپ وبەسەرچوو ناهێنی بۆ وڵاتەکەت ومیللەتەکەت. ئەوە ئەگەر تۆ ئەم بازرگانیەت نەکرد بەناوی قەناعەتەوە، گوناهبار دەبی و ئەوە لەدیارنەبونی تۆیە کۆمەڵە بازرگانێك پەیدا دەبن کە لەخواناترسن و خائینن بەرامبەر بەهاونیشتمانی خۆیان وداوا لەکۆمپانیاو شەریکەکان دەکەن، کەکەلوپەلی خراپیان بەڵام لەنرخدا هەرزانیان بۆ دروست بکەن. بۆئەوەی زۆر زۆر قازانج بکەن. چەند قاتی ئەوەی پێیان داوە قازانج بکات وکڕیاریش هەرئەوەندە گەیاندیەماڵەوە سوتاو بەکەڵ نەهات. ئەوە تۆی دەوڵەمەندی موسڵمانی ئەمیندار گوناهباری، چونکە ئەگەر تۆ ببویتایە ڕێگای ئەو خراپەکارانە دەبەسترا.

ئەوە تۆی موسڵمانی بەڕێز وسەنگینی خوێندەوار ورۆشنبیری، کەبەناوی قەناعەتەوە گۆشەگیری و هیچ نانوسی و ڕۆژنامەو گۆڤار دەرناکەی وناچیتە مەیدانی شانۆ و نواندنەوەو فیلمی بەسود دەرناکەی وهونەری ڕەسەن هەڵناگری، بۆیە کەسانی بێ دین، مەجال و دەرفەتیان بۆ دەڕەخسێ وخەڵکی ناچار ڕوو لەنوسین ونواندنی پڕ ژەهری ئەوان دەکەن.

ئەو مامۆستا بەڕێزە ئایینی یەی کەبەخەڵکی دەڵێ: قەناعەتتان هەبێ بەو تۆزە بایەعیەی کەکەس نازانێ چۆن دەدرێ ودەخورێ!، ڕازی بن بەو کارەبایەی بێ موەلیدەی ئەهلی وڵات ڕووناك ناکات. قەناعەت بکەن بەو بەلوعە ئاوەی کە تائێستا گەروی تەڕ نەبووە، ڕازی بە بە (٣٠) هەزاری خانەنشینی کەبە بەلاش وەری دەگرێ. کوڕە میللەت مادام ئازادین، نان و ئاومان ببێ بەسمانە. ئیتر قەناعەت خەزێنەیە دونیاو پارەو ئوتومبێلی باش و خانوی پاکو خاوێن و پارك و باخچەو کتێبخانەو گوڵ و گوڵزار بابۆ ئەو کافرانە بێ!!

بەداخەوە مزگەوتی واهەیە لەبەربۆن گۆرەوی ناوێری سوزدەی تێدا ببەی! کەچی فەرمانگەکان پاکوخاوێن و ڕازاوە بن. ئەوە ئەم جۆرە بانگەشەیە بۆ قەناعەت، جەریمەو تاوانێکی سیاسی یە، بەرامبەر گەل ومیللەت و وڵات ونەوەی داهاتوو ئەنجام دەدرێت.

ئەبێ بزانین کام دونیا لەلای خوا نەفرەتی لێ کراوە. ئەو دونیایە

پیس وبۆگەنە، کەببێتە جێگای تەکەبور وخۆبەزل زانین وزوڵم وستەم وچەوساندنەوەی هەژاران. ئەو دونیایەی کەهەمووو هیوا وئاوات پارە خۆری ومفتە خۆریە، بەحەرام پەیداکردن و حەرام خواردن. نەك دنیای کاری جوان وهەوڵ وتێکۆشان وحەڵاڵ کارکردن وحەڵاڵ خواردن وبلاوکردنەوەی دادگەری وجوانی وپاکی ودڵسۆزی وخزمەتکردن. لەئیسلامدا ئەو دونیاو پارەو سامانە قێزەون وخراپە. کەخەڵکی لەسەری سیلەی ڕەحم دەپچڕێنن. یەکتری لەسەر دەکوژن، ئەو دونیایەی چینێك دەکات بەسەید وچینێك دەکات بەکۆیلە!

جێگای داخە موسڵمانان کە: ئێمە ئەم ئیسلامە گەورە وئازیزەمان بەدەستی خۆمان پێش دوژمنانی ئیسلام ناشیرین کردوە. ئەوە خۆمانین وامان کردوە کەدوژمنانی ئیسلام، ڕەخنە لەئیسلام وموسڵمانان بگرن وبڵێن: ئەمانە ناتوانن دونیای جوان و مۆدێرن وپاکو پێشکەوتوو بۆ خەڵکی دابین بکەن. ئەمانە بەقەناعەتن. ئەو قەناعەتەش بەکەڵکی ئەمڕۆ نایەت!!

بەلام: بێئاگا لەوەی کەنەخێر ئەو قەناعەتە ئیسلام ڕەفزی کردوە، ئێمەی موسڵمانین ستەممان لەووشەی ڕاستەقینەی گەوهەرینی قەناعەت کردوە. بەداخەوە، زۆر موسڵمان یان کارو کەسابەت ناکەن تاهەژار دەکەوێ و ئەمجا ڕوو لەمزگەوت دەکاو لێ ی دەکەوێ ودەخەوێ! مزگەوت و پەیامی مزگەوتیش ناشیرین دەکات.

بەداخەوە خەریکە لەهەندێ جێگا مزگەوت ببێتە جێگای ئەوانەی کار وکەسابەتیان پێ ناکرێ. کەتەمەڵەو حەزی لەئیش نیە، یان ئەو ڕۆژە بێ ئیشە. بەلام ئەوەی ئیش و کەسابەت دەکات، کەم ڕوودەکاتە مزگەوت بەتایبەت جەماعەتەکان.

یان بەپێچەوانەوە، هەرهەوڵ دەدات وتێر ناخوات. حەرام وحەڵاڵ لەیەك جیاناکاتەوە. قەناعەتی نیە بەوەی کەخوای گەورە پێ ی بەخشیوە کەحەلاڵەکەیە. نوێژیش دەکات و دەبێتە موڵك ومۆرێکی ناشیرین لەسەر ئیسلام. یان هەوڵی داوە معامەلەوکارو کەسابەتی کردوە وزەرەری کردوەو وەکو خەڵکی قازانجی زۆری نەکردوە. کەلێرەدا واجبە قەناعەتی هەبێ وهیمەتی بەرزبێ. کەچی کوفر دەکات ورەخنە لەکاری خوا دەگرێ (نعوذ بالله).! جاری واهەیە دەڵێ: باشە خۆ من نوێژیش دەکەم وجومعەش دەکەم و دینداریشم، کەچی لەکار





وکەسابەتدا بۆم نایەو هەر زەرەر دەکەم.

بەلام بێ ئاگا لەوەی کە: نوێژو خواپەرستی ئەرکی بەندایەتی کردنتە، معامەلەو بازارەکەت کەزەرەرت لێ کردوە، کرێ ی نوێژو جومعەو جەماعەت ودینداریەکەت نیە. ئەوە کەزەرەرت کردوە، یان کەموکوریەك لەلای خۆتەوە هەیەو باش لێ ی نازانێ و شارەزای کاسپیەکەت نی، یاخود: خوای گەورە خۆی باش دەزانێ ئاوا بۆ تۆ باشترە وبەرژەوەندی داهاتوت لەوەدایە وتۆ نایزانی. ئارام بگرە وبڵێ: خوایە ڕازیم بەبەشت. من هەوڵی خۆمم داوە. ئەوەش کەتۆ پێم ببەخشی هەرئەوە باشە. وە معامەلەوکڕین وفرۆشتن بۆیە حەلالەو جیاوازە لەڕیبا، کەزەرەریشی لێ دەکەی. هەرقازانج ناکەی. بۆ ئەوەی ڕوو لەخواکردن و پشت بەخوا بەستنت لەیاد نەچێ بەهۆی قازانجی بەردەوامی مسۆگەرەوە. کەلەڕیبا خۆریدا هەیە. ئالەم کاتەدا کەهەوڵی خۆتت بەجوانی خستە گەڕو درێخیت نەکرد، بەلام زەرەرت کرد.

قەناعەت جوانەو بەجێ یەو شەرعیەو دڵت ئاسودە دەکات و ئیمانت سەلامەت دەکات. لەدڵتەنگی و نائومێدی و کوفرو ناشکوری و حەسودی بەخەڵك دەتپارێزێ و توشی هەڵپەی حەرام نابی.

ئیمانداران: بەڕاستی قەناعەتی شەرعیانەو عیزەتی نەفس زۆر گەورەیە، مرۆڤ ئەگەر عیزەتی نەفسی هەبێ، پارێزراوە لەسەرشۆڕی وڕیابازی وخیانەت ودرۆکردن و دوو ڕوویی. عیزەتی نەفسیش بەرهەمی قەناعەتی شەرعیە. کەهەوڵی تەواوت داوە و ئەمجا ڕازی بەوەی کەخوا پێ ی بەخشیوی وچاوت لەماڵی هیچ کەسێکەوە نی یە. مامۆستا قانعی شاعیر، لەپێنج خشتەکیەکی لەسەر غەزەلێکی (موفتی پێنجوێنی) بەناوی (عیزەتی نەفس) دەفەرموێ:

(لەسایەی عیزەتی نەفسم، لەپاشا مەرحەبا ناکەم
لەئەڕبابی کەرەم دوورم، بەکەس خۆم ئاشنا ناکەم.
کراسی چەرمی خۆم ئەدڕم، سواڵی سەرکەوا ناکەم.....
ئەگەرچی لەحزەیەك دەرد وخەم و قەهرم بەبانادەم
ئیلاهی زۆر شوکور، ئومێدی نانێ من لەشا ناکەم....
لەتۆزی ئاشەدا غەرقم، لەتەوقی سەرهەتا ئەژنۆم...
نەترسی ئەمری مافەوق ونەمە حکومی بەراتی تۆم

بەلام چەند خۆشە ئەو تۆزە کەهەر خۆم ئامێرم بۆخۆم
....لەسایەی زەحمەتی قاچ وسەر وشان و دەست وئەستۆم
لەبۆ کەس چاو لەبەرنیم وخەیالی ڕێ ی ڕیاناکەم.
چ خۆشە، تاژیانت بێ، لەلای کەس کەچ نەکەی گەردن....
عەرەق برژێ لەناو چاوت، لەرێگەی کاسپی کردن
بەشەرتێ سەربەسەربەستی، لەمەیدانا بەدەربردن....
بەشالی خاکەکەم ڕازیم ونەیپۆشم هەتا مردن
لەفاسۆن وبەرگەدین، تائەبەد سەلتە وکەوا ناکەم.
دەشەرتە شەرتی مەردبێ، لەدنیا تاحەیاتم بێ....
نەهیوای سەرقەلەمدانەو، نەئومێدی خەلاتم بێ.
لەسەر ئەم حالەتی خۆمە، ئەگەربێتو سوباتم بێ....
بەئومێدم بەسەربەستی، لەحەشریشا نەجاتم بێ.
لەدنیادا کەهیچ کەس توشی ئازار وبەلا ناکەم.
قەناعەت چاکە، واچاکە بساچێنم بەشۆر باوێ....
کەوای تاقەی منەت لابەم، لەبەرکەم شال یا جاوێ.
لەبۆدانەی تەماعکاری، نەکەومە گێژی هیچ داوێ....
ئەگەر شیعرێ بلێم ونەشری کەم، هیچم لەکەس ناوێ.
لەفیکرا پەیرەوی مەرحومی زاتی شێخ ڕەزا ناکەم.

ئیمانداران: سەرەنجامی بێ قەناعەتی یەکسانە بەناشکوری کردن وناشکوری کردنیش سەرەنجامەکەی بریتی یە لەوەی کە: ئەوەی هەشتە خوای گەورە لێت ئەسەنێتەوە گوێ بۆ ئەم بەسەرهاتە بگرن. کەلەیەکێ لەپارێزگاکانی هەرێمی کوردستان ڕوی داوەو شاگردی چێشتخانەیەکی گەورەی ئەو شارە بۆمان دەگێرێتەوە ودەلێ: من شاگردی چێشتخانەیەکی گەورەبوم، خاوەن چێشتخانەکە (مەطعەمەکە) پیاوێکی زۆر دەولەمەند بوو. بەلام لەگەل ئەو هەموو سامانەدا زۆر چاوچنۆك وحەسود بوولەتەنیشت چێشتخانەکەی ئێمەوە، چێشتخانەیەکی تر هەبوو. ڕۆژێکیان خاوەن مەطعەمەکەمان لەپشت مێزەکەی خۆی دانیشتبوو بۆ پارەوەرگرتن. ئەو ڕۆژەیان قەدەری خوا وابوو موشتەریمان کەم بوو.

بەلام چێشتخانەکەی تەنیشتمان بازاڕی باشی هەبوو. بۆیە سەیرمکرد، خاوەن چێشتخانەکەمان ئۆقرەی لێ هەلگیرابوو. نەیدەزانی چی بکات. دەچوە





دەرەوەو دەهاتەوە. زۆر قەڵس وتوڕە بوو. بەتايبەت کەئەو خەڵکە زۆرە ڕوويان دەکردە چێشتخانەکەی تەنيشتمان وکەم کەس دەهاتە لای ئێمە. لەهەمووومان توڕە دەبوو. لەسەر مێزەکەی دانيشت ودەستی خستە ژێر چەناگەی. لەناکاو چاوی کەوتە سەرئەو (الله).ی لەسەر ديوارەکەی بەرامبەری نوسرابوو. هەستاو ووتی: دەزانم خەتای ئەو (بسم الله)يەيە بازارمان نيەو خەڵك ڕومان تێ ناکات!!! چوو بۆياخێکی پەمپی هێناو (بسم الله)يەکەی ڕەش کردەوە!! ئێمە هەمووو زۆر پێ ی دلگران بوين. بەڵام چونکە شاگرد بوين، نەمانتوانی هيچ بڵێين ڕۆژگار هات وچوو.

خاوەنی چێشتخانەکەمان کەبەردەوام هەرچاوی لەسەر ماڵی خەڵکی بوو هەرسەيری ئەو کەسانەی دەکرد کەلەودەوڵەمەندترن. ڕۆژێکيان کەبيستی يەکێ لەهاوڕێ کۆنەکانی چەند ساڵێك لەوەوبەر ڕۆيشتبوو بۆ دەرەوەی وڵات وتازە هاتبۆوە. پارەيەکی زۆری لەگەڵ خۆی هێنابۆوە، کاتێ کەئەم خاوەن چێشتخانە دەچێ بۆ سەردانی وئەويش بۆی باس دەکات کەچەند ڕيزە دوکان وشوقەی کڕيوە وبەتەمايە چەند گەراج و مەطعەميش بکڕێ! ئەم خاوەن مەطعەمە ئارامی لێ هەڵدەگيرێ و خۆی بەهەژار دێتە بەرچاوو بڕياری ئەوە دەدات بۆئەوەی وەکو ئەو دەوڵەمەندبێ، بڕوات بۆ دەرەوەی وڵات. بەڵام بۆئەوەی قاچاخچيەکی زۆر شارەزا بيگەيەنێتە توركياولەوێشەوە بۆ ئەوروپا. بۆيە هەستا مەطعەمەکەی فرۆشت، خانوەکەی فرۆشت وژن ومناڵەکەی خستە خانوی کرێوە، ئوتومبێلە مۆدێل بەرزەکەی فرۆشت. تەنانەت زۆرێك لەکەل و پەلی ماڵەوەشی فرۆشت. وە ژن ومناڵەکەی بەوە ڕازی کرد، کەهەرگەيشتە ئەوروپا. بەو پارەی پێ يەتی دەستی لەئيشێکی باش گيربێ و ئەوانيش ڕاکێشێ.

بەڵام بێ ئاگا لەوەی کەکوفرکردن وسڕينەوەی (الله) و بێ قەناعەتی و تەماح کاری نابەجێ، چی پێ دەکات وچۆن دەيسڕێتەوە!

لەگەڵ يەك دوو کەسی تردا، بەشوێن قاچاخچی کەوتن و هەرکە گەيشتنە خاکی توركيا وەکو ئەوەی جاسوس بەسەريانەوە بێ. کەفلان کەسی دەوڵەمەند هات وخاوەن پارەيەکی زۆرە. کەوتە ناو دەستەيەك ڕێگرەوە وگرتيان!! ئەوەی پێيان بوو لێيان سەند وئەوەشی کەمابوی لەماڵەوە، بەتەمابوو کەگەيشتە شوێنی خۆی بۆی بنێرن. لەژێر ئەشکەنجەدان وهەڕەشەی کوشتن دا. ناچار

داوای کرد وبۆیان نارد بەحیسابی ئەوەی ئەم گەیشتۆتە ئەوروپا. بەڵام هەمووی لێ سەندرا وبەگیرفانی بەتاڵ ولەشی شکاوەوە فڕێیاندایەوە خاکی کوردستانەوە. بەم شێوەیە هاتەوە بۆماڵەوە! بەدەستی خاڵی وبێ خانوو ماڵ وبێ کار وکەسابەت. لەناچاریدا بەشوێن ئیشدا دەگەڕا. تا نانێکی ڕۆژانە بەدەست بهێنێ. چونکە لەژیانیدا هەر لەمەطعەمدا کاری کردبوو. لای ناسیاوێکی بەشاگرد مەطعەم دامەزراو قاپ شۆری مەطعەم بوو!! ئەمەیە سەرەنجامی بێ قەناعەتی وناشکوری. خوای گەورەو میهرەبان قەناعەت بخەیتە دڵ و دەروونمانەوە، لێت دەپاڕێینەوە ودەڵێین:

﴿ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾

ٱللَّهُمَّ ءَآمِينَ



## سەرچاوەکان




١- قورئانی پیرۆز.

٢- تەفسیری ئاسان ، بورهان محمد أمین.

٣- مَوْسُوعَة الاخلاق الاسْلامِيَّة ، سَعْد یوسف أَبُوعَزیز ، ج٢ ، ص١٧.

٤- ڕۆژنامەی ستاندەر ، ژمارە: ٥٦ لە ٢٠٠٨/١٢/١.

٥- نامیلکەی (سێ کورتە چیرۆك) ، فەرمان نەجار ، ل٤.




الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجْمَعين.

ئیمانداران: ئامانجی بنەڕەتی وهەرە گەورە لەهاتنی ئاینی ئیسلام بۆ دوو مەبەستی زۆر گرنگە:

١- خەڵكی هەموو تەنها بەندەی خوای گەورەبن وبەندەی یەكتری نەبن.

٢- دروست كردنی خۆشەویستی ومەحەبەت لەنێوان مرۆڤەكاندا..

جا یەكێ لەوشتانەی كەئاینی ئیسلام بۆ تەبایی دروستكردن وخۆشەویستی پەیداكردن لەناومرۆڤەكاندا بەگشتی وموسڵمانان بەتایبەتی دایناوەو گرنگی پێ داوە. بریتی یە لەدیاری وهەدیە پێشكەش كردن بەیەكتری...

ئیمانداران: صەدەقەو دیاری، جیاوازیان لەوەدایە كە: صەدەقە وخێركردن لەدەوڵەمەندەوە بۆ هەژارە وتەنها مەبەست لێ ی ڕەزامەندی خوا وئەجر وپاداشتی قیامەتەو زۆرجار ئەم صەدەقەو خێركردنە بەنهێنی ئەنجام دەدرێ. وە زۆرجار صەدەقەو خێر دەدرێ بەكەسێك كەنایناسی. بەڵام دەزانی هەژارە. وە زۆرجار هەرگیز نایبینیتەوە. بەڵام هەدیە ودیاری، بەئاشكرا پێشكەش دەكرێ وئەجر وپاداشتی قیامەتیشی هەیەو (ئەگەر مەبەست پێ ی ڕەزامەندی خوابێ) وە هەدیە ودیاری لەهەژاریشەوە پێشكەش بەدەوڵەمەند دەكرێ. وە مەبەست وئامانجیش ڕێزلێنان لەكەسی بەرامبەر ودروست كردنی پردی خۆشەویستی ودۆستایەتی ولەیەكتر نزیك بونەوەیە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (تَهادَوا تَحابُوا) رَواهُ البُخاري في الادَب المُفْرَد بِرَقَمْ: (٦٠٧) وَحَسَّنَهُ إِبْنُ حَجَر.



واتە: دیاری پێشكەش بەیەكتری بكەن، لای یەكتر خۆشەویست دەبن. وە لەفەرمودەیەكی تردا، هاتووە: (تَهادَوا، فَإِنَّ الهَدِيَّةَ تذْهَبُ وَحَرَ الصَّدْرِ) - رَواهُ البُخاري في الادَب المُفْرَد -

واتە: دیاری پێشكەش بەیەكتری بكەن. چونكە هەدیە ودیاری، كینەی ناو سینە لادەبات. ڕق وقینی ناو دڵ، كەبەرامبەر كەسێك دروست بوە، بەو هەدیەیە لادەچێت.

ئیمانداران: هەدیەو دیاری چەند جۆرێكی هەیە. وەكو:

١- هەدیەو دیاری بەمەبەستی سیاسی، كەئەمە لەنێوان سەركردەكاندا دروست



دەبێ، وەکو هەدیەکەی (بەڵقیس) بۆ حەزرەتی سولەیمان کەکاتێ حەزرەتی سولەیمان بەپەیوسلێمانەدا (هدهدْ) نامەیەکی بۆ ناردو داوای موسڵمان بوونی لێکرد. بەڵقیس وەزیرو دەست وپێوەندەکانی کۆکردەوەو پێ ی ووتن: ﴿ وَإِنِّي مُرۡسِلَةٌ إِلَيۡهِم بِهَدِيَّةٖ فَنَاظِرَةُۢ بِمَ يَرۡجِعُ ٱلۡمُرۡسَلُونَ فَلَمَّا جَآءَ سُلَيۡمَٰنَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٖ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيۡرٞ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُمۚ بَلۡ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمۡ تَفۡرَحُونَ ﴾ النمل: ٣٥-٣٦

واتە: بەڵقیس ووتی: من بڕیارم داوە کەهەدیە ودیاریەکیان بۆ بنێرم، جا چاوەڕێ دەکەم بزانم نوێنەرەکان چ هەواڵێکم بۆ دەهێننەوە وهەڵوێستی سولەیمان چۆن دەبێ. جا کاتێك نوێنەری نێردراوەکان گەیشتە لای سولەیمان، هەواڵی دیاریەکەی گەیاند. حەزرەتی سولەیمان بەتوڕەییەوە پێ ی ووت: ئێوە دەتانەوێت بەماڵ وسامان ودیاری کۆمەکیم بکەن؟ من دڵنیام ئەوشتانەی کەخوا پێ ی بەخشیوم لەوە چاکترو بەنرخترە، کەبەئێوەی بەخشیوە، نەخێر من بەودیاریە دڵشاد نابم، بەڵکو ئێوەن بەدیاریەکەتان شاد دەبن..بەڵێ ئەم جۆرە لەهەدیەو دیاری بۆ دۆستایەتی وخۆشەویستی نیە. بەڵکو بۆ مەبەستێکی سیاسیە.

هەر بۆیە حەزرەتی سولەیمان، دیاریەکەی وەرنەگرت وپێ ی دا ناردنەوە. لەتەفسیری (إبنُ كثير ج٣ ص٣٦٢) دا — لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا هاتوە کە:

ئیبن عەباس فەرمویەتی: بەڵقیس کەدیاریەکەی نارد بۆ حەزرەتی سولەیمان بەگەلەکەی خۆی گوت: ئەگەر دیاریەکانی وەرگرت وپێ ی شادمان بوو. ئەوە بزانن پاشاو دەسەڵاتدارێکی دونیایی یەو تەنها مەبەستی پارەو سامانەو، ئەوکاتە ئێمەش بەهێز بەرەو ڕووی دەبینەوە وشەڕی لەگەڵ دەکەین. خۆئەگەر دیاریەکەی وەرنەگرت و ئەو هەموو شتە بەنرخانەی ڕەت کردەوە. ئەوە بزانن کەکەسێکی خاوەن بیروباوەڕەو ڕاست دەکات کەپەیامی خوای پێ یەو ئیتر بەشەڕکردن ناتوانین بەرەو ڕووی ببینەوە لەبەرئەوە شوێنی دەکەوین و ئیمانی پێ دێنین!

بەڵێ لەمێژودا زۆرجار دەسەڵاتداران، زەوی و وڵاتی گەلانی هەزار پێشکەش بەکەسانی تر دەکەن ودەیکەن بەدیاری دەستیان بۆ مەرامی سیاسی خۆیان. لەوڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا سەرکردەکان بەردەوام دیاری دەبەخشن بەسەرەك هۆزو بەرپرسان وخەڵکی پێ دەکڕن! وە بەهەدیە ودیاری خەڵکی نەیاری خۆیان بێدەنگ دەکەن. جاهەرکەسێ وازی لەمەبدەئو بیروباوەڕەکەی خۆی هێنا

وده‌ستی برد بۆ وه‌رگرتنی دیاری وهه‌دیه‌ی کاربه‌ده‌ستان، ئه‌وه هه‌رگیز سه‌رکه‌وتوو نابێ وکه‌س سود له‌وکه‌سه نابینێ ومولْکی که‌س نی یه.

به‌ڵێ، پیاوچاکان وزانایانی به‌ڕێزی ئیسلام، هه‌دیه ودیاری پاشا وخه‌لیفه‌کانیان ڕه‌ت کردۆته‌وه، هه‌رچه‌نده (هه‌دیه ودیاری ڕه‌ت ناکرێته‌وه). چونکه زانیویانه ئه‌و هه‌دیه‌و دیاریه‌یان له‌به‌ر دڵسۆزی وخۆشه‌ویستی زانایانی ئیسلام نیه. به‌ڵکو بۆ ئه‌وه‌یانه که‌ده‌میان بگرن وله‌دژیان نه‌دوێن. بۆیه ڕه‌تیان کردۆته‌وه هه‌رگیز ده‌ست درێژبکه‌ن بۆ وه‌رگرتنی دیاری و پاشاو سه‌رکرده‌کان. نه‌وه‌کو بکه‌ونه ژێر منه‌تی ئه‌و هه‌دیه‌وه‌و له‌کاری فه‌رمان به‌چاکه ونه‌هی له‌خراپه‌دا که‌مته‌رخه‌می بکه‌ن.

٢- هه‌دیه‌و دیاری له‌لایه‌ن هاولاْتیه‌وه بۆ سه‌رکرده وکاربه‌ده‌ستانی حکومی:

زۆرجار ئه‌و پرسیاره له‌مامۆستایانی ئاینی به‌ڕێز ده‌کرێت. که‌ئایا ئه‌گه‌ر که‌سێك ئیش وکارێکی که‌وته فه‌رمانگه‌یه‌کی حکومیه‌وه‌و ئه‌و که‌سه‌ی کاره‌که‌ی هه‌یه، هه‌دیه‌و دیاریه‌کی برد بۆ کاربه‌ده‌سته‌که. لێپرسراوی فه‌رمانگه‌که، فه‌رمانبه‌ره‌که، ئایا ئه‌مه حه‌لاْڵه یان حه‌رامه؟

له‌وه‌لاْمدا ده‌ڵێین: هه‌موو ئه‌وه‌ی که‌وا ناوده‌برێ به‌هه‌دیه‌و دیاری وله‌لایه‌ن هاولاْتیه‌وه ده‌درێت به‌فه‌رمانبه‌ری حکومی و به‌رپرسان. له‌ڕاستی دا هه‌دیه نیه‌و ڕیشوه‌و به‌رتیله. وه له‌شه‌ریعه‌تی ئیسلامی دا، به‌حه‌رام دانراوه که‌هاولاْتی به‌ناوی هه‌دیه‌و دیاریه‌وه، هیچ شتێك بدات به‌هیچ مۆزه‌ف و لێپرسراوێك. وه حه‌رامه مۆزه‌ف وکاربه‌ده‌سته‌که‌ش وه‌ری بگرێ له‌به‌رئه‌وه‌ی:

١- یان کاره‌که‌و ئیشه‌که. نایاساییه‌و ئه‌م به‌ناو دیاری له‌حه‌قیقه‌تدا به‌رتیله، هاولاْتی ده‌یه‌وێ کاره نایاساییه‌که‌ی بۆ جێ به‌جێ بکرێ، که‌بێگومان کاری نایاسایش قه‌ده‌غه‌یه وده‌بێته هۆی زیان گه‌یاندن به‌که‌سێك یان که‌سانێك.

٢- یاخود کاره‌که یاسایی یه‌و مافی هاولاتیه‌که خۆیه‌تی. که‌واته: له‌پێناوی چیدا کاربه‌ده‌سته وفه‌رمانبه‌ری فه‌رمانگه، شت له‌هاولاْتی وه‌ربگرێ؟! واجبی سه‌رشانیه‌تی دڵسۆزانه کاره‌که‌ی بۆ ڕابپه‌ڕێنێ، وه له‌به‌رامبه‌ر کارکردنیدا، له‌لایه‌ن حکومه‌ته‌وه موچه وه‌رده‌گرێ.

٣- حه‌رامه هاولاْتی به‌ناوی هه‌دیه‌و دیاریه‌وه هیچ پێشکه‌ش به‌هیچ لێپرسراوو فه‌رمانبه‌رێك بکات. چونکه ئه‌مه ئه‌و فه‌رمانبه‌ره فێری به‌رتیل خۆری ده‌کات وئیتر وای لێ دێ به‌بێ به‌رتیل وبه‌بێ وه‌رگرتنی شتێك له‌هاولاْتی، ئاماده نه‌بێ






ئیمزایەکی بۆبکات. زۆربەی فەرمانبەرو کاربەدەستانی حکومی کەفێری بەرتیل خۆری دەبن، هەرلەو دیاری و هەدیانەوە فێردەبن کەخەڵکی بۆیان دەبەن!

بۆ زیاتر تێگەیشتن لەم بابەتە بابچینە خزمەت ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ: پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ کابرایەکی نارد بۆناو هۆزێك بۆ کۆکردنەوەی زەکات. پاش ماوەیەك ئەوکەسە هاتەوەو چوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺو ووتی: ئەمە ماڵی زەکاتە کەکۆمکردۆتەوە ونەو هەندە دانەوێڵەو باقلەمەنی و حوشترو مەڕو بزنەش ئەوە هەدیەو دیاریە خەڵکی ئەو شوێنانە کەزانیان من زەکات کۆدەکەمەوە، بەدیاری بۆخۆمیان هێنا!! پێغەمبەری خوا ﷺ کەئەمەی بیست. یەکسەر چوە سەر مینبەر وفەرموی: ئەی خەڵکینە، بەڕاستی من کاتێ کەسێك لەئێوە دیاری دەکەم وکارێکی دەوڵەتی پێ دەسپێرم، کەچی کاتێ کارەکەی جێ بەجێ دەکات ودێتەوە بۆلامان دەڵێ: ئەمە مۆڵکی دەوڵەتەو ئەمەش لەلایەن هاوڵاتیانەوە وەکو هەدیەو دیاری پێشکەش کراوە بەخۆم!!

ئەمجا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ووتە گەوهەرینەی فەرمووە: (أَفَلا جَلَسَ فِي بَيْتِ أَبِيهِ وَأُمِّهِ، حَتَّى تَأْتِيهِ هَدِيتُهُ إِنْ كانَ صادِقاً؟!)

فەرموی: ئەوە بۆ ئەو کەسە لەماڵی باوکی، یان لەماڵی دایکی دانانیشێ و واز لەکاری حکومەت ناهێنێ. ئەمجا بابزانێ کەس هەدیەی بۆ دەبات یان نا؟!) ئەم فەرمودەیە پێشەوا (مسلم) ڕیوایەتی کردوە.



ئیمامی نەوەوی لەشەرحی صەحیحی مسلم دا، ج٤ ص٥٣٣، فەرمویەتی: (وَفي هذا الحَديْثِ بَيانٌ، أَنَّ هَدايا العُمّالِ حَرامٌ وَغُلوْلٌ، لأَنَّهُ خانَ فِي وِلايَتِهِ وَأَمانَتِهِ).

واتە: لەم فەرمودەیەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی ڕوون کردەوە کە: دیاری و هەدیەی کاربەدەستان حەرامەو پاشقول دانی ماڵی حکومەتە. چونکە خیانەت کردنە لەپۆست و پلەکەی، وە لەو ئەمانەتەی لەژێر دەستیایەتی. پاشان ئیمامی نەوەوی لەهەمان شوێندا دەفەرموێ: بۆیەش ئەم دیاری وەرگرتنە لەلایەن فەرمانبەری حکومیەوە حەرامە. چونکە بەهۆی پلە وپۆستەکەیەوە خەڵکی دیاری وهەدیەی بۆ دەبەن. نەك لەبەرخۆشەویستی وپەیوەندی پێشتربێ...

ئێمەش بەکاربەدەست وفەرمانبەرەکان دەڵێین: ئایا ئەگەر لەو پۆست وپلە وپایەدا نەمان وچونەوە ماڵەوە دانیشتن وبونەوە هاوڵاتیەکی سادەی ئەم وڵاتە.

ئایا ئەو کەسانەی کەدوێنێ لەکاتی کاربەدەستیدا دیاریان بۆ دەهێنا. ئەمڕۆش هەرئاوا بۆی دەبەن بۆ ماڵەوە؟! بەبێ گومان نەخێر. کەواتە: ئەوە دیاری نیەو بەرتیلەو حەرامە. وە ئەی فەرمانبەر وکاربەدەستانی حکومەت. بەجوانی گوێ لەم فەرمودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ بگرن وکاری پێ بکەن کەفەرمویەتی: (من اسْتَعمَلْناهُ عَلى عَمَلٍ فَرَزَقْناهُ رِزْقاً فَما أَخَذَ بَعْدَ ذلك فَهُوَ غُلول) رَواهُ أبُوداود، وَقالَ الشَّيْخ الالْباني: صَحيحْ. صَحيح الترغيب والتَّرهيب، ص٣٣٠.

واتە: هەرکەسێك کەلەلایەن ئێمەوە (حکومەتەوە) خرایەسەر کارێك وئیشێکی پێ سپێردراو کرا بەفەرمانبەرو کاربەدەست، وە موچەی بۆ بڕدرایەوە. دوای ئەوە هەرشتێك وەربگرێ، ئەوە بەدزی حیسابەو خیانەتی کردوە!..

وە لەفەرمودەیەکی تردا هاتوە کەپێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (هَدايا العُمّالِ غُلُولٌ) - رَواهُ أَحْمَد، وَصَحَّحَهُ الالْباني في - إرواءِ العَليل ج٨ ص٢٤٦.

واتە: هەدیە ودیاری وەرگرتن لەلایەن فەرمانبەرو کاربەدەستانی حکومەتەوە دزی یە. خۆ ئەگەر کەسانێك بڵێن: باشە خۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نیش وکاری خەڵکی بەڕێوەبردوەو سەرۆکی دەوڵەت بوە وهەدیەو دیاریشی وەرگرتوە. وە حەزرەتی ئەبوبەکرو عومەریش لەگەڵ ئەوەدا کەکاربەدەست بوون، هەدیەیان وەرگرتوە، ئەی بۆچی فەرمانبەر وکاربەدەستانی ئەم سەردەمە حەرامە؟! وەڵامی ئەو پرسیارە دەسپێرین بەخەلیفەی دادپەروەری ئیسلام. عومەری کوڕی عبدُالعزیز، کەکاتێ کەهەدیەیان بۆ برد ووەری نەگرت، هەمان پرسیاریان لێ کرد. ئەویش لە وەڵامی ئەوان وئێمەش وهەموو خەڵکیش دا فەرموی: (كانَتِ الهَدِيَّةُ في زَمَنِ رَسُولِ اللهِ ﷺ هَدِيَّةٌ، وَاليَوْمُ رِشْوَةٌ). رَواهُ البُخاري.

واتە: جاران هەدیە لەسەردەم و زەمانی پێغەمبەردا ﷺ لەبەرخۆشەویستی وڕێز بوو. وە کاریگەری دروست نەدەکرد لەسەر حوکم وفەرمانڕەوایی بۆیە هەدیەو دیاری بوو، وەرگرتنی حەڵاڵ بوو. بەڵام ئەمڕۆ، هەدیەو دیاری بۆ کاربەدەستان، چونکە لەبەرخۆشەویستی نیەو کاریگەری لەسەر حوکم و فەرمانڕەوایی کاربەدەست دروست دەکات، بەبەرتیل حیسابەو هەدیەو دیاری نیە.

٣- جۆری سێ یەمی دیاری، هەدیەو دیاری ئەولاد بۆ دایك وباوکی: کەکوڕ وکچ دیاری پێشکەش بەباوك ودایکیان بکەن، بەتایبەت لەبۆنەکاندا. یان کاتێ دەچنە سەفەرێك کەگەڕانەوە، دیاری تایبەت بۆ دایك و باوکیان بهێنن.



کەنیشانەی ئەوەیە ئێوەمان هەرگیز لەیاد نەچوە. کەبەڕاستی ئەمە ئەجرو پاداشتی لای خوای گەورە یەگجار زۆرە، بەتایبەت ئەگەر دایك وباوکەکە پیرو بەسالآچوو بوون. یان نەخۆش بوون. یان دەست کورت وهەژار بوون. ئەوە ئەجرو پاداشتەکە گەلێ زیاتر دەبێ. چونکە لەوکاتانەدا، دڵیان ناسکتر بۆتەوەو زیاتر بەدڵسۆزی ڕۆڵەکانیان دڵخۆش دەبن.

٤- هەدیە ودیاری دایك وباوك بۆ نەوەکانی خۆیان. کەئەمەش خێر وپاداشتی زۆری هەیەو خۆشەویستی زیاتر دەکات لەنێوانیاندا. بەڵام دەبێ دایك وباوك ئاگاداربن. کەلەکاتی دیاری پێشکەش کردندا، نابێ جیاوازی بکەن لەنێوان ڕۆڵەکانیاندا. دیاری بدەن بەیەکیان ونەیدەن بەیەکیان. یان تەنها بیدەن بەکوڕەکە ونەیدەن بەکچەکەیان. یان بەپێچەوانەوە. چونکە ئەوکاتە لەجیاتی خێر دەبێت بەشەڕو منالەکان دەبن بەدوژمنی یەکتر ونەوەی هیچی وەرنەگرتوە، سۆز وخۆشەویستی بەرامبەر دایك و باوکی کز دەبێت، یان هەرنامێنێ. هەروەکو پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ لەوەڵامی ئەو کەسەدا، کەووتی: دیاریەکم پێشکەش کردوە بەکوڕێکم، یەکسەر پێغەمبەری خوا ﷺ لێ ی پرسی: ئایا کوڕی ترت هەیە؟! ووتی: بەڵێ، فەرموی: ئایا بەشی ئەوانیشت داوە، لەو هەدیەو دیاریەی کەداوتە بەو کوڕەت؟!

کابرا ووتی: نەخێر. تەنها ئەو کوڕەیانم زۆر خۆش دەوێ وهەدیە ودیاریم داوە بەئەوەیان. پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم کارەی ڕەت کردەوە وفەرموی: (فَلا تَشْهَدني إذَاً، فَإنِّي لاأَشْهَدُ عَلى جَوْرٍ) رَواهُ البُخاريُّ (٢٦٥٠).

واتە: دەی من مەکە بەشاهیدو ئاگاداری ئەم مەسەلەیە. چونکە من نابمە شاهیدی ستەم!! وە ئەگەر منالْ گەیشتە تەمەنی ژیری وفامیدەیی ومێردمنالی، دەبێ ئەو دیاریە تایبەتەی دایك وباوکی کەتەنها بەو بەخشراوەو براو خوشکەکانی لێ ی مەحرومن، وەری نەگرێ وڕەتی بکاتەوە. هەروەکو ئەو مێردمنالەی کەکاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ مەرحەبایی کردو شتێکی جوانی پێوە بینی. فەرموی: (ماهذا؟!) ئەمە چی یەو لەکوێت بوو؟ ووتی: باوکم بەدیاری پێشکەشی کردوم. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (فَكُلُّ إخْوَتِكَ أَعْطاهُ كَما أَعْطاكَ؟! قالَ: لا، قالَ: فرِدَّهُ) رَواهُ مُسْلِم.

واتە: ئایا باوکت بۆ هەموو براکانت، لەوێنەی ئەمەی تۆی، بەدیاری پێشکەش کردون؟ منالەکە ووتی: نەخێر، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: کەواتە ڕەتی بکەوەو تۆش وەری مەگرە.

بەڵێ. هەرکارێکی جوان وچاك، ئەگەر بەگوێرەی شەرع نەکرێ، بەرهەمەکەی پێچەوانە دەبێتەوەو لەجیاتی خێر بۆیان دەبێت بەنەگبەتی و شەڕ.

٥- دیاری پێشکەش کردن بەمەبەستی هاندان ودەست خۆشی لێکردن:

وەکو هەدیە و دیاری مامۆستا بۆ خوێندکارو قوتابی سەرکەوتوو. وە قوتابی ڕەوشت بەرزو گوێڕایەڵ. یان سەرۆکی فەرمانگە، دیاری پێشکەش بکات بەفەرمانبەرو کرێکاری دڵسۆز وخەمخۆری فەرمانگەکە. کەبۆتە مایەی جوانی وپێشکەوتنی فەرمانگەکەی. کەبەڕاستی ئەم جۆرە هەدیەو دیاریەش کاریگەری خۆی دەبێ.

٦- دیاری پێشکەش کردن بەزانایانی ئیسلام، بەمەبەستی نزیك بونەوە لەڕەزامەندی خوا. وە هاندانی ئەو سەنگەر نشینانەی مینبەرو میحراب، بۆ زیاتر خزمەت کردن بە ئیسلام و پڕکردنەوەی پێویستیەکانیان، کەپێویستیان بەدەستی خەڵکی نەبێ وەکو هەدیەکردنی کتێب بۆ مامۆستایان، کەخۆی توانای کڕینی نی یە.

٧- دیاری پێشکەش کردنی ژن ومێرد بۆ بەکتری، بەتایبەت لەجەژن و بۆنەکاندا. یان کاتێ لەسەفەر گەڕانەوە، کەبەڕاستی ئەم دیاری پێشکەش کردنە خۆشەویستی نێوانیان زیاد دەکات. وە ئەگەر دەمەبۆڵەو پرتەو بۆڵەیەك تۆزێ ساردی لەنێوانیاندا دروست کردبێ، ئەم هەدیەو دیاری پێشکەش کردنە لای دەبات.

هەندێ لەئادابی هەدیەو دیاری:

١- هەرکاتێ هەدیە ودیاریت پێشکەش کراو لەسنوری شەرع دەرنەچوو بوو، ئەوە وەری بگرە وڕەتی مەکەوە. چونکە تۆ خۆت داوات نەکردوە. هەروەکو کەڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێ ماڵ و پارەی دا بەحەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب. حەزرەتی عومەریش فەرموی: (یارَسُولَ اللهِ، أعطه من هُوَ أَفْقَرُ مِنّي) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بیدە بەکەسێکی هەژارتر لەمن، پێغەمبەری خوا ﷺ



فەرموی: ئەی عومەر بیگرە، ئەگەر شتێکت بۆ هات لەم ماڵ و سامانە، لەلای کەسێکەوە. بەبێ ئەوەی تۆ داوات کردبێ وچاوت لەدوای بوبێ، ئەوە وەری بگرەو ڕەتی مەکەوە. جا ئەگەر حەزت لێبوو بیخۆو ئەگەر ئارەزووت کرد، بیکە بەخێرو بیدە بەکەسێکی تر.. ئەم فەرمودەیە: (رَواهُ أحمد في مُسْنَدِهِ (١٣٦) وَصَحَّحَهُ الشَّيْخ أحمد شاكر في المُسْنَد، ج١ ص٢٢٤.

- وە لەفەرمودەیەکی تردا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (لاتَرُدُّوا الهَدِيَّةَ).
- رَواهُ البُخاري في الادَب المُفْرَد - وَصَحَّحَهُ الالْباني في الارواء - (١٦١٦)..

واتە: هەدیەو دیاری ڕەت مەکەنەوە.

٢- باهەدیەو دیاری لەنرخدا کەم وبێ نرخ بێ، هەر وەری بگرەو مەڵێ جائەوە چی یە؟! گرنگ ئەوەیە ئەو کەسە تۆی لەیاد بوە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (لَوْ دعيتُ إلى كراعٍ أَوْ ذراعٍ لأجَبْتُ، وَلَوْ أهدى إِلَيَّ كُراعٌ لَقَبِلْتُ) رَواهُ البُخاري (٢٥٦٨) وَمُسْلِم.

٣- هەرکەسێ هەدیە ودیاری پێشکەش کردی، تۆش بەپێ ی توانا هەدیە ودیاری پێشکەش بکەوە، بۆئەوەی منەت وچاوبەرەژێری کەس نەبی، هەر وەرگر نەبی و بەخشەریش بی، وە بۆئەوەی ئەم دیاری گۆڕینەوە، ببێتە خۆشەویستی دوولایەنە نەك هەرلەلایەکەوە بێ. وە کاتێکیش کەدیاری وهەدیەت بەخشی بەکەسێك کەئەو پێشتر بەدیاریەك بەسەری کردبویەوە. ئەوە دەیسەلمێنێ کەتۆ کەسێکی چاکەی خەڵکت لەبەرچاوە وسپڵە وپێ نەزان نیت.

٤- لەکاتی بەخشینی دیاریدا، ڕەچاوی نزیك ونزیکتر بکە. دایکی ئیمانداران، خاتوو عائیشە دەفەرموێ: عەرزی پێغەمبەری خوام کرد: (إنَّ لي جارَيْنِ، فَإلى أَيِّهِما أَهْدي؟ فَقالَ: إلى أَقْرَبِهِما منكَ باباً) - رَواهُ البُخاري: (٢٢٥٩).

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من دوو دراوسێم هەیە. ئایا ئەگەر لەدەستما بوو، وە ویستم دیاریەك، هەدیەیەك پێشکەش بکەم، بیدەم بەکامیان؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: بیدە بەوەیان کەدەرگاکەی لێت نزیکترە..

یاخود لەخزمایەتیدا. کامیان لەپێشترە، کامیان موحتاج ترە، کامیان ساردیەك هەیە لەنێوانتاندا. بەو دیاریە، ئەو ساردیە لادەچێ، دیاریەکە پێشکەش بەویان بکە.

٥- ئەگەر هاتوو لەگەڵ کەسێکدا، ناکۆکیەك کەوتە نێوانتانەوەو دواتر ئاشت بونەوە لەوکاتەدا کەچوی بۆلای و سەردانت کرد، دیاریەك لەگەڵ خۆت

ببە. ئەمە زیاتر دڵ پاك دەكاتەوە ونیاز پاكی دەردەخات ودەبێتە پردی خۆشەویستی. پێغەمبەری خوا ﷺ، پارچەیەك قوماشی گەورەی بۆ هاتبوو. (تۆپێ قوماش) بوو، دابەشی كرد بەسەر ئەوانەی دەوروبەریداو پارچەیەكی هەڵگرت بۆخۆی. جا كاتێ كە (مەخرەمەی كوڕی نەوفل) كەتازە موسڵمان ببو، هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ. كاتێ لەدەرەوە هەواڵی پێغەمبەری خوای پرسی وپێغەمبەری خوا ﷺ لەژورەوە گوێ ی لەدەنگی بوو. پارچە قوماشەكەی — كەبۆ خۆی هەڵگرتبوو — بەدەستیەوە گرت ورۆیشت بەپێشوازی یەوە ودەرگای لێ كردەوەو بەخێرهاتنی گەرمی كردو قوماشەكەی پێشكەش كردو فەرمووی: (يا أبا المسور، خبئتُ لكَ هذا). ئەی ئەبا مەسور، ئائەم پەرچە قوماشەم بۆتۆ هەلاگرتوەو پێشكەشت بێ! — رَواهُ البُخاري. وَصَحَّحَهُ الالْباني في صَحيح سُنَن أَبي داود (٤٠٢٨).

(سُبْحانَ الله) لەحیكمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، كاتێ ئەم كەسە تازە موسڵمان بوە، دێتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ. كەئەو دیاریەی پێشكەش دەكات و دەفەرموێ: ئەمەم لەوتۆپە قوماشە كەدابەشم كرد بۆتۆ هەڵگرتووە، واتە: تۆم هەرلەبیرە. بەوەنیە كەتازە موسڵمان بووی. ڕێزی تایبەتت هەیە لەلام وهەمیشە لەیادمی. ئیتر بزانە ئەم پیاوە چەندە دڵی خۆش بوە بەم ڕێزلێنانەو دەیەها ڤاتی جاران، ئیسلام وپێغەمبەری خوای ﷺ لەلا خۆشەویست بوو.

٦- ئەگەر لەناو كۆمەڵە كەسێكدا بوی ولەوكاتەدا دیاریەكت بۆهات، ئەگەر ئەو دیاریە دابەش دەكرا وبەشی كەسی تری لێ دەدرا. وەكو: خواردن و میوەو شیرینی و خواردنەوە ئەوە كارێكی بەجێ وجوانە، كەبەشی ئەوكەسانەی لێ بدەی كەلەلاتن. هەروەكو كاتێ كەپێغەمبەری خوا ﷺ، توشی هاوەڵی بەڕێز، ئەبو هورەیرە بوو. لێ ی پرسی: ئەبا هورەیرە ئەوە چۆنە لەم كاتەدا لەدەرەوەی ماڵی؟! ئەبو هورەیرە فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ برسێتی ناچاری كردم كە بێمە دەرەوە. زۆرم برسی یە؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بەخوا منیش زۆرم برسی یە وەرە بابڕۆینەوە بۆ ماڵی ئێمە كە چووینە ماڵەوە ، فەرموی: ئەرێ چیمان هەیە بیخۆین ؟ ووتیان: (أَهْداهُ لَكَ فُلانٌ أَوْ فُلانَةً) ڤاپێ شیرت بۆ هاتوە. ئەبو هورەیرە دەفەرموێ: لەبیرم نەماوە. ووتیان: فلاّن پیاو ، یان فلاّن ئافرەت بەدیاری بۆی ناردووی! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (أَبا هِرٍ، نادِ أَهْلِ





الصُفَة). ئەی ئەباهیڕ – بۆ خۆشەویستی و لەخۆشیاندا ناوەکەی کورت کردەوە – بڕۆ هەموو دانیشتوانی صوففە، (ئەو فەقیرو هەژارانەی لەسەر سەکۆکەی بەردەمی مزگەوت ماونەوەو ماڵوحاڵوکەس وکاریان نیە) – بڕۆ هەمویان بانگ بکە. بابێن لەم شیرە بخۆنەوە!!! ئەبوهوڕەیرە دەفەرموێ: فەرمانەکەی پێغەمبەری خوام ﷺ جێ بەجێ کرد – هەرچەندە لەدڵیشەوە پێم خۆش نەبوو. چونکە شیرەکە تەنها قاپێك بوو. زۆریشم برسی بوو. چاوەڕێ ی ئەوە بوم نیوەی بۆ من بێ!! – بەڵێ، ئەهلی صوفەش بەشادمانیەوە بەرەو ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتن. پێغەمبەری خوا ﷺ یەك یەك قاپە شیرەکەی دانێ ولێیان تێر دەخواردەوە، هەتا کەس نەما. فەرموی: ئەباهوڕەیرە، ووتم: لەخزمەتتام ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: کێ ماوە شیر بخواتەوە؟! عەرزم کرد، جەنابت ومنیش نەمخواردۆتەوە! فەرموی: وەرە تۆش بخۆرەوە. منیش خواردمەوە. فەرموی: ئەمجارەش بخۆرەوە، دیسان خواردمەوە. فەرمووی: ئەمجارەش بخۆرەوە!! ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا جا بیکەمە کوێمەوە. تەواو تێرم خواردۆتەوە! ئەمجا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆخۆشی خواردیەوە! ئەم فەرمودەیە ئیمامی (بوخاری) ڕیوایەتی کردوە..

کەلەم فەرمودەیەوە ئەوە تێ دەگەین، کاتێ دیاریەکت بۆهات بەشی کەسانی تریشی لێ بدەی. بەتایبەت دراوسێکانت. یان ئەو کەسانەی کەلەوکاتەدا لەگەڵتان وهاوڕێ وهاودەم وهاوپیشەتن.. وە هەروەها موعجیزەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبینین لەزۆربونی خواردن وخواردنەوەی کەمدا، کەبەدەمیەها قاتی خۆی زیادی کردوە! ئەمەش ڕێز لێنانی پێغەمبەری خوایە. لەلایەن خوای پەروەردگارەوە، لەئەنجامی ئەو دڵ ودەرونە سەخی یە بێ وێنەی. کەخۆی زۆری برسی بوە، لەوکاتەدا کەمرۆڤ تەنها خۆی لەبیرە. بەڵام ئەو زاتە هەژارانی ئوممەتەکەی لەبیرنەچوە وتائەوان تێریان نەخواردوە. خۆی تێرنەکردوە. هەزاران هەزار صلاوەت لەدیداری ئەو محمدە – خۆشەویستیە بێت. اللّهُمَّ صَلِّ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلِّم.

٧- ئەگەر دیاری وهەدیەیەکت لەلایەن کەسێکەوە پێشکەش کراو تۆش بەدڵت نەبوو. یان پێویستت نەبوو، ئەوە ڕەتی مەکەوەو مەڵێ نامەوێ. بەڵکو وەری بگرەو پاشان تۆش بەهەدیە بیدە بەکەسێکی تر..

ئافرەتێك ناوی (أمُ حفید – هزیله بنت الحارث)بوو. ئەم سێ شتەی لەدمشتەوە

بەدیاری هێنا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆشاری مەدینە. سێ شتەکەش کەلەتوێشە بەرەیەکەوە پێچرابوو. ئەمانە بوون: (أَقْطاً، وَسِمْناً، وَأضباً). کەشك و ڕۆنی ئاژەڵ وگۆشتی بزن مژە..

پێغەمبەری خوا ﷺ کەشك و ڕۆنەکەی خواردو گۆشتی بزن مژەکەی نەخواردو فەرموی: دڵم نایباو لەم وڵاتەدا نی یەو پێشتر نەم خواردوەو بەهەدیەو دیاری دای بەکەسێکی تر.. ئەم فەرمودەیە – رَواهُ البُخاري - (٢٥٧٥).

کەواتە: ئەو قسەیەی کەلەناو خەڵکا مەشهورەو دەڵێ: (الهدِيةُ لاتهدى ولاتباع) لەڕووی شەرعەوە ئەصڵی نیەو ئەوشتەی کەبەهەدیە پێشکەش بەتۆ کراوە. ئەوە تازە موڵکی تۆیەو خۆت ئازادی لەوەی بەکاری دێنی یان دەیفرۆشیەوە، یان دەیبەخشی.

ئیمانداران: ڕەنگە کەسێك بپرسێ: ئایا هەدیە ودیاری لەکافر وەردەگیرێ؟!

لەوەڵامدا دەڵێین: بەڵێ، دروستە هەدیە و دیاری لە ناموسڵمان (کافر) وەربگیرێ بەمەبەستی ئەوەی، ئەمە سەرەتایەك بێ بۆ کۆکردنەوەی دەرگای گفتوگۆ وسەرەنجام بتوانی قسەی بۆبکەی بەئومێدی ئەوەی بەڵکو موسڵمان ببێ. یان بۆیە هەدیەکەی لێ وەربگری، بۆئەوەی لەشەڕ وخراپەی بەدووربی وئەگەر هەدیەکەی لێ وەرنەگری، ڕەنگە ڕق وقینت لێ هەڵگرێ وبەهۆی ئەوەی دەسەڵاتدارە توشی زیانێکت بکات. لەم کاتەدا دروستە، دیاری لەو کافرە وەربگری. ئەمەش چەند نمونەیەك لەباسی هەدیە وەرگرتن لەکافر:

١- لەصەحیحی (مسلم)دا هاتوەکە: (ئەکیدەر) دەسەڵاتداری (دَومةُ الجندَل)، جل و بەرگێکی ئاوریشمی بەدیاری بۆ پێغەمبەری خوا ناردپێغەمبەری خواش ﷺ قبوڵی کردو پاشان بەخشی بەئیمامی عەلی.

٢- ئیمامی ئەحمەد لەموسنەدەکەیدا هێناویەتی کە: (أنَّ - المقوقس - أهْدى إلى النَبِيِّ ﷺ. جُرَّةً من مَنٌ - أي عَسَلٍ - فَقَسَمَها بَيْنَ أصْحابِهِ).

واتە: فەرمانڕەوا – مەقۆقس – کوپەیەك هەنگوینی بەدیاری بۆ پێغەمبەری خوا نارد ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ دیاریەکەی قبوڵ کردو دابەشی کرد بەسەر هاوەڵانیدا.





٣- فەرمانڕەوای (ئەیلە) کەکافر بوە، ئەسپێکی سپی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بەهەدیە ناردو پێغەمبەری خواش ﷺ قبوڵی کرد.

٤- پێغەمبەری خوا ﷺ دیاری لەژنە جولەکە وەرگرتوە، هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنەس دەفەرموێ: ئافرەتێکی جولەکە بەدیاری بەرخێکی سورەوەکراوی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا، بەڵام ئەم بەرخەی ژەهراوی کردبوو!! بۆئەوەی لەم ڕێگەیەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژێ! پێغەمبەری خوا ﷺ دیاریەکەی قبوڵ کردو لێی خوارد، یەکسەر تفیەوەو فەرموی: ئەم گۆشتە ژەهراوی کراوە، صەحابەکان چونە سەرماڵی ئافرەتە جولەکەکەو هێنایان بۆ خزمەت پێغەمبەری خواو، دانی نا بەتاوانەکەیدا!!

صەحابەکان فەرمویان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (ألا نقتلها؟!) ئایا نەیکوژین؟! فەرموی: نەخێر. مادام من پێ ی نەمردوم، مافی ئەوەمان نیە بیکوژین یان بەندی بکەین وئازاری بدەین. لێ ی گەڕێن بابڕوات!!! (بەخوا ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ پاشاو دەسەڵاتدارێکی دونیایی بوایە. بەزیندویی پێستی ئەو ژنە جولەکەی لێ دەکردەوەو نەك هەرخۆی دەیان کەسی تریش تیادەچوون، بەبیانوی ئەوەی دەستیان لەم کارەدا هەبوەو دەستی لەپشتەوە بووە!!

ئەگەر ئەمڕۆ سەرکردەیەکی جیهانی ئاوا ژەهر خوارد بکرێ و ئەوەی کارەکەی کردوە ئاشکرا بکرێ، وە بڵێ وا لێ ی خۆش بوم و مەیکوژن، ئایا چۆن هەرچی ڕاگەیاندنی جیهانە دەبێتە پشکی شێری هەواڵەکانیان و چۆن موسڵمانان پێی سەرسام دەبن وبەشانازی دیموکراسی دەزانن – لەکاتێکدا نەشبوەو ناشیبینین!! –

بەڵام ئەوە پێغەمبەری خۆمانە ﷺ کەئەوەی داهێنا، کەهەم دیاری وخەڵات لەوکەسانە وەربگرێ کەئیمانیان پێ نەهێناوە ولەسەر بیروباوەڕێکی دژ بەئیسلام بوون، وە هەم کەلەوڕێگەیەشەوە، هەوڵی لەناوبردنیان داوە. عەفوی کردون وئازادی کردون. دەی هەزاران هەزار سوپاس بۆتۆ خوای پەروەردگارمان کەپێشەوایەکی ئاوامان هەیە). بەڵێ، ئەنەس دەفەرموێ: (فَمازِلْتُ أعْرِفُها في لَهَواتِ رَسُولِ اللهِ ﷺ).

واتە: لەوەودوا بەردەوام شوێنەواری ئەو ژەهرە خەستە کوشندەم، بەمەلاشووی پێغەمبەری خواوە ﷺ دەبینی. کەپێستی مەلاشووی لێکردبۆوە!..

٥- ئافرەتێك بەناوی (قەتیلەی کچی عبدُالعزی)وە، کەئافرەتێکی موشریك بوو، دایکی ئەسمائی کچی ئەبوبەکر بوو. لەمەککەوە هات بۆ ماڵی کچە موسڵمانەکەی (ئەسماء) وە لەگەڵ خۆیدا دەست ودیاری بۆ هێنابوو. کەبریتی بوو لە:

کەشك و ڕۆن وگۆشتی بزن مژە، کاتێ لەدەرگای داو ئەسماء دەرگای کردەوە، سەیری کرد دایکیەتی. فەرموی: دایە گیان، ڕێزت لەسەرچاوم. بەڵام تۆ موشریکی ومن موسڵمانم. هەتا نەچمە خزمەت پێغەمبەری خواو ﷺ.پرسی پێ نەکەم.

ناهێڵم بێتە ئەم دیوو دەرگاوەو دیاریەکەشت لێ وەرناگرم. بەڵێ دایکی لەدەرگا دانیشت و ئەسماء، چوو بۆ ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ وە پرسیارەکەی بەخاتوو عائیشە گەیاندو ئەویش بەپێغەمبەری خوای ﷺ گوت. لەوکاتەدا.

خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوەو فەرموی: ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴾ الممتحنة: ٨

واتە: خوای گەورە ڕێگریتان ناکات دەربارەی ئەو هاوبەش پەرستانەی کەشەڕتان لەگەڵ ناکەن لەسەرئەوەی کەئیماندارن. وە لەماڵ وحاڵی خۆتان دەرتان ناکەن. ئەگەر چاکەیان لەگەڵ بکەن ودادپەروەربن لەگەڵیان ویارمەتیان بدەن، بەڕاستی خوای گەورە دادگەران وئەوکەسانەی خۆش دەوێ کەلەماڵی خۆیان یارمەتی کەسانی تر دەدەن. ئەمجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد کە (ئەسماء) ڕێگای دایکی بدا بچێتەژورەوە، وە بەگەرمی پێشوازی لێ بکات. وە دیاریەکەشی لێ وەربگرێ و یارمەتیشی پێشکەش بکات!.



وە هەروەها دروستە بۆ موسڵمان کەهەدیە ودیاری پێشکەش بەناموسڵمان بکات، بەتایبەت ئەگەر ئەو ناموسڵمانە خزم بوو. ئیمامی بوخاری لەصەحیحەکەیدا، بەشێکی تایبەتی دیاری کردوە بەم باسەو ناوی ناوە: (بابُ الهَدِيَّةِ لِلْمُشرِكِينَ). کەبەڕاستی لەمەوە زۆرجوان ئەوە ڕوون دەبێتەوە، کەئەم ئیسلامە دینی بەیەکەوە ژیانە لەگەڵ هەموو کەسێکدا. ئەوەتا زۆر بەشتێکی ئاسایی وەرگیراوە لەئیسلامدا. کەکەسێك موسڵمانێکی ڕاستەقینەو دڵسۆزبێ، وە خزمەکەی، تەنانەت باوك و دایکەکەی وخوشك وبراکەی کافربێ. مادام کافرێکە زەرەر لەئەهلی ئیسلام نادات و شەڕ لەگەڵ موسڵمانەکان ناکات. نەك



هەر فەرمان بەموسڵمانەکە ناکات کەدەنگی لێ دابڕێ ومەرحەبایی نەکات ونەفرەتی لێ بکات. بەڵکو هانی دەدات کەدیاری لێ قبوڵ بکات وهەدیە ودیاریشی پێکەش بکات. وە کەهات بۆماڵی پێشوازی لێ بکات وڕووی لەگەڵی خۆش بێ وبەڕەفتارو هەڵسوکەوتی شیرین پێ ی بسەلمێنێ، کەئەم ئیسلامە دینی ڕەحمەتەو بۆلابردنی زەحمەت هاتوە.

ئیمانداری بەڕێز: ئاگاداری ئەوەشبە کەهەدیەو دیاری لەهەمووکەس وەرمەگرە، ئەگەر زانیت هەموو ماڵەکەی حەرامەو حەڵاڵی نیە. یان گومانت هەبوو تۆ بلێ ی ئەم شتەی پێشکەشی منی کردوە، هی ڕاوەڕووت وفەرهود نەبێ، چونکە فەرهود چی بوو!! یان ئەگەر کەسەکە زۆر منەتکار بوو. شتێکی بدایە بەکەسێك، لای هەموو کەس باسی دەکرد ونەدەبڕایەوە، یان چاوەڕێ ی ئەوەبوو. لەپاداشتی ئەو دیاریەدا تۆ چەند قاتی ئەوە شتی پێشکەش بکەیتەوە! لەم حاڵەتانەدا دەتوانی بەشێوازێکی جوان ونەرم کەنەهێڵی دڵی گەرد بگرێ وعاجزی لێ پەیدابێ، دیاریەکەی لێ وەرنەگری.. ئەمەش لەژیاننامەی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتوە، کە: ئەعرابیەك حوشترێك بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دێنێت و پێشکەشی دەکات ودەڵێ:

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە هەدیە ودیاری منە وپێشکەشت بێ، پێغەمبەری خواش ﷺ لێ ی وەردەگرێ وسوپاسی دەکات ووەکو عادەتی هەمیشەیی خۆی حەزی دەکرد کەپاداشتی بداتەوە وشتێکی پێشکەش بکاتەوە. بۆیە کاتێ کەئەعرابیەکە وویستی بگەڕێتەوە بۆ گوندەکەی خۆی. پێغەمبەری خوا ﷺ حوشترێکی زۆر چاکتر لەوەی خۆی پێشکەش کردەوەو فەرموی: ئەمەش دیاری ئێمە بۆ تۆ. بەڵام ئەوکەسە کە لە ئەعرابی (بەنی فەزازە) بوو لەوکەسانە بوو کەبەمێشك ووشك وقسەڕەق ناسرابوون. لەوەڵامی پێغەمبەری خوادا ﷺ لەجیاتی سوپاس و مەمنونی، زۆر بەڕەقی و زمانێکی تاڵ وزبر وەڵامی دایەوەو ووتی: ئائەمە پاداشتی دیاریەکەمە. جا ئەمە چی یە؟!

لەڕیوایەتێکدا دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا ﷺ شەش حوشتری دایە. کەچی ئەو هەردڵی ئاوی نەدەخواردەوە وهەردەیگوت: ئەو حوشترەی من بەدیاری بۆتۆم هێنا ڕەفیقی ئەمانە نەبوو. دەبوایە پاداشتی من زۆر زیاتر بوایە! ئەوەندەی قسەی ناخۆش کرد، کەپێغەمبەری خوا ﷺ ناچاربوو، بچێتە سەرمینبەرو فەرموی:





ئەی خەڵکینە، کەسی واهەیە، هەدیە ودیاریم بۆ دێنێ. پاشان منیش بەوەندەی لەدەستمان بێ، دەمەوێ پاداشتی بدەمەوەو پێ ی ببەخشمەوە. کەچی ئەوکەسە، هەر ناڕازی یەو هەرقسەی ناخۆش دەکات.
دەی سوێند بەخوای گەورە، لەدوای ئەمساڵەوە، هەدیەو دیاری لەهیچ عەرەبێك وەرناگرم، جگەلە: (ئەنصاریەکانی مەدینە وقورەیشی مەککە وهۆزی سەقیف و هۆزی دەوس) نەبێ، چونکە ئەم چوارە بە بەرچاو تێری و بەخشندەیی و ڕەوشت بەرزی ناسراون.. (ئەم فەمودەیە: رَواهُ البُخاري في الادَب المُفرَد (٦٠٩) بإسْنادٍ حَسَّنَهُ الالْباني).

کەواتە: هەرکات هەدیە ودیاریت پێشکەش بەکەسێك کرد، هەرگیز لای خەڵکی باسی مەکە، وە چاوەڕێ ی پاداشتیش مەکە. بەداخەوە هی واهەیە، ئەگەر جارێك لەجاران دیاریەکی پێشکەش بەکەسێك کردبێ، ئەوا هەرگیز لەبیری ناچێتەوەو وەکو ئەو ئەعرابیە، هەرچاوی لەوەیە. هەمووماڵی خۆتی بدەیە، ئەمجا لەمنەتی دیاریەکەی ڕزگارت دەبێ!.. کەئەم جۆرە کەسانە دروستە دیاریان لێ وەرنەگری.

وە ئاگاداریشبە: دیاری پێشکەش بەکەسێك مەکە، کەبێزی نەیەت دەست بۆ دیاریەکەت درێژ بکات و بەشایانی خۆی نەزانێ. مامۆستا هەژاری موکریانی، لەکتێبە ناوازەکەیدا، (چێشتی مجێور) دەڵێ: جارێکیان خەنجەرێکم دا بەئاغای دێیەکەمان بەهەدیەو دیاری. کەگرانبەهاترین وبەنرخترین شت بوو لەلای من، کەچی ئەو بەنۆکەرێکی خۆی گوت: ئادەی ئەو خەنجەرەی لێ وەرگرەو دەبەرپشتێنی خۆتی ڕاکە!! نەك هەربەشایانی خۆی نەزانی، دەستیشی لێ نەدا. ئەمجا بۆم دەرکەوت. ئەوەی کەبەلای منەوە لەهەمووشتێ بەنرخترە، لەلای ئاغای هەرشایستەی نۆکەرو خزمەتکارەکانیەتی!..
بەڕێزان: جۆرێکی گرنگ لەهەدیە، ئەو هەدیەو دیاریەیە کەماددی نیەو پارە وسامان نی یە. بەڵام زۆر بەنرخترە لەدیاری ماددی. کەئەویش بریتی یە لە: (ئامۆژگاری و نەصیحەتی خێر وچاکە). جاهەرکات ئەگەر عەیب وکەم وکورتیەکت لەکەسێك، لەدەزگایەك، لەفەرمانگەیەکی حکومی، لەکاربەدەستێك بینی. چاك وایە ئامۆژگاری بکەی وعەیب وکەم وکورپەکانی پێ بڵێی. بەڵام




بەشێوازێکی زۆر جوان و زانایانە ودانایانە، بەشێوەیەك کەبەڕاستی نەصیحەت بێ. نەك فەزیحەت! حەزرەتی (عومەری کوڕی خەتاب) دەیفەرموو: (رَحِمَ اللهُ إِمْرَأً، أهدى إِلَيَّ عُيُوبِي). ڕەحمەتی خوا لەوکەسە بێ کەعەیب وکەم وکوڕیەکانی خۆم بەدیاری پێشکەش دەکاتەوە!.. ئەو ڕەخنە لێ گرتنە بنیات نەرەی ناو نا — دیاری ...

ئیمانداران: بەپێویستی دەزانم سەرنجتان بۆلای دوو بابەتی گرنگ، لەسەر مەسەلەی هەدیە ودیاری، پەیوەست بەڕۆژگاری ئەمڕۆوە ڕابکێشم.

١- کارێکی پیرۆزە ئەگەر کەسێك خانوی کرد، یان ژنی هێنا، یان منالی بوو. خەڵکی خزم وناسیاوو دراوسێ وهاوپیشەکانی، هەدیەو دیاری پێشکەش بکەن. کەئەمە لەکوردەواریدا لەکۆنەوە هەبوە وشتێکی زۆر جوان بوە وخۆشەویستی و دۆستایەتی وخزمایەتی پێ تۆکمە بۆتەوە.

بەڵام ئەمڕۆ: بەهۆی فراوان بوونی بازنەی ناسیاوی وخزمایەتی وهەروەها گران بونی کەل وپەل وشمەك لەبازاڕدا. ئەم هەدیەو دیاریە، لەمەبەستە سەرەکیەکانی خۆی لایداوە کەبریتی یە لە (دروست کردنی خۆشەویستی) بەڵکو زۆرکات لەناو زۆر خێزاندا بۆتە مایەی ڕق وقین دروست کردن. ئەویش بەهۆی ئەوەی کەخێزانێك، ماڵێك، کەسێك. خۆی دەخاتە ژێر باری قەرزەوە، چونکە دیاریەکی گران بەهای وەها دەکڕێ کەلەگەڵ باری ئابوری ئەودا ناگونجێ و بەڵام لەبەر لەڕوودامان دەیکڕێ، تا خەڵکی لۆمەی نەکەن.

سەرەنجام پارەکەی پێ نادرێ ودەکەوێتە ژێر باری قەرزەوە وئەمجا لەدڵی خۆیدا سەت نەفرەت لەوکەسە دەکات کەدیاریەکەی بۆ بردوە!!..

ئەمە لەکاتێکا، کەمەرج نیە دیاری هەرشتێکی گران بەهابێ، یان پارەیەکی زۆر بێ، بەڵکو ئەمە شتێکی ڕەمزیە وتۆ لەڕێگەی ئەم هەدیە ودیاریەوە نیشانی دەدەی کەتۆ بەخۆشحاڵی ئەو خۆشحاڵی وئەم دیاریەش نیشانەیەتی. ئیتر بابچوکترین دیاریش بێت. وە ئەو کەسەی کەدیاریەکەی بۆ دەچێت، نابێ تەماشای نرخی دیاریەکە بکات، بەڵکو پێویستە تەماشای ڕێزلێنانی ئەوکەسە بکات بۆی، کەلەقەدەر توانای خۆی دیاریەکەی پێشکەش کردوە. حەزرەتی یوسف کەبوو بەعەزیزی میصر وفەرمانڕەوا. برادەرێکی سەردەمی زیندانی ئاوێنەیەکی بەدیاری پێشکەش کردو ووتی: بۆیە ئەم ئاوێنەیەم بەدیاری بۆ هێنای، تاوەکو هەموو جارێ کەسەیرت کرد ئەو دەم وچاوە جوانەی خۆتی

تێدا ببینی ومنیشت بەبیربێتەوە. حەزرەتی یوسف ئاوێنەکەی بەخۆشحاڵیەوە وەرگرت وفەرموی: بڕوابکە بەئەندازەی هەموو سامانەکەم دڵم بەو ئاوێنە دیاریە خۆشە!.

٢- کاتێك کەحاجیەکانی ماڵی خوا لەحەج دەگەڕێنەوە وکەس وکار وناسیاوو دراوسێ دەچن بۆ بەخێرهێنانەوەیان. بەڕاستی پێویستە کەچاوەڕێ ی هیچ دەست و دیاریەك نەبن. چونکە ئەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆ وەکو جاری جاران نی یە، کەحاجی لەگوندێکی بچکۆلەی چەند ماڵی دا بتوانێ دیاری بۆ هەمووکەس بهێنێ بەڵکو ئەمڕۆ بازنەی ناسیاوی وتێکەڵی بەشێوەیەك فراوان بووە. کەئەگەر مام حاجی، ئەوەندەی لەحەجەکەی خەرجی کردوە، بایی ئەوەندەش زیاتر دیاری لەگەڵ خۆی بۆ ناسیاوو خزمانی بێنێ. هێشتا هەربەش ناکات وخەڵکێکی زۆری لێ دڵگران دەبێ!! لەکاتێکدا بۆیە چوبوە حەج، دوای بەجێهێنانی ڕوکنی ئیسلامەتیەکەی. دڵی خەڵکی بەرامبەری پاك ببێتەوەو گەردنی خەڵکی ئازاد بکات وگەردنی ئازاد بکەن! لەبەرئەوە زۆر ناشرینە، ئەگەر کەسێك دەچێ بۆ بەخێرهێنانەوەی حاجیەك، بۆشت وەرگرتن چوبێ ودوای هاتنەدەرەوەی لەماڵەکەی بڵێ: حاجیەکی ووشك بوو. خۆهیچی نەهێنا بوو. یان جا ئەوە هەدیەو دیاری حاجی یە؟ خۆبەکەڵك نایەت و زۆر هەرزانە لەبازاڕ!!! لەڕاستی دا ئەم عادەتەی کوردەواری ئێمە پێچەوانەی وڵاتانی دونیایە. کەلەزۆربەی وڵاتانی دونیادا، خەڵکی کەدەچن بۆ حەج، ئەوانەی کەدەچن بۆ بەخێرهێنانەوەی دیاری بۆ دەبەن ویارمەتی دەدەن. نەك دیاری لێ وەرگرن و مەصرەفی پێ بکەن. پاشان خۆ جگە لەئاوی (زمزم) کە ئەگەر بەپاکی بهێنرێتەوە، پیرۆزە و (إن شاءالله) هەرکەس بەهەر نیەتێك بیخواتەوە. بۆی دەبێتە شیفاو بەدیهێنانی ئاواتە خێرەکەی. ئەوی تری هیچی پیرۆز نییەو جێگای داخ بۆ خواردنە. هیچی بەدەستی موسڵمان دروست ناکرێ وهەر لەکڵاوی سپی حاجیەکەوە، تا کامێرای نیشاندانی دیمەنی کەعبەو بەردە ڕەشەکەو مەوقیفەکانی حەج. هەمووی لەسەری نوسراوە (**Made in China**) لەوڵاتی (صین) دروستکراوە، کەدەوڵەتێکی کۆمەنیستیە!!! کەبەڕاستی بەبینینی ئەمە، نەك موبارەك نابین، دەبێ بەزەیمان بەخۆمان و بەحاڵی موسڵمانانەدا بێتەوە!!..

بەڕێزان: خاڵێکی پێویست کەدەبێ موسڵمانان لێ ی بەئاگابن. ئەوەیەکە، ئەگەر کەسێك هەدیەو دیاری پێشکەش بەکەسێك کرد، حەرامە لێ ی بسەنێتەوە.





بەبەڵگەی ئەو فەرمودەیەی کەپێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: (العائِدُ في هِبَتِهِ كالْعائِدِ في قيئِهِ). رَواهُ أبُوداود. ئەوکەسەی کەلەهەدیەو بەخشین پەشیمان ببێتەوەو بیگێڕێتەوە بۆخۆی، وەکو ئەوکەسە وایە، کەبڕشێتەوەو پاشان دەم لەڕشانەوەی خۆی بنێتەوەو بیخواتەوە. کەبێگومان خواردنەوەی ڕشانەوەش حەرامە..

تەنانەت لەشەرعدا دەفەرموێ: ئەگەر کەسێك شتێکی بەکەسێك بەخشی، یان بەدیاری پێشکەشی کرد. ئەوە نابێ بەهیچ شێوەیەك جارێکی تر لێ ی وەربگرێتەوە.

تەنانەت ئەگەر بەکڕینیش بێت لێی. هەروەکو لەهەردوو صەحیحی (بوخاری ومسلم)دا هاتوەکە: حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب دەفەرموێ: ئەسپێکی زۆر چاکم دا بەیەکێك لەتێکۆشەرانی ڕێگای خودا، کەجیهادی دژی کافران لەسەر بکات. پاش ماوەیەك بیستم کەئەو کەسە دەیەوێ ئەسپەکە بفرۆشێ. لەدڵی خۆمدا ووتم: ئەسپەکە. ئەسپی چاکەولەوەدەچێ بەنرخێکی هەرزان بیفرۆشێ. لەبەرئەوە با بۆخۆم لێ ی بکڕمەوەو خەڵکی بەهەرزان لێ ی نەکڕن و من حەقی تەواوی خۆمی دەدەمێ و سودمەندیش دەبم لەئەسپەکە. بەڵام پێش ئەوەی قسەی لەگەڵ بکەم پرسم بەپێغەمبەری خوا کرد ﷺ. خۆشەویست ﷺ فەرموی: (لاتَشْتَرِه، وَلاتَعُدْ في صَدَقَتِكَ، وَإنْ أعْطاكَهُ بِدِرْهَمٍ، فَإنَّ العائِدَ في صَدَقَتِهِ، كالْعائِدِ في قَيْئِهِ).

واتە: لێ ی مەکڕەوەو بەخشینەکەت مەگێڕەوە بۆلای خۆت، با بەیەك دیرهەمیش پێت بفرۆشێ. چونکە ئەو کەسەی کەبەخشینی خۆی بگێڕێتەوە بۆ ژێر موڵکیەتی خۆی. وەکو ئەو کەسە وایە، کەبڕشێتەوەو پاشان بڕواتەوە سەر ڕشانەوەکەی ودەمی تێ بنێ و بیخواتەوە!! بەڵام ئەگەر باوك شتێکی دا بەئەولادی خۆی. بەهەدیەو دیاری یان بەبەخشین، ئەوە بۆی هەیە لێ ی وەربگرێتەوەو ئەو بەرئەو حوکمە ناکەوێت!.

ئەوەی کەماوە لەبارەی هەدیەو دیاریەوە کەبیڵێین ئەوەیەکە:

خەڵات و دیاری لەبیربونی بەرامبەر دەسەلمێنێ، هەموو لەبیربونێکیش مانای خەم خواردن — پەرۆش بوون — دەگەیەنێ. هەموو ئەوانەش خۆشەویستی دەسەلمێنێ، خۆشەویستیش هەوێنی ژیان وخۆراکی ڕۆحە. بۆیە زۆر گرنگە ودانا وحەکیمە پێشووەکانی کورد گوتوویانە: (دیاری شوان یان شنگە یان هاڵە

کۆکە).

کەواتە: بەئەندازەی توانای خۆت وبەپێ ی پێویست، مەرج نیە کەڤەرز بکەیت بۆ کڕینی دیاری، یان لەسەفەرێکدا کەدەگەڕێیتەوە، جانتایەکی تایبەت بکڕین بۆ دیاری.

جا بۆئەوەی دیاریەکەت ئامانج داربێت وخۆشەویستی دروست بکات وئەگەر پێویستیش بوو، جێگایەك پڕکاتەوە. سەیری ئەم حاڵەتانەی خوارەوە بکە وبزانە هەریەکەیان جۆری دیاریەکەی جیایە، لەوانە:

* دیاری بۆ نۆ ماڵی، زیاتر پێداویستی پێك هێنانی ماڵەکەیە، نەك جوانکاری بەتایبەت بۆ کەم دەسەکان.

* دیاری بۆ نوسەر، زیاتر قەڵەم وکتێبە تاشتی ترو هەندێك جار بەپێ ی پێویستی نووسەرەکەیە..

* دیاری بۆ پیاوی دەوڵەمەند، زۆرجار شتی ڕەمزی یە.

* دیاری بۆ پیاوی گەورەو پلەدار، بریتی یە لەشتی ڕەمزی (وەك شت ومەکی بەدەست دروستکراوی وڵاتەکەت. قەڵەمی تایبەت، کتێبی تایبەت).

* هەر وڵاتێك یاسایەکی هەیە بۆ ڕادەی قیمەت وبەهای دیاری ونابێت لەو ڕادەو بەهایە دەرچێت. ئەگینا دەبێتە موڵکی دەوڵەتو ئەو دەزگایەی ئەوکەسە (دیاری پێ بەخشراوە) کاری تێدا دەکات، پاش تەواوبونی پۆستەکەی. وە بیانیەکان بەشێوەیەکی گشتی حەزیان لەتابلۆو شت و مەکی کلتوریەو ئەو شتانەیە کەبەدەست دروست دەکرێن. وە کەم وزۆری لای ئەوان گرنگ نی یە.. وە هەروەها لای بیانیەکان پێچانەوەی دیاری وبەرگی جوان و لەسەر نووسینی، کۆمەڵێك نەتەکێتن لای ئەوان و گرنگی و بایەخی خۆی هەیە.

لەکۆتایی دا: لەخەڵات ودیاری دا، بەخیل وچروك مەبە وکەم ئەرزش سەیری مەکە. بانرخەکەشی کەم بێت. چونکە بەهای دیاری زیاتر مەعنەویە، تامادی بێت..





**سەرچاوەکان**

١- منهاجُ الصّالِحين في الآداب الإسْلامِيَّة ، محمد عبدالعاطي بحيرى ، ص٥٥٥.
٢- ئادابی کۆمەلایەتی ، نەوا محمد سَعید ، ل١٠٩.
٣- يَسْأَلُونَكَ ، د.حِسام الدِّين عَفّانه ، ج٣، ص٢٥٤، ص٤٦٢.
٤- قِصَصُ الأنبياء ، عَمروُخالد ، ص٤٢٠.
٥- المُسْتَفاد من قِصَص القُرْآن ، د.عبدالكريم زيدان ، ج١، ص٤٣٧.
٦- وَقَفاتٌ في حَياة الأنبياء، خالِد عَبْدُالعَليم ، ص٢٦٣.
٧- أَخْلاق المُسْلِم، عَلاقَتَهُ بالنَّفْسِ وَالكَوْنِ ، د.وَهْبَة الزُّحَيلى ، ص٢٥١.
٨- بیست ڕایەڵی مرۆڤ دۆستانە ، م.محمد ڕەئوف ل٤١.

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجْمَعين.

ئیمانداران: لەووتارەکانی ڕابردودا باسی ئەوەمان کرد، کاتێ کەئیسلام دەفەرموێ نابێ مرۆڤ حەرام بخوات. کۆمەڵێ ڕێگاشی داناوە، کەئەگەر مرۆڤ جێبەجێیان بکات توشی حەرام خۆری نابێ و ئەگەر حەرام بێتە بەردەمیشی پاڵی پێوە دەنێ.

یەکەم: بونی قەناعەتی شەرعیانە بوو، کەلەووتاری ڕابردوتردا باسمان کرد.

دووەم: کەبابەتی ئەمڕۆمانە، (إن شاءالله). تێگەیشتنە لەمەسەلەی ڕزق و ڕۆزی. چونکە ئەگەر بەوردی سەرنج بدەی، زۆرێك لەموسڵمانان هی ئیمان کزی نیە کەحەرام دەخۆن. بەڵکو هۆکارەکەی زیاتر باش تێنەگەیشتنە لەمەسەلەی ڕزق وڕۆزی.

سەرەتا دەڵێین: پێویستە موسڵمان نەخشەیەکی ڕێکوپێك و تێگەیشتنێکی واقیع بینانەی هەبێت (دوور لەخەیاڵ) بۆ ئەوەی بزانێ چۆن هەوڵ بۆ ژیان و هەوڵ بۆ قیامەت بدات.. چۆن خۆی لەئیسراف بپارێزێ ولەهەمان کاتیشدا، تەممەڵی یەخەی پێ نەگرێت... چۆن هەوڵی کاسبی حەلاڵ بدات و دونیاش لەخشتەی نەبات. چۆن خۆی لەحیرص و تەماع وچاوشۆڕی وزەلیلی بپارێزێ.. ئەوەش کەئەم نەخشەیەی پێ یەو وەڵامی هەموو پرسیارەکان دەداتەوە: ئاینی پیرۆزی ئیسلامە. چونکە موسڵمانی خاوەن عەقیدەی پاك و پاڵفتە، لەبابەتی ڕزق و ڕۆزیدا ئەوەندە ئاگادارەو یەقینی تەواوی بۆ دروست بووە کە ڕزق و ڕۆزی تەنیا بەدەستی خوایەو لەدەستی هیچ کەسێکدا نی یە. بۆیە چاوەڕێ ی ڕزق وڕۆزی تەنها لەخوا دەکات و ئەگەر کەسێکیش لەوپێناوەدا یارمەتی دا، دوعای خێری بۆ دەکات. بەڵکو بەو بۆنەوە ئەوکەسەش بکەوێتە بەرشالاوی ڕەحمەتی خوا. نەك وابزانێت بەو دەژیت. یان کاروباری بەو بەڕێوە دەچێت!...

ئیمانداران: خوای پەروەردگار، لەقورئانەکەیدا، لە (١٢٣) جێگای ئەو قورئانەدا باسی ڕزق و ڕۆزی مرۆڤ وهەموو دروستکراوەکانی کردوە. لەتەواوی ئەو هەموو جێگایانەدا. بۆیەك جاریش ئاماژە بەوە نەکراوە، کەڕزق وڕۆزی غەیری (الله) کەسێکی تر. دەسەڵاتی تێ ی دا هەبێ. چونکە ڕۆزی دەر تەنهاو تەنها هەردەبێ خالیق و دروستکەربێ، ئیتر چۆن مەخلوق دەبێ بەڕازیق؟!

سەرنجی قورئان بدەن کەدەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ﴾ الروم: ٤٠
واتە: زاتی (الله) ئەو پەروەردگارەیە کەهەموتانی دروست کردوەو پاشان ڕزق و ڕۆزیشی داون.. سەرنج بدەن (رَزَقَ) بەصیغەی فعلی ماضي ڕابردوو، هاتوە.
واتە: بژێوی ژیان و ڕزق و ڕۆزی ڕابردوەو لای خوا بڕاوەتەوە. هەر لەگەڵ دروست بوونی هەر مەخلوقێکدا، خالیق کە (الله) یە ڕزق و ڕۆزیەکەشی بۆ دیاری کردوە..
وە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿ هَلْ مِنْ خَٰلِقٍ غَيْرُ ٱللَّهِ يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ فاطر: ٣
واتە: ئایا چ دروستکەرێك جگەلە (الله)، ڕزق وڕۆزیتان دەدات لەئاسمان و زەوی دا؟!

جا سەرنج بدەن: دەفەرموێ: (هَلْ من خالِقٍ؟) نافەرموێ: (هَلْ من أحَدٍ؟) یان: (هَلْ من مَخْلُوقٍ؟) کەخوای گەورە لەمەوە پێمان دەفەرموێ: ڕۆزی دەر تەنها دەبێ دروستکەربێ. کەواتە: (لاخالِقَ إلا اللهَ، وَلارازِقَ إلا اللهَ).
وە لەقورئاندا ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێ، کەخوای گەورە ڕۆزی دانی هەموو مەخلوقاتی (حەصر) کردوە لەسەرخۆی. وەکو دەفەرموێ:
﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ﴾ الذاريات: ٥٨
خۆ ئەگەر خوای گەورە بیفەرموایە: (إنَّ اللهَ رَزَّاقٌ). هەرماناکەی تەواو بوو. بەلاَم بۆیە (ضمیری) (هو)ی بەکارهێناو فەرموی. (هُوَ الرَّزاقُ)
واتە: تەنهاو تەنها خوای گەورە هەرخۆی ڕۆزی دەرەو ئەی مرۆڤ نەکەی هیچ کەس و شتێکی ترت بێتە خەیاڵەوە. کە لەگەڵ خوای گەورەدا ڕۆزی بدات. نەخێر، تەنهاو تەنها هەرخوای گەورە ڕۆزی دەدات! وە پێویستی بەهیچ یارمەتیدەرو هاوبەشێك نیە.
ئیمانداران: هەرلەخزمەت قورئانداین، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبًا وَقَضْبًا ﴿٢٨﴾ وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا ﴿٢٩﴾ وَحَدَآئِقَ غُلْبًا ﴿٣٠﴾ وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴿٣١﴾ مَّتَٰعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَٰمِكُمْ ﴾
عبس: ٢٤-٣٢

مانای ئایەتەکان بەکوردی: دەبا ئادەمیزاد سەیری خواردنەکەی بکات وسەرنجی بدات وبیری لێ بکاتەوە. بێگومان ئێمە ئاومان بۆ داباراندۆتە





خوارەوە، چۆن داباریننێك. لەوەودوا زەویمان بۆ لەت لەت کردوە. بەچەکەرەی ناسکی ڕووەك. ئینجا دانەوێڵەمان تێدا ڕواند. هەروەها تریێ وسەوزەوات، هەروەها زەیتون ودارخورماش باخچەی دەورەدراو بەخوما، یان درەختی تر، یاخود باخی چڕ وپڕ. جۆرەها میوە هاوڕێ لەگەڵ هەموو ئەو گژوگیایانەی کەخوا کردە ومالأت دەیخوات لەلەوەڕگاکاندا. هەموو ئەمانەمان ئامادە کردوە، تاخۆتان ومالأتەکانتان سوودی لێ وەربگرن..

جاسەرنج بدەن، خوای گەورە ئاگادارمان دەکاتەوەو دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزاد تەماشاکە ئەو پاروەنانەی کەیخۆی هەروا بەئاسانی دروست نەبووە. بەڵکو:

١- أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا: جابیربکەرەوە ئەو بارانەی لەئاسمانەوە دەبارێتە سەر زەوی بۆ فەراهەم هێنانی ڕۆزی ئادەمیزاد وهەموو زیندەوەران، خۆهەر لەخۆوە بەڕێکەوت نابارێتە سەرزەوی. (تەماشای بەهەڵم بوون وخەست بونەوە وهەورو باو، هەوری سارد و گەرم و بەرز نەبونەوەی سوێری ئاوەکە لەگەڵ هەڵمەکەدا) بکە، خۆئاشکرایە ئەو ئاوە سەلیقەو ژیریەکی وەهای نیە، ئاگاداری حاڵی سەرزەوی بێت.

کەئادەمیزاد بۆ باران داماوەو زۆری پێویستە. تائەویش بەزەیی پێدابێتەوە وببارێت. دەی کەواتە: ئەو بارانە بەهێزو وویستی دەسەڵاتدارێك دەبارێت.. لەساڵانی شەستەکاندا، لەڕێگەی ڕۆژنامەو ڕادیۆوە بڵاودەکرایەوە کە: (کۆمپانیا هەیە لەئەمریکا باران دەفرۆشێ، کەچی دەیان وسەدان کەس لەخاوەن زەویەکان، کەکڕیاری باران بوون لەکۆمپانیاکان، بۆیان دەرکەوت ئەو هەواڵە ناڕاست بوو، بۆیە سکاڵا گەیشتە نەتەوەیەکگرتوەکان و سەرەنجام کۆمپانیا باران فرۆشەکان. ڕایانگەیاند: باران بارین لەڕێگەی مرۆڤەوە قسەیەکی ساختەکارانەیەو دوورە لەڕاستی یەوە!..

(د.فوت) کەزانایەکی کەشناسیە ووتی: بەهۆی تەکنەلۆژیای پێشکەوتوەوە گەیشتوینەتە ڕادەیەك کەدەزانین بەیانی پلەی گەرما چەندە. ڕادەی شێ و پاڵەپەستۆی هەوا چەندە. بەڵام مەسەلەی باران جێگیر ناکرێ.

کەواتە: باران ڕزقە لەلایەن خواوە بۆ سەرزەوی دەسەڵاتی هیچ کەسی تێدانیە. بەم شێوەیە ئەم ئایەتە تێمان دەگەیەنێ. لەبارینی بارانەکەدا، تەنها

(الله) دەسەڵاتدارە.

٢- ثُمَّ شَقَقۡنَا ٱلۡأَرۡضَ شَقّٗا: ئەو گڵەش کەبارانەکە لەخۆی دەگرێ وگژوگیاو ڕووەکەکانی پێ سەوز دەبن، ئەو گڵەش زۆر لەوە دورە، کەشەفەقەت و سۆزی بۆ ئادەمیزاد بجولێت و بەزانین و توانای خۆی ڕۆزی بۆ مرۆڤ ئامادە بکات!

کەواتە: ئەویش خۆی قلیش ودرزی تێ نابێت، بۆ هاتنەدەرەوەو سەوزبونی ڕووەکە جۆربەجۆرەکان، بەڵکو دەسەڵاتدارێك فەرمانی پێ دەکات کەدرزی تێ ببێت ونەو چڵە گیانەرمە کە ئەڵێی ی داوی دەزووە لەباریکی دا. کەچی بەئاسانی ئەو خاکە هەڵدەتەکێنێ و دێتەدەرەوە. کەئەو زاتەش تەنها (الله) یە، کەخالیقە.

٣- فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا حَبّٗا وَعِنَبٗا وَقَضۡبٗا ... الخ، (سُبْحانَ الله). هەربەو ئاوی بارانە. هەر لەو زەوی یە. ئەو هەموو بەرهەمە جیاوازە دێتەبوون. هەریەکەی باڵایەك، هەریەکەی تامێك، هەریەکەی هی وەرزێك، هەریەکەی بۆ شوێنێك. ئەوەتا خوای گەورە لەئایەتەکەدا باسی زەیتون و خورماو ترێ وسەوزەو میوەهات دەکات. بۆ ئەوەی سەرنجمان ڕابکێشی. کەچۆن خورما، باڵای بەرزە. باشە خورما بەو باڵا بەرزیەیەوە ئەگەر لەتەختایی بیابان نەبوایە ولەسەر لوتکەی شاخێك بوایە، کێ دەیتوانی بەئاسانی و سەلامەتی بچێتە سەری وبەرهەمەکەی لێبکاتەوە؟! (سبحان الله) کاری خوا چەند جوانە. ئەگەر خورما ئاوا بەرز نەبوایە. ودرەختێکی باڵا کورت بوایە ئەوا خورمایەکەی لەتەپ و تۆزدا بەکەڵکی خواردن نەدەماو ئەو هەموو جرو جانەوەرو حەشەراتەی لەبیاباندا هەیە، هەر بەفەریکی دەیانخواردو نەیاندەهێشت پێ بگات و مرۆڤ لێ ی سودمەند بێ. کەچی ترێ کەلەناوچە کوێستانەکان دەبێ، باڵای کورتەو بەئاسانی مرۆڤ لێ ی دەکاتەوە. وە هەروەها چونکە ئاووهەوای پاك وبێ تۆزە بەرهەمەکەی پیس نابێ وحەشەراتی کەمە ولەناو ناچێ!!

سەرنج بدەن: شوتی وکاڵەك بەرهەمێکی هاوینەیە ولە گەرمیان دەبێت. چونکە لەهاویندا پێویستیت بەخواردنی کاڵەك و شوتی یە. بۆئەوەی ئەو برە ئاوەی بەهۆی گەرماوە، لەلەش دەچێتەدەرەوە. بەهۆی خواردنی کاڵەك و شوتی







یەوە كەنزیكەی (٩٠٪)ی ئاوە پڕببێتەوە، سەرەڕای وەرگرتنی چەندین جۆری ڤیتامین. بەڵام گوێز بەرهەمێكی پایزیە ولەناوچەی كوێستان دەبێ، چونكە خەڵكی ئەو ناوچە كوێستانیانە. لەوشوێنە ساردانەدا، لاشەیان زیاتر پێویستی بەووزەو چەوری هەیە. كەخوای گەورە باشترین چەوری وماددەی ووزە بەخشی لەكاكڵی گوێزدا دروست كردوە، كەبەهۆی خواردنی ئەو گوێزەوە، دانیشتوانی ئەو شوێنە ساردو بەفراویانە. لاشەیان بەرگەی سەرما دەگرێت. پاشان ئەگەر بێتو شوتی بەدارگوێزەوە بوایە. ئەوە لەجیاتی سودمەندی، دەبویە مایەی ناڕەحەتی وهەرشوتیەك بكەوتایە خوارەوە وبەرهەركەس بكەوتایە. لەناوی دەبرد. خۆ ئەگەر گوێزیش بەبڕكی شوتی وكاڵەكەوە بوایە. ئەوا هەر منداڵ هیچی نەدەهێشت وهەرزوو هەمووی لێ دەكرایەوە!!

پاشان سەرنج بدەن، سێو و پرتەقاڵ، بەرهەمی زستانەیە. چونكە ڤیتامین (C) تێدایە بۆ بەرەنگاربونەوەی ئەو نەخۆشیانەی بەهۆی سەرماوە توشی مرۆڤ دەبن!... دەی بەخوا دار ودرەخت و ڕووەكەكانیش زۆر لەوە دورن كەبتوانن بەروبوم و دانەوێڵەكان پێ بگەیەنن. گوایە خەمی ڕزق ورۆزی مرۆڤ وئاژەڵ دەخۆن!!

بەڕێزان: ئێمە كەلەم ووتارەدا ووشەی (ڕزق) بەكاردەهێنین، دەبێ بزانین كەمەبەستمان لەرزقی حەقیقی یە. چونكە ڕزق دووجۆرە:

١- ڕزقی حەقیقی: كەژیانی مرۆڤی لەسەر وەستاوەو بەبێ ئەوە ناژی ، وەكو نان و ئاو و هەوا وسێبەرو... هتد. خوای گەورە خۆی بەڵێنی ئەو ڕزقەی داوە كە لەهەموو بارودۆخێكدا مرۆڤ. وە تەنانەت هەموو گیانلەبەران، ئەو ڕزقەیان دەست دەكەوێت و لەبرسان نامرن. كەمرد ئەوە هی بێ ڕزقی نی یە. ئەوە ئەجەلی هاتوەو ژیانی تەواو بووە، ئەگەر تێر وتەسەلیش بوایە هەردەمرد. مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ لەم جۆرە ڕزقەیە كەدەفەرموێ: (إِنَّ الرِّزْقَ لَيَطْلُبُ العَبْدَ، أَكْثَرَ مِمَّا يَطْلُبُهُ أَجَلُهُ). حَديثٌ صَحيح، رَواهُ الطَّبَراني.

واتە: بەڕاستی ڕزق بەشوێن مرۆڤەوەیە، زیاتر لەوەی كەئەجەلەكەی بەشوێنیەوەیەتی. وە لەفەرمودەیەكی تردا دەفەرموێ: (لَو فَرَّ أحدكم من رِزْقِهِ أَدْرَكَهُ، كَما يُدْرِكُهُ المَوْتُ) رَواهُ الطَّبَراني بِإِسْنادٍ حَسَنٍ. واتە: ئەگەر یەكێ لەئێوە لەڕزقەكەی ڕابكات، ئەو ڕزقە هەرپێ ی دەگات. هەروەكو چۆن مردن لەبەری ڕابكەی، هەرپێت دەگات.

لەجیهانی ئاژەڵانیشدا هەروایە..

پێشەوا (إبنُ كثيرِ) له (البِدايَة والنِّهايَة) دا، (ج٦ ص٦٠٠) دەفەرموێ:

زانای گەورە. ئەبولحەسەنی بەصری نەحوی. ڕۆژێکیان لەگەڵ هەندێ له هاوڕێکانی دا، لەدەشتێکا دادەنیشن وکاتی نان خواردن دەبێت. سفرە ڕادەخەن ودەست دەکەن بەنان خواردن. لەوکاتەدا پشیلەیەك بەدەوروپشتیاندا دێت ودەست دەکات بەمیاو میاو، ئەوانیش شتێکی بۆ فڕێ دەدەن. پشیلەکە خواردنەکە دەبات وزۆری پێ ناچێ دێتەوە و دیسان خواردنی تری دەدەنێ وئەمجارەش دەڕوات وبەپەلە دێتەوە ودەست دەکاتەوە بەمیاواندن. ئەوانیش دەڵێن: ئەم پشیلەیە ئەم خواردنە هەموی بۆخۆی ناخوات. لەبەرئەوە ئەمجارەشیان خواردنی دەدەنێ وشوێنی دەکەون. دەبینن ئەوا ئەم پشیلەیە ئەو خواردنەی ئێستا وئەوەی پێشوشی هەموی هێناوە بۆ پشیلەیەکی کوێر کەلەپەنا دیوارێکدا لەونزیکانە، خواردنەکە ئەکات بەدەمی ئەم پشیلە کوێرەوە!! هەموو سەرسام دەبن بەم دیمەنە. شێخ ئەبولحەسەن دەفەرموێ: پاکی وبێ گەردی بۆخوا. ئەم ئاژەڵە، ئەم پشیلەیە. کەخۆی توانای گەڕان وسوڕان وپەیداکردنی بژێوی خۆی نەماوە. خوای گەورە ئەم پشیلە چاوساغەی چۆن بۆ موسەخەر (ژێربار) کردوە. لەگەڵ ئەو هەموو تەماحەی پشیلە بۆ خواردنی خۆی هەیەتی. کەچی خواردنەکە ناخوات ودەیخاتە دەمی ئەو پشیلەیەوە!! دەی ئیتر چۆن ڕزق وڕۆزی ئێمە نادات و ونانێرێ، لەکاتێکدا بەندەی ئەوین و بەندایەتی بۆ دەکەین ودەیپەرستین.



سەرنجی ئەم ڕوداوەش بدەن، کەلەم چەند ساڵەدا. لەکوردستانی خۆماندا ڕوی داوە. لەپارێزگای سلێمانی ولەگوندی (هەڵەدن) ڕوی داوە. (حاجی ڕەزا) ناوێك، لەسەرخەرمان خەریکی شەن کردن بوە. لەکاتی پشوداندا بینیویەتی وا زەردەواڵەیەك دێت دەنکە گەنم دەبات و چەندین جار دەڕواو دێتەوەو دەنکە گەنمی تر دەبات. بەبێ گومان زەردەواڵە گەنم ناخوات. بۆیە کاری ئەم زەردەواڵەیە سەرنجی مام حاجی ڕادەکێشێ و ناچار شەنەکەی دادەنێت و شوێنی زەردەواڵەکە هەڵدەگرێ.

دوای ئەوەی چەند جارێکی تر زەردەواڵەکە دەنکە گەنمی برد. بۆی دەرکەوت بەکۆمەڵێ دار ودەومنی ناوچەکەوە دەنیشێتەوە. حاجی دەچێ بزانێ زەردەواڵەکە ئەم دەنکە گەنمانەی بۆچی یە؟ دەبینێ واچوار بەچکە چۆلەکە (زەرنەقووتە)



ی بێپەڕووباڵ. دەمدەگەنەوەو زەردەواڵەی کۆنە دوژمنیان، هەرجارەی دەنکە گەنمێك دەخاتە زاری یەکێکیانەوە هەتا تێر دەبن، هەموو ڕۆژێ. ئەم زەردەواڵەیە ئەمە پیشەیەتی (بێگومان ئەم بەچکە چۆلەکانە، دایکیان بەهەرشێوەیەك بوبێ تێداچوەو هەر چاوەڕێ ی خواردنن، خوای گەورە ئەم زەردەواڵەی بۆ موسەخەر کردون ودەوری دایکیان بۆدەبینێ و (سبحانَ الله) وەکو دایکی خۆیان ئەمیش لێ ی تێك ناچێ، چونکە ئاشکرایە. ئەو بەچکە بچکۆلانە، هەمویان بەیەکەوە دەم دەکەنەوە! حاجی ڕەزا دەڵێ: هەتا چەند ڕۆژ من لەوێ بوم. ئەو زەردەواڵە خێرخوازەم دەبینی ئەوە پیشەی بوو. بەوکارە خێرخوازیە هەڵدەستا. بۆیە یەکەمجار کەبینیم بانگی حاجی عەزیزی خزمم کرد ووتم: وەرە تۆش بەچاوی خۆت بیبینە، نەوەکو دوایی کەباسم کرد، خەڵکی باوەڕم پێ نەکەن. حاجی عەزیزیش بەچاوی خۆی ئەو دیمەنە سەیرو سەرنج ڕاکێشەی بینی!. بەڵێ خوای گەورە خۆی فەرمویەتی: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا وَيَعۡلَمُ مُسۡتَقَرَّهَا وَمُسۡتَوۡدَعَهَاۚ كُلّٞ فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ﴾ هود: ٦.

واتە: هیچ زیندەوەرێك نییە. لەم زەویەدا، ڕزق و ڕۆزیەکەی لەسەر خوا نەبێت و ئاگادارە بەشوێنی حەوانەوە وشوێنی دەرچوونیان. هەمووشتێك تۆمارە لەدۆسیەی ئاشکرادا لە (لَوح المَحفوظ)دا..

٢- ڕزقی مەجازی: کەمرۆڤ پێویستیە لاوەکیەکان، بەپێویستی زەروری لەقەڵەم دەدات. ئەم جۆرە مەسرەفەی ژیان لەکەفالەت و بەڵێنی پەروەردگار دەردەچێت. ئەم جۆرە موسریفانە دواڕۆژیان ترسناکەو زۆرجار دەست لەدین هەڵدەگرن بۆ بەدەستهێنانی.

ئیمانداران: ئەوەی وا لەمرۆڤ دەکات، کەتوشی حەرام خواردن ببێ ئەوەیە: (حرص)ی هەیە لەسەر بەدەست هێنانی ڕزق وڕۆزی دا. (حرص)

واتە: ئامادەبێ بۆ بەدەست هێنانی ئەو برە پارەیە، سوێندی بەدرۆ بخوات، وەعدو بەڵێنی درۆ بدات. تەمەلوق بکات، مل کەچی خەڵکی خوانەناس ونامەردبێ، ماستاوچیەتی بکات. درۆبکات..

واتە: کاتێ هەوڵی بەدەست هێنانی ڕزق وڕۆزی دەدات. ئەوەندە سوربێ لەسەر بەدەست هێنانی، کەوانەزانێ ئەم هەرجولان وکاسپی کردنی لەسەرە. ئیتر سوربون لەسەرئەوەی هەردەبێ ئەو ڕزقەی بەنسیب ببێ، ئیشی ئەو نییە..

- خوای گەورە چەندین نموونەمان نیشان دەدات، تاتێ بگەین کەرزقی حەلاڵ بەهێزو توانای شان و باڵی خۆت و ڕاکەڕاکی لەڕادەبەدەر زیاد ناکات.. وە هەروەها ئاسان پەیداکردنی ڕزق بەستراوەتەوە بەکەم زانین وکەم دەسەڵاتیەوە. نەك بەزیرەکی و لێهاتویی یەوە.

بۆ نموونە: منالْ لەسکی دایکی دا پاکترین وچاکترین خواردنی هەیە، لەکاتێکا هیچ تواناو ئیرادەیەکی نیە بۆ بەدەست هێنانی خۆراکی خۆی. کەلەدایکیش بوو. لە بەربێ دەسەڵاتی وبێ توانایی ئەو منالە، کەلەجوجکی باڵندەو مەل بێ دەسەڵاتترە، بەسۆزو شەفەقەتی خوای خالیق ومیهرەبان، مەمکی دایکی بەوێنەی کانی شیری لێ دێتەدەر، وە کاتێ کەمنالْ برسی بوو. وە زمانی قسەی پێ ناکرێ تابڵێی برسیمەو دایکی خەریکی ئیش وکارەو لێی دورە. لەوکاتەدا شیر لەمەمکی دایکەکە دێتەخوارەوەو یەکسەر دایکەکە هەست دەکات کەمنالەکە برسیەتی!!

یان ئافرەتی واهەیە نابیستە (کەڕە) منالیشی هەیە. باشە خۆئەم دایکە گوێ ی لەهیچ نیە ونازانێ وامنالەکەی دەگری. ئالەم کاتەدا خوای گەورەو بەسۆز، کارێکی وای کردوە. کەئەم منالە هەست بەبێ نازی وکەم وکوڕی نابیستی دایکی نەکات.

ئەویش بەوەی کەهەرکات ئەم منالە گریا. ئەم دایکە، ئەگەر لەخەویشدابێ، دڵی تەپە تەپ دەکات وخێراتر لەجاران لێ دەدات و بەئاگادێتەوەودەزانێ نیشانەی ئەوەیە کەمنالەکەی برسیەتی. یان دەگری وپێویستی بەدایکیەتی!! بەڵێ منالْ تاکاتێ شیرە خۆرەیەو بێ توانایە. خوای گەورە ئەم شیری دایکەی بۆ دابین کردوە. ئەو شیرەی کەپاکترین خواردن، ناسکترین، خۆشترین خۆراکە بۆ منالْ، زۆر بەئاسانی هەزم دەبێ، بەپێ ی تەمەنی منالەکە ڤیتامینەکانی دەگۆڕێ، لە زستاندا گەرم ولەهاویندا فێنکە، کەددانی ڕواو نانی بۆخوراو جوڵە وهەڵس وکەوتێکی پەیداکردو داوای خواردنی کرد. خوای گەورە ئەم کانیە، کەشیری دایکە، ووشکی دەکات، بەڵام دەرگای تری لێ دەکاتەوە. ددانی بۆ دەڕوێنێ کەخۆراکی پێ بخوات. گەدەو ڕیخۆڵەکانی بەهێز دەکات کەتوانای هەرسی خواردنەکەیان ببێ، ئەمجا سۆزو خۆشەویستی لەڕادەبەدەر دەخاتە دڵی باوك ودایکیەوە. کەپاروو لەدەمی خۆیان دەگرنەوە ودەیخەنە دەمی منالەکەیانەوە. جاران هەردایکی خەمی تێرکردنی دەخوارد وباوك هیچی بۆ





نەدەكرا. ئێستا باوكیش وەكو دایك لەخەمی خۆراك پێدانی كۆرپەكەیدایە .. كاتێ دایك وباوك دەبینن منداڵەكەیان لەسەر سفرە نان دەخوات و زۆرجار هەتا ئەو تێرنەكەن، خۆیان هیچ ناخۆن، ئەوا چێژ لەوە وەردەگرن. كەمنداڵەكەیان دەیخوات. زیاتر لەوەی كەخۆیان دەیخۆن .. كەچی هەرئەم منداڵەیان، كەتەمەنی منداڵی ترازاو گەورە بوو، توانای كار وكەسابەتی پەیداكرد، ئەمجا دایك و باوك لێ ی تورە دەبن، لەسەرئەوەی كەبۆچی بۆخۆی هەوڵێك نادات و پارویەك نان بۆخۆی پەیداناكات. خۆئەمە هەرمنداڵەكەی سالانی ڕابردوە. ئەی بۆچی ئەوسا ئاوابوون بەرامبەری وئێستا ئاوان؟! ئەوە سۆز ومیهرەبانی خوای پەروەردگار بوو. كەلەوكاتەدا خستبویە دڵی ئەو دایك وباوكەوە، كەتامنداڵەكەیان تێرنەكەن، خۆیان نان نەخۆن ..

كەواتە: مرۆڤ تاگەورەتر وبەهێزتر بێ، دەبێ هەوڵ و كۆششی زیاتر بدات و خۆی زیاتر ماندوو بكات. تارزق و بژێوی ژیانی خۆی دابین دەكات.

نموونەیەكی تر: زۆربەی زاناو ئەدیب وشاعیرو فەیلەسوفەكانی جیهان، زیرەك و بەهرەمەند وبلیمەتەكانی دونیا، لەوپەڕی هەژاری دا دەژین. ژیانێكی هەژارانە وكەم و كورت بەسەردەبەن. كەچی زۆرێك لەگێل ونازیرەكەكان دەوڵەمەندی ناودارن، یان: شایەرو گۆرانی بێژو نوكتەبێژ، كەزمانیان شەو ورۆژ ڕاناوەستێ و بەشان و باڵی ئەم و ئەودا هەڵدەدەن و چاوەڕێ ی شاباشێكن، دەبینی تەواوی ژیانیان، هەرچاو لەدەست وموحتاجن و بەزەلیلی دەژین.. كەچی هی واهەیە ناتوانێ لەمەجلیسێكدا دوو قسە بكات. كەچی بەلێشاو پارەی دەست دەكەوێ!

ئەمە هەموی دەبینین تا ئەو ڕاستیە بسەلمێ: كەزۆر وكەمی ڕزق بەزیرەكی ولێهاتویی مرۆڤەوە نەبەستراوەتەوە. بەڵكو بەبێ دەسەلاتی وهەژاری وقەناعەت وتەسلیم بوون و پشت بەخوا بەستن دەبێت... بازرگانەكان تاقیان كردۆتەوە زۆرجار بووە، هەوڵێكی یەكجار زۆریان داوە بۆ بەدەست هێنانی ڕزقێك، پارەیەك، سامانێك... یان بازرگانیەكی گەورەیان ئەنجام داوەو ئومێدی قازانجی زۆریان لێ كردوە. كەچی ئەو مامەڵەیان زۆركەم قازانجی كردوە. جاری واش هەبوە، كەمتر چاوەڕێ ی بەدەست هێنانی ڕزقێكیان كردوە. یان ئومێدی قازانجی كەمیان لێ كردوە. كەقازانجێكی زۆری كردوە!..

زانای بەناوبانگ. (د.محمد راتب النابلُسي) لەكتێبە پڕ بەرەكەتەكەیدا:

(موسوعَة أَسْماء الله الحُسْنَى). ج٧ ص٢٤١ دەفەرموێ: لەجەنگی جیهانی دووەمدا، یەکێ لەدوکاندارەکان بەقەرزو قۆڵە شەکرێکی زۆری کڕی بوو. وە مەخزەن و دوکانەکەی لێ پڕ کردبوو. بەئومێدی ئەوەی لەوکاتی جەنگەدا سودمەندبێ لێ ی و قەرزەکان بداتەوەو شتێکی باشیش قازانج بکات. ئەوەبوو شەکر. بەهۆی جەنگەوە وەکو هەرپێداویستیەکی تری خەڵکی نرخی بەرزبۆوە. بەڵام قەدەغەبوو. کەلەنرخی دیاری کراو زیاتر بفرۆشرێ، ئەم دوکاندارە بەنرخی زیاتر لەوەی کەحکومەت دیاری کردوە. فرۆشتبوی بەخەڵکی، چونکە هەرلای ئەم دەست دەکەوت وخەڵکیش پێویستیان بەشەکربوو. تائەوەبوو. دوو سێ جارێك ئاوا بەنرخی زیادە فرۆشتبوی. ئەوەبوو لەلایەن حکومەتەوە ئاشکرابوو، وە دادگا بڕیاری دا دوکانەکەی بۆ ماوەی چەند مانگێك دابخرێ ومەخزەن ودوکانی پڕ لەشەکر لەلایەن ئاسایشی ئابوریەوە بەمۆمی سور داخراو نیشانەکرا. بۆ ئەوەی کەئەگەر کردیەوە مۆمەکە بشکێ ودووبارە سزای قورستری بۆ دابنێنەوە! کابرای دوکاندار بەمە زۆر دڵناڕەحەت دەبێ، بەڵام چەند مانگێکی کەم دوای ئەوە جەنگ کۆتایی پێ دێت و ئەمیش وەختی کرانەوەی دوکانەکەی دێت. بەڵام لەم کاتەدا، نرخی شەکر. سەد قاتی جاران بەرزببۆوە. هەرلەتەواوی جیهاندا نرخی بەرزببۆوە. بەڵێ ئەمیش یەك مەخزەنی گەورە شەکری هەبوو. بەمەمنونیەوە لێیان دەکڕی وئەوەندەی قازانج کرد سەدقاتی نرخەکەی خۆی. بەم شێوە لەپڕا، ئەوەندەی پارە دەست کەوت. کەئەولادی ئەولادیشی پێ دەوڵەمەند بوو، وە ئەم دوکان داخستنە بوو بەمایەی ئەو هەموو ڕزق ورۆزی یە فراوانە بۆی.

ئیمانداران: ئەگەر بیربکەینەوەو سەرنج بدەین دەبینین، کەڕووەك ودار ودرەختە بەردارەکان، کەئەوانیش جۆرێکن لەزیندەوەران و پێویستیان بەرۆزی هەیە وەکو تیشکی خۆر، ئاو، پەین. لەبەرئەوەی توانای جوڵەو هەڵپەیان نیە، لەشوێنی خۆیاندا بەسەری بەرزەوە قنج ڕادەوەستن وپشت بەخوای ڕۆزی دەر دەبەستن وخاوەنی قەناعەتی فیترین، ئەوا ئەو ڕۆزیەی کەپێویستیانە، بەوپەڕی تێرو تەسەلیەوە پێشکەشیان دەکرێت و چەند قاتی گیانلەبەر وئاژەڵەکان، ئەش ونما دەکەن و بەروبەرهەمی زیاتر پێشکەش دەکەن.

بەمانایەکی تر: دارودرەخت کەخۆیان ناجوڵێن. خوای گەورە وای کردوە ڕزق و ڕۆزیەکەیان بەرەو ڕوویان دەچێت!!

لەجیهانی گیانلەبەرو ئاژەڵەکانیش دا.



سەرنج بدەن، ئەو ئاژەڵ وگیانلەبەرانەی بەوپەڕی حیرص وسوربوون وهەڵپەوە بەدوای ڕزق و ڕۆزی دا دەگەڕێن، زۆر بەزەحمەت وبەوپەڕی ماندوبوون ونارەحەتیەوە ئەمجا بەکەم و کوڕی ونائارامی ڕۆزیەکەیان دەست دەکەوێت.

بۆ نموونە: شێر، پڵنگ، گورگ، پشیلە، هەڵۆ، داڵ. ئەمانە چونکە پشت ئەستورن بەهێزو هەڵمەت وچنگ ونینۆکی خۆیان وگوڕوتینیان وهەستی بەهیزیان. دەبینی، بەردەوام خەریکی گەڕان وسوڕانن و زۆر بەنارەحەت ڕاوێکیان بۆ دەکرێ وتابەژەمێك تێرن، بە (دە) ژەم برسین و هەمیشە چاوبرسین، ئاژەڵ وگیانداره بەسەزمانەکان شەو بەئیسراحەت دەکەون، بەڵام ئەم دڕندانە، شەو تابەیانی لەگەڕان وسوڕاندان وشەویش بەبرسیەتی دەکەنەوە. وە تەماشاکەن: گیانلەبەرە بەتواناو ڤێلاباز و زیرەك وخاوەن فرت وفێڵەکان وەکو مەیمون و ڕێوی، کەبەسەدان فرت و ڤێلا وخەڵەتاندن دەزانن، وە تەنانەت مرۆڤ و ئاژەڵەکانی تر دەخەڵەتێنن، کەچی هەمیشە کەم ڕزق وبرسی و لەڕوو لاوازن وتەنانەت ناوەکەشیان وەکو ڕەمزی سوکایەتی پێکردن دەبرێ. ئەوەتا مەیمون لەپێناوی مۆزێك و دەنکێ گوڵەبەڕۆژەدا، دەیان گاڵتەجاری وسەمەرەی پێ دەکرێ!

بەڵام سەیرکە: گیانلەبەرە بێ زیان وبەسەزمانەکان، بێ دەسەڵاتەکان، بێ چنگ و کەڵبە ونینۆکەکان. بەردەوام ڕزق وڕۆزیان بەئارەزوی خۆیان دەست دەکەوێ.

وە لەناو دەریاشدا: ئەو ماسیانەی کەبێ کەڵبەو ددانن و بێ دەسەڵاتن. زۆر بەئاسانی خۆراکیان دەست دەکەوێ.

بۆ نموونە: لەدەریا وزەریاکاندا، حوتی واگەورە هەیە. ئەوەندە گەورەیە ولاشەی ئەوەندە قورس بووە. کەناتوانێ لەجێگەی خۆی بجوڵ. لەبەرامبەر ئەودا. مێشولەی ناو دەریاش هەیە، کەئەوەندە بچوکە، هیچی پێ پەیدا ناکرێ.

ئەم دوانە — ئەم بەهێزەو ئەم لاوازە، کەئەمیان لەبەر قەڵەوی وگەورەیی. ئەمیشیان لەبەر بچوکی ولاوازی، ناتوانن خۆیان تێر بکەن وشتێ ڕاو بکەن. دێن لەناو خۆیاندا، ڕێکەوتننامەیەك مۆر دەکەن. حوتە گەورەکە دەڵێ: من ناتوانم جوڵەیەکی زۆر بکەم و بەدوای ماسی دا بڕۆم. وە پێویستیم بەوەیە. کەبەسەدان

ماسی بخۆم. لەبەرئەوە من خۆم بێ جوڵە دەکەم ودەمم دەکەمەوە. تۆش ئەی مێشولەی دەریا وەرە سەرلوتم. کەلەبەر بچوکیت، هیچ ماسیەك ناتبینێ، جا هەرکاتێ کۆمەڵە ماسی یەکی جوان و قەڵەو بەیەکەوە، هاتنە ناو دەممەوە، تۆ بەو دەرزیە تیژەت دەرزیەك لەلوتم بدە.

من تێدەگەم کەماسیەکی زۆر لەناو دەممدایە. یەکسەر دەمم دادەخەم وماسیەکان تێکڕا دەهاڕم وئەو ژەمە تێردەبم. دواتر دەمم دەکەمەوە و تۆ وەرە ناو دەمم وئەو پارچە گۆشتە بچوکانەی کەلەنێوان ددانەکانمدان، بۆخۆت بەئیسراحەت وبێ ماندووبوون بیانخۆ. بەم شێوەیە هەردوکمان تێر دەبین!!

بەڵێ ئیماندارى بەڕێز: تۆ هەوڵی خۆت بدەوکارو کەسابەتی حەلاڵی خۆت بکەو داوای ڕزق و ڕۆزی لەخوا بکەو قەناعەتت هەبێ وپشت بەخوا ببەستەو دەست بەکارو کەسابەتی خۆت بکە. بەڵام ئاگاداربە، خۆت بپارێزە لەداوی حیرص وتەماعکاری چونکە هەرئەوەت دەست دەکەوێ، کەخوا دیاری کردوەو تەنها ماندوبونت بۆ دەمێنێتەوە.

مامۆستا سەعید نەورەسی فەرمویەتی: مرۆڤی حەریص و تەماعکار، کەلەسنور دەرچوە. نمونەی ئەوکەسە. وەکو ئەو سواڵکەرە وایە، کەبەزۆر یەخەی خەڵکی دەگرێت ولەداواکردن کۆڵ نادات. خاوەنی حیرصێکی زۆرە، دەبینی خەڵك لێ ی بێزار دەبن و پێیان خۆش نی یە دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکەن. کەچی بۆ سواڵکەرێکی تر، کەبەقەناعەتەوە، بەبێ دەنگ دەست پان دەکاتەوە، سۆزیان بۆی دەجوڵو هەرکەسە پێ ی خۆشە بەپێ ی توانا یارمەتی بداتا...



بەڵێ ژیان وایە، مرۆڤ لەسەر هەرشتێ زۆر سور وحەریص بێ، زۆر بەناڕەحەت دەستی دەکەوێ.

بۆ نموونە: ئەو کەسەی کەحەز دەکات وهەوڵ دەدات کە چوە سەر جێگای خەوتن دەست بەجێ خەوی لێ بکەوێ، ئەوە چونکە سورە لەسەر زوو خەو لێ کەوتن. زۆربەی کات خەوی لێ دەرزێ و بەوپەڕی خەم و خەفەتەوە ئەم دیوو ئەو دیوو دەکات وخەوی لێ ناکەوێ. کەچی چەندین جار هەوڵ دەدەی خەوت نەیەت و لەبەرخەوەکە ڕادەکەی و دەم و چاو دەشۆی و چا دەخۆیتەوەو قسەدەکەی. کەچی هەرناگات لەخۆت نی یە. چۆن خەوت لێ کەوتوە.



دەی ڕزق وڕۆزیش بەهەمان شێوەیە. ئەوەی کەزۆر تەماحکارە ودەیەوێ لەپڕێکا دەوڵەمەند بێ وپارەیەکی خەیاڵی لەمانگێکا ولەمعامەلەیەکدا دەست بکەوێ. بەردەوام لەڕاکە ڕاك وماندوبوندایە وهەردەستیشی ناکەوێ. ئەوەش کەئەوەندە سور نی یەو بیر لەکەمێکی حەلاڵ دەکاتەوە، خوای گەورە چەند قاتی ئەوەی چاوەڕێ ی کردوە، لەڕزق وڕۆزی و پارەی حەلاڵ پێ ی دەبەخشێ..

کەواتە: بەهۆی سوربونتەوە لەسەر زوو دەوڵەمەند بوون، خۆت توشی حەرام خۆری مەکە.. دڵنیاشبە لەوانەیە فریانەکەوی ئەوەی هەتە بیخۆی، ئیتر بۆچی خەفەت بۆشتێك دەخۆی کەبەدەستت نەهێناوە.

هەر زانای گەورە (د.محمد راتب النابلسی) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ:

دووبرا دەبن. یەکیان دەمرێ و پێنج منداڵ لەدوای خۆی جێ دێڵێ، وە ئەم منالٚنە بەخێوکردنیان دەکەوێتە ئەستۆی مامیان. وە منالەکان هەمویان بچوك دەبن و توانای هیچ کار وپیشەیەکیان نابێ وهەم برا مردوەکە هیچی وای نابێ وهەم ئەوەشیان کەماوە. سامانێکی وای دەبێ، بەڵکو ڕۆژانە بەکرێکاری ژیانی خۆی دەباتەسەر. بۆیە هەموو جارێ کەسەیری ئەم پێنج منالە بێ باوکە دەکات و سەیری بێدەرامەتی و دەست کورتی خۆی دەکات ، دەست دەکات بەگریان لەدڵی خۆیا دەڵێ: باشە من ئەم پێنج منالە بەچی بەخێو بکەم؟!

ڕۆژێکیان مامۆستای مزگەوت ئەم پیاوە دەبینێ کەئاوا بەردەوام غەمبارو مەخرونەو چاو بەفرمێسکە. لێ ی دەپرسێ: بۆچی وا عاجزو غەمباری؟!

ئەویش باسی برازا هەتیوەکانی وحاڵ وگوزەران و دەستکورتی خۆی وئەوان باس دەکات. مامۆستاکە دەفەرموێ: باشە باوکیان هەرهیچ هیچی بۆ بەجێ نەهێشتون دوای خۆی؟! مامی منالەکان دەڵێ: بەڵێ مامۆستا، ئەوەی ڕاستی بێ، ئەوەندەی پارە لەپاش بەجێ ماوە کەئەگەر تایەك ساڵی تریش بیخۆن، بەشیان دەکات.

بەلام ئەی دوای سالەکە چیان لێ بکەم؟!! مامۆستای مزگەوتەکە دەفەرموێ: زۆرباشە، جارێ دڵشادو ڕوخۆش لەگەڵ منالەکان بژی وبابەگریان وغەمگینی تۆ، ئەوەندەی تر هەست بەبێ باوکی نەکەن. ڕووت لەخوابێ ودوای سالەکە، ئەمجا بگری و خەمی ڕزق و ڕۆزیان بخۆ. کەدڵنیابە ویەقینت بێ، نەئێستاو نەئەوساو نەهیچ کات، خوای گەورە پەکیان ناخات. ئیتر بۆ لەئێستاوە وابە

غەمباری ومات ومەلولی دەژی؟!.. بەڵێ، مامی مناڵەکان بەم ئامۆژگاریە جوان وبەجێ یەی مامۆستا، تۆزێ قەناعەتی هات و ڕۆژومانگ ڕۆیشتن و سێ مانگی تەواوی مابوو بۆ تەواوبوونی ساڵەکە. کەئەم مامە کت و پڕ مرد!! هێشتا پارەی سێ مانگ مابوو. کەمناڵەکان بیخۆن. مامیان مردو بەجێ ی هێشتن!..

بەڕێزان: پرسیارێك کەزۆر دەکرێ ئەوەیە: کەئایا خوای گەورە کە (العدل) ڕزق ورۆزی هەموو کەسی وەکو یەك داوە یان نا؟! وە ئایا هۆکاری زیادبوونی ڕزق ورۆزی چی یە؟ وەلامی ئەو پرسیارە هەڵدەگرین بۆ ووتاری داهاتوو. بەپشتیوانی خوای گەورە (إن شاء الله).

[اللّهُمَّ اغْنِنا بِحَلالِكَ عَنْ حَرامِكَ وَبِطاعَتِكَ عَنْ مَعْصِيَتِكَ، وَبِفَضْلِكَ عَمن سِواكَ]

اللَّهُمَّ آمِينَ



**سەرچاوەکان**

١- قورئانی پیرۆز.
٢- نامیلکەی ڕزق ورۆزی ، حبیب محمد سعید.
٣- خُطب الجُمُعَة ، نذير محمد المكتَبى.
٤- کۆباسەکانی میحراب، شەماڵ موفتی، ئامادەکردنی: عادل شاسواری ل١٠١.
٥- الخُطب المنبَرِيَّة ، محمد متولى الشعراوي ص٣٥.
٦- مَوْسُوعَة أسْماء الله الحُسْنَى ، د.محمد راتب النابلُسي، ج١،ص٢٣٩، ص٢٤١.



الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالمين ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى سَيدنا مُحَمْدٍ وَ عَلى آلهِ وَصَحْبِهِ أجْمَعين.

ئیمانداران: لەچەند ووتارێك لەمەوبەردا ، باسی حەلاڵ و حەراممان کرد ، ووتمان خەڵکی کە ئەهلی ئیمانەو حەرام دەخوات، زۆربەی هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ تێنەگەیشتنی ڕاست و دروست لە مەسەلەی ڕزق و ڕۆزی . لە ووتاری ڕابردوشدا باسی ئەوەمان کرد کە دوو پرسیار هەیە و (إن شاءالله) لەم ووتارەدا وەڵامیان دەدەینەوە، ئەوانیش:

١- ئایا ڕزق و ڕۆزی زیاد دەکات؟! ومبەچی زیاد دەکات؟! بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەڵێین: بەڵێ ڕزق و ڕۆزی زیاد دەکات بەدوو جۆر، جۆرێکیان زیادکردنیەتی لەڕووی ماددیەوە . کە بەچاو دەبینی کە چۆن پارەکە زیاد دەکات . ملك و ماڵت زیاد دەکات.

جۆرێکی تریان لەڕووی زیادکردنی بەرەکەتەوەیە، بەوەی کە خوای گەورە لەنەخۆشی وا دەتپارێزێ کە هەرچی هەتە لەلاشەی خۆتا یان خێزان و منالّتا خەرجی بکەیت. یان لە مەصرەف و خەرجی لابەلا دەتپارێزێ. کە ناچاردەبی بەهۆی ڕوودا و پێشهاتێکەوە خەرجی مانگێکت لەڕۆژێکدا خەرج بکەی. خوای گەورە لەو بەلایانە دەتپارێزێ و ئەو پارەیەت بۆ دەگەڕێتەوە .. بەڵێ هەریەك لەئێمە داوا دەکات، خوای گەورە ڕزقی زیاد بکات، دە بزانە و ئاگاداربە کە ڕزق بەچی زیاد دەکات. پەنا مەبە بۆ نوشتەی ناشەرعی بەمەبەستی زیادبوونی ڕزق و ڕۆزی، بەوە ڕزق زیاد نابێ.



وەرە گوێ بۆ قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بگرە بزانە ڕزق بەچی زیاد دەکات:

١- تەقوا. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ ﴾ الطلاق: ٢-٣.

واتە: هەرکەسێك لە خوا بترسێت و تەقوای خوا بکات. ئەوە خوای گەورە دەروی لێدەکاتەوە، لەشوێنێکەوە ڕزق و ڕۆزی پێ دەبەخشێت کە حیسابی بۆ نەکردبێت و خۆی پێی نازانێت.

وە لە قورئانی پیرۆزدا. خوای گەورە باسی خانمێکی موتەقیمان بۆ دەکات. کە ئەویش خاتوو (مەریەم)ی دایکی حەزرەتی عیسایە. کاتێك کەلە شوێنەکەی خۆیدا خەریکی خوا پەرستی بوو. جا هەرکاتێ کە حەزرەتی زەکەریا دەچوو بۆ سەردانی مەریەمە لەشوێنی خوا پەرستیەکەیدا، دەیبینی ڕزق و ڕۆزی جۆراو



جۆری لایە.

حەزرەتی زەکەریا فەرمووی: ﴿ يَـٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَـٰذَا ۖ قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾ آل عمران: ٣٧.

واتە: ئەی مەریەم ئەم هەموو رزق و رۆزیەت لەکوێ بوو؟! لەکاتێکدا لەم ژوورە نەچویتە دەرەوە و هەروەها ئەم میوەهاتە هی هاوینە و تۆ لەزستاندا لەلاتە. لەکاتێکدا لەهیچ شوێنێکدا دەست ناکەوێ؟! مەریەم لەوەلامدا فەرمووی: ئەوە لەلایەن خواوەیە، ئەو بۆم دەنێرێت. بەڕاستی خوای گەورە بە هەرکەس بیەوێت رزق و رۆزی بێ سنوور و بێ هۆکار دەبەخشێت ..

نمونەیەك لە ژیانی تابعین ، لەسەر ئەوەی کەهەر کەسێ بەڕاستی گوێڕایەڵی خوای پەروەردگاری بێت، خوای گەورە رزق و رۆزی بەبێ حیساب بۆ دەنێرێت ، ئەو زاتەش (ئەبو موسلیمی خەولانی) یە .. ئەوەبوو کاتی کە (ئەسوەدی کوڕی قەیسی عەنەسی درۆزن) لەیەمەنەوە، دیعایەی ئەوەی کرد کە ئەویش پێغەمبەرە و دەبێ خەڵکی شادەی پێ بێنن و لەدەوری کۆببنەوەو بەفەرمانی ئەو بجوڵێنەوە.

بەڵام کەسی وای لێ کۆنەبۆوە. بۆیە ئەوانەی دەوروبەری پێیان وت : ئەگەر بێت و زانای بەناوبانگ و خوا پەرستی ناودار، ئەبو موسلیمی خەولانی ، دان بنێ بەوەدا کەتۆ پێغەمبەری خوای، ئەوە خەڵکێکی یەکجار زۆر بڕوات پێ دەکەن و ئەبو موسلیم بەمانای هەزاران کەس!! بەڵێ لەهەموو سەردەمێکدا دوژمنانی خواو پێغەمبەر ﷺ خۆیان لەزانایانی ڕاستەقینەو میراتگرانی بەحەقی پێغەمبەران نزیك دەکەنەوە نەك لەبەر ڕێزگرتن و خۆش ویستن ، بەڵکو بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ئەوانەوە جەماوەر لەخۆیان کۆبکەنەوەو خەڵکە کە ئەو مەلاو زاناو پیاو چاکە ببینن. تەئیدی ئەو درۆزن و تاغوتە دەکات. ئەوانیش کە ئەو عالم و پیاو چاکە بە پێشەوای خۆیان دەزانن ، دەڵێن دیارە فلان کاربەدەست و فەرمانڕەوا و ڕژێمەکەی چاکە و لەخزمەت دیندایە. بۆیە شوێنی دەکەون .. بەڵێ (ئەسوەدی عەنەسی درۆزن) ناردی بەشوێن ئەم عالم و پیاو چاکەدا و پێی ووت: (أَتَشْهَدُ أَنّي رَسُولُ الله؟!) ئایا شایەتی دەدەی کە من پێغەمبەری خوام؟! ئەبو موسلیم فەرمووی: (ما أسمعُ!!). گوێم لێ نیە دەڵێی چی! (ئەسوەدی عەنەسی) چەند جار ئەو پرسیارەی دووبارە کردەوە: کە ئایا

شایەتی دەدەی کەمن پێغەمبەری خوام ﷺ؟! ئەبو موسلیم هەر دەیفەرموو: (ما أَسْمَعُ!!) گوێم لێ نیە!! ئا ئەمە تەقوایە. کە ئەم پیاو چاکەئەوەی فێرکردین کە ئێمەی موسوڵمان هەرگیز، هیچ کات و هیچ زەمان و لەهیچ زەمینێکدا و لەهیچ بارودۆخێکدا گوێمان لەقسەی دوژمنانی ئیسلام نیە.

سەرنج بدەن ئیمانداران. ئەبو موسلیم نەیفەرموو. نەخێر شایەتی نادەم تۆ پێغەمبەری بەڵکو تۆ درۆزنی و درۆ بەدەم خواوە دەکەی. بەڵکو فەرموی: هەر هیچ نابیستم و گوێم لەهیچ نیە. واتە: قسەی دوژمنانی ئیسلام، هەر شایانی گوێ لێگرتن نیە. نەك وەڵامدانەوە.{ئەمڕۆ چەندین گەنجی خەمخۆری ئەم ئیسلامەو دڵسۆزی ئەم پێغەمبەرە نازدارە ﷺ ڕۆژانە دەپرسن:

کە مامۆستا لە ئەنتەرنێتا فلان سایت کراوتەوە بۆ دوژمنایەتی ئیسلام و بێ ئەدەبی کردن بەرامبەر بە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ ئایا چی بکەین؟! ئایا دانیشین ڕۆژانە ڕەتی بدەینەوە و دەم کوتی بکەین و درۆکانی ئاشکرا بکەین؟!

لەوەڵامدا بەو خۆشەویست و دڵسۆزانە دەڵێین، وەرن با دەرس و وانە لە ئەبو موسلیم وەربگرین و بڵێین: ئێمە هەر گوێمان لەقسەی درۆزنان و بوختان چیان و ناحەزانی ئیسلام نیە. هەتا کاتی خۆمان بەفیرۆ بدەین بەدەم کوت کردن و بەدرۆخستنەوەیان.بەڵکو ئەم باسە لەشوێنی خۆی بمرێنین و بەکەسی ڕامەگەیەنن و بەبێ ئاگایی مەکەونە بانگەوازو ڕیکلام کردن بۆی!!}.

بەڵێ، کاتی ئەسوەدی عەنەسی درۆزن، بێتاقەت بوو لەوەڵامی (ئەبو موسلیمی خەولانی) کە هەر دەیگوت: گوێم لێ نیە، ووتی: تۆ بڵێی ڕاست بکات گوێی کەڕ بوبێ و هیچ نەبیستێ. یان هەر ئەم قسەیە نابیستێ و نایەوێ وەڵام بداتەوە. بۆیە پرسیارەکەی گۆڕی و ئەمجارەیان ووتی: (أَتَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ؟!) ئایا شایەتی دەدەی کە محمد پێغەمبەری خوایە ﷺ؟! ئەبو موسلیم دەست بەجێ دەم و چاوی کرایەوە و بەزمانێکی پاراو و دەنگێکی زوڵاڵەوە فەرموی (نعم) بەڵی من شایەتی ئەدەم کە محمد پێغەمبەری خوایە. {بەڵێ ئێمەی موسوڵمان بەشانازیەوەو بەدەنگی زوڵاڵەوە شایەتمان دێنین. تەقوا ئەوەیە شانازی بە ئیسلامەوە بکەی، نەك پێت شەرم بێ ناوی ئیسلامت پێوەبێ!!}...

ئەسوەدی عەنەسی درۆزن. ووتی: دیارە تۆ هیچ ڕێزێك بۆ من و پێغەمبەراتیەکەم دانانێی و إعتراف ناکەی بە پێغەمبەرایەتی من. دەی شەرت





بێ بتکەم بە پەند بۆ هەموو کەس! (فَأَمَر بِنارٍ عَظيمٍ فَأُجِّجَتْ). فەرمانی کرد کە ئاگرێکی زۆر گەورە بکەنەوە . کە بڵێسەی دەچوو بە ئاسماناو یەکتری دەخواردەوە لەبەهێزی دا .. ئەبو موسلیمی خەولانیان گرت و دەست و قاچیان بەست و فرێیان دایە ناو ئاگرەکەوە! بەڵام (سبحان الله). ئاگرەکە تەنها ئەو حەبلەی سوتاند کە دەست و قاچی پێ بەسترابوو. کە ئاگرەکە خامۆش بوو ئەبو موسلیم بەسەلامەتی هاتە دەرەوەو نەك هەر لاشەی نەسووتابوو مویەکی لاشەشی نەکوڕوزابوو. وە جل و بەرگەکەشی نەسوتا بوو!! کاتێ ئەسوەدەی عەنەسی درۆزن ئەوەی بینی. چاوی ئەبڵەق بوو. زمانی بەستراو هیچی بۆ نەگوترا تەنها ئەوە نەبێ کە بەدارو دەستەکەی ووت: باشی چی لێ بکەین؟! ئەو چڵکاو خۆرانەش ووتیان: (إنْفِهِ عَنْكَ ، وإلا أفْسَدَ عَلَيْكَ من تَبِعَكَ) لەم وڵاتی یەمەنە نەفی بکە و دووری بخەرەوە، ئەینا ئەگەر لێرە بمێنێتەوە هەموو ئەوانەش کە بڕوایان پێ کردووی کە پێغەمبەری، ئەم پیاوە قسەیان بۆ دەکا و بیروباوەڕیان تێك دەداو پەشیمانیان دەکاتەوە! .. بەڵێ ئەسوەدەی عەنەسی فەرمانی دەرکرد کە ئەبو موسلیم و خێزان و منداڵەکەی لەوڵاتی یەمەن دەربکرێن و تا سەر سنوور بردیانن و لەوێ بەرەڵایان کردن. ئەبو موسلیم رووی کردە شاری مەدینە. شارەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ. ئەو کاتە پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کردبوو. سەردەمی خیلافەتی ئەبوبەکری صدیق بوو .. ئەبو موسلیم لەبەردەرگای مزگەوتی پێغەمبەری ﷺ وڵاخی سواریەکەی بەستەوەو ژن و منداڵەکەی لەپەنایەك. لەسێبەرێك دانان و چووە ناو مزگەوتی پێغەمبەرو ﷺ لەپەنای کۆڵەکەیەکدا نوێژی کردو لەوکاتەدا حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب. هاتە مزگەوتەوەو چاوی بە (ئەبوموسلیم) کەوت. کاتێ نوێژەکەی تەواو کرد.

حەزرەتی عومەر چووە لایەوەو سەلامی لێ کردو فەرمووی: دیارە خەڵکی مەدینە نیت و لەدەرەوە هاتوی، ئەبو موسلیم فەرموی: بەڵێ، لەیەمەنەوە هاتووم. یەکسەر حەزرەتی عومەر بەفەڕاسەتی مرۆڤی ئیماندار، فەرموی: بەخوا ڕەنگە ئەو کەسە بی کە ئەو درۆزنە ویستی بەئاگر بیسوتێنێ، بەڵام خوای گەورە پاراستی؟!، ئەبو موسلیم فەرموی: ئەوە پیاوێکە ناوی (عبدُالله ی کوڕی پۆب) {ئەمە ناوی ئەبوموسلیم بوو. ئەبو موسلیم کونیەی بوو}،

حەزرەتی عومەر فەرمووی: تو ئەو خوایە تۆ ئەو کەسە نی؟! ئەبو موسلیم فەرموی: بەڵێ من ئەوم. ئەمجا حەزرەتی عومەر باوەشی پێدا کردو ماچی کرد و دەستی کرد بەگریان . پاشان دەستی گرت و بردی بۆ مەجلیسی ئیمامی ئەبوبەکرو ئەبو موسلیم لەلایەن خەلیفەی موسوڵمانانەوە زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکراو، ئەبو موسلیم لەنێوان حەزرەتی ابوبکرو حەزرەتی عومەردا دانیشت. حەزرەتی عومەر فەرموی: (الحَمْدُ لله الّذي لَمْ يُمِتْني، حَتّى أراني في أُمّةِ مُحَمّدٍ ﷺ من فُعِلَ بِهِ كَما فُعِلَ بِإبْراهيم (عليه الصّلاة وَالسّلام) خَليلُ الرّحْمن ..) سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە نەیمراندم . هەتاوەکو بەچاوی خۆم کەسێکی نیشاندام لە ئومەتی محمد پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوەی پێکرا، کەبەحەزرەتی ئیبراهیم کراو خوای گەورە چۆن ئیبراهیمی خەلیلی خۆی لەئاگر ڕزگار کرد بەسەلامەتی ئاواش ئەو بەندەی ئوممەتی محمدی لە ئاگر ڕزگار کرد بەسەلامەتی و یاسای ئاگری بۆ گۆڕی. کە نەسوتێنێ. بەڵێ هەرکەس ئاوا موتەقی بێ. وەعدی خوایە ﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ﴾ الطلاق: ٢.. ئاوا دەروی خێری لێدەکاتەوەو لەتەنگانە ڕزگاری دەکات ..

وە خوای گەورە فەرموی: ﴿ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُ ﴾ بابزانین ئەبو موسلیم چۆن ئەم بەشەی ئایەتەکەشی بۆ هاتەدی . ڕۆژێکیان خێزانەکەی پێی دەڵێ: ئەی ئەبو موسلیم ئاردمان نەماوە، بەڵکو بچی هەندێ ئارد بکڕی. ئەبو موسلیم دەفەرموێ: ئەرێ هیچ پارەیەك شك دەبەی ، چونکە من هیچ شك نابەم؟! ژنەکەی دەفەرموێ: بەخوا منیش تەنها ئەم دیرهەمەم لایە. هەندێ شتم چنی بوو. چووم فرۆشتم و ئەو دیرهەمەم لاماوە. ئەبو موسلیم فەرموی: زۆرباشە، ئەو دیرهەمەم بدەیە و ئەو گونیەیەشم بدەیە بابچم ئاردەکەی تێبکەم. بەڵێ ڕۆیشت بۆ بازاڕ و ویستی بڕواتە دوکانی کابرایەکی ئارد فرۆشەوە، لەدواوە هەژارێك بانگی کرد: توخوا هەژارم و خێرێکم پێ بکەن! ئەبو موسلیم کەتەنها ئەو دیرهەمەی شك دەبرد، نەیزانی چۆن پێی بڵێ. کە ئاخر هەر ئەو دیرهەمەم لایەو ماڵو مناڵی خۆیشم چاوەڕێم دەکەن کە ئاردیان بۆ بکڕم.

بۆیە دوکانەکەی بەجێ هێشت و چووە دوکانێکی تری ئارد فرۆشتن. بەڵام ئەم هەژارە هەر بەشوێنیدا چوو. لەوێش داوای پارەتی لێکرد. ئەبو موسلیم ئەوەندە خاوەن ڕێزو دڵنەرم و بەبەزەیی بوو. لەوێش دڵی نەهات. دڵی ئەم





هەژارە بشکێنێ و بە نائومێدی دەست بەڕوویەوە بنێت. بۆیە دیرهەمەکەی دا بە ئەو و بۆ خۆی بە گوێنی خاڵیەوە گەڕایەوە. بەڵام چۆن بچێتەوە بۆ ماڵەوەو چیان پێ بڵێ، بڵێ پارەکەم کرد بە خێر. لەکاتێکدا ئەوە حاڵی خۆمانە!! بۆیە وەکو خۆ ڕزگارکردن چوو لەدوکانی دارتاشێکدا. کە ئاردەداری فڕێدابووە دەرەوە. ئیزنی وەرگرت و گوێنیەکەی پڕ کرد لەئاردەدار و لەملاشەوە هەندێ خۆڵە وردەی تێکردو بەکۆڵیادا و بردیەوە بۆ ماڵەوەو خستیە ئەو دیو دەرگاوەو بانگی خێزانی کرد، ئافرەت وامن دەڕۆم و تاشەو ناگەڕێمەوە. ئیتر ڕۆیشتە دەرەوە و خێزانیشی کە هات گوێنیەکە دانراوە هەڵی گرت و بردیە سەر تەنوربانەکە. لەملاوە کە ئەبو موسلیم کە شەو گەیشتە نیوەی لەمزگەوتەوە بەرەو ماڵەوە کەوتە ڕێ و بەئەسپایی چووە ژوورەوەو لەدڵی خۆیدا ووتی: ئێستا بەبرسیەتی هەموو خەوتوون! بەڵام ئەوەی کە چاوەڕوانی نەدەکرد ئەوەبو کە ژنەکەی بەرووبەکی خۆشەوە بەخێرهاتنەوەی کرد و پێی ووت: باشە بۆچی وا درەنگ هاتیتەوە؟! دڵنیام نانیشت نەخواردووە. وەرە نانەکەت بخۆ. سینیەکی هێنا کە پڕبوو لەکولێرەی سپی زۆرجوان!! ئەبوموسلم بەسەر سوڕمانەوە فەرموی: ئەمەتان لەکوێ بوو؟! خێزانەکەی ووتی: چی لەکوێمان بوو. لەو ئاردە سپیە جوانە دروستمان کرد. کە ئەمڕۆ هێناتەوە. باشە ئەم ئاردە نایابەت لەکوێ کڕی؟ چۆن دیرهەمێك ئەو هەموو ئاردەی پێ کڕدرا؟! ئەبوموسلیم دەستی کرد بەکولێرە خواردن و لەگەڵ خواردنەکەدا. دەگریا. وەکو سوپاس کردنێك بۆ ئەو هەموو لوتفەی کە خوای پەروەردگار لەگەڵ ئەم بەندەی خۆی کردویەتی. خوایەك کە (الرّزاق)ە و بەتوانایە لەسەر ئەوەی ئاردەدارو گڵ بگۆڕێ بۆ ئاردی سپی. هەر ئەو خوایەی کە دەنکە گەنمی ڕەق لەگڵدا دەڕوێنێ و بەرهەمی دێنێ لەو گیایە ئەم نانە بەرهەم دێنێ ..

بەڵێ، هەرکەسێ حەزدەکات خوای گەورە ڕزق و ڕۆزی بۆ زیاد بکات با تەقوای خوا بکات. با تەقوای خوا بکات.

٢- تەوەکولی شەرعیانە لەسەر خوا: کە پێناسەی تەوەکول ئەوەیە ، بەندە دڵی تەنها وتەنها وابەستە بێت بەخوای گەورەوە. خوای گەورە خۆی فەرمویەتی: ﴿ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ﴾ الطلاق: ٣

واتە: هەرکەسێ بەڕاستی پشت بەخوا ببەستێ. خوا بەسە کە پشت و پەنای بێت و پێویستی بەکەسی تر نیە.






وە هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡحَيِّ ٱلَّذِي لَا يَمُوتُ ﴾ الفرقان: ٥٨. واتە پشت ببەستە بەو خوایەی کە هەمیشە زیندووە و هەرگیز نامرێت ..

بەرێزان: سەرنج بدەن: ئەگەر خوای گەورە تەنها بیفەرموایە: ﴿ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡحَيِّ ﴾بەس بوو. بەڵام بۆ ﴿ ٱلَّذِي لَا يَمُوتُ ﴾ یشی باس کرد؟! والله أعلم. چونکە مرۆڤ کە ووشەی (ٱلۡحَيِّ) گوێ لێ دەبێت. ڕەنگە گومانی ئەوەی بەدڵدا بهاتایە کە ڕۆژێك لەڕۆژان. ئەم زیندووە مردنی بەسەردا بێت. بەڵام کە فەرمووی: (ٱلَّذِي لَا يَمُوتُ ) ئەو گومانەو ئەو بۆچونەش لاچوو ..

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (لَوْ أَنَّكُمْ تَوَكَّلُونَ عَلى اللهِ حَقَّ تَوَكُّلِهِ، لَرُزِقْتُمْ كَما تُرْزَقُ الطَّيْر، تَغْدُوا خِماصاً وَتَرُوحُ بِطاناً) - حَديثٌ صَحيح ، أخرجه أحمد (٣٧٠) والترمذي (٢٤٤٧).

واتە: ئەگەر ئێوە، تەوەکولتان لەسەر خوا بوایە. بەتەواوی مانای پشت بەستن و تەوەکول ئەوا ڕۆزیتان دەدرا، هەروەکو ئەو باڵندەیەی کەبەیانیان بەبرسیەتی لەهێلانەکەی دەڕواتە دەرەوەو چیکڵدانەی خاڵیە ، ئێوارەش بە چیکڵدانەی پڕەوە دەگەڕێتەوە.

کەواتە: تەوەکولی شەرعیانە بریتیە لەهەوڵ دان و چوونە دەرەوە لەماڵ. لەبەیانیەوە تا ئێوارە هەوڵ و تێکۆشان و هەڵسوڕان و کار و کەسابەت کردن.

بەڵام یەقینت هەبێ ئەم کارکردن و جموجوڵەی تۆ تەنها سەبەبێکە و ڕزق و ڕۆزی هەر خوای گەورە دەینێرێ پاشان دڵنیاو بێگومان بی بێ ڕزق ناگەڕێیتەوە. هەروەکو ئەو باڵندەیەی کەبەیانی بەسکی خاڵی لەهێلانەکەی دەچێتە دەرەوە و دڵنیاشە لەوەی کە بەبرسیەتی ناگەڕێتەوە.

نموونەیەکی بەرچاو: کاتێ هاجەرە خاتوون و ئیسماعیلی مەلۆتکە لەمەککە ، لە ﴿ بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ ﴾ إبراهيم: ٣٧. مانەوەو خواردن و ئاوەکەیان تەواو بوو. هاجەرە خاتوون بۆ سۆراغ کردنی ئاوێك (٧) جار هاتوچۆی نێوان صەفاو مەڕوەی کرد.

کە چی خوای گەورە ئاوی لەژێر قاچی مەلۆتکەیەکی بێ دەسەڵاتی وەکو ئیسماعیل دا، هەڵقوڵاند!! بۆچی؟! تاوەکو هاجەرە خاتوون و هەموو ئیمانداران لەوە تێ بگەن کە تەوەکول یانی ڕاکردن و هەوڵدان . بەڵام دڵنیابوون لەوەی کە بوونی ڕزقەکەو پەیدا بوونی تەنهاو تەنها بەدەست خوایە ..



٣- هۆکاری سێیەم کەدەبێتە هۆی زیادبوونی رزق و رۆزی بریتیە لە: (نوێژ کردن). خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَأۡمُرۡ أَهۡلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصۡطَبِرۡ عَلَيۡهَاۖ لَا نَسۡـَٔلُكَ رِزۡقٗاۖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُكَۗ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلتَّقۡوَىٰ ﴾ طه: ١٣٢.

واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ وە ئەی ئیماندار ، فەرمان بدە بە هەرهەموو تاکەکانی خێزانت تا نوێژەکەیان بەچاکی ئەنجام بدەن. چونکە خۆراکی رۆحەو بەردەوام و کۆڵنەدەرو خۆڕاگربە لەسەری ، بێگومان ئێمە داوای ڕزق و ڕۆزی لەتۆ ناکەین بەڵکو ئێمە ڕزق و ڕۆزی بە تۆ دەبەخشین. سەرەنجامی چاك هەر بۆ خواناسی و دینداریە.

سەرنج بدەن بەڕێزان. چۆن باسی نوێژ و پابەند بوون و بەردەوام بوون لەسەر نوێژ پاکی و نوێژکردن لەکاتی خۆیداو گەرم و گوڕی و بەردەوامی لەسەری دەبێتە هۆی زیادبوونی ڕزق و ڕۆزی .. صەحابەکان دەفەرمون: (أَنَّ النَبِيَّ ﷺ كانَ إذا نَزَلَ بأَهْلِهِ الضَّيْقُ أَمَرَهُمْ بالصَّلاةِ، ثُمَّ قَرَأَ هذهِ الايَة) .. - أخرجه الطَّبَراني في - المعجم الكبير - والبَيْهَقي في سُنَنِهِ وَ صَحَّحَهُ.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکاتێ دەست کورتی و نەبوونی ڕووی لە خێزانەکەی بکردایە. فەرمانی پێدەکردن . کە هەستن نوێژ بکەن. پاشان ئەم ئایەتەی سوڕەتی (طه)ی دەخوێندەوە.



وە لەفەرمودەیەکی تردا هاتووە. کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (ثَلاثَةٌ كُلُّهُمْ ضامِنٌ عَلى اللهِ، إنْ عاشَ رُزِقَ وَكُفِيَ، وَ إنْ ماتَ أَدخَلَهُ اللهُ الجَنَّةَ).

واتە: سێ کەس هەن. کە هەرسێکیان زەمانەتیان لەسەر خوایە و. خوای گەورە بەڵێنی داوە تا ئەو کەسە لەژیاندا بێ، بەپێ ی پێویست ڕزق و ڕۆزی دەدات وناهێڵێ موحتاج بێ. وە ئەگەر مردیش، خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە!

ئەو سێ کەسەش ئەمانەن:-

١- (من دَخَلَ بَيْتَهُ، فَسَلَّمَ فَهُوَ ضامِنٌ عَلى اللهِ): هەرکەسێ چوەوە ماڵی خۆیەوە، کاتێ لەدەرەوەی ماڵ دەگەڕێتەوە، لەگەڵ ئەو هەموو ماندوبونەی کەهاتۆتە ڕێگای لەبواری دەوام وکارکردن وپیشەکەیدا، کەچی ئەو ماندوبون وبیستنی

قسەی ناخۆش و هەواڵی ناخۆشە کەئەو ڕۆژە بیستویەتی ووناڕاستەی کراوە و دڵی توند کردوە. وە ئەوەی کەمافی خوراوە وستەمی لێ کراوە، بەڵام ئەم پیاوە، یان ئەم ئافرەتە کەهاتەماڵەوە، ئەم دڵتەنگی وماندوبونە لەگەڵ خۆی ناباتە ژورەوە وبەڕوویەکی خۆشەوە سەلام لەخێزان ومناڵەکانی دەکات وبەڕوی خۆشەوە بەرەو ڕویان دەچێت.

ئەوە ئەوکەسە (پیاوبێ یان ژن — چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (من) هەرکەسێ — جا جاری واهەیە ئەوکەسە ژنێکە کەفەرمانبەرە لەدائیرەیەك، یان ئافرەتێکی ماڵەوەیە ولەبەردەستکورتی وهەژاری ونەخۆشی مێردەکەی، مەردانە دەڕوات کاردەکات وسەربەرزانە بەحەیا وحورمەتەوە، پارەیەکی حەلاڵ بۆ مێردەکەی و مناڵەکانی پەیدا دەکات وناهێڵێ موحتاجی خەڵکی بن، وە هیچ پرتە وبۆڵەو ڕووتاڵیەك نانوێنێ کەهاتەوە بۆماڵەوە. هەرچەندە زۆریش ماندوە، بەڵام سەلامێکی جوان بەڕوی خۆش وزمانی شیرینەوە لەمێردەکەی ومناڵەکانی دەکات. ئەم کەسە خوای گەورە بەڵێنی داوە کەتابژی ڕزق وڕۆزی بۆ دەنێرێ وپەکی ناخات وموحتاجی کەسی ناکات وئەگەر مردیش دەیخاتە بەهەشتەوە!..

٢- وَمن خَرَجَ إلى المَسْجِدِ، فَهُوَ ضامِنٌ عَلى اللهِ .. هەرکەسێ لەماڵی خۆیەوە، لەدوکانەکەیەوە، لەسەر ئیش وکارەکەیەوە، لەفەرمانگەکەیەوە، کەگوێ ی لەبانگ بوو، هەرچەندە دەیتوانی لەشوێنەکەی خۆی نوێژ بکات، بەڵام ئەوەندە دڵی بەمزگەوت دەکرایەوە وئەوەندە تەماحی قیامەتی هەبوو بۆ پاداشتی نوێژی جەماعەت بەرەو مزگەوت بەڕێ کەوت وگوێ ی نەدایە سەرماوگەرما وتاریکی شەو ودوری ڕێگا ودەست هەڵگرتن لەکار وکەسابەت وخۆگۆڕین ولەبەرکردنی جل وبەرگی شایستە بەمزگەوت وناوخەڵکی — کەئەگەر لەماڵەوە نوێژەکەی بکردایە، ئەمەی نەدەویست — ئەوە ئەوکەسەش خوای گەورە زەمانەتی کردوە، کەتابژی لەڕزق وڕۆزی بەپێ ی کیفایەتی ژیان، پەکی ناخات وئەگەر مردیش بیخاتە بەهەشتەوە!..

٣- (وَمن خَرَجَ في سَبيلِ اللهِ، فَهُوَ ضامِنٌ عَلى اللهِ).. وە هەرکەسێك لەپێناوی خوای گەورەدا، بۆ عیزەتی ئیسلام، لەماڵی خۆی بچێتە دەرەوە. ئەوە ئەوکەسەیش، خوای گەورە خۆی بەڵێنی پێداوە. کەئەگەر بژی، لەڕزق و ڕۆزی پەکی ناخات وئەگەر مردیش دەیخاتە بەهەشتەوە. واتە: بەختەوەری دونیاو قیامەت دەبێت.





خوای گەورە لەقورئاندا فەرمویەتی: ﴿ وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٠﴾ ﴾ النساء: ١٠٠.

واتە: جائەوەی کۆچ بکات لەپێناوی خوادا، لەو زەویەی کەکۆچی بۆ دەکات. سەربەرزیەك بۆخۆی وریسواییەکی زۆریش بۆ دوژمنانی دروست دەکات. بەرەکەت و فراوانی ڕزق ورۆزی ڕووی تێدەکات. هەرکەسێکیش ماڵوحاڵی خۆی بەجێ بهێڵێت و لەپێناو خوا وپێغەمبەرەکەیدا دەرچێت. پاشان مردن یەخەی پێ بگرێت، ئەوە ئیتر ئەم کەسە، پاداشتەکەی کەوتۆتەسەر خوا. هەرخۆی دەزانێت چۆن پاداشتی دەداتەوە. خوا هەمیشەو بەردەوام لێخۆشبوو میهرەبانە. بەتایبەت بۆئەو جۆرە کەسانە. کەئاوا بۆخوا تێدەکۆشن.

جا ئەمڕۆ ئەگەر هیجرەت ئەماوە لە دارُ الکُفرەوە بۆ دارُ الاسْلام — لەسەر ڕای زۆرێك لەزانایانی سەردەم — چونکە ئەو زانایانە بەلایانەوە وایە، لەهەرشوێنێ موسڵمان بتوانێ بەئازادی نوێژو خواپەرستی بکات. بە (دارُ الاسلام) حیسابە. وە سوپاس بۆخوا ئەمڕۆ مزگەوت لەسەرتاسەری ئەم سەرزەویەدا هەیەو شوێنێك ئەماوە لەم سەرزەویەدا کەموسڵمانانی لێ نەبێ وخواپەرستی بەئازادی نەکرێ. تەنانەت مزگەوت لەباکوری ئەرویج کرایەوە، کەنزیکە لەجەمسەری باکوری گۆی زەوی!..

کەواتە: هیجرەت وکۆچ کردنی ئەمڕۆ بۆ موسڵمان بریتی یە لەگۆڕینی ڕەفتارو ڕەوشت بەرەو ئیسلام. موسڵمانانە ڕەفتارکردن وگوفتارگوتن، زیندوکردنەوەی سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ، وازهێنان لەبیدعەت، وازهێنان لەکاروکاسپی حەرام. ڕووکردنە مزگەوت وپشت کردن لەهەرجێگایەك کەدژایەتی مزگەوتی لێ دەکرێ. بۆ خوشکان خۆداپۆشین بەکاڵای نور، دوای ئەوەی سفور بومو جلی ناشەرعی لەبەرکردوە.

هەروەها هەریەك لەئێوەی بەڕێز کەلەسەرەنجامی گوێگرتنتان بۆئەم ووتارانەی باسی حەلاڵ وحەرام، هەڵوێستان نواند ووازتان لەکار وکەسابەتی حەرام هێنا، ئەوە بەڕاستی کۆچتان کردوە لەپێناوی خوادا. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (المُهاجِرُ من هَجَرَ مانَهَی اللهُ عَنهُ). دەی وەعدو بەڵێنی خوایەو زەمانەتی خوایە کەموهاجیر لەژیانی دا ڕزق و ڕۆزی فراوانی لەلایەن خواوە بۆ دابین دەکرێ و لەقیامەتیشا بەهەشتی خۆی مسۆگەرە (إن شاءالله)...

بەڵێ خۆشەویستان: ئەم ئیسلامەتیە هەمووی خێر وبەرەکەتە، هیچ شتێ نیە وا لەمرۆڤ بکات کەحەرام نەخوات، کەچی ئیسلام وای لێ دەکات کەحەرام نەخوات بەبێ ئەوەی چاوی کەسی لەسەربێ.

نموونەیەك: (محمدی کوڕی سیرین) زانای بەناوبانگی ئیسلام، زانای لێکدانەوەی خەون، ئەوەندە زانابوو. ئەوەندە خواناس و موتتەقی بوو. کاتێ کەهاوەڵی زۆر خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنەسی کوڕی مالیك کاتێ کەلەسەرە مەرگدا بوو. وەصیەتی کردو فەرموی: هەرکاتێ کەمردم با (محمدی کوڕی سیرین) بمشوات و نوێژم لەسەر بکات!! بەڵام کاتێ کەئەنەسی کوڕی مالیك وەفاتی کرد. (محمدی کوڕی سیرین) لەگرتوخانە (سجن) دا بوو، دەزانن بۆچی؟! ئایا ئەم پیاوە زانا وبەڕێزە خواناسە. کەصەحابەی پایەبەرزی وەکو (ئەنەسی کوڕی مالیك) ئەو دیاری بکات کەبیشوات. دەبێ چ تاوانێکی کردبێ وا لەگرتوخانەدا بێ؟!! هیچ تاوانێکی نەبوو. بەڵام هۆیەك وای کرد کەئەم پیاوە زانایە بچێتە سجنەوە، ئەویش ئەوە بوو، کەڕۆژانە لەدوای تەواوبونی دەرس و وانە وتنەوەی ئەو ڕۆژەی، دەچوە بازاڕ ومعامەلە وکڕین و فرۆشتنی دەکرد بۆئەوەی موحتاجی دەستی کەس نەبێت. ئەوەبوو جارێکیان ڕۆنێکی زۆری کڕی. ڕۆنەکە ڕونی زەیت بوو (شل) بوو. کرابوە چەند کوپەیەکەوە. کاتێ کەڕۆنەکەی کڕی وهێنایەماڵەوەو وویستی بیکاتە چەند کوپەیەکی بچکۆلەوە ولەدوکانەکەی بەچەند کوپەیەکی بچوك بچوك بیفرۆشێتەوە. کاتێ یەکێ لەکوپە گەورەکانی ڕۆکرد، تەماشای کرد مشکێکی تێدا تۆپیوە ومشکەکە زۆر دەمێك بوە لەورۆنەدا ماوەتەوە وپوکاوەتەوە!! کاتێ کەئەمەی بینی هیچ کەسی لەلانەبوو ئاگای لەم مەسەلەیەبێ. تەنها خۆی لەوژورەدا بوو، زۆر بەئاسانی دەیتوانی مشکەکە وپاشماوەکەی فڕێ بدات وهیچ کەسیش هەستی پێ نەکات وقازانجێکی زۆریش بکات. بەڵام کەئەوەی بینی دانیشت وکەوتە بیرکردنەوەو هاتەسەر ئەو قەناعەتەی کەئەم ڕۆن زەیتە شلە، یەکەمجار لەمەنجەڵی زۆر گەورەدا ئامادەکراوە وپاشان کراوەتە ئەم کوپە گەورانەوە. وە بەدڵنیاییەوە مشکەکە کەوتۆتە ناو مەنجەڵە گەورەکەوە، کەسەری بەتاڵ بوە وپاشان کراوەتە ئەم کوپانەوە وئەم کوپانە، سەریان هەیە وقەپات کراوە. کەواتە: تەنها ڕۆنی





ئەم کوپەیان پیس نی یە کەنەم مشکەکەی تێدا بینیوە. بەڵکو ڕۆنی هەموو کوپەکان پیسە! جالەم کاتەدا ئەگەر ڕۆنەکە بداتەوە بەخاوەنی، ئەوە ڕەنگە ئەو نەیرێژێ وبچێ بەکەسێکی تری بفرۆشێ وسەرەنجام موسڵمانان ئەم ڕۆنە میکرۆباویە بکڕن وبیخۆن وتوشی نەخۆشی ببن. خۆ ئەمیش ئاگای لەم تاوانەیەو ئیتر چۆن بێدەنگ بێ! لەبەرئەوە بڕیاریدا ئەم زەرەرە گەورە مادیە بخاتە ئەستۆی خۆی وموسڵمانان لەشەڕەکەی پارێزراوبن. بۆیە هەموو ڕۆ‌نەکەی ڕشت وتەلەفی کرد!! سەرەنجام توشی قەرزاریەکی زۆر بوو وە لەکاتی خۆیدا پارەکەی پێ نەدرایەوە وخاوەن پارە شکاتی لێ کرد وخرایە زیندانەوە!!، وە کاتێ هاتن بۆلای وپێیان ووت، هاوەڵی بەڕێز (ئەنەسی کوڕی مالیك) وەفاتی کردوەو وەصیەتی کردوە کەتۆ جەنازەکەی بشۆری. فەرموی: ئاخر ئاوا دەبینن من لەسنجدام و ئەگەر سەرۆکی سجنەکەش یارمەتیم بدات و لەبەرحورمەتی ئەم صەحابە گەورەو وەصیەتەکەی بۆماوەی چەند سەعاتێك مۆڵەتم بدات.

تا دەیشۆم ودێمەوە، ئەوە لەڕووی شەرعەوە، ناتوانم بێمە دەرەوە. هەتاوەکو پرسی خاوەن قەرزەکە نەکەم، ئەوەبوو [illegible]لای خاوەن قەرزەکەو مۆڵەتیان لێ وەرگرت و (محمدی کوڕی سیرین) بۆچەند کاتژمێرێك لەزیندان هاتە دەرەوەو جەنازەکەی شۆردو پاشان گەڕایەوە بۆ زیندان!..

بەڵێ ئیسلام کەسی ئاوا پێئەگەیەنێ. کەلەبەرخاتری ڕەش وڕووت و برسی میللەت. کەنەوەکا بەشتی خراپ ومیکرۆباوی ئەوەندەی تر نەخۆش بکەون وقوڕ بەسەرتربن. خۆی دەخاتە گۆشەی زیندانەوە. نەك وەك ئەمڕۆ. کەزۆر بازرگان، کەخۆیان زۆر بەگەورە وگرنگ دەزانن وتەکەبور بەسەر زەویدا لێ دەدەن، لەژێر ئەم هەموو چاودێری پزیشکی وئاسایشی ئابوری سەرسنورەکان و ناوبازاڕەکان، کەچی ئەم هەموو شتە بەسەرچوو خراپە بەخەڵکی دەفرۆشن ولاشەی پڕدەکەن لەژەهرو بۆ یەگجاری لەناوی دەبەن. کەهەندێ جار شەریکی مەسئول و کاربەدەستی دیموکراسی و مۆدێرنیش لەگەڵیانن وپشتگیریانن بۆئەوەی نەهێڵن بخرێنە زیندانەوە، یان حوکمەکەیان لەسەر سوك بکرێ!!!

٤- هۆکاری چوارەم کەدەبێتە هۆی زیادبوونی ڕزق و ڕۆزی بریتی یە لە: (صلة الرَّحمِ). ئەبو هورەیرە دەفەرموێ: لەپێغەمبەری خوام بیست ﷺ کەفەرموی: (من سَرَّهُ أَنْ يُبَسطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ، وَأَنْ يُنْسَأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ، فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ) - رَوَاهُ

البُخاري (٥٩٨٥).

واته: هەرکەسێك حەزدەکات کەرزق وڕۆزی فراوان وزیاد وپڕ بەرەکەت بێ وخوای گەورە لەبەلاو موصیبەت لایدات وتەمەنی بەبەرەکەت بێ. باسیلەی ڕەحم جێ بەجێ بکات و بۆ کەس وکار وخزمەکانی باش بێت.

بەڵێ ئیمانداری بەڕێز: ئەگەر خوشکێکت، برایەکت، پورێکت، ئامۆزا وپورزایەکت دەست کورت وهەژار بوو. تۆش هەتبوو. یارمەتی بدە، دەست گیرۆیی بکە، مەهێڵە موحتاجی دەستی بێگانەبێ. دڵنیابە خوای گەورە ڕزق وڕۆزیت فراوان دەکات و بەدەیان قاتی ئەوەی تۆ بەئەوانت بەخشیوە، بۆت پڕ دەکاتەوە.

٥- هۆکاری پێنجەم بۆ زیادبوونی ڕزق وڕۆزی بریتی یە لە: (مُساعَدَةُ طالِبُ العِلْمِ) یارمەتی دانی فێرخواز، جا فێرخوازی زانستە شەرعیەکان بێت، یاخود زانستی ئەمڕۆی دونیایی کەلەخزمەتی مرۆڤدایە. کەئەو خوێندکارە لەئامادەیی. یان پەیمانگاو زانکۆ بخوێنێت وکەسێکی موسڵمان وڕەوشت بەرزو نوێژ پاك بێت و لەهەوڵی ئەوەدابێ. کەبەو خوێندنەی لەپاشەڕۆژدا مرۆڤێکی بەکەڵك وبەخزمەتی لێدەرچێت بۆ کۆمەڵگاکەی و بۆ ئیسلامەکەی. وە باری خەڵکی سوك بکات، نەك ببێ بەبار بەسەر خەڵکی یەوە..

صەحابی پایەبەرز، ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرموێ: لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ لەشاری مەدینە دوو برا هەبوون. یەکێکیان ڕۆژانە دەهاتە خزمەت پێغەمبەری خواو گوێ ی لەفەرمایشتەکانی دەگرت وجوان لەبەری دەکردو بەخەڵکی دەگەیاند. واتە: وەکو خوێندکارێکی ئەکادیمی ئاوا خۆی بۆفێربونی زانستی شەرعی لەخزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ، تەرخان کردبوو. برایەکەی تریشی ئیشی دەکرد و سنەعاتکار بوو. ڕۆژێ ئەم برا ئیشکەرە شکاتی لەبراکەی کرد لەخزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ. وە ووتی: (یارَسُولَ اللهِ، إنَّ هذا أخي لایُعینُني بِشَيٍ) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم برایەم بەهیچ جۆرێ هاوکاریم ناکات وکارێکم لەگەڵ ناکات وپارەیەك پەیدا ناکات وهەرخەریکی فێربونی زانستی شەرعیە. هەردەبێ من یارمەتی بدەم وگوزەرانی بۆ دابین بکەم!!).





پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (لَعَلَّكَ تُرْزَقُ بِهِ). بەخوا ڕەنگە خوای گەورە بەهۆی ئەو برا فێرخوازەتەوە، ڕزق وڕۆزی تۆش بدات وبەرەکەتت بۆتێ بخات. تۆ بەهۆی ئەوەوە نان بخۆیت. نەك ئەو لەژێر منەتی تۆدا بژیت!. ئەم فەرمودەیە: حَدْيثٌ صَحيح، أَخْرَجَهُ الترمِذي (٢٣٤٦) وَفِي الصَّحيحة: (٢٧٦٩).

مەلا عەلی قارئی – ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە (مرقاة المفاتيح) ج٩ ص١٧١دا. لەڕاڤەو شەرحی ئەم فەرمودەیەدا فەرمویەتی: کاتێ کەپێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (لعلكَ ترْزَقُ بهِ) بەصیغەی مەجهول فەرموی، کەماناکەی وای لێ دێ: (أَرْجُوا أَوْ أخافُ أَنَّكَ مَرْزُوقٌ بِبَرَكَتِهِ، لا أَنَّهُ مَرْزُوقٌ بِحِرْفَتِكَ، فَلا تَمُنْنْ عَلَيْهِ بِصِنْعَتِكَ) واتە: بەڕاستی من وادەزانم ویەقینم هەیە، تۆ بەهۆی بەرەکەتی ئەو برا خوێندکارەتەوە، خوای گەورە ئەو ڕزق وڕۆزی یە فراوانەی بەسەر تۆدا ڕشتوە نەك ئەو چاو بەرەژێری نان و ڕزقی تۆبێ. لەبەرئەوە بەنیش وکارەکەت منەتی بەسەردانەکەی!

کەواتە: ئەی ئەو کەسانەی کەکوڕوکچتان خوێندەوارەو خوێندکارەو مەصرەفێکی زۆری بۆ دەکەی. ئەوە دڵنیابە هەموی دەبێتە بەرەکەتی ڕزق و ڕۆزی.

٦- خاڵی شەشەم کەدەبێتە هۆی ڕزق زیادبوون، بریتی یە لە: (الاحْسان إلى الضُّعَفاء): چاکەو یارمەتی دانی خەڵکی چەوساوەومەزڵوم وبێ کەس وکار. یاخود کەسێك لەماڵەوە مناڵێکی نوقسانی هەیە. مەنغۆلە، یان کەمئەندامە.. یان خزمێکت نەخۆشەو تۆ عیادەی پێ دەکەی و پارەی دەرزی ودەرمانی بۆ دەدەی و منەتیشی بەسەردا ناکەی ئەوە دڵنیابە کەخوای گەورە، بەهۆی ئەو مەزڵوم و ناکامڵەو کەم ئەندامەوە بەرەکەت دەخاتە ڕزق و ڕۆزیتەوەو خوای گەورە ڕزقی تۆ زیاد دەکات بەهۆی ئەوەوە، نەك باربێت بەسەرتەوە. پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ فەرموی: (هَلْ تُنْصَرُونَ وَتُرْزَقُونَ إلا بِضُعَفائِكُمْ) رَواهُ البُخاري.

واتە: ئایا کەئێوە سەردەکەون بەسەر دوژمندا خوای گەورە ڕزق و ڕۆزی فراوانتان پێ دەبەخشێت هەر بەهۆی لانەوازو بێ دەسەڵاتەکانتانەوە نی یە؟!

واتە: هەرچەندە ئەو زەعیف ولاوازانە نەشەڕیان پێ دەکرێ لەگەڵ دوژمن نەکارو کەسابەتیشیان پێ دەکرێ بە ڕواڵەت ئێوە بەرگری لەوان دەکەن و لە دوژمن دەیانپارێزن. وە ئێوە ڕزق و ڕۆزی بۆ ئەوان دابین دەکەن.

بەڵام نەخێر، ئەوە خوای گەورە بەبەرەکەتی دوعاونزای ئەو لاوازو بێ دەسەڵاتانەوە، یارمەتی ئێوە دەدات وسەرکەوتنتان پێ دەبەخشێ و بەسەر دوژمندا زاڵتان دەکات و ڕزق و ڕۆزی زۆرتان بەنسیب دەکات. کەواتە: هەرگیز منەتیان بەسەردا مەکەن.

٧- هۆکاری حەوتەم کەدەبێتە هۆی زیادبوونی ڕزق وڕۆزی بریتی یە لە: دوعاو پاڕانەوە. بەدڵ لەخوای گەورە بپاڕێیتەوە کەڕزق وڕۆزیەکی پاك وحەلاڵت پێ ببەخشێ. هەروەکو کەلەفەرمودەدا هاتوە کە: (كانَ رِسُولُ اللهِ ﷺ يَقُولُ بَعْدَ السَّلامِ من صَلاةِ الفَجْرِ: اللّهُمَّ إنِّي أسْألُكَ عِلْماً نافِعاً وَرِزْقاً طَيِّباً، وَعَملا مَتَقَبَّلا). صَحيحُ سُنَن إبْنُ ماجَّة ج١ ص١٥٢.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکات کەلەنوێژی بەیانی سەلامی دەدایەوە دەیفەرموو: خوای پەروەردگارم بەڕاستی داوات لێ دەکەم کەزانستی بەسودم پێ ببەخشی، وە ڕزق وڕۆزی پاك وحەلاڵم پێ ببەخشی، وە داوات لێ دەکەم یارمەتیم بدەی کەکار وکردەوەیەك بکەم کەبەگوێرەی فەرمانی تۆ بێ. بۆئەوەی لێم قبوڵ بکەی...

کەواتە: تۆی موسڵمان بەیانی زووهەڵسە لەخەوو نوێژی بەیانی بکە و دوای سەلام دانەوە لەنوێژ ئاوا لەخوا بپاڕێوە کەڕزقی حەلاڵ و پاکت پێ ببەخشێ. بەپشتیوانی خوای گەورە بڕۆ بۆسەر کارەکەت. دڵنیابە (إن شاءالله) ڕزق و ڕۆزیت فراوان دەبێت. ئەمە بکە کەپێغەمبەری خوا ﷺ کردویەتی، نەك پەنا ببەی بۆ نوشتەنوس وداوای نوشتەی ڕزق وڕۆزی لێ بکەی!!



٨- یەکێکی تر لەوشتانەی کەدەبنە مایەی فراوان بونی دەرگای ڕزق وڕۆزی لەسەرت بریتی یە لە: (الاتقانُ فى العمل): هەرکار وپیشەیەکت کرد زۆر بەڕێکوپێکی و دڵسۆزیەوە ئەنجامی بدە، غەش وکەمتەرخەمی تێدا مەکە، ئەوە (إن شاءالله) دەبێتە هۆی فراوان بونی دەرگای ڕزق وڕۆزی لەسەرت.

چونکە هەرکەس کار وپیشەی خاوێن بوو. خەڵکی بەشوێنیا دەگەڕێن بۆ کارکردن و یەك بەیەك بانگەوازی بۆ دەکەن وبەخەڵکی دەناسێنن وهەرگیز بێ کار نابێ وخوای گەورەش پشتیوانی لێ دەکات وکاری ڕاست دێنێ وبەرەکەت دەخاتە ئەو پارەیەوە کەوەری دەگرێ. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (إنَّ اللهَ يُحِبُّ مِنَ العَبْدِ إذا عَمِلَ عَمَلا أنْ يُتْقِنَهُ). بەڕاستی خوای گەورە پێ ی خۆشە کاتێ بەندە کارێکی کرد، زۆر بەپوختی ودڵسۆزی وڕێکوپێکی ئەنجامی بدات وهیچ



غەش وفێڵی تێدا نەکات.

٩- یەکێکی تر لەهۆیەکانی زیادبونی ڕزق وڕۆزی بوونی دایك و باوکی پیرو بەساڵاچوە، کەخوای گەورە لەشێوەی بەرەکەتدا ڕزق و ڕۆزی ئەوان دەنێرێ وخوای گەورە بەرەکەت دەخاتە ئەو ماڵەوە کەدایك و باوکی پیری تێدا بەخێودەکرێت.

بۆ وەڵامی پرسیاری دووەمیش کە: ئایا خوای گەورە ڕزقی هەموو کەسی وەکویەك داوە؟! لەوەڵامدا دەڵێین:

١- هەموو قورئان بخوێنەوە، نابینی ووشەی (الرازِق) هاتبێ. بەڵکو بەردەوام ( الرَّزاق) هاتووە جا ئایا جیاوازی نێوان (الرَّزاق) لەگەڵ (الرَّازِق) چی یە؟!

(الرازِق):- بەمانای ئەوە دێت کەڕزقی هەندێ کەس دەدات و ڕزقی هەندێ کەس نادات، هەندێ جار ڕزق دەدات وهەندێ جار نایدات.

بەڵام: (الرَّزاق) واتە: ڕزقی هەموو بەشەر بەئیماندارو بێ ئیمانەوە، وە هەموو دروستکراوەکانی دەدات. کەواتە: خوای گەورە نەك ڕازیقە، بەڵکو -- (الرَّزاق) ە.

٢- ئایا ڕزق وڕۆزی هەرتەنها پارە وسامانە؟! لەوەڵامدا دەڵێین: ڕزق لەمانا هەرە ووردو دیارەکانیدا: (هُو مايُنْتَفَعُ بِهِ). هەرشتێ سودی لێ ببینرێ ڕزقە.

سەرنج بدەن، ماڵ و پارە وسامان سودی لێ دەبینرێ، ڕەوشت ونەخلاقی بەرز وەکو نەرم ونیانی و لەسەرخۆیی وڕاستگۆیی ودەستپاکی، ڕووخۆشی، دەم بەزەردەخەنەیی.

ئەوە هەرڕزقەو باشترین جۆری ڕزقە. پاشان دڵئارامی وئاسودەیی دڵ ودەرون ڕزق و ڕۆزیەکی گەلێ گەورەیە. چونکە زۆرکەس هەیە هەموو سامانەکەی دەبەخشێ تەنها بۆئەوەی کەمێك لەدڵ تەنگی ودڵەڕاوکێ وقەلەقی ڕزگاری ببێ وبەدڵی ئاسودەوە سەربکاتە سەر سەرین...

وە هەروەها لەڕزق وڕۆزی هەرەگەورە، هاوسەر وهاوژینی ڕێك وپێك ودڵسۆزە، کەبەڕاستی هاوبەشی ژیانت بێ. نەك ژەهری ژیانت بێ. وە هەروەها ئەولادی صاڵح و خواناس وڕەوشت بەرز، کەهەتا لەژیاندای بەبینینی دڵو

ده‌روونت بکرێته‌وه وچاوت پێ ی ڕۆشن ببێته‌وه ودوای مردنیشت دوعای خێرت بۆبکات وخه‌ڵکی بڵێن ڕه‌حمه‌ت له‌و دایك وباوکه‌ی که‌ئه‌و ئه‌ولاده صاڵحه. ئه‌و کوره باشه. ئه‌و کچه چاکه‌ی لێ بوه!! ئای چه‌ند که‌س هه‌یه حه‌زی ده‌کرد، هیچ ماڵ وسامانی نه‌بوایه. به‌لاَم وه‌کو فلاَن که‌سی حه‌ماڵ کوڕێکی ئاوا ڕێك وپێك وکچێکی ئاوا به‌حورمه‌تی هه‌بوایه‌و وه‌کو چرا بۆ ڕووناکی ژیانی خه‌ڵك بسوتایه وخۆی وموسڵمانانی ئاسوده بکردایه!

که‌واته: ئه‌ولادی صاڵحیش له‌باشترین جۆری ڕزق و ڕۆزی یه:

دوعاو پاڕانه‌وه، که‌خودای گه‌وره زمانت ڕابێنێ که‌به‌رده‌وام دوعای خێری پێ بکه‌ی. به‌ڕاستی ئه‌وه باشترین جۆری ڕۆزی یه... دووڕکات له‌نیوه‌ی شه‌ودا، ئه‌وکاته‌ی خه‌ڵکی خه‌وتون ئای چ خۆشیه‌ك به‌ده‌روون ده‌به‌خشێ و به‌هه‌موو سامانی دونیا به‌بێ عیباده‌ت به‌راورد ناکرێ... دراوسێ ی چاك. که‌له‌ده‌ست و زمان وچاوی ئه‌مین بی و چاوه‌ڕێ ی خێری لێ بکه‌ی به‌ڕاستی ڕزقێکی گه‌وره‌یه‌و دراوسێ ی باش، به‌پاره‌و سامان ناکڕدرێ. ئه‌ی له‌ش ساغی؟! بێ موصیبه‌تی وبێ وه‌یی وبێ ترس خه‌وتن و هاتوچۆکردن وکاسپی کردن؟! ئه‌ی حورمه‌ت وڕێزی ناو خه‌ڵك؟! ئه‌ی کارو که‌سابه‌تی باش که‌له‌شه‌واندا بێیته‌وه ناوماڵ و منالی خۆت وئاواره‌ی ولاَتان نه‌بی؟!

ئایا ئه‌مانه له‌باشترین ڕزق وڕۆزی نین؟!! ئایا ئه‌مانه‌ت نه‌بێ وهه‌موو سامانی دونیات هه‌بێ، هیچ نرخی هه‌یه وهیچ تام وچێژی لێ وه‌رده‌گری؟! به‌بێ گومان نه‌خێر... ده‌ی که‌واته: وادابنێ هه‌موو که‌سێك بایی (١٠٠) نمره‌ی هه‌یه بۆ ڕزق و ڕۆزی. هاوسه‌ری چاك وخواناس وڕه‌وشت به‌رز = ١٠ پله ونمره. ئه‌ولادی صاڵح و گوێڕایه‌ڵ ودیندار = ٥ نمره. دراوسێ ی چاك = ٧ نمره، له‌ش ساغی = ٢٠ نمره. پاره و سامان وخانوو سه‌یاره = ١٠ نمره. به‌م شێوه‌یه شته جوان و به‌سوده‌کان که‌ژیان خۆش ده‌که‌ن بژمێره، هه‌تا سه‌د (١٠٠) نمره‌که ته‌واو ده‌که‌ی. جاده‌بینی که‌سی واهه‌یه له‌هاوسه‌ری ژیاندا (٥) نمره‌ی هه‌یه. به‌لاَم له‌مناڵدا (١٠) نمره‌ی هه‌یه. له له‌ش ساغی و دڵ خۆشی وڕوخۆشی دا (٤٠) پله‌ی هه‌یه. به‌لاَم له‌پاره‌و سامان وسه‌یاره‌دا (٥) پله‌ی هه‌یه. به‌م شێوه‌یه هی هه‌مووکه‌س هه‌رده‌کاته (١٠٠) نمره‌که، به‌لاَم نمره‌کان به‌پێ ی زۆر وکه‌می ودابه‌ش بونیان به‌سه‌ر شته‌کاندا که‌مرۆڤ لێیان سوود مه‌ند ئه‌بێ





و پێیان بەختەوەر دەبێ جیاوازن وەی ئەم لەم پلەدا زیاترە وەی ئەو کەمترەو لەشتێکی تردا بەپێچەوانەوە!..

کەواتە: دڵنیابە خوای گەورە بەیەکسانی ڕزق و ڕۆزی هەمووکەسی وەکو یەك داوەو مرۆڤ کاتێ هەڵە تێ دەگات، کەوابزانێ سەروەت وسامان ورزق و ڕۆزی تەنها پارەو دینارو دۆلار وئاڵتون وخانوو سەیارەیە! کەواتە: کەلەمانای (الرَّزاق) گەیشتین، پێویستە:

١. حەرام نەخۆین، چونکە دڵنیابە ئەگەر پەلەنەکەی و ئارام بگری لەسەر حەلاڵ خۆری. ئەوەی ئەمڕۆ بەحەرام دەستت کەوتوە، ڕۆژێ بەحەلاڵی دەستت دەکەوت.

٢. مادام خوای گەورە هەرخۆی (الرَّزاقَ) إِنَّ اللهَ هو الرَّزاقُ — ئیتر دڵنیابەو هەرگیز خۆت مل کەچی کەس مەکە لەپێناوی ڕزق ورۆزی دا.

هەرگیز دوو ڕوویی و ڕوپامایی وماستاوچیەتی و تەقریرنوسی وجاسوسی بۆ پاروە نانێك و یەك دوو پارەی سووك وچروکدا، مەکە..

٣. هەرگیز حەریص و سورمەبە لەسەر بەدەست هێنانی پارەوسامان. بەڵکو بەجوانی و پوختی هەوڵی خۆت بدە وپشت بەخوا ببەستەو مەکڕوزێوەو مەلالێوە لای خەڵکی، کەهیچیان پێ ناکرێ بۆت وهەموو کەسیش ڕقی لەوکەسەیە. کەبەردەوام دەکڕوزێتەوە وباسی نەبونی وهەژاری خۆی دەکات وهەردەڵێ نیمە!..

وە هەروەکو وتمان هەرشتێ زۆر سوربی لەسەر بەدەست هێنانی بەئاسانی دەستت ناکەوێ یان هەر دەستت ناکەوێ!. وەکو خەوتن. ئەو کەسەی لەجێگای خەوتنەکەیدا بیەوێ دوای (١٠) دەقیقەی تر خەوی لێ بکەوێ. دوای یەك سەعاتی تر بەدڵنیاییەوە خەوی لێ ناکەوێ، چونکە سورەو حەریصە لەسەری. کەبێگومان لەمەسەلەی ڕزق و ڕۆزیشدا هەروایەو تۆ تەنها هەوڵ و تێکۆشانت لەسەرەو ئیتر ڕزق و ڕۆزیەکە لای خوای پەروەردگار دیاری کراوە.

لەخوای پەروەردگار دەپاڕێینەوەو دەڵێین: یاالله، یارَزاق، یارَزّاق:

(إغْنِنا بِحَلالِكَ عَنْ حَرامِكَ، وَبِطاعَتِكَ عَنْ مَعصِيَتِكَ، وَبِفَضْلِكَ عَمن سِواكَ)

اللَّهُمَّ آمِين

## سەرچاوەکان


١- تەفسیری ئاسان ، بورهان محمد أمین.

٢- تأملات في الإسلام ، د. محمد راتب النابلسي ، ص٨٥.

٣- موسوعة الأخلاق الإسلامية ، سعد یوسف أبو عزیز ، ج١ ، ص٤٧٩.

٤- التقوى في القرآن الكریم ، رفاه أحمد رضا مفتي ، ص٣١٤.

٥- باسمك نحیا ، عمرو خالد ، ص ١٣٠.

٦- موسوعة أسماء الله الحسنى ، د. محمد راتب النابلسي ، ج١ ، ٢٤١.

الحَمْدُللهِ رَبِّ العالَمينَ ... يارَب، وَقَفَ السّائِلوُنَ بِبابِكَ، وَلاذَ الفُقَراءُ بِجَنابِكَ، وَنَدِمَ المفرطونَ عَلى تَفريطِهِمْ في طاعَتِكَ، وَخَجَلَ العاصُونَ حَياءً من مُراقَبَتِكَ، أَنْتَ الجَوّادُ الكريم، وَأَنْتَ الغَفُورُ الرَّحيم، لَنْ تُطاعَ إلا بِإِذنِكَ، وَلَنْ تُعْصَى إلا بِعِلْمِكَ، تُطاعُ فَتَشْكُرُ، وَتُعْصَى فَتَغْفِرُ، أَقْرَبُ شَهيد، وَأَجَلُّ حَفيد، السِّرُّ عِنْدَكَ عَلانِيَة، وَالحَلالُ ماأَحْلَلْتَ، وَالحَرامُ ماحَرَّمْتَ، وَالأمْرُ أَمْرُكَ، وَالدِّينُ دينُكَ، وَالقَضاءُ قَضاءُكَ، وَالحُكْمُ حُكْمُكَ، أَنْتَ الواحِدُ لاشَريكَ لَكَ، أَنْتَ الفَرْدُ الصَّمَدُ، لا نِدَّ لَكَ...

إلهي: أَنْتَ أَهْلُ الثَّناءِ وَالمَجْد، أَحَقُّ ماقالَ العَبْدُ، وَكُلُّنا لَكَ عَبْدٌ، لامانِعَ لِما أَعْطَيْتَ، وَلامُعْطِيَ لِما مَنَعْتَ، وَلا قابِضَ لِما بسطتَ، وَلا باسِطَ لِما قَبَضْتَ ... نَسْأَلُكَ بِأَسْمائِكَ الحُسْنَى، وَبِصِفاتِكَ العُلَى. أَنْ تَجْعَلَ القُرْآنَ العَظيمَ رَبيعَ قُلوبِنا، وَتَرْحَمَنا هذهِ السّاعَة. وَتَجْعَلَنا مِنَ المَقْبُولينَ عِنْدَكَ يارَبَّ العالَمينَ..

أَشْهَدُ أَن لاإله إلا اللهُ وَحْدَهُ لاشَريكَ لَهُ. شَهادَةً تَنْفَعُ قائِلَها يَوْمَ تُبَدَّلُ الارْضُ وَالسَّماوات.. ﴿ يَوْمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ (المطففين: ٦) ..﴿ يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَرًا وَمَا عَمِلَتْ مِن سُوٓءٍ تَوَدُّ لَوْ أَنَّ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُۥٓ أَمَدًۢا بَعِيدًا ﴾ (آل عمران: ٣٠).

لاإلهَ إلا الله، يَعْلَمُ دَبيبَ النَّمْلَةِ السَّوْداء، في اللَّيْلَةِ الظَّلْماء، عَلى الصَّخْرَةِ الصماء... وَلايَخْفَى عَلَيهِ شَئٌ في الارْضِ وَلا في السَّماءِ.. وَأَشْهَدُ أَنَّ سَيِّدِنا وَحَبيبَنا مُحَمَّداً، عَبْدُاللهِ وَرَسُولُهُ، إصْطَفاهُ رَبُّهُ، رَحْمَةً لِلْعالَمين.. أَرْسَلَهُ رَبُّهُ لِلإيمانِ مُنادِياً، وَإلى الجَنَّةِ داعِياً، وَإلى الطَّريقِ المُسْتَقيمِ هادِياً، وَفي مَرْضاةِ رَبِّهِ ساعِياً، وَبِكُلِّ مَعْرُوفٍ آمِراً، وَعَنْ كُلِّ منكرٍ ناهِياً، هُوَ خاتَمُ النَّبِيِّنَ، وَقائِدِ الغُرِّ المَيامِينَ. اللّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّم وَبارِكَ عَلى صاحِبِ الحَوْضِ المَوْرُود، واللِّواءِ المَعْقُود، وَالمَقامِ المَحْمُود. وَصاحِبُ الغُرَّةِ والتَّحجيل، المَذْكُورِ في التَوراةِ وَالإنجيل، المُؤَيِّدُ بِجُبْرِيل. وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ، وَمن سارَ عَلى هَدْيِهِ إلى يَوْمِ الدِّين. وارْضَ اللَّهُمَّ عَنْ ساداتِ دينِنا وَأَئِمَّتِنا، لاسيما على الشّابِ المُؤمِنِ، صاحِبِ رَسُولِ اللهِ في الغارِ والطَّريق، من قالَ في حَقِّهِ رَسُولُ اللهِ المُوْتَى بالدِّينِ الوَثيق، (ماطَلَعَتْ شَمْسٌ ولاغَرُبَتْ على رَجُلٍ أَفْضَلَ بَعْدَ النَبِيِّنَ من أَبي بَكْرٍ الصِّديق)!!...

وَعَنِ الأميرِ الأَوّاب، مُزَيِّنِ المنبَرِ، مُشَيِّدِ المِحْراب، الناطِقِ بالحَقِّ وَالصَّواب، من قالَ في حَقِّهِ رَسُولُ المَلِكِ الوَهّاب (لَوْكانَ بَعْدي نَبِيّاً لَكانَ عُمَرَ بْنَ الخَطّاب). وَعَنْ أَميرِ الزَّمانِ، صاحِبِ الحَياءِ والعِرْفانِ، جامِعِ القُرْآنِ من قالَ في حَقِّهِ رَسُولُ المَلِكَ الدَّيان: (إِنَّ مَلائِكَةَ الرَّحْمنِ، لَتَسْتَحي من

عُثْمانَ ابْنِ عَفّانَ).... وَعَنْ أَميرِ الابْرار، أَسَدِ اللهِ، الغالِبِ عَلى الكُفّار، من قالَ في حَقِّهِ رَسُولُ المَلِكِ الجَبّار: (عَلِيٌّ مِنّي وَأَنا من عَليٍّ). يَعْني الحَيْدَرَ الكَرّار... وَعَنِ السَّيِّدَيْنِ السَّنَدَيْنِ، سَيِّدَي شَبابِ أَهْلِ الجَنَّة، الحَسَن وَالحُسَيْن... وَعَنْ أُمِّهِما فاطِمَةَ الزَّهْرا، وَعَنْ جَدَّتِهِما خَديجَةَ الكُبرى، وَعَنْ عائِشَةَ أُمِّ المُؤْمِنينَ، وَعَنْ بَقِيَّةِ أَزواجِ رَسُولِ اللهِ أَجْمَعين.، وَعَنْ عَمَّي نَبِيِّكَ حَمْزَةَ وَالعَبّاس، الطاهِرينَ مِنَ الدَّنَسِ وَالأَرجاسِ، وَعَنْ جَميعِ الصَّحابَةِ وَالتّابِعينَ وَمن تَبِعَهُمْ بِإِحْسانٍ إِلى يَوْمِ الدِّين، وَعَنّا مَعَهُمْ بِفَضْلِكَ وَكَرَمِكَ ياأَكْرَمَ الاكْرَمينَ، وَأَرْحَمَ الرّاحِمينَ..

أَمّا بَعْدُ فَيا عِبادَ اللهِ، فَإِنَّني أُوصيكُمْ في هذا المَقامِ بِتَقْوى اللهِ وَطاعَتِهِ (يأَيُّها الَّذينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللهَ حَقَّ تُقاتِهِ وَلاتَمُوتُنَّ إِلا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُون). أَيُّها المُؤْمِنُونَ: الإِيمانُ باللهِ عَزَوَجَلَّ، وَالإِيمانُ بالاسْلامِ وَبِرَسُولِ الإِسْلامِ، أَساسُ كُلِّ خَيْرٍ، فَمن فَقَدَ هذا الإِيمانَ، فَقَدَ في الحَقِيقَةِ كُلَّ خَيرٍ، وَكانَ مِنَ الخاسِرينَ..

إِنَّ الإِيمانَ عَقيدَةٌ تَعْمُرُ القَلْبَ، وَيَقِينٌ صادِقٌ يَمْلا النَّفْسَ، الإِيمانُ عَمَلٌ وَجِهادٌ في سَبيلِ اللهِ، وَعِبادَةٌ خالِصَةٌ لِوَجْهِ اللهِ. الإِيمانُ تَضْحِيَةٌ وَفِداءٌ، وَإِسْتِسْلامٌ مُطْلَقٌ لِكُلِّ ماجاءَ عَنِ اللهِ وَرَسُولِه، وَرَفْضٌ لِكُلِّ مَبْدَإٍ يُخالِفُ الإِسْلامَ في نَصِّهِ وَرُوحِه، وَإِذا أَرَدْتُم أَنْ تَعرِفُوا من هُمُ المُؤْمِنُونَ حَقّاً وَصِدْقاً، فَتَدَبَّروا قَوْلَ اللهِ عَزَوَّجَلَّ: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾ (الانفال: ٢-٤).

عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ، عَنْ النَبِيِّ ﷺ قالَ: تَرَكْتُ فيكُمْ شَيْئَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُما: كِتابَ اللهِ وَسُنَّتي، وَلَنْ يَتَفَرَّقا حَتّى يَرِدَا عَلَيَّ الحَوْضَ) رَواهُ الحاكم.

بارَكَ اللهُ لي وَلَكُمْ بالقرآنِ العَظيمِ، وَنَفَعَني وَإِيّاكُمْ بِما فيهِ مِنَ الآياتِ وَالذِّكْرِ الحَكيم، أَقُولُ قَوْلي هذا، وَأَسْتَغْفِرُ اللهَ العَظيمَ لي وَلَكُمْ وَلِوالِدَيَّ وَلِوالِديكُمْ وَلِكافَّةِ المُسْلِمينَ فاسْتَغْفِرُوهُ إِنَّهُ هُوَ الغَفوُرُ الرَّحيم.



الحَمْدُلِلّهِ الرَّؤُوفِ بِعِبادِهِ، الرَّحيمِ بِخَلْقِهِ، وَهُوَ عَلى كُلِّ شَيْ قَدير، وَأَشْهَدُ أن لا إلهَ إلا اللهُ دَعا إلى الرَّحْمَةِ، وَمَنَّ عَلى المُسْلِمينَ بِخاتَمِ المُرْسَلينَ، الَّذي وَصَفَهُ في كِتابِهِ الكريم بِقَوْلِهِ ﴿ لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾ (التوبة، ١٢٨).

وَأَشْهَدُ أَنَّ سَيِّدنا مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، طَبَعَهُ اللهُ عَلى الرَّحْمَةِ، وَرَبّاهُ عَلى الرَّأْفَةِ بالإنسانِيَّةِ جَمْعاء، إذْ خاطَبَهُ بِقَوْلِهِ ﴿ وَمَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ﴾الانبياء، ١٠٧

اللّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَأَصْحابِهِ الَّذينَ أُشْرِبُوا في قُلُوبِهِمُ الرَّأْفَةُ وَالرَّحْمَةُ، فَكانُوا مِثالا لِلتَّضامُنِ الإجْتِماعِيِّ وَالتَّكافُلِ الإنْسانِيِّ ﴿ فَأُولَٰئِكَ لَهُمْ جَزَاءُ الضِّعْفِ بِمَا عَمِلُوا وَهُمْ فِي الْغُرُفَاتِ آمِنُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾ سبأ: ٣٧

أَمّا بَعْدُ فَيا عِبادَ اللهِ، أُوصيكُمْ وَنَفْسي أَوَّلا بِتَقْوى اللهِ تَعالى وَطاعَتِه فَاتَّقُوا اللهَ وَالزَمُوا طاعَتَهُ، وَأَنيبُوا إِلَيْهِ وَاسْتَغْفِرُوهُ: ﴿ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾ الاحزاب: ٧١



أَلا وَصَلُّوا وَسَلِّمُوا - رَحِمَكُمُ اللهُ - عَلى الهادي البَشيرِ، وَالسِّراجِ المُنيرِ، كَما أَمَرَكُمْ بِذلك اللَّطيفُ الخَبير، فَقالَ في مُحْكَمِ التَّنْزيلِ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾ الاحزاب: ٥٦

اللّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ عَلى عَبْدِكَ وَرَسُولِكَ مُحَمَّدٍ خاتَمِ النَبِيِّنَ، وَالرَّحْمَةِ المُهْداةِ لِلْعالَمينَ، وَآلِهِ الطَّيِّبينَ، وَأَزْواجِهِ أُمَّهاتِ المُؤْمِنينَ، وَارْضَ اللّهُمَّ عَنِ الخُلَفاءِ الرّاشِدينَ، أَبي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمانَ وَعَلِيٍّ، وَعَنْ بَقِيَّةِ الصَّحابَةِ وَالقَرابَةِ وِتابِعِيهِمْ بِإِحْسانٍ إلى يَوْمَ الدِّينِ، وَعَنّا مَعَهُمْ بِمَنِّكَ وَفَضْلِكَ ياأَرْحَمَ الرّاحِمينَ.

اللّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُؤْمِنينَ وَالمُؤْمِناتِ. وَالمُسْلِمينَ وَالمُسْلِماتِ، الأَحْياءِ مِنهُمْ وَالأَمْواتِ.

اللّهُمَّ آتِ نُفُوسَنا تَقْواها، وَزَكِّها أَنْتَ خَيْرُ من زَكّاها، أَنْتَ وَلِيُّها وَمَوْلاها. اللّهُمَّ فَوِّزْنا

بِغُفْرانِكَ وَرَحْمَتِكَ يَوْمَ لايَنْفَعُ مالٌ وَلابَنُون. اللّهُمَّ أدخِلْنا مَعَ الَّذينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ، الَّذينَ لاخَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاهُمْ يَحْزَنُونَ.

اللّهُمَّ اشفْي مَرْضانا وَارحَمَ مَوْتانا. وَعافِ مُبْتَلانا بِرَحْمَتِكَ يا أَرْحَمَ الرَّحِمينَ. **اللّهُمَّ اجْعَلْ** بِلادَنا كُرْدُسْتانَ، وَسائِرَ بِلادِ المُسْلِمينَ، آمِناً مُطْمَئِنّاً وَعامِراً بالإيمان. **اللّهُمَّ اجْعَلْنا مَعَ الَّذينَ** أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ مِنَ النَبِيِّنَ والصِّديقينَ وَالشُّهَداءِ وَالصّالِحينَ، وَحَسُنَ أُوْلئِكَ رَفيقاً.

عِبادَ الله: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴾ النحل: ٩٠

فَاذْكُرُوا اللهَ العَظيمَ يَذْكُرْكُمْ، وَاشكُرُهُ عَلى نِعَمِهِ يَزِدْكُمْ، وَلَذِكْرُ اللهِ أَكْبَرُ، واللهُ يَعْلَمُ ماتَصْنَعوُنَ.

﴿ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾

ٱللَّهُمَّ ءَامِينَ





الحَمْدُ لِلّهِ العَليمِ فَلا تَخْفَى عَلَيْهِ خافِيَةٌ، الخَبيرِ بِما تَكْسِبُهُ كُلُّ نَفْسٍ سِرّاً أَوْ عَلانيَةً، الحَمْدُ لِلّهِ قَدَّرَ لِكُلِّ امرِيءٍ أَجَلاً لايَتَجاوَزُهُ وَلايَعْدوهُ، بَلْ عِنْدَهُ تَقِفُ دَقّاتُ قَلْبِهِ، وَتُنْزَعُ رُوحُهُ من جَسَدِهِ، وَإِذْ ذاكَ لايَنْفَعُهُ حَسَبٌ أَوْ نَسَبٌ، وَلا ذُرِّيَةٌ وَلاسَبَبٌ، وَلكِنَّهُ العَمَلُ، فَإِنَّهُ مُسْعِدُهُ أَوْ مُشْقِيهِ: ﴿ فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾ ﴾ النازعات: ٣٧-٤١.

وَأَشْهَدُ أَن لا إِلهَ إلا اللهُ وَحْدَهُ لاشَريكَ لَهُ، يُحْيي وَيُميتُ وَهُوَ عَلى كُلِّ شَيٍْ قَدير، وَأَشْهَدُ أَنَّ سَيِّدَنا مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ قَبَضَهُ مَولاهُ إِلى الرَّفيقِ الأَعْلى، وَأَعَدَّ لَهُ في جَوارِهِ الدَّرَجاتِ العُلى. اللّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَأَصْحابِهِ الَّذينَ لَمْ تَشْغَلْهُمْ دُنْياهُمْ عَنْ آخِرَتِهِمْ، وَلاحاضِرُهُمْ عَنْ مُسْتَقْبَلِهِمْ. بَلْ كانُوا كَما قالُوا: ﴿ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُوا۟ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴾ البقرة: ٢٠١-٢٠٢.

أَما بَعْدُ فَيا عِبادَ اللهِ، أُوصيكُمْ وَنَفْسي أَوَّلا بِتَقْوى اللهِ تَعالى وَطاعَتِهِ. وَلُزُومِ أَوامِرِهِ وَكَثْرَةِ ذِكْرِهِ وَمَخافَتِهِ، فَإِنَّ اللهَ مَعَ الَّذينَ اتَّقَوا وَالَّذينَ هُمْ مُحْسِنُونَ.

هذا وَصَلُّوا وَسَلِّمُوا (رَحِمكُمُ اللهُ) عَلى سَيِّدِ الأَوَّلينَ والآخِرينَ، كَما أَمَرَكُمْ بِذلكَ رَبُّ العالَمينَ، فَقالَ تَعالى قَوْلا كَريماً: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِىِّ ۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ صَلُّوا۟ عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴾ الاحزاب: ٥٦

اللّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ المَخْصُوصِ بِـ (أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ). وارضَ عَنْ أَبي بَكْرٍ الَّذي نالَ من آهل الرِدةِ مناهُ وأدْرك ، وعنْ عُمرَ الذي كانَ إِسْلامُهُ عَلى المُؤمنينَ أَيْمَنَ وَأَبْرَكَ، وَعَنْ عُثمانَ الَّذي جَمَعَ القُرْآنَ وَلَمْ يُلْحَقْ في التِّلاوَةِ وَلَمْ يُدْرَكْ، وَعَنْ عَلِيِّ الَّذي ما سَجَدَ لِصَنَمٍ قَطُّ وَلا أَشْرَكَ، خُصُوصاً عَنْ سَيِّدَيْ شَبابِ أَهْلِ الجَنَّةِ أَبي مُحَمَّدٍ الحَسَن وَأَبي عَبْدِاللهِ الحُسَيْنِ، وَعَنْ أُمِّهِما سَيِّدَةِ النِّساءِ، فاطِمَةُ الزَهْراءِ، وَعَنْ عَمَّيْهِ المكرمينِ بَيْنَ النَّاسِ، أَبي عمارة حَمْزَةَ وَأَبي الفَضْلِ العَبّاسِ. وَعَنِ السِّتَةِ الباقينَ، وَعَنْ باقي الصَّحابَةِ أَجْمَعينَ.، وَعَنّا مَعَهُمْ بِرَحْمَتِكَ ياأَرْحَمَ الرّاحِمينَ..

اللّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُؤْمنِينَ وَالمُؤْمِناتِ، وَالمُسْلِمِينَ وَالمُسْلِماتِ، الأحْياءِ منهُمْ وَالأمْواتِ، من أَهْلِ السُّنَّةِ وَالجُمُعَةِ وَالجَماعاتِ.

اللّهُمَّ يارَب، ياذَا العِزَّةِ وَالجَبَرُوتِ، يامالِكَ المُلْكِ وَالمَلَكوُتِ، يامن أمنتَ يُونُسَ في بَطْنِ الحُوتِ، وَنَجَّيْتَ مُوسَى في التّابُوتِ، وَحَفِظْتَ الحَبِيبَ مُحَمَّداً بِنَسيجِ العَنْكَبُوتِ، سُبْحانَكَ أَنْتَ الحَيُّ الَّذي لايَمُوتُ، إغْنِنا بالإفْتِقارِ إِلَيْكَ وَلاتفقرنا بالاسْتِغْناءِ عَنْكَ. اللّهُمَّ إنّا نَعُوذُ بِكَ مِنَ الفَقْرِ إلاّ إلَيْكَ، وَمِنَ الذُّلِ إلاّ لَكَ، وَمِنَ الخَوْفِ إلاّ منكَ، نَعُوذُ بِكَ من عُضالِ الدّاءِ، وَمن شَماتَةِ الأعْداءِ، وَمِنَ السَّلْبِ بَعْدَ العَطاءِ.

اللّهُمَّ عافِنا في قُدْرَتِكَ، وَأَدْخِلْنا في رَحْمَتِكَ، واقْضِ أَجَلَنا في طاعَتِكَ. اللّهُمَّ أَنْزِلْ عَلَيْنا من خَيْراتِ السَّماءِ، وَأَنْبِتْ لَنا من بَرَكاتِ الارْضِ....

اللّهُمَّ اجْمَعْ شَمْلَنا، وَوَحِّدْ كَلِمَتَنا، وانْصُرْنا عَلى من عادانا، واحْفَظْ كُرْدُسْتانَنا، وَأَصْلِحْ أَوْلادَنا، واشْفِ مَرْضانا، وَعافِ مُبْتَلانا، وَارْحَمْ مَوْتانا، وَخُذْ بِأَيْدينا إلى دينِكَ الحَقِّ، وَهَدْي كِتابِكَ المُبينَ، وَكُنْ دائِماً خَيْرَ عَوْنٍ لَنا فيما يُصْلِحُ شُؤُونَنا يارَبَّ العالَمينَ.

عِبادَ الله: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴾ النحل، ٩٠.

فَاذْكُروا اللهَ العَظيمَ يَذكُرْكُمْ، وَاشْكُرُوهُ عَلى نِعَمِهِ يَزِدْكُمْ، وَلَذِكْرُ اللهِ أَكْبَرُ، وَاللهُ يَعْلَمُ ماتَصْنَعُونَ..

الحَمْدُلِلَّهِ الَّذي أَنْزَلَ الكِتابَ عَلى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعالَمينَ نَذيراً، وَأَرْسَلَ رَسُولَهُ شاهِداً وَمُبَشِّراً وَنَذيراً. وَداعِياً إِلى اللهِ بِإِذْنِهِ وَسِراجاً مُنيراً، وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلهَ إِلا اللهُ وَحْدَهُ لاشَريكَ لَهُ تَعالى عَمّا يَقُولُ الظالِمُونَ عُلُوّاً كَبيراً.

وَأَشْهَدُ أَنَّ سَيِّدنا مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ بَعَثَهُ بالْحَقِّ إِلى كافَّةِ الخَلْقِ بَشيراً وَنَذيراً، اللّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَأَصْحابِهِ وَآتِهِمْ من لَدُنْكَ فَضْلا كَبيراً..

أَمّا بَعْدُ فَيا عِبادَ اللهِ: أُوصيكُمْ وَنَفْسي أَوَّلا بِتَقْوى اللهِ تَعالى وَطاعَتِهِ (يأَيُّها الَّذينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللهَ حَقَّ تُقاتِهِ وَلاتَمُوتُنَّ إلا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ).

أَيُّها الاخْوَةُ المُؤمِنُونَ: إِنَّ أَحْسَنَ الحَديثِ كِتابُ اللهِ تَعالى، نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الامينُ. عَلى قَلْبِ الرَّسُولِ النَبِيِّ الامِيِّ، ذِي الخُلُقِ العَظيمِ، لِيَكُونَ هُدىً لِلْناسِ وَمَوْعِظَةً، وَنُوراً وَشِفاءً، وَتبْصِرَةً وَبُرْهاناً ﴿ يَهْدِى بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ... يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيرًا مِّمَّا كُنتُمْ تُخْفُونَ ﴾ المائدة، ١٦.

لَقَدْ جاءَ هذا القُرْآنُ العَظيمُ تَزْكِيَةً لِلْنُفُوسِ، وَتَبْصِرَةً لِلْعُقُولِ، وَتَوْجيهاً لِلْناسِ إِلى مَعاني الإنسانِيَّةِ الكامِلَةِ، وَخصائِصِها الفاضِلَةِ، وَتَخْفيفاً عَلَيْهِمْ من أَثْقالِ المادِّيَّةِ، وَتَطْهيراً لَهُمْ من أَدْرانِ الفَسادِ وَالبَغْيِ، وَنَوازِعِ الشَّرِّ وَالشَّرَهِ وَالطَّمَعِ..

من قالَ بِهِ صَدَقَ، وَمن حَكَمَ بِهِ عَدَلَ، وَمن عَمِلَ بِهِ أُجِرَ، وَمن دَعى إِلَيْهِ هُدِيَ إِلى صِراطٍ مُسْتَقيمٍ..فَاتَّقُوا اللهَ عِبادَ اللهِ، وَصَلُّوا وَسَلِّمُوا عَلى من أُمِرْتُمْ بالصَّلاةِ وَالسَّلامِ عَلَيهِ عُمُوماً، بِقَوْلِهِ تَعالى - وَلَمْ يَزَلْ قائلا عَليماً:- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ ۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ صَلُّوا۟ عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴾ الاحزاب، ٥٦

فَأَكْثِرُوا مِنَ الصَّلاةِ عَلَيْهِ تَكُونُوا مِنَ الفائِزينَ. اللّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ عَلى عَبْدِكَ وَرَسُولِكَ مُحَمَّدٍ

خاتَمِ النَبِيِّينَ وَإمامِ المُرْسَلين.

اللّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُؤْمِنينَ وَالمُؤْمِناتِ، وَالمُسْلِمينَ وَالمُسْلِماتِ. الاحْياءِ منهُمْ وَالامْواتِ، من أهْلِ السُّنَةِ وَالجُمُعَةِ وَالجَماعاتِ.

اللّهُمَّ لاتَدَعْ لَنا في هذا اليَوْمِ العظيمِ ذَنْباً إلاّ غَفَرْتَهُ، وَلاكَرْباً إلاّ فَرَّجْتَهُ، وَلاعَيْباً إلاّ سَتَرْتَهُ، وَلا دَيْناً إلاّ أَدَيْتَهُ، وَلا مَريضاً إلاّ شَفَيْتَهُ، وَلامَيِّتاً إلاّ رَحِمْتَهُ، وَلا سائِلا إلاّ أَعْطَيْتَهُ، وَلا غائِباً إلاّ رَدَدْتَهُ، وَلا حاجَّةً إلاّ قَضَيْتَها ياأرْحَمَ الرَّحِمينَ...

نَسْأَلُكَ اللّهُمَّ إصْلاحاً في الوَلَدِ، وَالأَمْنَ في البَلَدِ، وَالعافِيَةَ في الجَسَدِ، اللّهُمَّ ارْفَعْ عَنّا الغَلا وَالوَبا وَالرِّبا، وَالزِّنَى وَالزَّلازِلَ وَالمِحَنَ، وَسُوءَ الفِتَنِ، ماظَهَرَ منها وَمابَطَنَ، عَنْ بَلادِنا كُرْدُسْتانَ وَعن سائِرِ بِلادِ المُسْلمينَ اللهم اجعل بِلادنا رَخاءً سَخاءً، آمِناً مُطْمَئِنّاً وَعَامِراً بالإيْمانِ. آمينْ يامُجيبَ السّائِلينَ.

عِبادَ اللهِ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴾ النحل: ٩٠.

وَلَذِكْرُ اللهِ أَكْبَرُ، وَاللهُ يَعْلَمُ ماتَصْنَعُونَ...

# ناوەڕۆك

